ISSN: 2520 - 4106



# گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

گۆڤارێكی ئەكادیمی و زانستیی وەرزییە

ژمارە (٤٠)    ٢٧١٨ ی كوردی    ٢٠١٨ زاینی



http://kurdish-academy.com/index.php/gak

هەولێر- شەقامی هەڵەبجە

**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەساز: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، شیلان جەلال، ئیمان نەجات
- بەشی پەیوەندی: شیلان جەلال
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
- تیراژ: ٢٥٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یان بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی کوردی زمانی سەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤارەکە، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستی بە زمانانی دیکەش بڵاودەکاتەوە کە سەروکاری بە کوردستانەوە هەبێت.

٣- هەر بابەتێک کە بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەکە، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەکەی بە دوو زمانی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکە لە کۆتایی توێژینەوەکە بنووسێت، کە نابێت لە یەک پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکە بخرێنەڕوو.

٥- لە دوای پەسەندکردنی باسەکە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوکردنەوەی بە توێژەر دەدات.

٦- بۆ ئەوەی بابەتەکە لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێک بیرۆکەی سەرەکی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٧- ئەگەر باسەکە لە بارەی ساخکردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەکە بە پێی بنەما زانستییەکان بێت و چەند لاپەڕەی کۆپیکراوی دەستنووسەکە و شوێنی وەرگرتنی، کۆد و جۆری دەستنووسەکە (دەستنووس، چاپ، مایکرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.

٨- ئەگەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەکە، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێت، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێت فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A4) بە فۆنتی یۆنیکورد بێت، ناوونیشانی سەرەکی بە قەبارە (١٥) و ناوی توێژەر و ناوونیشانی لاوەکی بە قەبارە (١٤) و ناوەڕۆک بە (١٣)، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانیشەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و لە حاڵەتی ناچاریشدا تا (٣٠) لاپەڕە وەردەگیرێت.

١٠- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی پەیڕەوی بنەماکانی plagiarism دەکات.

١١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ جۆرێک توێژینەوەی وەرگیراو لە نامەکانی ماستەرو دکتۆرا ( مستل) بڵاوناکاتەوە.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ شێوەیەک نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# تیۆری (ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی) پەیوەندی بە تیۆرەکانی ترەوە

**پ.د.ساجیدە عەبدوڵلافەرهادی**
بەشی زمانی کوردی -کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەددین

**م.ی.شادیە سالح مستەفا**
بەشی زمانی کوردی- کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەددین

**پێشەکی:**

**ناونیشان و بواری لێکۆڵینەوەکە:**

(تیۆری (ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی ) پەیوەندی بە تیۆرەکانی ترەوە) ناونیشانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە تیایدا بەشێوەیەکی گشتی باس لە مێژووی سەرهەڵدانی و بنەماکانی ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی دەکرێت و چ پەیوەندی بە تیۆرەکانی تری ڕێزمانەوە هەیە، هەروەها جیاوازی و لێکچوونی نێوانیان لە شیکردنەوەی ڕستەدا دەردەخات، چونکە بوار و سنووری لێکۆڵینەوەکە پەیوەندی بە ئاستی ڕستەسازییەوە هەیە.

**ڕێباز و کەرەستەی لێکۆڵینەوەکە:**

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە ڕێبازی وەسفی ڕۆنانییە ، کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەش زاری کوردی ناوەڕاستە.

**ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو تەوەر پێکدێت.

تەوەری یەکەم : بەناونیشانی (پێناسە و سەرهەڵدان و بنەماکانی تیۆری ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی)یە،کە تیایدا باس لەمانەی خوارەوە دەکرێ: پێناسەی تیۆرەکە، سەرهەڵدانی ڕاستەقینەی تیۆرەکە، بنەماکانی تیۆرەکە: جیاوازی بوون/گۆڕانگەرایی، سەراپایی،

بەردەوامبـوون لەسـەر یەک ڕێـڕەو، وەک کـاردانەوەیەک بـۆ ڕێزمـانی گوێزانەوە... .

تەوەری دووەم: بەناونیشانی( تیۆری(ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی ) پەیوەنـدی بە تیۆرەکـانی تـرەوە )یە، کە تیایـدا بـاس لەمـانەی خـوارەوە دەکـرێ: پەیوەنـدی ئەم تیـۆرە بە ڕێزمـانی بەنـدێتییەوە، پەیوەنـدی بەیاساکانی فرێزپێکهێنانەوە، پەیوەندی بە ڕێزمانی فۆرمالیزمییەوە.

ئەنجـامی لێکـۆڵینەوەکەش لە چەنـد خاڵێکـدا خـراونەتە ڕوو.، بە کورتەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی، هەروەهـا لیسـتی سەرچاوەکان کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکە هاتووە.

## تەوەری یەکەم

## پێناسە و سەرهەڵدان و بنەماکانی تیۆری ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی

**– پێناسە:**

تیۆری ڕێزمانی فەرهەنگی – ئەرکی (Lexical- Functional Grammar)، کورتکراوەکەی بریتییە لە (LFG)، تیۆرێکی ڕێزمانییە، لە کۆتایی سـاڵانی (١٩٧٠) لە لایەن هەردوو زمـانەوان جـۆن بریسـنان (Joan Bresnan) و ڕۆنالد کاپلان (Ronald Kaplan) [1] سەری هەڵداوە. ئەم تیـۆرە لە کاتێکدا گەشـەی کـرد، کە زۆر بیـرۆکەی نـوێ دەربـارەی زمـان و پێکهـاتە جیاوازەکانی زمـان هـاتنە نـاو لێکـۆڵینەوە زمانەوانییەکـان، وەکو تیـۆری دەسـەڵات و بەسـتنەوەی (چۆمسـکی ١٩٨١). ئەم تیـۆرە یەکێـک بـوو لە تیـۆرە بەناوبانگەکـانی (تیـۆری بەرهەمهێنـان و گـوێزانەوە)، کە چەنـدین تیۆری تریش دەگرێتەوە وەکو: (تیۆری ڕۆنانە سینتاکسییەکان– ١٩٥٧ ، تیـۆری سـتاندارد – ١٩٦٥ ، تیـۆری سـتانداردی فراوانکـراو – ١٩٧٠ ، تیـۆری بچـووکترین پرۆگـرام-١٩٩٣)، "هەر یێکی-ێ لەم قۆناغـانە بە ڕێبـازێکی سـەربەخۆ و پرکەرەوەی کەموکورییەکانی قۆناغەکانی پێش خۆی ئە ژمێرێ " (وریا عومەر ئە مین :٢٠١١: ٢٦ ) ئە م زمانە وانە لە تیۆرە کانیدا هەوڵی ئە وە ی دە دا، کە یاسایە کی گشتگیر دابڕێژێت بە

جۆرێک لە سە ر هە موو زمانە کان جێبە جێبکرێت، لە ژێر ناونیشانی ڕێزمانی سە راپا "ئامانجی سە رە کی لە م ڕێزمانەدا داهێنانی مۆدێلێکی ماتماتیکی بوو، بۆ هە ندێک لە لایە نە جۆرا و جۆرە کانی زمان" (Falk: 2001 :1 ) چۆمسکی لە م ڕێزمانە دا گرنگیی زۆری بە پێکهاتە کانی زمان دەدا وەکو: ڕۆنانی فرەیزەکان و چۆنیە تی ڕۆنانی سە رە وە و ژێرە وە ی ڕستە کان و پەیوەندی نێوان پێکهاتە کان لە سە ر هێڵکاریی درە ختییدا...تد. بە لام تا ڕادە یە ک ئە رکە ڕێزمانییەکانی پشتگوێ خستبوو، بەجۆرێک لە سە ر درە ختی ڕۆنانی فرەیزە کان ئاماژە ی بە ئەرکە ڕێزمانییە کان دە کرد، چونکە ڕێزمانە کە ئە وە ی نیشاندە دا، کە جیاوازییە کی کە م لە نێوان پێکهاتە کان و ئە رکە ڕێزمانییە کاندا هە یە . بە لام لە ڕاستیدا ئە گە ر سە یری ئە م هێڵکارییە ی خوارە وە بکە ین، دە بینین هیچ پە یوە ندییە کی ڕاستە وخۆ لە نێوان ئە م دوو ڕۆنانە دا نییە .



( Sells:1985:137)

لە م هێڵکارییەدا دەردەکەوێت ئە م دوو ئاستە پەیوە ندییەکی ڕاستە وخۆ لە نێوانیاندا نییە ، بۆیە لە "ڕێزمانی فە رهە نگی ئە رکی چە مکە کە ئە وە یە ، کە ئاستە جیاوازە کان هێمای جیاوازییان هە

یە ، پە یـڕە وی سـنووره کـانی خۆیـان دە کە ن".(سـە رچـاوە ی پێشوو:١٣٧)

جوولاندنی کە رە سە کان لە شوێنێکە وە بۆ شوێنێکی تری درە ختی ڕۆنانی فرە یزە کان و کردە کانی گواستنە وە لە ئاستی ڕۆنانی ژێرە وە بۆ ڕۆنانی سە رە وە دوو بیرۆکە ی سەرەکی تیۆرە کانی گـویزانە وە بـوون،بە لاّم تیـۆری ڕێزمـانی فە رهە نگـی ئە رکـی "جوولاندنی کەرەسـە کان و کردە کانی گواستنە وە بۆ وەسفکردنی ڕستە یە ک بە کار ناهێنێت". (Kifle:2011:71)

ئەگەرچـی (بریسـنان) سـەرەتا، وەکـو ڕێزمـان نووسـێکی بـواری تیۆری گوێزانەوە دەستی پێکرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٨) کتێبێکی دەرکرد بە نـاوی (تیـۆری گـوێزانەوەی ڕاسـتەقینە)، ئەوەی بـۆ دەرکەوت، کە هەنـدێک شـت دەربـارەی تیـۆری گـوێزانەوە هەڵەیە. ( کـاپلان)یش لە لێکـۆڵینەوە زمانەوانییەکانیـدا هەمـان بیـر و بـاوەڕی (بریسـنان) ی بـۆ دروسـتبوو، لە کۆتاییـدا هەسـتیان بەوەکـرد، کە بیرۆکەکانیـان هەمـان ئاڕاسـتەی هەیە، ئەمەش بـووە هـۆی سـەرهەڵدانی تیـۆری ڕێزمـانی فەرهەنگـی ئەرکی"چـونکە گریمانەکـانی گـوێزانەوە نە دەگونجـان لەگەڵ لێکۆڵینەوەکـانی ڕێزمـانی سـەراپا، بـۆیە (LFG) تـێکەڵەیەکە لە ڕێزمـانی بەرهەمهێنان، کە جێگرەوەی تیۆرەکانی گوێزانەوەیە".( Falk:2001:2).

**– سەرهەڵدانی ڕاستەقینەی تیۆرەکە:**

یەکەم کتێـب کە لە بـارەی ئەم تیـۆرە بڵاوکـرایەوە بە ناونیشـانی (نوانـدنی هۆشـەکی بـۆ پەیوەنـدییە ڕێزمانییەکـان-١٩٨٢) ( The MentalRepresentation of Grammatical Relation) بوو. تیۆرەکە گرنگییەکی زۆری بە فەرهەنگ و سینتاکس و سیمانتیک دەدا. ئەم تیۆرە تیۆرێکی فەرهەنگییە نەک گوێزانەوەیی، فەرهەنگ لەم تیۆرەدا ڕۆڵێکی زیـاتری پێـدەدرێت بە بەراورد لەگەڵ تیۆرەکـانی گـوێزانەوە، هەروەهـا لە لێکۆڵینەوەکانیـدا کەمتـر پشـت بەڕۆنـان دەبەسـتێت "ئەمەش بە گریمـانەکردنی شـێوەیەکی تـری ڕستەسـازی، کەوا بە تەواوی پشـت بە

ڕۆنان نا بەستێت، یان پشتگیری لەو بۆچوونە دەکات کە دەڵێت: زۆر شت دەربارەی ڕستەسازی هەیە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی، کە دەتوانی لە ڕێگەی درەختی ڕۆنانی فرەیزەکان دەریببڕی" (Sells:1985:135) لەم تیۆرەدا ئاستێکی نوێ بۆ ڕۆنانی زانیارییە ئەرکییەکانی زمان زیادکرا ئەویش ڕۆنانی ئەرکی (Functional Structure) بوو، ئەم ڕۆنانەش گرنگی بە سیما و تایبەتمەندیی ئەرکە ڕێزمانییەکان دەدات. ئەم ئەرکە ڕێزمانییانەش بە کەرەسەی سەرەکی تیۆرەکە دادەندرێت. ئەگەرچی پێش (بریسنان)یش لە لایەن چەند زمانەوانێک ئەوە خرابووە ڕوو، کە نابێت ئەرکە ڕێزمانییەکان لەسەر درەختی ڕۆنانی فرەیزەکان ئاماژەی بۆ بکرێت، چونکە ئەم ئەرکە ڕێزمانییانە زۆر تایبەتمەندی و سیمایان هەیە ناکرێ لەسەر درەختی ڕۆنانی فرەیزەکان بنوێندرێن، بەڵکو درەختی ڕۆنانی فرەیزەکان زیاتر بۆ خستنەڕووی (ڕیزبوونی رووکەشی وشەکان، ڕۆنانی فرەیزەکان، خستنە ڕووی پەیوەندیی نێوان کەرەسەکان) گونجاوە، ئەم ڕۆنانە ناتوانێت ئەم ئاستە ئەبستراکتەی زمان بە هەموو تایبەتمەندییەکانییەوە لە خۆبگرێت. هەروەها ئەم تیۆرە لەپاڵ ڕۆنانی پێکهێنەکان و ڕۆنانی ئەرکی گرنگی دەدات بە ڕۆنانی ئارگیومێنتی (Argument Structure)، ڕۆنانی سیمانتیکی (Semantic Structure)، ڕۆنانی دەق (Discourse Structure)، کەواتە"ئەم نوانەدنە جیاوازانە ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاستییەن، کە جۆری جیاواز لە زانیاریی سەربەخۆ لەنێوان بەشەکانی ڕستەدا هەیە، بۆیە وا باشترە، ڕۆنانی جیاواز بەکاربێت" (Falk:2001:10) بەم جۆرە تیۆری LFG پشتگیری لێکرا، چونکە تیۆرەکە دەیتوانی لە ڕێگەی ڕۆنانی جیاجیا و سەربەخۆ گشت تایبەتمەندییە جیاوازەکانی زمان شیبکاتەوە.

**- بنەماکانی تیۆرەکە:**

**١. جیاوازی بوون/گۆڕانگەرایی: (Variability)**

هەموو دەربڕینێک لە زماندا ڕۆنانێکی هەیە، ڕۆنانی ئاستی سەرەوەی هەر دەربڕینێک بریتییە لە فۆرمی وشەکان، چۆنیەتی درکاندن (Pronunciation)، ڕیزبوونی ئاستی سەرەوەی کەرەسەکان...تد.

هەمـــوو زمانەکـــانی جیهـــانیش لەم ڕووەوە لەیەکتـــر جیـــاوازن، ئەمەش یەکێـک بـوو لەو هۆکـارانەی وایکـرد، کە ڕەخنەیەکـی زۆری ڕووبەڕووی یاسـاکانی فرەیـز پێکهێنـان ببێـتەوە، چـونکە زیـاتر لەگەڵ پێکهـاتەی زمـانی ئینگلیـزی و ئەو زمانـانە دەگونجـا، کە ڕۆنـانی پێکهێنەکانیان لەو زمانە نزیک بوو. ئەم جۆرە جیاوازییانەش وا دەکەن فـۆرمی دەرەوەی زمانەکـان وەک یەک نەبێـت و لەیەکتـر نەگەیشـتن لەنێـوان زمانەکـان هەبێت. بەم جـۆرە بنەمـای جیـاوازی بـوون دەڵێت "ڕۆنانە دەرەکییەکان بەپێی زمانەکان دەگۆڕێن". (Bresnan:2001:43) ئەو ڕۆنـانەی، کە پێکهێنـی دەرەوەی دەربڕینەکـان دەنوێنێت لە (LFG)یشـدا بریتییە لە ڕۆنانی پێکهێنەکان (Constituent-structure) .

ڕۆنانی پێکهێنەکان لە ڕێزمانی گوێزانەوەی (چۆمسکی)دا ناسێندرا، بە تایبەتی لە تیۆری دەسـەڵات و بەسـتنەوەدا بنەماکانی بۆ دیـاریکرا و تایبەتمەندییەکانی خـرایەڕوو، کە دەتواندرێت هەر ڕسـتە و فرەیزێک لە ڕێگەی هێڵکاری درەختـی شـیبکرێتەوە و پەیوەنـدیی نێوان پێکهاتەکانی دیاریـب کرێـت. ئەم هێڵکـارییە درەختیـیە دەکـرێ بـۆ شـیکردنەوەی پێکهاتەی فرەیز و ڕسـتەی زۆربەی زمانەکانی جیهان بەکاربێت، بەڵام هەنـدێک زمـان هەیە ڕیزبـوونی کەرەسـەکانی لە ڕسـتەدا سـەربەخۆیە، بۆنموونە لە زمانی (یابانی) ڕستە هەیە زیاتر لە چوار جۆر ڕیزبوونی پێکهاتەکانی هەیە، لەم بارەدا ئەم ڕستەیە دوو هێڵکاری بۆ دەکرێت، کە یەکێک لەم هێڵکارییانە تەختە ئەوی تریـان هێڵکاری درەختی دەبێت، لە هەمانکاتـدا درەختـی ڕۆنـانی فرەیزەکـان زۆر گونجـاو نەبـوو بـۆ ئەو زمانانەی، کە سیستەمێکی مۆرفۆلۆجی ئاڵۆزییان هەیە. درەختی ڕۆنانی فرەیزەکـان سـێ ئاسـت لە خـۆ دەگرێت ئاسـتی بەرز، کە ڕسـتە یـاخود فرەیزەکە دەگرێتەوە، ئاستی ناوەند، ئاستی نزم (ئاستی خوارەوە).

**٢. سەراپایی: Universality**

بەپێی بنەمای سـەراپایی "ڕۆنـانە ناوەکییەکان تـا ڕادەیەکی زۆر لە هەمـــوو زمانەکـــان وەکـــو یەکـــن" (ســـەرچاوەی پێشـــوو:٤٥) ڕۆنـــانە ناوەکییەکان ئەرکە ڕێزمانییەکان دەگرێتەوە، وەک: بکەر، بەرکار ...تد.

ئەرکە ڕێزمانییەکان وەکو یەکەیەکی سینتاکسی ئەبستراکت لە هەموو زمانەکان وەکو یەکن، تەنیا ئەوە نەبێ ڕیزبوونی ئەم ئەرکانە لەنێوان زمانەکاندا جیاوازە. ڕۆنانە ناوەکییەکان ڕەنگدانەوەی ئەو دیاردانەن: دۆخی دەسەڵات، بەستنەوەی جێناوی، پەیوەندییەکانی ڕێکەوتن لە نێوان گوزارە و ئارگیومێنتەکانی ڕستەیەک.

لە تیۆری (LFG)دا ئەو ڕۆنانەی پێکهاتە ناوەکییەکان دەنوێنێت ، بریتییە لە ڕۆنانی ئەرکی (Functional-Structure) لەم ڕۆنانەدا لەجیاتی (ف ن، ف ک،...تد) چەمکەکانی (بکەر، بەرکار،...تد) دەنوێندرێن. ڕۆنانی ئەرکی لە کەرەسەی فرەیزە کۆتاییەکانی درەختی ڕۆنانی فرەیزەکان پێکدێت. (بریسنان و کاپلان ) ئەوە دەخەنە ڕوو، کە ڕۆنانی ئەرکی بۆ ڕستەی هەموو زمانەکانی جیهان وەکو یەکە و ئەم ڕۆنانە بە ڕۆنانێکی سەراپایی دادەنێن، چونکە ئەرکە ڕێزمانییەکان لەهەموو زمانەکاندا وەک یەکن.

**٣. بەردەوامبوون لەسەر یەک ڕێڕەو: Monotonicity**

وەک لە بنەمای جیاوازی بوون و سەراپایی دەردەکەوێت، ئەم دوو ڕۆنانەی زمان تەواو خاوەن تایبەتمەندیی جیاوازن، لە کاتێکدا ئەو بیرۆکەی (چۆمسکی ) لە ڕێزمانی سەراپادا ڕابەرایەتی دەکرد، ئەوەبوو ئەم دوو ڕۆنانە پێویستە هەمان فۆرمیان هەبێت، ئەویش لە ڕێگەی هێڵکاریی درەختی هەردوو ڕۆنانەکە دیاریدەکران، هێڵکارییەکە زیاتر گرنگی بە ڕۆنانی پێکهێنەکان دەدا. هەر لە ڕێگەی هێڵکارییەکەوە پەیوەندییە ئەبستراکتەکانی ڕستە دەستنیشان دەکران، بەڵام تیۆری LFG ئەم دوو ڕۆنانە لەیەک جیا دەکاتەوە، لە ڕێگەی نەخشەی جووتکردن (Mapping Corresponds ) ئەم دوو ڕۆنانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئەم نەخشەیە "خزمەت بەوە ناکات ئەم دوو ڕۆنانە هەمان فۆرمیان هەبێت، لەجیاتی ئەوە ئەو زانیارییانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کە لە لایەن ڕۆنانی دەرەکی و ڕۆنانی ناوەکییەوە دەربڕاوە".(سەرچاوەی پێشوو:٤٦) بەپێی ئەم مەرجە "دەتواندرێت

زانیارییەکـان زیـاد بکرێـت، بەڵام ناتوانـدرێت بگۆڕدرێـت، لە کاتێکـدا گوێزانەوەکـان زانیـاری دەگـۆڕن" (Falk:2001: 9 ). لەم تیـۆرەدا هەر گۆڕانێـک لە پەیوەنـدیی نێـوان کەرەسـەکان ڕوویـدات دەدرێـتە پـاڵ فەرهەنـگ و بە گـۆڕانێکی فەرهەنگـی دادەنـدرێت، واتە "گـۆڕانی هەر پەیوەندییەکی ڕێزمانی فەرهەنگییە" (Bresnan:2001: 77) بۆنموونە، کاتێک ڕستەیەک لە بکەر دیار دەگۆڕدرێت بۆ بکەر نادیار، ئارگیومێنتێکی فەرهەنگـی، کە (کـارا)ی ڕسـتەکەیە لا دەبرێـت و( کـارتێکراو) شـوێنی دەگـرێتەوە و دەبێـتە بـکەری ڕسـتەکە، مـۆرفیمی بـکەر نادیـاریش بـۆ ڕستەکە زیاد دەکرێت، بەم جۆرە یاساکانی تیۆری LFG دەتوانن "تەنیا سیما سینتاکسییەکان زیاد بکەن، بەڵام ناتوانن لایببەن یاخود بیانگۆڕن" (Salzmann:2004: 82) بەم جۆرە گۆڕانی پەیوەندیی سینتاکسـی لەنێوان کەرەسـەکانی ڕسـتەدا دەدرێـتە پـاڵ فەرهەنـگ، ئەمەش یەکـێکە لەو لایەنـانەی، کە تیـۆرەکە لەسـەر یەک ڕێـڕەو دەڕوات بەوەی گـۆڕانە سینتاکسـییەکان هەمـوو کـات گۆڕانی فەرهەنگین. ئەمەش پەیوەندی بە تیـۆری نەخشەکێشـانی فەرهەنگـی هەیە، کە لـقە تیـۆرییەکە لە تیـۆری LFG.

**- وەک کاردانەوەیەک بۆ ڕێزمانی گوێزانەوە :**

پێشـتر ئامـاژە بەوەدرا تیـۆری LFG لە ئەنجـامی ڕەتکـردنەوەی هەندێک بیرۆکەی ڕێزمانەکانی گوێزانەوە سەری هەڵدا، دواتر وەکو جێگرەوەیەکـی ئەم تیـۆرە ناسـرا. وەک دەزانـین LFG تیـۆرێکی گوێزانەوەیی نییە، چونکە "هەر ڕێزمانێک دوو ئاست بۆ ڕستە دیاری بکـات ڕۆنـانی ژێـرەوە و سـەرەوە ئەو دوو ڕۆنـانەش بەیەکەوە ببەسـتێتەوە بە سیسـتەمێکی تـایبەتی، ئەوا ڕێزمـانێکی گـوێزانەوەییە" (یوسف نوری محەمەد ئەمین: ٢٠١٠: ٨) بەڵام LFG تەنیا مامەڵە لەگەڵ ڕۆنـانی سـەرەوەی ڕسـتەدا دەکـات و زانیارییەکـانیش لە ڕێـگەی سـێ ئاست شیدەکاتەوە. بۆیە ئەو زمانانەی، کە ڕستە لە شێوەی فرەیزێک دەردەبڕن، وەک لە زمـانە تێکچڕژاوەکانـدا، ئەوا لەم تیـۆرەدا پێویسـت ناکات ڕستەکە بگێڕینەوە بۆ ڕۆنانی ژێرەوەی. وەک:




ڕیزبوونی کەرەسەکان لە ڕۆنانی ئەرکی ئارەزوومەندانەیە و هیچ مەرجێکی لەسەر نییە، بەڵام لەم تویژینەوەیەدا بەپێی ڕیزبوونی کەرەسەکان لەزمانی کوردیدا، کە (sov)یە لە ڕۆنانی ئەرکیدا بەم شێوەیە ڕیزکراون.

وەک دەبینین تیۆرەکە بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ڕۆنانی ژێرەوە، لە توانایدا هەیە تایبەتمەندییەکانی ڕستەکە شیبکاتەوە.

لە ڕوانگەی تیۆری GB ئاستی ژێرەوە بەرپرسە لە پەیوەندییە واتاییەکانی نێوان کەرەسەکان و ئاستی سەرەوەش بریتی دەبێت لە درکاندنی ڕستەکە "بەم پێیە هەردوو پێکهێنەری فۆنۆلۆجی و واتایی تەنیا ئەرکیان لێکدانەوە دەبێ و هەر یەکێکیان ئەو زانیارییەی، کە پێکهێنەری سینتاکسی دەیانداتێ بەکاری دێنن". (ڤیان سلێمان حاجی: ٢٠٠٩: ٢٢) بەڵام بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە، کە واتا بەندە بە ڕۆنانی ژێرەوە چەند تیۆرێک سەریان هەڵدا .

یەکێک لەم تیۆرانەی، کە لە ئەنجامی کاردانەوەی بیرۆکەکانی ڕێزمانی گوێزانەوە سەری هەڵداوە ڕێزمانی فەرهەنگی ئەرکییە. بەپێی ئەم تیۆرە "ئەرکە ڕێزمانییەکانی بکەر، بەرکار،...تد.ئاماژە بەوە دەکەن، کە پەیوەندیی ڕێزمانی ئاستی سەرەوە، لە ژێر کاریگەریی پەیوەندی لۆجیکیدا نییە، کە لە ڕۆنانی ژێرەوەی ڕێزمانەکانی گوێزانەوە نوێنراوە"( Kaplan And Bresnan:1982:179).

- **تیۆری بەستنەوە:** Binding Theory

لە تیۆری (LFG) دا، بەستنەوە پشت بە ئەرکە ئارگیومێنتییەکان و نا ئارگیومێنتییەکان دەبەستێت، بە پێچەوانەی تیۆری (GB)، کە پێکهاتە ئارگیومێنتی و نائارگیومێنتییەکان دەگرێتەوە لە ڕۆنانی فرەیزەکاندا.

مەبەست لە ئەرکە ئارگیومێنتییەکان ئەوانەن، لە سەر پەیوەندیی هەرەمی لە خوارەوە دەستنیشانکراون.

١. **پەیوەندیی هەرەمی:** Relational Hierarchy

پەیوەندیی هەرەمی ئەو ئەرکە ڕێزمانییانە دەگرێتەوە، کە تیۆرەکە وەک کەرەسەی سەرەکی بە کاریاندێنێت، بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکانی بەستنەوە. ئەرکە ئارگیومێنتییەکان بریتین لە (بکەر ، بەرکار..تد) ئەرکە نا ئارگیومێنتییەکان (Non Argument Functions) بریتین لە (سەرتۆپ، تیشکۆ، سەربار). هەرچەندە سەربار ئەرکێکی نا ئارگیومێنتییە، بەڵام دەکەوێتە ناو پەیوەندیی هەرەمی، پەیوەندیی هەرەمی پێکدێت لە:

بکەر > بەرکار > بەرکارOBLɵ < ɵ > تەواوکار > سەربار.١

(Bresnan:2001:212 )

(سەر تۆپ و تیشکۆ) ناکەونە ناو پەیوەندیی هەرەمی، چونکە ئەمانە " ئەو ئەرکە سینتاکسییانەن ، کە ڕاستەوخۆ لە لایەن مەرجی دەقبەستی بە گوزارە نەبەستراونەتەوە"٢.(سەرچاوەی پێشوو:٢١٢) هەریەک لە (سەرتۆپ، تیشکۆ) لە لایەن گوزارە داوا ناکرێن، بەڵکو ئەمانە پەیوەندییان بە بار و دۆخی قسەکەرەوە هەیە، ئەمەش دەچێتە ناو چوارچێوەی ڕێزمانی هاڵیدەی، لە ڕوانگەی ئەم ڕێزمانەوە "زمان پەیوەندی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و باری دەروونی و دەوروبەری قسەکەر هەیە، بۆیە ڕستەیەکی ئاسایی جیاوازە لەو ڕستەیەی کە یەکێک لە کەرەسەکانی بە لووتکە کراوە یاخود تیشک خراوەتە سەر یەکێک لە کەرەسەکانی".(ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی: ٢٠٠٣: ٣) وەک:

٤.أ. کچەکە گوڵەکەی بۆنکرد.
ب. گوڵەکە کچەکە بۆنیکرد.
سەرتۆپ

ڕستەی (٤.أ) ڕستەیەکی ئاساییە، بەڵام ڕستەی (٤.ب) ڕستەیەکە تێکەڵ بە بار و دۆخی قسەکەر کراوە، یەکێک لە کەرەسەکانی ڕستەکە بەلووتکە کراوە، ئەمەش هیچ پەیوەندی بە لایەنی سیمانتیکی یاخود سینتاکسی گوزارەکەوە نییە. بۆیە (سەرتۆپ) لەم ڕستەیەدا ئەرکێکی نا ئارگیومێنتییە.

جیاوازیی نێوان ئەرکە ئارگیومێنتییەکان و نا ئارگیومێنتییەکان، وەک جیاوازیی نێوان شوێنی ئارگیومێنتی A و شوێنی نا ئارگیومێنتی A یە لە GB دا.( Falk:2001:56)

لەم تیۆرەدا پلەی سینتاکسی (Syntactic Rank) لە بەرامبەر کەرەسە- حوکمکار (C-Command) و بەرزترین- حوکمکار (M-Commands) ی تیۆری GB دەوەستێت.

١. بوونی هێمای (ϴ) لەگەڵ (بەرکار، OBL) واتە ئەم دوو ئەرکە بە شێوەیەکی سیمانتیکی بەستراون، بەرکارϴ لەگەڵ ئەو کارانە دێت، کە دوو بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرن، بەرکاری دووەم پێیدەڵێن (بەرکار (OBLϴ) .(ϴ) لەگەڵ ڕۆڵی سیمانتیکی (شوێن) دێت. لە بەشی دووەم لە بابەتی ڕۆنانی ئارگیومێنتی ئەم ئەرکانە زیاتر ڕووندەکرێنەوە.

٢. مەرجی (دەقبەستی، تەواویەتی، دەقئاویزانی) ئەو سێ مەرجەن، ڕۆنانێکی ئەرکی دروست لە ڕۆنانێکی ئەرکی نا دروست جیادەکەنەوە، هەر یەک لەدەقبەستی و دەقئاویزانی مامەڵە لەگەڵ ئەو ئارگیومێنتانە دەکەن، کە لە لایەن گوزارە داوا دەکرێن، لە بەشی سێیەم بەدرێژیی باس لەم مەرجانە دەکرێت.

٢. **پلەی سینتاکسی:** Syntactic Rank

A بە شێوەیەکی لۆکاڵی پلەی بەرزترە لە B ئەگەر A و B بۆ هەمان ڕۆنانی ئەرکی بگەڕێنەوە، A لە B ناسراوترە لە سەر پەیوەندیی هەرەمی. A پلەی بەرزترە لە B ئەگەر A بە شێوەیەکی لۆکاڵی پلەی

بەرزتر بێت لە C کە B یش دەگرێتەوە. ( Bresnan:2001: 213)

وەک لە پەیوەندیی هەرەمیدا بە دەرکەوت، بکەر لە پێش بەرکار دێت و بەرکاریش لە پێش بەرکار o دێت ...تد. لە تیۆری LFG دا بیرۆکەی کرۆک (Nucleus) بەرامبەر بە بیرۆکەی (کەتیگۆری حوکمکار)ی تیۆری GB دێت.

٣. **کرۆک**: Nucleus

کرۆک بریتییە لە"کۆمەڵە لقێک (subpart) لە ڕۆنانێکی ئەرکیدا، کە پێکدێت لە سیمای گوزارە و هەموو ئەو ئارگیومێنتە ئەرکییانەی، کە گوزارە هەڵیاندەبژێرێت".( Falk:2001:175)

لە GBدا جێناوەکان دابەشدەبن بۆ سەر دوو جۆر، جێناوە سەربەخۆکان ئەوانەن، کە پێویستییان بە (بۆگەڕاوە) نییە، تا ئاماژەی لێوەربگرن وەک: من ، تۆ، ئەو،..تد. بەڵام ئەنافۆرەکان " جێناوە خۆیەتییەکانی وەک (خۆم، خۆت، خۆمان، خۆتان..) و جێناوە هاوبەشەکانی وەک (یەکتر، یەکتری) " (حاتەم ولیا محەمەد: ٢٠٠٩: ٢١٧) پێویستییان بە بۆگەڕاوە هەیە، تا ئاماژەی لێوەربگرن. بەڵام لەم تیۆرەدا هەر یەک لە " جێناوەکانی خۆیی و هاوبەش و سەربەخۆ ئەنافۆرن" ( Falk:2001:174) لەکاتێکدا بیرۆکەی ئەنافۆرەکان لەم تیۆرەدا هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ بۆچوونی ئەنافۆر و جێناوەکان لە تیۆری GB دا. ئەنافۆرەکان دابەشدەبن بۆ:

أ. ئەنافۆرە ناوکییەکان: Nuclear Anaphor

ئەنافۆرە ناوکییەکان پێویستە بەستراوبن لە بچووکترین ناوەندا (یان بچووکترین ناوەندی تەواو)، کە دەیانگرێتەوە. وەک جێناوی خۆیەتی و هاوبەش.

ب.ئەنافۆرە بێ ناوکەکان: Non- Nuclear Anaphor

پێویستە بە بچووکترین ئەو ناوەندە (یان بچووکترین ناوەندی تەواو) نەبەسترێنەوە ، کە دەیانگرێتەوە. وەک جێناوە سەربەخۆکان. (سەرچاوەی پێشوو: ٢٠١-٢٠٢)

بنەماکانی بەستنەوە لەم تیۆرەدا بەم شێوەیە دەبێت:

أ. A دەبەسترێتەوە بە B ئەگەر A و B هاونیشانە بن.

ب. B بەستراو دەبێت، ئەگەر بە بەشێک لە A ببەسترێتەوە، سەربەخۆش دەبێت ئەگەر بە A نە بەسترێتەوە.( Bresnan:2001:214)

بەپێی ناوکی و بێ ناوکی جێناوەکان سێ بنەما دیاریدەکرێن:

**بنەمای A:**

جێناوی ناوکداری (خۆیی و هاوبەش) پێویستە بەستراو بێت لە بچووکترین ناوەند کە دەیگرێتەوە.

**بنەمای B:**

جێناوی بێ ناوک (جێناوی کەسی) پێویستە سەربەخۆ بێت لە بچووکترین ناوەند کە دەیگرێتەوە.

**بنەمای C:**

ناوەکانی تر پێویستە سەربەخۆ بن. (Bresnan:2001:215)

٥. نەسرین $^{i}$ خۆی $^{i}$ بریندار کرد.




جێناوی( خۆی) کە ئەرکی (بەرکار)ی هەیە بەستراوەتەوە بە (نەسرین) کە ئەرکی (بکەر)ی هەیە لە بچووکترین ناوەند کە

دەیگـرێتەوە، (بـکەر) یـش بەرزتـرە لە (بەرکـار)، بەپێـی پەیوەنـدیی هەرەمی.

٦.* نەسرین i ئەوی i بینی.

هەرچەندە بکەر و بەرکار هاونیشانەن و بکەر بەرزترە لە بەرکار، بەڵام پێشێلی بنەمای B دەکات، چونکە بەپێی ئەم بنەمایە دەبێت جێناوە کەسییەکان سەربەخۆبن لە بچووکترین ناوەند کە دەیانگرێتەوە.

٧. *خۆی i نەسرینی i بینی.

ئەم ڕستەیە پێشێلی بنەمای C دەکات، کە دەڵێت ناوەکان دەبێت سـەربەخۆبن لە بچـووکترین ناوەنـد کە دەیگـرێتەوە. وەک لە شیکردنەوەی نموونەکان بینیمان بنەماکانی بەستنەوە لە تیۆریLFG دا جیاوازییەکی بنەڕەتی نییە لەگەڵ بنەماکانی بەستنەوە لە تیۆری GBدا.

**– داڕشتنەوەی ئەلفا بجووڵێنە** :Move-a

ئەلفـا بجـوولێنە Move-a یاسـایەکی گشـتیی گواسـتنەوەیە لە تیـۆری دەسـەڵات و بەسـتنەوەدا، ئەم گواسـتنەوانە لە"ئەنجـامی جووڵاندنەوەی کەرەسەیێکە لە شوێنەکەیەوە لە درەختی فرەیزەکاندا بۆ ئەو شوێنەی کە تیایدا دەنیشێتەوە".(سەباح رەشید قادر: ٢٠٠٩: ١٤٦) لە زمانی ئینگلیزی و هەندێک لە زمانانی جیهاندا "بەڵگەی ئاشکرا دەبینین، کە دەتواندرێت فرەیزێک لە شـوێنەکەیەوە بگوازرێتەوە بۆشـوێنێکی تـر" (Bresnan:2000: 16 ). وەک:

٨– a.We talked about that problem for adays.

ئێمە دەربارەی ئەو کێشەیە قسەمانکرد بۆماوەی چەند ڕۆژێک.

ئێمە بۆماوەی چەند ڕۆژێک قسەمان دەربارەی ئەو کێشەیە کرد.

b.That problem we talked about t for adays.

ئەو کێشەیە، ئێمە قسەمانکرد دەربارەی t بۆماوەی چەند ڕۆژێک.

وەک لە ڕسـتەی (٨ b)دا دەردەکەوێـت، (ف ن) (that problem) گـوازراوەتەوە بـۆ سـەرەتای ڕسـتەکە و شـوێن پێیەکـی لە دوای خـۆی جێهێشـتووە. ئەم گواستنەوانە لە هەمـوو زمانەکانی جیهـان وەکو یەک

نین، ئەوەی تاکو ئێستا لە زمانی کوردیدا دانی پێداندراوە و بوونی هەیە (بە لووتکەکردن، کرتاندن، لابردن)ە،"زمانی کوردی جوولاندن و گواستنەوەی فرێزی ناوی لە ڕستەسازییدا نیشان نادات".(حاتەم ولیا محەمەد: ٢٠٠٩: ٢٠٣) هەروەها "گواستنەوەی (وشەی پرسیار بجوولێنە) لە سینتاکسی زمانەکەماندا جێبەجێ ناکرێت".(محەمەدی مەحویی: ٢٠٠١: ٢٨٥) واتە وشەی پرسیار ڕاستەوخۆ شوێنی فرەیزە ناوییەکە دەگرێتەوە، بەبێ ئەوەی بجوولێندرێت. بە شێوەیەکی گشتی LFG " جوولاندنی پێکهاتەی سینتاکسی ڕەتدەکاتەوە، وەکو میکانیزمێک لە لایەن ڕۆنانی سینتاکسی سەرەوەی ئارگیومێنتەکان دیاری دەکرێت، ڕێگە بە گۆڕینی پەیوەندییە ڕێزمانییەکان نادات".( Neidle: ?:1) ڕیزبوونی کەرەسەکان لە چوارچێوەی ڕستەی هەر زمانێکدا تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بۆنموونە ڕیزبوونی کەرەسەکان لە زمانی کوردیدا (SOV)یە ئەمەش ڕیزبوونێکی سەرەکییە لە زمانەکەدا، بەڵام کاتێک لە ڕێگەی بە لووتکەکردن بەرکار دەبرێتە سەرەتای ڕستە، ئەوا ڕیزبوونەکە دەبێتە (OSV) کە ڕیزبوونێکی لاوەکییە، وەک:

٩.أ. کێ منداڵەکەی برد؟

ب. منداڵەکە کێ بردی؟

ئەم جۆرە جوولاندنانە بە شێوەیەکی گشتی لە زماندا پێویست نین، ئەگەرنا "بنەماکانی تیۆری سادەیی، سەراپایی، توانای فێربوون لە زماندا، ئەم جۆرە جوولاندنانە بۆ هەموو زمانەکانی جیهان داوا دەکەن". ( Bresnan:2001:16) هەروەها لە زماندا "هیچ یاسایەکی سینتاکسی نییە بۆ گۆڕینی شوێنی ئەرکێک بە ئەرکێکی تر".( Kaplan and Bresnan:1982:180) کاتێک لە ڕۆنانی ژێرەوە پێکهاتەیەک لە شوێنەکەیەوە دەگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، شوێن پێیێک جێدەهێڵێت، ئەم شوێن پێیە " لە ڕۆنانی پێکهێنەکاندا پێویست نییە، چونکە ڕۆنانی پێکهێنەکان تەنیا کەرەسە سینتاکسییەکان دادەڕێژێ ، بەڵام شوێن پێ کەرەسەیەکی سینتاکسی نییە".( Falk:2001:151) وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، تیۆرەکە تەنیا مامەڵە لەگەڵ ڕۆنانی سەرەوەدا دەکات هەموو جوولاندنێکیش لە ڕۆنانی ژێرەوەی ڕستەکاندا ڕوودەدات.

## تەوەری دووەم

## تیۆری(ڕێزمانی فەرهەنگی- ئەرکی ) پەیوەندی بە تیۆرەکانی ترەوە

**– پەیوەندی بە ڕێزمانی بەندێتییەوە:**

ڕێزمانی بەندێتی (Dependnecy Grammar) لە چوارچێوەی زانستی زماندا لە ساڵی (١٩٥٩) لە لایەن زمانەوانێکی فەرەنسی بە ناوی (Lucien tenierss) گەشەی کرد، دواتر( هەیس ١٩٦٤) و (گاپڤامان ١٩٦٥) لە تایبەتمەندییە بیرکارییەکانی ڕێزمانی بەندێتییان کۆڵییەوە و بووە هۆی سەرهەڵدانی چەند تیۆرێکی تر وەک: ڕێزمانی وشە، تیۆری واتا- دەق ...تد. "ڕێزمانی بەندێتی هەریەک لە کەرەسە سینتاکسییە ئەبستراکتەکان و پەیوەندیی بەندییێتی دەسەپێنێ و گرنگی بە تایبەتمەندییەکانی مۆرفۆسینتاکس و ڕیزبوون و دەرەنجامە سیمانتیکییەکان (شیکارە سیمانتیکییەکان) دەدات " ( Broker:1998:1).

یەکێک لە بیرۆکە سەرەکییەکانی ڕێزمانی بەندێتی، ئەوەیە"هەر وشەیەک لە ڕستەدا بەندە بە وشەیەکی تر ، بەڵام ئەو وشەیەی بەند نییە بە هیچ کەرەسەیەکی تر ئەوە پێیدەڵێن (ڕەگ–Root ) یان (کەرەسەی ناوەندی –Central Element )".( Debusman:2000 :2) وەک:

– منداڵەکە نووست. بەم شێوەیە شیدەکرێتەوە:

(ەکە) بەندە بە (منداڵ)ەکە، (منداڵەکە) بەندە بە (نووست)، بەڵام کاری (نووست) لەم ڕستەیەدا بە هیچ کەرەسەیەکی تر بەند نییە، بۆیە بە ڕەگی ڕستەکە دادەندرێت، کەواتە:

ەکە (دیارخەر)ی منداڵە.

منداڵەکە (بکەر)ی ڕستەکەیە و بەندە بە کارەکە.

نووست (کار)ی ڕستەکەیە.

| | |
|---|---|
| ک | نووست |
| \| | \| |
| ن | منداڵ |
| \| | \| |
| ناسین | ەکە |

تیۆری بەندێتی تیۆرێکی فەرهەنگییە، لە شیکردنەوەکانیدا زیاتر پشت بە تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکان دەبەستێت بۆ شیکردنەوەی

پێکهاتەکانی ڕستە، لە هێڵکاریی بەندێتیدا کەتیگۆرییە فەرهەنگییەکان بە وشەکان دەبەسترێنەوە. وەک لەم هێڵکارییەدا دەردەکەوێت:

- کچەکە نانەکەی خوارد.




ڕێزمانی بەندێتی "خاوەنی یاسای لێکسیکییە، کە بەشێکی بریتییە لە (فەرهەنگ) کە تێیدا تایبەتمەندیی سینتاکسی و فۆنۆلۆجی وشەکان دیاری دەکرێ، ئەرکی ئەم یاسایە گۆڕینەوەی تایبەتی واتایی و سینتاکسی و فۆنۆلۆجیانەیە بە وشە یان کەرەسەی وشەیی" .(ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی: ٢٠١٠: ٤٩).

بۆنموونە وشەی (سەرباز) لە فەرهەنگدا بەم سیما سینتاکسییانە تۆمار دەکرێ:

< +ناو +گشتی +تاک >

(ڕێزمانی فەرهەنگی ئەرکی)ش بە هەمان شێوە لە شیکردنەوەکانیدا زیاتر گرنگی بە لایەنی فەرهەنگی و ئەرکی دەدات، لەم ڕووەوە"هێڵکاریی بەندێتی بە تەواوی لەگەڵ ڕۆنانی ئەرکی لە تیۆری LFG دا دەگونجێ". ( Broker: 1998:10)

بۆنموونە ئەگەر ئەم ڕستەیەی خوارەوە بە هێڵکاری بەندێتی و ڕۆنانی ئەرکی شیبکرێتەوە، دەردەکەوێت لێکچوونێکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، بەوەی کە هەر دووکیان پشت بە فەرهەنگ دەبەستن:١٢ . منداڵەکە شیرەکەی خوارد.




لە ڕێزمانی بەندێتیدا (کار) ئەو کەرەسە سەرەکیەیە لە ڕستەدا، کە کەرەسەکانی ڕستە هەڵدەبژێرێت، واتە سەرە ئەرکییەکان یان حوکمکارەکان لقکردنی کاتیگۆری دەکرێت بۆ تەواوکارەکانیان بۆنموونە کاری تێپەڕی (خوێندن) داوای دوو تەواوکار دەکات، یەکێکیان ناوە و ئەرکی ڕێزمانی بکەری هەیە، ئەوی تریان ئەرکی ڕێزمانی بەرکاری هەیە. ( Debusman:2000:3 )

لە تیـۆری LFGدا "بیـرۆکەی لقکردنـی کـاتیگۆری یـان توانـای کـار وەکو مەرجی تەواویەتی و مەرجی دەقبەستییە" (سەرچاوەی پێشوو: ٣) بەپێـی مەرجـی تەواویەتـی، ئەگەر کەرەسـەکانی ڕسـتە بەپێـی پێداویستی کاری ڕستەکە نەبێت ئەوا ڕستەکە ناڕێزمانی دەبێت ،وەک:

١٣.أ. *منداڵەکە بردەوە.

لێرەدا قسـەپێکەری زمـان دەزانێت ئەم ڕسـتە ناڕێزمـانییە، چـونکە یەکێک لە پێداویستییەکانی گوزارەی (بردنەوە) لەڕستەکەدا نییە، ئەویش (بەرکـار)ە. کـاری (بـردنەوە) داوای بـکەر و بەرکـار دەکـات و ئەم دوو ئەرکە بەڕێوە دەبات، بۆیە بە زیـادکردنی (بەرکار)ێک بـۆ ئەم ڕسـتە ناڕێزمانییەی سەرەوە، دەبێت بە ڕستەیەکی ڕێزمانی، وەک:

ب. منداڵەکە یارییەکەی بردەوە.

ڕێزمانی بەندێتی لەڕووی ڕۆنانەوە تەنیا یەک ئاستی ڕۆنانی هەیە، ئەمەش جیـای دەکـاتەوە لە ڕێزمانەکـانی تـر بە تـایبەتی لە ڕێزمـانی گـوێزانەوەی (چۆمسـکی ) ئەم تیۆرە"وەسـفێکی ورد بەڕسـتە ڕێزمانییەکـان دەبەخشـێت ، بەڵام لەجیـاتی بەخشـینی کۆمەڵێک ڕۆنـان (ژێرەوە و ناوەند و سەرەوە)، ڕێزماتی بەندێتی تاکە یەک ڕۆنان دەدات بەو ڕستەیەی کە لە ڕووی ڕۆنانەوە بێ تەم و مژە". (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهـادی: ٢٠١٠: ٤٣) واتە تایبەتمەنـدییەکانی ڕسـتە لە ڕێـگەی چەنـد یاسـاییکەوە شـیدەکاتەوە ئەم یاسـایانەش تەنیـا مـامەڵە لەگەڵ ڕۆنـانی سەرەوەی ڕستەکان دەکەن. ڕێزمانی فەرهەنگی ئەرکی بە هەمان شێوە ڕۆنـانی ژێرەوەی ڕێزمـانی گوێزانەوە ڕەتدەکاتەوە لەجیـاتی ئەوە"دوو ڕۆنـانی جیـاواز و هاوتـای نواندنە سینتاکسـییەکان بـوونی هەیە، کە لە ڕێگەی نەخشەیەکەوە بەیەکەوە دەبەستریێنەوە" ( Petzell: 2004:1 ).

لەم تیۆرەدا زانیارییەکانی ئاستی سەرەوەی ڕستەکان لە ڕێگەی دوو ڕۆنانی جیاواز، کە بریتین لە ڕۆنانی ئەرکی و ڕۆنـانی پێکهێنەکـان شیدەکرێنەوە.

لەبەر ئەوەی ڕێزمانی بەندێتی تەنیا دان بە ڕۆنانی سەرەوەی ڕستەکاندا دەنێت، ڕۆنانی ژێرەوەش لە ئەنجامی چەند کردەیەکی گواستنەوە ڕۆنانی سەرەوە بەرهەم دێنێ، بۆیە"لە ڕێزمانی بەندییێتیدا نە یاساکانی گوێزانەوە نەفیلتەری سەرەوە نەماون". (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی : ٢٠١٠: ٣٧) لەم ڕووەوە ڕێزمانەکە وەسفێکی وردتر بە شیکردنەوەی ڕستەکان دەبەخشێت، چونکە لەم ڕێزمانەدا "ئەو یاسایانەی کە پەیوەندیی نێوان کەرەسەکان دیاری دەکەن (یاساکانی پێکهێنان) جیان لەو یاسایانەی کە شوێنی کەرەسەکان دیاری دەکەن یان کەرەسەکان لەسەر هێڵێک ڕیز دەکەن، هێزێکی گەورەتر دەدات بە وەسفکردن کە لە ڕێزمانی بەرهەمهێنان و گواستنەوە بوونی نییە" (سەرچاوەی پێشوو: ٣٧) .

بە هەمان شێوە ڕێزمانی فەرهەنگی ئەرکیش جوولاندن یاخود گواستنەوە ناگرێتەوە، چونکە گواستنەوەکان کۆمەڵە کردەیەکن تایبەتن بە ڕۆنانی ژێرەوە.

**– پەیوەندی بەیاساکانی فرەیز پێکهێنانەوە:**

یاساکانی فرەیز پێکهێنان (Phrase Structure Rulse) بۆ یەکەم جار لە لایەن (چۆمسکی ١٩٥٧) خرایە ڕوو و تایبەتمەندییەکانی دەستنیشان کرا ، ئەمەش"کۆمەڵە یاساییکە بۆ پێکهێنانی فرەیز لە ڕستەی جیاوازدا کە لەسەر کەتیگۆرییە ڕێزمانییەکان کاردەکا نەک پەیوەندییە ڕێزمانییەکان". (سەباح ڕەشیدقادر: ٢٠٠٩: ١٩)

یاساکانی فرەیز پێکهێنان لایەنی سینتاکس و فەرهەنگ بەیەکەوە دەبەستێتەوە، چونکە هەر فرەیزێک لە سەرەیەکی فەرهەنگی پێکهاتووە، فرەیزەکەش ناوی ئەو سەرە فەرهەنگییە وەردەگرێ، بۆنموونە: (ف ن) سەرەیەکی (ناو)ی تێدایە، (ف ئاوەڵ) سەرەیەکی (ئاوەڵناو)ی تێدایە...تد. بەم شێوەیە کەرەسە فەرهەنگییەکان دەبنە سەرەی فرەیزەکان، (چۆمسکی) لەم یاسایانە هەوڵیدا پێکهاتەی ڕۆنانی فرەیز لە زمانە جیاوازەکاندا دیاری بکات و یاسایەکی گشتگیر دابڕێژێت، بەڵام هەر

زمانێک بەپێی ڕیزبوونی کەرەسەکان و چۆنیەتی پێکهاتی کەرەسەکان یاسای تایبەت بەخۆی هەیە، کە شێوەی دروستی ڕۆنانی فرەیزەکانی دیاری دەکات. ئەو یاسایانەی (چۆمسکی) دیاری کردبوون، چواریان تایبەت بوون بە فەرهەنگ و چوارەکەی تر تایبەت بوون بە ڕێزمان، لە زمانی کوردیدا یاساکانی فرەیز پێکهێنان ئەمانەن:

١. ڕستە ← گرێی ناوی، گرێی کاری
٢. گرێی ناوی ← (دیارخەر)+ناو+نیشانەی خستنە سەر+(نیشانەی نەفش)+دیارخراو
٣. گرێی کار ← ( گرێی ناو) + کار
٤.گرێی بەند ← ئامراز+گرێی ناوی. (ڤیان سلێمان حاجی: ٢٠٠٩: ١٨)

ئەم یاسایانە هەر زوو تووشی ڕەخنە بوون، وەک لە پێشتر ئاماژەی پێدرا هەر زمانەی یاسای تایبەت بە خۆی هەیە لە ڕیزبوونی کەرەسەکانیدا، ئەم یاسایانەش بۆ هەموو زمانێک نەدەگونجان، هەروەها ئەم یاسایانە ئەوەندە فراوان نەبوون بتوانن ڕۆنانی هەموو جۆرە ڕستەیەک یان فرەیزێک دیاری بکەن، بۆیە (چۆمسکی ) لە تیۆری دەسەڵات و بەستنەوەدا لەجیاتی ئەم هەموو یاسایانە یەک یاسای دارشت، کە لە توانایدا هەبوو ڕۆنانی زۆرێک لە فرەیزی زمانە جیاوازەکان دیاری بکات.

تیۆری فەرهەنگی ئەرکی تیۆرێکی ڕێزمانییە، زانیارییەکانی زمان لە ڕێگەی چەند ڕۆنانێکەوە دەنوێنێت، یەکێک لە ڕۆنانە سەرەکییەکانی تیۆری LFG بریتییە لە ڕۆنانی پێکهێنەکان، "ڕێگایەکی تەقلیدی لە پێناسەکردنی ڕۆنانی پێکهێنەکان بریتییە لە یاساکانی فرەیز پێکهێنان"( Falk:2001: 144)

یاساکانی فرەیز پێکهێنان لە LFGدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ یاساکانی فرەیز پێکهێنانی (چۆمسکی). یاساکانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. بەرزترین جێکەوتەی ئەرکی١ : Functional Maximal Projection

**'Cp ⟶ XP C**

**Ip ⟶ (CP / DP) I**

**DP ⟶ DP D' 2**

٢. جێکەوتەی ئەرکی یەک بار:Functional Single –Bar projection

**C' ⟶ C IP**

**I' ⟶ I VP**

**D' ⟶ D NP**

٣. فرەیزە فەرهەنگییەکان:Lexical Phrases

**VP ⟶ V DP DP PP* (IP / CP)**

**PP ⟶ P DP PP IP**

**NP ⟶ N PP* CP**

**AP ⟶ A PP (IP / CP)**

**Falk: 2001:44-45"**

لە LFGدا دوو یاسا هەیە ئەوانیش (زاڵبوونی ڕاستەوخۆ(- ID (Immediate Dominance ، ڕیزبوون(Linear Precedence- LP) ئەم یاسایانە بۆ یەکەم جار" (لە لایەن Gazdar & Pullum1981 ناسێندران، دواتر لە تیۆری LFG لە لایەن Falk1983 گەشەی کرد". ( Dalrymple:2001: 96) یاسای ID بەرپرسە لە پەیوەندییەکانی زاڵبوون، یاسای LP بەرپرسە لە پەیوەندییەکانی ڕیزبوون، وەک:

**VP ⟶ V NP**

بەپێی یاسای LP ئەم یاسایەی سەرەوە دەکرێ دوو یاسای تری لێ دروستبکرێت:

VP ⟶ V NP

VP ⟶ NP V

١. یاساکان لە زمانی ئینگلیزی چۆنن، لێرەدا بەهەمان شێوە وەرگیراون، بەڵام لە بەشەکانی داهاتوودا هەوڵدەدرێت ، تا بکرێ هێما و کورتکراوەی زمانی کوردی بەرامبەر ئەو یاسایانە و یاساکانی تریش بەکاربهێنێت.

٢. (DP) فرەیزە داخراوەکانیشی پێدەڵێن، چونکە ژمارەیان کەمە، کۆمەڵەیەکی داخراو پێکدێنن.

لەهەر زمانێکدا دەکرێ ئەم یاسایانە بەپێی تایبەتمەندیی زمانەکە لە ڕێگەی LP پێکهاتەکانیان ڕیزبکرێن ، بە گوێرەی ڕیزبوونی پێکهاتەکان لە هەر زمانێکدا. بوونی XP لەیاسای ژمارە (١) بە مانای ئەوە دێت، دەکرێ ئەم کەرەسەیە هەر فرەیزێک بێت وەک: (ف ن، ف ئاوڵناو...تد) ، وەک:

IP ⟶ XP I'

XP بریتی دەبێت لەمانەی خوارەوە:

{XP ≡ {NP|PP|VP|AP|AdvP

**– پەیوەندی بەڕێزمانی فۆرمالیزمییەوە:**

زمانەوانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم قالبێکی زانستیی سەربەخۆی وەرگرت، لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی پێش ئەم سەردەمە زیاتر لە چوارچێوەی زانستی تردا ئەنجامدەدران. (فێردناند دی سۆسێر ١٨٥٧-١٩١٣) یەکێک بوو لەو زمانەوانانەی ڕۆڵێکی پێشەنگی هەبوو لە بەرەو پێشبردنی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، کە چەند بیرۆکەیەکی نوێی خستەڕوو و چەند دووانەیەکی لە یەکتر جیاکردەوە وەک : لێکۆڵینەوەی دایکرۆنی و سایکرۆنی، زمان و ئاخاوتن، دال و مەدلول...تد. هەروەها "باوەڕی وابوو زمان سیستەمە، پەیڕەوی سیستەمێک دەکات و ڕەگەزەکانی زمان لە پەیوەندیی دیالێکتیکی دان".(سەلام ناوخۆش: ٢٠٠٨: ٣١) پاشان لە لایەن قوتابخانەی ڕۆنانی ئەمریکی (فۆنیم و

مــۆرفیم) ناســـێندران. بەم جــۆرە وردە وردە لێکۆڵینەوەکـــان بەرەو ڕۆنـــان و پێکهـــاتە و ســـیما و ئەدگارەکـــانی نـــاوەوەی زمـــان ڕۆیشـــتن. لێکۆڵینەوەکـان زیـاتر شـێوەیەکی ڕۆنانییـان وەرگـرت، ئینجـا کارەکـانی چۆمسکی لەم بوارەدا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد، بەپێـی قۆناغەکـان چەنـدین تیـۆری جیاجیـای خسـتەڕوو، هەمـوو ئەو تیۆرانەش تیۆری فۆرمالیزمی بوون، بەپێی تیۆری فۆرمالیزمی "ڕێزمان بــریتییە لە کــۆمەڵە یاســـاییکی بەرهەمهـــێن". ( Levin:2004:2) وەک ئەو یاسـایانەی، کە (چۆمسـکی) لە تیۆرەکانیـدا پێشـنیازی دەکـرد، یاسـاکان زیاتر سروشتێکی ماتماتیکییان هەبوو. وەک:

ڕ → ف ن ف ک

لێرەدا هەریەک لەم هێمایـانەی سـەرەوە بەرامـبەر بە پێکهـاتەیەکی زمان بەکاردێت، بەم جۆرە بە دەستنیشانکردنی یاسا جۆرا و جۆرەکان دەکرێ هەموو پێکهاتە و تایبەتمەندییەکانی زمان شیبکرێنەوە. ڕێزمـانی فەرهەنگـی ئەرکـیش "وەکـو هەمـوو جۆرەکـانی ڕێزمـانی بەرهەمهێنـان ڕێزمانێکی فۆرمالیزمییە" ( Falk:2001: 192)تیۆری LFG چەندین ڕۆنـانی جیاجیـا بۆ پێکهاتەکانی زمـان دەسنیشـان دەکات ، بۆ هەر ڕۆنـانێکیش یاسای ماتماتیکی تایبەت پێشنیاردەکات و هەوڵدەدات پەیوەندیی نێوان ڕۆنانە جیاجیاکانیش بخاتە ڕوو. وەک:

ڕ → ف ن ف ک .

(↑ بکەر) =↓ ↑ = ↓

**ئەنجام:**

لە ئەنجامدا گەیشتووین بەم خاڵانەی خوارەوە:

١- تیـۆری ڕێزمـانی فەرهەنگـی -ئەرکـی گرنگییەکـی زۆری بە فەرهەنگ و سینتاکس و سیمانتیک دەدا. ئەم تیۆرە تیۆرێکی فەرهەنگییە نەک گوێزانەوەیی، فەرهەنگ لەم تیۆرەدا ڕۆڵێکی زیاتری پێدەدرێت بە بەراورد لەگەڵ تیۆرەکانی گوێزانەوە

٢- لە ڕێزمـانی فەرهەنگـی - ئەرکـی ئاسـتە جیاوازەکـان هێمـای جیاوازییان هەیە، پەیڕەوی سنوورەکانی خۆیان دەکەن.

٣- بنەماکـانی ڕێزمـانی فەرهەنگـی - ئەرکـی بـریتین لە جیـاوازی بوون، سەراپایی، بەردەوامبوون لەسەر یەک ڕێڕەو....

٤- ڕێزمـانی فەرهەنگـی - ئەرکـی پەیوەنـدی بە ڕێزمانەکـانی تـری وەک ڕێزمانی بەندێتی ، یاساکانی فرێزپێکهێنـان، ڕێزمـانی فۆرمـالیزم،... هەیە.

٥- تیۆری فەرهەنگی ئەرکی تیـۆرێکی ڕێزمـانییە، زانیارییەکـانی زمـان لە ڕێـگەی چەنـد ڕۆنـانێکەوە دەنوێنێـت، یەکێـک لە ڕۆنـانە سـەرەکیەکانی تیۆری LFG بـریتییە لە ڕۆنـانی پێکهێنەکـان، "ڕێگـاییەکی تەقلیدی لە پێناسەکردنی ڕۆنانی پێکهێنەکان بـریتییە لەیاسـاکانی فرەیـز پێکهێنان"

٦-ڕێزمانی فەرهەنگی - ئەرکی بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ڕۆنـانی ژێرەوە لەتوانایدایە تایبەتمەندییەکانی ڕستە شیبکاتەوە.

٧- ڕێزمانی فەرهەنگی - ئەرکی بەهەمان شێوەی ڕێزمانی بەندێتی لە شیکردنەوەکانیدا زیاتر گرنگی بەلایەنی فەرهەنگی و ئەرکی دەدات.

## سەرچاوەکان:

### سەرچاوەکان بەکوردی:


- حاتەم ولیا محەمەد (٢٠٠٩) پەیوەندییە ڕۆنانییەکانی نواندنە سینتاکسییەکان، چ١، چاپخانەی خانی، دهۆک.
- ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی (٢٠٠٣) ڕستە و پاش ڕستە تێڕوانینێکی ئەرکی، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر.
- ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی(٢٠١٠) ڕێزمانی بەندێتی و هەندێ لایەنی ڕستەی کوردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر.
- ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی (٢٠١٣) هەندێ لایەنی ڕستەسازی زمانی کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
- سەباح ڕەشید قادر (٢٠٠٩) هەندێ لایەنی ڕێزمانی دەسەڵات و بەستنەوە (GB) لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
- سەلام ناوخۆش(٢٠٠٨) پوختەیەک دەربارەی زمانناسی مێژوویی– بونیادگەری– چۆمسکی، چ٢، چاپخانەی کاروان، هەولێر.
- ڤیان سلێمان حاجی (٢٠٠٩) کەرەسە بەتاڵەکان لە ڕوانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
- محەمەدی مەحوی(٢٠٠١) ڕستەسازی کوردی، زانکۆی سلێمانی.
- وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٩) ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.
- یوسف نوری محەمەدئەمین (٢٠١٠) هەندێ لایەنی ڕستەی لێکدراو لە زمانی کوردیدا بەپێی یاساکانی گوێزانەوە، نامەی ماستەر، کۆلیجی زمان، زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر.


### سەرچاوەکان بە ئینگلیزی:


-Bresnan,J (2001b)Lexical–FunctionalSyntax, Blackwell Publsher: Oxford.
-Falk,Y.N.(2001) Lexical – Functional Grammar:An Introduction to.
-Kaplan,M.R. and Bresnan,J(1982) Lexical- Functional Grammar: A Formal System for Grammatical Representation, The Mental Represntation of Grammatical Relation,ed.Bresnan,173-281 MIT press, London .
-Sells,P.(1985) Lectures on Contemporary Syntactic Theories: An Introduction to Government – Binding Theory Generalized Phrase Structure Grammar and Lexical- Functional Grammar ,CSLI Publication, United States.
-Kifle,A.M.(2011)Tigrinya Applicatives in Lexical – Functional Grammar,phD Dissertation,University of Bergen.
-Levin,L.S.(1986) Operations on Lexical Form: Unaccusative Rules in Germanic Languages,MA. Dissertation,University of Pennsylvania.
-Petzell,M. (2004) LFG vs Transformational Theories: a Comparison. www.sprak.gu.se/digital Asserts.

**ملخص البحث**

هذا البحث الموسوم ب(نظريةالقواعد المعجمية- الوظيفية وعلاقتها مع النظريات الاخرى) يبحث بصورة عامة عن تأريخ الظهور والمبادئ لنظريةالقواعدالمعجمية- الوظيفية وعلاقتها مع النظريات الاخرى،مثل(النحو الترابطى و النحوالشكلى...) و تحديد جوانب التشابه والاختلاف بينهما فى تحليل الجملة، لان موضوع هذا البحث له علاقة بالمستوى النحوى. والنهج المتبع فى هذا البحث هوالمنهج الوصفي التركيبى.

مضمون البحث يتكون من محورين بعد المقدمه والخاتمة.

المحورالاول: الذي يحمل عنوان (تعريف وظهور والمبادى نظرية القواعد المعجمية- الوظيفية) يتحدث فيه عن التعريف و تاريخ الظهور والمبادئ لهذه النظرية مثل الشامل، المتغير،الاستمرارية على نهج معين.

المحور الثانى: عنون ب (نظريةالقواعد المعجمية- الوظيفية وعلاقتها مع النظريات الاخرى) يتحدث عن علاقة نظرية القواعد المعجمية- الوظيفية مع النحو الترابطى ، النحوالشكلى والقاعدة التركيب العبارة...

واختتم البحث باهم النتائج التى توصل اليها ويليها ثبت المصادر والمراجع وملخص البحث باللغتين العربية والانگليزية.

## Abstract

The theory of 'Lexical-Functional Grammar and its Relations to Other Theories is the title of the research. Generally, in this research the emergence, history and the principles Lexical-Functional Grammar theory are mentioned, and the relation of this theory to other theories of grammar is also stated. Further, the similarity and dissimilarity between this theory and other theories of grammar in sentence analysis is revealed. This is because the area and the scope of the study is related to syntax.

The methodology of the study is descriptive construction and the raw material is middle Kurdish dialect.

The study content consists of two sections alongside to introduction and the conclusions.

The first section entitled 'The definition, emergence and the principles of Lexical-Functional Grammar Theory. This section comprises these sub-sections: the theory definition, the real emergence of the theory and the principles of the theory such as variability, universality and Monotonicity as a reaction Transformational Grammar… .

The second section entitled 'Lexical-Functional Grammar Theory is related to other theories in grammar. This section includes: the relation of this theory to Dependency Grammar, Phrase Structure Rules and Formalism Grammar. The study results are presented in several points. The study concludes with abstract in Kurdish, Arabic and English followed by the references.

# سۆزی خاکپەرستی لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا

**(شاعیرانی دەشتی هەولێر) بە نموونە**

**د. بەکر شاکر عەبدوڵلا**
کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەتی/ بەشی کوردی/
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و بە لاوازبوون و پاشان لەناوچوونی دەسەڵاتە کوردییەکان، ئەدەبی کوردی بەگشتی و شیعری کوردی بەتایبەتی تووشی بارودۆخێکی ناهەموار دەبیت، بەڵام ئەم قۆناغە زۆری نەخایاند، چونکە وایکرد شاعیران و نووسەران زیاتر ئاوڕ لە ژیان و بەسەرهاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئەو سەردەمەی کورد بدەنەوە، لەلایەکی تریش لایەنی نیشتمانی و نەتەوەیی خۆیان وەک هۆکارێک بۆ رزگاربوون لەو ناخۆشی و نەهامەتییەی بەسەر میللەتەکەیاندا هاتبوو لەبەرچاو بگرن، کە بۆ ئەوکات کارێکی پڕ بایەخ بوو، ئەمەش وایکرد شیعری کوردی پێ بنێتە ناو قۆناغێکی نوێوە، بەڵام بەهاتنی جەنگی یەکەمی جیهان داهێنان و هێنانە ناوەوەی توخمەکانی تری شیعریی خێراترکرد، گەلێک لە شاعیرانی کورد بە گشتی و شاعیرانی شاری هەولێر بەتایبەتی هەریەک بەپێی تواناو ئەو دەرفەتانەی بۆیان رەخسابوو رۆڵیان تێدا بینیوە، ئاماژەکردن بە رۆڵی هەر یەکێک لەم شاعیرانە ئەڵقەی پێویستی لێکۆڵینەوەی ئەدەبین ؛ بۆیە لێرەدا هەوڵدراوە رۆڵ و توانای چەند شاعیرێکی کورد بەگشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی لەناویشیاندا دەشتی هەولێر لەبواری خۆشەویستیی خاک و نیشتماندا بەسەر بکەینەوە، کە بەشێوەیەکی قووڵ و بەرین زەمینە بۆ پێداچوونەوە بە

مێـــژووی ئەدەبـــی کـــوردی و نووســـینەوەکەی خـــۆش دەکـــات و لەداهاتووشدا شوێنی شیاوی خۆیان تێیدا بەردەکەوێ .

**هۆکاری هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوەکە :**

نەبوونی زانیاریی تەواو و پێویست، هەروەها کەمیی سەرچاوە لەســەر هەنـدێ لە شـاعیرو نووســەرانی شـاری هەولێـر بە گشـتی و بەرچاو نەکەوتنی لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی لەسـەریان، ئەویش بەهۆی چاپ نەبوونی دیوانی هەندێکیان و ئاوڕ لێ نەدانەوەیان لەلایەن نووسەران و لێکۆڵەرانەوە .

**سنوور و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە :**

ئەم لێکـۆڵینەوەیە لە دوو بەش و هەر بەشـێکیش لە دوو تەوەردا خۆی دەبینێتەوە، لە بەشـی یەکەم و لە تەوەری یەکەمدا : هەوڵـدراوە چەمک و پێناسـەی خاکپەرستی بخرێتە روو لەگەڵ زاراوەی نیشتمانی (کە بە خاکپەرســتی ناویمــان بــردووە) لە شــیعردا بخــرێتە روو، لە دووەمیشــدا مێـژووی ســەرهەڵدانی ئەم هەســت و ســۆزە لە ئەدەبـی کــوردی بەگشــتی و لە شــیعری شــاعیرانی کلاســیکیدا بەتــایبەتی نیشــاندراوە، بەشــی دووەمــیش، تــایبەتە بە خاکپەرســتی لە شــیعری شاعیرانی شاری هەولێر، کە کراوەتە دوو تەوەر و، لە یەکەمدا : باس لە خاکپەرسـتی لای شـاعیرانی نـاو شـاری هەولێر بە گشـتی کـراوە و بەپێی نـاوچەی جـوگرافی و شـوێنی لە دایکبوونیـان جیاکراونەتەوە، لە تەوەری دووەمــیش : رۆڵ و ئەرکــی شــاعیرانی دەشــتی هەولێــر و شوێنیان لەچاو شاعیرانی تری کوردیدا خراوەتە روو .

## بەشی یەکەم

### تەوەری یەکەم - چەمک و پێناسە و زاراوەی خاکپەرستی

**١ : چەمک و پێناسەی شیعری خاکپەرستی (نیشتمانپەروەری) :**

شیعری خاکپەرستی یان (نیشتمانپەروەری) : یەکێکە لەو بابەتە شیعرییە گرنگ و پڕ بایەخانەی کە زۆربەی شاعیرانی کورد لە شیعرەکانیاندا ئاوڕیان لێ داوەتەوە و پانتاییەکی بەرین و فراوانیان بۆ تەرخان کردووە، چونکە ((گەورەترین کەرەستەیە لە هەستی نیشتمانی و خۆشەویستی مرۆڤ بەرامبەر بە خاک و نیشتمان سەرهەڵئەدات)) [رسول، ١٩٨٩،٨٧] شاعیرانیش لە چوارچێوەی شیعرەکانیانەوە هەست و سۆزو خۆشەویستیی خۆیان بۆ نیشتمان و ئەو خاکەی لەسەری ژیاون دەربڕیوە و وەک قەڵغانێک بەرامبەر بە دوژمنان بەکاریان هێناوە ؛ لەم بوارەدا ئەگەر بۆ پێناسەیەکی شیعری خاکپەرستی بگەڕێین، دەبینین چەندین پێناسەی جۆراو جۆر لەلایەن پسپۆران و رەخنەگرانی ئەدەبەوە کراوە، وەک دەڵێن : ((شیعری نیشتمانی دەربڕینی هەست و سۆزو خۆشەویستییە بۆ ئەو خاکەی لەسەری دەژی و ئەو نەتەوەیەی کە لەگەڵیدا دەژی، ئەویش بە وەسفکردنی دیمەنی جوان و دڵگیری کوردستان و ستایشکردنی پێشینان و دەرخستنی ئەو هەڵسوکەوت و کار و چالاکییەی تیایدا ئەنجام دەدرێت بە وشەی سادە و رستەی کاریگەر و دەربڕین و داڕشتنی گشتی [حەوێز، ٢٠٠٨، ٥٦]، هەرچەندە : ((شیعری نیشتمانی بۆخۆی خۆشەویستیی نیشتمان و هەستکردن بەو پەیوەندییە دەروونییە ئەگەیەنێت کە هاووڵاتی پێوەی دەبەستێت و وای لێ دەکات خۆشی بوێ و شانازی پێوە بکات و لە پێناویدا قوربانی بدات)) [ئاگرین، ١٩٩٤، ٤٩]، یان : ((ئەو هەستە ناسک و بەسۆزەیە کە بەرامبەر خۆشەویستیی نەتەوە و نیشتمان سەر هەڵئەدا، شاعیرانیش وەک پێشڕەوی کاروانی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایە لە ریزی پێشەوە دەوەستن و شیعرەکانیان دەبێ بە خۆراکی گیان لە پێناوی ژیان و ماندا)) [رسول، ١٩٨٩، ٧٨]،

ئەمە جگە لەوەی کە ((بۆن و بەرامەی خاک و خۆڵی وڵاتی لێ بەرز ئەبێتەوە و دەنگی رەسەنایەتی هەستە پیرۆزەکەی رۆڵانی نەتەوە بەدنیا ئەگەیەنێ و هەوێنی پاکێتی و دڵسۆزی تیا ئەژی و گەرمە پۆخڵی رۆژگاری لێ نەنیشتووە و رەنگدانەوەی رەسەنایەتی و سروشتی بێ گەردی هەستی بەرزی مرۆڤایەتییە)) [ئاگرین، ١٩٨٨، ٤٧]، ئەگەرچی ئەم جۆرە شیعرە پەیوەندییەکی قووڵی بەخاک و نەتەوەوە هەیە و شاعیر لە شیعرەکانیدا هەموو کاتێک ئامادەیە بۆ قوربانیدان و باسکردنی خۆشەویستیی گەل و نیشتمان [خۆشناو،٢٠٠٢، ٧٥]، بەڵام ئەم جۆرە شیعرە زۆر کۆنە و نەگۆڕە و هەمیشەیی و نەمرە و لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخدا ناگۆڕێ، لە کۆتاییشدا لەبارەی شیعری نیشتمانی کە بە خاکپەرستی ناومان بردووە دەتوانین بڵێین: ئەو شیعرەیە کە هەست و سۆزو خۆشەویستی شاعیری تێدا بەدی دەکرێت بەرامبەر بەو خاکەی لەسەریدا دەژیت و ئامادەیە لەپێناویدا گیانی خۆی بەخت بکات، چونکە ئەو بۆن و بەرامەی لەو خاکە بۆی دێت ناچاری دەکات هەموو بەها بەرزو پیرۆزەکان لەپێناویدا بەخت بکات و هەوڵی پاراستن و بەردەوامی بدات.

## ٢ : زاراوەی خاکپەرستی لە زمانی کوردیدا :

وشەی خاکپەرستی[1] لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی لە رووی شێوە و پێکهاتنەوە هاوشێوەی وشەکانی تری وەک : (یەکتاپەرستی، ئاگرپەرستی، نەژادپەرستی، خوداپەرستی، نەتەوەپەرستی، رەگەزپەرستی، پارە پەرستی[2]، کۆنەپەرستی، هونەرپەرستی، حەقپەرستی، نەزانپەرستی[3])و زۆرانی ترە، بەڵام لە رووی مانا و مەبەست و بەکارهێنانیەوە هەر خۆشەویستی ئەو خاکە دەگەیێنێت کە هەوڵی پاراستن و مانەوەی بۆ دەدات لە لەناوچوون و داگیرکردنی لەلایەن هێز و دەسەڵاتی تری بێگانەی خاکەکەوە، شاعیرانی کورد لەمەدا زیاتر وشەی نیشتمانیان بۆ بەکارهێناوە، کە مەبەستیان ئەو شوێنەی لەسەری نیشتەجێ بوونە و رۆژگاریان تێدا بەسەر بردووە،

لێرەدا رەنگە بەکارهێنانی پەرستن بۆ خاک هاوشێوەی پەرستن بۆ خودا و ئاین لەبەرگوێمان نامۆ بێتن و بەمانا و مەبەستی تر لێکبدرێتەوە، بەڵام لە رووی زمانەوانیەوە : پەرستن لە وشەی پاراستن، پارازتن، یان پارێزتن، پارێز، پارێس، پاراس هاتووە و پاشگری (تن یان گار)ی چووەتە سەر، کە مەبەستی پاراستن و پارێزگاریکردنە لە نەمان و فەوتان، ئەویش بە خزمەتکردن و بایەخدان و هەوڵی مانەوەدان بۆی، وشەی خاکپەرستیش مانای پاراستن و پارێزگاریکردنە لەو خاکەی لەسەری دەژیت و مانەوەی خۆی تێدا دەبینێتەوە، وشەی خاکیش کە بەمانای (ئاخ، بووم، خۆڵ، گڵ، تۆز، گەرد، عەرد) دێت، لەبنەڕەتدا یەکێکە لە رەگەزەکانی سروشت و لە ئاینی کۆنی کوردیدا بەچاوێکی پیرۆزەوە سەیرکراوە، چونکە هەمان مانای (زێد، مەڵبەند، وڵات، وەتەن، نیشتمان) دەگەیێنێت [رەشید، ٢٠١٣، ١٦٩]، لە زمانی کوردیشدا جگە لە نیشتمانپەروەری چەندین زاراوەی تری بۆ بەکارهاتووە و هەمان مانای ئەو دەدات، وەک (خاکپەرستی، وڵات پەروەری، وڵات پارێزی،، خۆشەویستی نیشتمان[عەلائەدین، ٢٠١٣، ١٧] یان (نیشتماندۆستی، نیشتمانپەرستی، نیشتمانویستی) [ئەبریشەیی، ٢٠٠٦، ١٦] و (خاکپەروەری)و زۆرانی تر .

**تەوەری دووەم - سەرهەڵدانی سۆزی خاکپەرستی لەناو کوردانداا**

ئەوەی تائێستا لەسەر مێژووی سەرهەڵدانی خاکپەرستی لەناو کورداندا روون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە دوو بەڵگە یان دوو سەرچاوە باس لە مێژووی میللەتی کورد و نەتەوەکەی دەکەن، کە ناوەرۆکەکەیان وەک هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی لە مێژووی گەلەکەماندا دەیانبینین، ئەوانیش :

أ : کتێبی (تجارب ألامم - ابن مسکویه)یە کە تیایدا هاتووە : (نەتەوەی کورد لە سەدەی دەیەمی زاینی ناسراوە وەک نەتەوەیەکی سەربەخۆ بەهەموو پێوەر و بنیاتێکی نەتەوایەتی و خاوەن کولتووری تایبەتی خۆی نەک لەسەر بنەمایەکی ئایینی ) [أحمد، ٢٠٠٣، ٢٢] .

ب : ئەو بۆچـوونەیە کە دەڵێـت : هۆشـیاری نەتەوەیـی لە شـەڕی چاڵـدێرانەوە (١٥١٤)ی زاینـی دەسـت پێـدەکات [قاسـملو، ١٩٧٣، ٤٧] ؛ بەتێڕوانین لەم دوو سـەرچاوەیە و هـی تریش بۆمـان دەردەکەوێت کە بـوونی کـورد لەسـەر ئەم خـاکەی ئێسـتادا بـوونێکی گومـانبڕ و حاشـا هەڵنەگرە، چونکە هەوڵیداوە وەک میللەتانی تری نـاوچەکە بوونی خـۆی بسەلمێنێ و بیپارێزێ و لەگەڵ ڕەوڕەوەی مێژووی ناوچەکەدا بڕوات .

**١ : سەرهەڵدانی شیعری خاکپەرستی لە ئەدەبی کوردیدا :**

بـۆ گەڕان بەدوای مێـژوویەک یـان دیـاریکردنی سـەرەتایەک بـۆ سـەرهەڵدانی مێـژووی شـیعری خاکپەرسـتی لە ئەدەبەکەمانـدا، دەبـێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای دەستپێکردنی شیعر بە زمانی کوردی، چونکە دانانی شیعر بە زمانی کوردی سەرەتاییکە بۆ سـەرهەڵدانی ئەم جۆرە شـیعرە ؛ بەڵکـو وازهێنـانی شـیعر بەزمـانی بێگـانە و ئـاوڕدانەوەی شـاعیران بۆ بەکارهێنانی شیعر بەزمانی خۆیان کارێک و هەنگاوێکی گرنگ و پڕ بایەخە، ئەویش (( لەبەر ئەوەی کورد تاکو ئێستا خاوەنی قەوارەیەکی سیاسـی سـەربەخۆی بـۆ خـۆی دابین نەکـردووە، شـیعرە سیاسیەکەشـی ڕەنگـدانەوەی ئەو واقـیعە تـاڵەیە و هـانی ڕۆڵانـی ئەدا کۆشـــش و خەبــات لە پێنــاوی دامەزرانــدنی قەوارەیەکــی سیاســـی سەربەخۆ لە کوردستاندا بکەن)) [ئاگرین، ١٩٩٤، ١٦] بۆیە ڕۆشنبیران و شاعیرانی کوردیش لەم ڕووەوە بێبەش نەبووینە و لە ئاست خـاک و نیشتمانەکەیاندا کەمتەرخەم نەبوونە، جا چ بە نووسین بێت، یان دەنگ لێ هەڵبڕین ؛ بەڕای نووسەران و ڕەخنەگرانیش ((مێژووی سەرهەڵدانی شـیعری سیاسـی و نیشـتمانی لە ئەدەبـی کوردیـدا بـۆ سـەرەتای پەیدابوونی حوکمی عوسمانی دەگەڕێتەوە کە کوردسـتان تێیدا ببـووە چەنـد پـارچەیەک و دابەشـکرابوو لە نێـوان هەردوو ئیمپراتـۆریەتی عوسمانی و ئێرانـی سـەفەوی دا)) [شارەزا،١٩٩٣، ٧١] ئەگەرچی بەلای هەنـدێکی تـر لەو کـاتەوە هـاتۆتە کـایەوە کە (( شـاعیر تەلـی هەسـتی هوشیاری بەرانبەر دەسەڵاتی مرۆڤ و جۆری حوکمڕانی بزواوە ... سا

ئەوە لە ناخی دەروونی خودی خۆیەوە هەڵقوڵابێ یاخود بارودۆخ و ژیانی دەوروبەر كاری تێكردبێ هاتووە بەراوردی ژیانی سیاسیی نەتەوەكەی لەگەڵ گەلانی سەربەخۆ و ئازاد و خاوەن قەوارەی سیاسی كردووە، هەستی بە ژێردەستەیی و داگیركردنی خاك و گەلەكەی كردووە)) [ئاگرین، ١٩٩٦، ٩]، بەڵآم تا نەهاتنی شاعیرانی كوردی وەك : مەلای جزیری (١٥٦٧ - ١٦٤٠) و ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ - ١٧٠٧) و پاشان نالی (١٨٠٠ - ١٨٧٦) و حاجی قادری كۆیی (١٨١٦ -١٨٩٧)، ئەم جۆرە شیعرە و شێوازەی دەربڕینانە پەیدا نەببوون .

**٢- خاكپەرستی لە شیعری شاعیرانی كلاسیكی كوردیدا :**

چاوخشانێك بە لاپەڕەكانی مێژووی ئەدەبی كوردی ئەوەمان پێدەڵێت، كە : خۆشەویستی خاك و نەتەوە و زمان و نیشتمان[٤] لەناو شیعری شاعیراندا پانتاییەكی فراوان و بەرینیان گرتووە و چەندین شاعیری كلاسیكیمان هەیە ئاوڕیان لەم بابەتە داوەتەوە و وەك چەكێكی كاریگەر و بەهێزیش لە دژی دوژمنانی كورد بەكاریان هێناوە و بە هۆیەوە گەلەكەیان پێ هوشیاركردووەتەوە، شاعیرانی وەك :

**أ : مەلای جزیری (١٥٦٧-١٦٤٠) :**

مەلای جزیری بە سەرئامەدی ئەو شاعیرانە دادەنرێت كە ئاوڕیان لەم بابەتە داوەتەوە و لاپەڕەكانی دیوانەكە و مێژووی ئەدەبەكەی پێ رازاندووەتەوە، چونكە یەكەم شاعیری كوردە تائێستا ناوی كوردستان و خاكی كوردستانی لەناو شیعرەكانیدا هێنابێت و هەست و سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ نیشتمانەكەی دەرخستبێت [كاروانی،٢٠٠٠، ٥٤]، ئەگەرچی لە سەردەمێكدا ژیاوە هێشتا هەستی نیشتمانی چەكەرەی نەكردبوو، ئەوەندەش پەرەی نەساندبوو، وەك لەم دێڕانەدا دەردەكەوێت و دەڵێت :

**گوڵی باغی ئیرەمی بۆهتانم　　شەبچراغی شەبی كوردستانم**

[ دۆسكی، ٢٠٠٥، ٣٥٧]

یان دەڵێت :

**ئەی تنێ تەبریزو کوردستان لبەر حوکمی تەبن**

**سەد وەکی شاهی خوراسانی د فەرواریێ تە بی**

[ دۆسکی، ٢٠٠٥، ٣١٠]

ئەمە جگە لە شیعرەکانی تری وەک : سوڵتانی بۆتان و پەسنی میری بۆتان و پەسنی میر شەرەف و چرای کوردستان [دۆسکی، ٢٠٠٥، ٣٠٩ - ٣١٧]دا بەهەمان شێوە بە روون و ئاشکرایی بنەماکانی بوونی دەوڵەتمان بۆ بەرچاو دەخات، کە مەبەستی سنووری خاکەکەیەتی، وەک لە شیعری (میرێ جزیرا بۆتان)و پەسنی (میرشەرەف)دا هاتووە، کە باسی پێویستبوونی سەرکردەمان بۆ دەکات، لەگەڵ دیاریکردنی سنووری جوگرافی ئەو دەسەڵاتەی کە پێویستە هەیبێت .

**ب : ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧) :**

خانیش وەک جزیری لە ئاوڕدانەوە و بایەخدان بە مەسەلەی نیشتمان و نەتەوە بە یەکێک لە رابەرانی ئەم بوارەدا دادەنرێت، چونکە ناوەرۆکی زۆربەی شیعرەکانی (بەتایبەتی دیباجەکەی مەم وزین) بۆن و بەرامی نیشتمان و نەتەوەیان لێ دێت و بووەتە مەشخەڵێک بۆ رووناککردنەوەی بەرپێی رۆشنبیرانی کورد، چونکە : ((خانی وەک رووناکبیرێک و فەیلەسوفێک و شاعیرێک سەیری مەسەلەی کوردی کردووە و پێش شاعیرو زانایانی سەردەمی خۆی کەوتووە، هەروەها جەوهەر و حەقیقەتی کوردی لە سەردەمی خۆیدا دەستنیشان کردووە)) [رسول، ١٩٧٩، ٩٥] کە میللەتەکەی لەبەر بێکەسی لەگەڵ یەکدا ناکۆک و ناتەبا بوونە، وەک دەڵێت :

**گەردێ هەبووا مە ئیتیفاقەک　　ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەک**

**رۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی　　هەمیان ژ مە را دکر غولامی**

**تەکمیل دکر مە دین و دەولەت　　تەحصیل دکر مە عیلم و حکمەت**

[ئۆسمان،٥٣,١٩٩٠]

ئەمە جگە لە شاعیرانی کرمانجی خوارووی سەدەی نۆزدەهەم، شاعیرانی وەک : رەنجووری (١٧٤٥ - ١٨٠٥) و نالی(١٨٠٠ - ١٨٧٦)و سالم (١٨٠٥- ١٨٦٩)و کوردی (١٧٨٢- ١٨٥٩)و شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥- ١٩٠٩)، کە ناوەرۆکی هەندێ لە شیعرەکانیان وەک : ستایش و پێداهەڵدان لە پەسنی میر و سەرکردەی کوردان و هۆزو شوێنەکانیان بۆن و بەرامە و هەست و سۆزو خۆشەویستی خاکی کوردستانی لێ بەدی دەکرێت .

**ج : نالی (١٨٠٠ – ١٨٧٦) :**

مەلا خدری شارەزووری وەک یەکێک لە شاعیرە هەرە لە پێشەکانی ئەم دیالێکتە و لەم بوارەشدا، لووتکەی بیرو هەست و خۆشەویستی بۆ نیشتمان لەو نامە شیعرییە (٤٣) دێڕەیدا دەردەکەوێت، کە لە شامەوە بۆ سلێمانی ناردوویەتییەوە و تیایدا ئەوپەڕی خۆشەویستی خاک و نیشتمان و هەستی نیشتمانپەروەری نیشان دەدات، کە سەرەتاکەی بەم دێڕە دەست پێدەکات و دەڵێت :

**قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مرور !**

**ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور) !**

[مدرس، ١٩٧٦، ١٧٤]

نالی لەم شیعرە پڕ لە سۆزەدا بیرەوەری کۆن لە سروشتی خاکی نیشتمان دەتوێنێتەوە و هەموو سووچ و قوژبنێکی ئەم بیرەوەرییانە وێنەیان لە شاخ و داخ و شار و گوند و رووبارو کانیاوی نیشتمانەکەی دەبینێتەوە .

**د : حاجی قادری کۆیی (١٨١٦ - ١٨٩٧) :**

حاجی قادریش وەک یەکێک لە شاعیرانی سەدەی نۆزدەهەم لەم بوارەدا و وەک رۆشنبیرێک سەیری مەسەلەی نیشتمان و خاکەکەی کردووە و ناوەرۆکی زۆربەی شیعرەکانی وەک (خاکی جزیرو بۆتان)، (تا رێک نەکەون قەبیلی ئەکراد)، (خۆ دەزانن سولالەیی ئەکراد)، (حاکم

و میرەکانی کوردستان) [میران، ١٩٨٦، ٧٨، ١٧٨-١٨١] بۆئەم مەبەستە تەرخانکردووە، چونکە فرمێسک ڕێژتنە بۆ حاڵی کوردان و ئەو بارە ناهەموارەی تێیدا ژیاون، وەک دەڵێت :

**خاکــی جزیر و بۆتـــــان، یەعنی وڵاتی کـــــوردان**
**سەد حەیف و سەد مەخابن دەیکەن بە ئەرمەنســتان**

[میران، ١٩٨٦، ٧٨]

یان دەڵێت :

**یەک بەیەک حافیزی شەریعەت بوون**
**سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون**

[میران، ١٩٨٦، ١٨١]

**٣- خاکپەرستی لە شیعری شاعیرانی سەردەمی نوێماندا :**

ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی بە ماوەی سەرهەڵدانی بیری سیاسی و نەتەوەیی بۆ زۆر لە نەتەوە و وڵاتانی جیهان دەناسرێت، چونکە بە سەرکەوتنی هێزی هاوپەیمانان بۆ نەتەوەکانی رۆژهەڵات و وڵاتانی تر هەندێ ئازادی هێنایە کایەوە، بەڵام ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی بەسەر عێراق و ناوچەکەدا هاتن، بوونە هۆی بێبەشبوونی میللەتی کورد لەم ئازادییە، پاشان سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و بارزان کە بە شکەستن کۆتاییان هات، بووە هۆی بەدەست نەهاتنی مافی گەلی کورد و نەگەیشتن بە خەونەکانیان، ئەم کارەش جۆرە نائومێدییەکی لای کورد دروست کردو وای لێهات تاکی کورد هاوشێوەی میللەتانی تر بیر لە چارەنووسی خۆی بکاتەوە، شاعیرانی ئەو سەردەمەش وەک چاوساخ و ڕێنیشاندەری میللەتەکەیان درکیان بەو مەینەتیانە کردووە کە سەرچاوەکەی لە داگیرکردنی خاک و نیشتمانەکەیدا هاتووە، بۆیە هاتوون خۆشەویستی خاکیان لەناو دڵ و دەروونی هاوڵاتیاندا چەکەرە پێداوە، ئەویش بە پێداهەڵدان و وەسفکردنی جوانی و دڵڕفێنی سروشتەکەی، هەروەها دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی و دیارکردنی کاریگەری و ماهییەتەکەی، یان چواندنی

خاک و نیشتمان بە دین و ئیمان و گەیاندنی بە پلەی پەرستن، هەندێ جاریش بە قیبلەی دینەکەیان بزانن، یان بیچوێنن بەدایک ؛ ئەم بابەتەش لای زۆربەی شاعیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، شاعیرانی وەک: پیرەمێرد (١٨٦٧- ١٩٥٠) و عەورفی (١٨٦٩- ١٩٦١) و ناری (١٨٧٤- ١٩٤٤) و زێوەر(١٨٧٥ - ١٩٤٨) و مەلا محەمەدی گەورەی کۆیی (١٨٧٦- ١٩٤٣) و حەمدی (١٨٧٨- ١٩٣٦) و مەلا حەمەدەمین حوتان ئەمین (١٨٨٤- ١٩٧٤) و کەمالی (١٨٨٦- ١٩٧٤)و شێخ سەلام (١٨٩٢- ١٩٥٩)و عاصی (١٨٩٢- ١٩٧٥)و وئەسیری (١٨٩٥- ١٩٦٢)و خادیم (١٨٩٥- ١٩٧١)و ئەحمەد موختار جاف (١٨٩٨- ١٩٣٦)و قانع (١٨٩٨- ١٩٦٥)و بێکەس (١٩٠٥- ١٩٤٨)و زەکی هەناری (١٩٠٩- ١٩٦٧)و سامی عەودال (١٩١٠- ١٩٨٥)و عاصم (١٩١٢- ١٩٨٠)و رۆستەم حەوێزی (١٩١٣- ١٩٩٩)و عوسمان عەونی (١٩١٤- ١٩٩٢)و دڵدار (١٩١٨- ١٩٤٨)و زۆرانی تر بەرچاو کەوتوون، وەک :

**ا : عەبدوڵڵا زێوەر (١٨٧٥ – ١٩٤٨) :**

زێوەری شاعیر وەک زۆربەی شاعیرانی تری کوردستان هەستی بە ژێردەستەیی و داگیرکردنی خاکەکەی کردووە، بە تایبەتی دوای کەوتنی شاری سلێمانی و دەرچوونی شێخ مەحموود لە شارەکەدا، بۆیە هاتووە بەم دێڕانە هەست و سۆزی خۆی بۆ خاک و نیشتمانەکەی دەردەبڕێت و دەڵێت :

**زەڕڕەیەک لە خاکی وەتەن نادەم بە قەسری قەیسەری**

**جوملە ئەنهاری وەکو کەوسەر هەوای وەک جەننەتە**

[زێوەر، ٢٠٠٨، ٢٠٨]

یان نیشتمان لای ئەو ئەوەندە خۆشەویستە لە جێگەی رۆح و دین و ئیمانەکەیەتی، ئەگەرچی کەسێکی خوا پەرست و پیاوی مزگەوت و مەلاش بووە، وەک لەم دێڕانەدا دەردەکەوێت، کە دەڵێت :

**ئەی وەتەن ! چەند خۆشەویستی رۆحی شیرینی منی**

**مەزرەعەی توخمی نیشات و باعیسی ژینی منی**

**گەرچی ئەرزی، هێند بڵندی وەختە لای من بچیە عەرش**
**واسیتەی سەربەستیی و ئیجرایی ئایینی منی**

[زێوەر، ٢٠٠٨، ٢١٠]

**ب : ئەحمەد موختار جاف (١٨٩٨- ١٩٣٦) :**

ئەحمەد موختار جاف، وەک شاعیرێکی خەمخۆر هەستی بە داگیرکردن و زەوتکردنی خاکەکەی کردووە و لەژێر دەستی داگیرکەراندا نالآندوویەتی، ئێش و ئازارەکەی وای لێکردووە وەک خەڵک چۆن قوربانی دەکەن، ئەو هاتووە لەپێناو خاکەکەی روحی خۆی بە قوربانی نیشتمانەکەی بکات و بڵێت :

**جەژنی قوربان، سالّی جارێ خەڵکی قوربانی ئەکەن**
**بۆ وەتەن من رۆژی سەدجار رۆحی خۆم قوربان ئەکەم**

[خەزنەدار، ٢٠٠٥، ٤٦٥]

شاعیر نیشتمان بە بەهەشتی سەرزەمین دەچوێنێ و بەقیبلەی هەموو کوردانی دادەنێت، وەک دەڵێت :

**ئەی وەتەن جەننەتی یا رەوزەیی ریزوانی تۆ**
**باعیسی کەیفی دڵە باغ و گوڵستانی تۆ**
**تۆزەکەت سوورمەیە بۆ چاو و عەبیرە خاک**
**راستە گەر بێتو بڵێم قیبلەیی کوردانی تۆ**

[ موختار، ١٩٨٦، ٩٣]

یان دەڵێت :

**دێتە گوێم دەنگێ بە سۆز و شیوەن و گریانەوە**
**نالەیی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە**

[موختار، ١٩٨٦، ٧٢]

ئەمەش ئەوپەڕی بێزاری و دڵتەنگیە لەئاست ئێش و ئازارەکان لەهەمان کاتدا هیواو ئامانج و خەونی کوردی بووە.

**ج : قانع (١٨٩٨ – ١٩٦٥) :**

قــانعی شــاعیریش کە بە شــاعیری چەوســاوەکانی کوردســتان دەژمێردرێت، بێبەش نەبووە لە دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی بۆ خاک و نیشتمانەکەی و بەخشینی بەها پیرۆزەکانی ژیان لەپێناویدا، وەک دەڵێت:

**قوربانی ئەم خاکەیە ئەم رۆحە لە بەرما سۆزی دڵی پڕ دەردە کە خولیایە لەسەرما**
**ئامادەیی مەیدانم و ئەم بەرگە کە پۆشیم کفنە ! نەوەکو چاکەت و پانتۆڵە، لەبەرما**

تا دەگاتە کۆتایی و دەڵێت :

**من هیچم کە لێ نایە، مەگەر هەر وەکو قانع**
**شیوەن بکەم و لیتەیی ئەم خاکە بەسەرما**

[قانع، ٢٠٠٠، ٤٦]

یان لەشیعری (خاکی وەتەن)دا کە شیوەن و لاوانەوەیەتی بۆ لە دەستدانی خاک و نیشتمان، وەک دەڵێت :

**ئەی خاکی وەتەن ! قوڕ بەسەرو بێ سەرو پا خۆم**
**بۆ بێ هونەری ئەهلی وەتەن، شێتی جەفا خــــۆم**

لە کۆتاییشدا دەڵێت :

**(قانع) وەرە ئەمجارە، دە غەوغایێ بەرپا کە**
**بۆ خاکی وەتەن فەرزە بە دڵ و رۆح بە فیداکە**

[قانع، ٢٠٠٠، ١٣٢]

**د : فائق بێکەس (١٩٠٥ – ١٩٤٨):**

بــێکەس لە مەیــدانی شــیعری خاکپەرســتیدا ئەگەر ســەرقافڵە نەبووبێت، بێگومان دوا قافڵەش نەبووە، چونکە زۆربەی شیعرەکانی بۆ گەل و نیشتمانەکەی تەرخانکردووە، هەروەها هانی داون لە پێناو خاک و نیشتمان گیانی خۆیان بکەنە قوربانی، وەک لە شیعرەکانی: (فیکری سەرکەوتن)، (ئەی وەتەن)، (وەفدی کوردستان)، (یادی نیشتمان)، (ئەی کورد)، (قەومی کورد)، (داری ئازادی)و زۆرانی تردا بەرچاو دەکەون، وەک دەڵێت:

**قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر رووی زەمین**
**میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین**
**ئەو کەسەی گیانی لە رێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا**
**پێی مەڵێن مردوو، شەهیدە، وا لە فیردەوسی بەرین**
**پیاو ئەبێ دائیم خەمی قەوم و وڵاتی خۆی هەبێ**
**ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکەنین**

[ئاشنا، ٢٠٠٥، ٣٦]

یان دەڵێت :
**من کە مەحرووم بووم لە وەصڵت تازە ژینم بۆ چییە ؟**
**حورمەت و جاهـ و جەلال و رۆح و دینم بۆ چییە ؟**
لە کۆتاییشدا دەڵێت:
**باعیسی رووناکیی قەلب و نووری چاوم تۆی، وەتەن**
**چی لە دونیا کەم بەبێ تۆ جێنشینم بۆ چییە ؟**
[ئاشنا، ٢٠٠٥، ١٨]

**هـ : دڵدار (١٩١٨ – ١٩٤٨) :**

یەکێک لە کاریگەرترین و بەهێزترین ئەو شیعرانەی کە دەچنە خانەی خاکپەرستی لای شاعیرانی کورد بە گشتی و لای دڵداری شاعیر بە تایبەتی شیعری (ئەی رەقیب)ە، کە بووەتە سروود و مارشێکی نیشتمانی و رەمزی بوونی میللەتی کورد، شاعیر لە سەرەتاکەیدا پڕبەدەم هاوار دەکات و بەدوژمنانی میللەتەکەی دەڵێت: کورد هەر ماوەو هەر دەمێنێت و قەت لەناو ناچێت، وەک دەڵێت :

**ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کوردزمان**
**نای رمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**
**ئێمە رۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین**
**دینمان ئاینمانە نیشتمان**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ١٧٤]

لای شاعیر نیشتمان ئەوەندە بەسۆز و پڕ بەهایە وەک هەموو بەها پیرۆزەکانی تر لە ئاوەزیدا دەگەوزێن، چونکە لای ئەو دین و ئیمانیەتی ؛ یان لە شیعری (سروودی کوردستان)دا کە موناجاتێکی پڕ لە سۆزی خۆشەویستییە لەگەڵ خاکی کوردستاندا، شاعیر تیایدا دەڵێت:

**کوردستانی خۆش، نیشتمانی جوان**

**تۆ قیبلەگاهی منی بێ گومان**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ١٨٢]

شاعیر لەمەدا هەر تەنها کوردستانی بە قیبلەی خۆی نەزانیوە، بەڵکو بەخولقێنەری خۆیشی دادەنێت و بە خوا و دینیشی زانیوە، بێگومان ئەم بۆچوونەش لای هەندێک لە خاوەن بیرو باوەڕە ئاینییەکان وەک لادان و گوناهـ سەیر دەکرێت، کە تیایدا دەڵێت :

**بەڵێ کوردستان تۆ منت خولقاند**

**تۆ منت خولقاند پێت بەخشیم ژیان**

**خۆشی ژیانم خۆشی ژینته**

**ئێشی ژینی من رۆژی شینته**

**چونکە کوردستان کوردستانی جوان**

**قیبلەمی دینمی خوامی بێگومان**

[علاءالدین، ١٩٨٥,١٨٢]

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم و لەپاش جەنگی دووەمی جیهانیشدا کۆمەڵێ شاعیری تری وەک : جگەر خوێن (١٩٠٣ - ١٩٨٤)و قەدری جان (١٩١٦-١٩٧٢)و ئەبوبەکر هەوری(١٩١٥ - ١٩٧٨) و دڵزار (١٩٢٠ - ؟)و هێمن (١٩٢١- ١٩٨٦) و هەژار موکریانی (١٩٢١- ١٩٩١)و محەمەد تۆفیق وردی(١٩٢٣ - ١٩٧٥)و کاکەی فەلاح (١٩٢٨-١٩٩٠)و مەحموود حەمەدەمین ئاغا (١٩٣٠- ٢٠٠٥)و مەجید ئاسنگەر(١٩٣٢-٢٠١٢)و عەبدوڵلا جەوهەری غەمگین (١٩٢٤- ١٩٩٣)و جەلال مەدحەت خۆشناو (١٩٣٤- ١٩٩٨)و زۆرانی تر ئاوڕیان لەم بابەتە داوەتەوەو بەشیعری ئاگریناوی دیوانەکانیان و مێژووی ئەدەبی کوردییان پێ رازاندووەتەوە، بۆ نموونە :

**ا : ئەبوبەکر هەوری (١٩١٥ — ١٩٧٨) :**

ئەبوبەکر هەوری شاعیر لە شاری سلێمانی، لە پاش هەستکردن بە زەوتکردن و داگیرکردنی وڵاتەکەی و بێ ئومێدی لەدەستچوونی خاکەکەی، هاتووە بەم شێوەیە دڵی خۆی دەداتەوە و دەڵێت :

**ئەی وەتەن تۆ وا مەزانە شادومانم ئارەزووی سەیران ئەکەم**
**حەز بە لەنجەو لار و دیتنی دیدە مەخموران ئەکەم**
**صەد هەزار چاوی خوماری عیشوەداری کەچ کولاو**
**بۆ سەعاتی شادومانی خاکەکەت قوربان ئەکەم**

تا دەگاتە ئەوەی بڵێت :

**شەرتە ئێسکم تا نەبێتە خاک لەبۆ کۆشکی وڵات**
**من لە قەبرا بۆ کەساسیت شیوەن و گریان ئەکەم**

[شارەزووری، ٢٠١٣، ٧٨]

**ب : هێمن موکریانی : (١٩٢١ – ١٩٨٦)**

هێمنی شاعیر وەک شاعیرانی تری کورد دوای جەنگی دووەمی جیهان، هاتووە مانەوەی داگیرکەران لەسەر خاکەکەی و ژێردەستەیی دەکاتە هەوێنی شیعریی و بەهۆیەوە خۆشەویستی و وەفاداریی خۆی بۆ خاک و نیشتمانەکەی دەردەبڕێت و لە شیعری (قەڵای نیشتمان)دا دەیەوێت پێمان بڵێت : نیشتمان شایەنی بەخشینی هەموو شتێکە لە پێناویدا، هەتا ئەگەر سەروماڵ و گیانیش بێت، وەک دەڵێت :

**وەتەن گیان و سەر و ماڵم فیدای تۆ**
**وە گیانی من کەوێ دەرد و بەڵای تۆ**
**لە پێناوت دەنێم سەر تا بزانی**
**منم رۆڵێکی ئازاو بە وەفای تۆ**
**لە بۆ پاراستن و حیفزی سنوورت**
**لە باتی (ماژینۆ) سینگم قەڵای تۆ**

[ هێمن، ٢٠٠٦، ٦٤]

یان لە شیعری (سنوور)دا، باسی ئەو سنوورە خەیاڵیەمان بۆ دەکات، کە دوژمنانی کورد بۆ پارچە پارچە کردن و داگیرکردنی

خاکەکەی نەخشاندوویانە، شاعیر راستەوخۆ پێمان دەڵێت : من خاکم دەپەرستم چونکە ئەو پارچە خاکەی کە هەمە لای من هەم خوایە و هەم خۆشەویستمە، وەک دەڵێت :

**ئەی ئەو کەسەی دەتپەرستم و لێم ونی**
**تۆ خودا نی، تۆ خۆشەویستی منی**
**لە ئاسمان نی تا وێت را نەگا دەستم**
**لە قاف نی کاڵەی ئاسنت بۆ هەڵبەستم**
**تۆی لە من ون کرد و منی لە تۆ دوور**
**ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنوور**

[هێمن، ٢٠٠٦، ١٥٤]

**ج : هەژار موکریانی (١٩٢١ – ١٩٩١) :**

هەژاری شاعیر ئەگەرچی زۆربەی ژیانی بەکولەمەرگی و دوور لە زێدی باب و باپیرانی خۆی ژیاوە، بەڵام کاریگەری و خۆشەویستی خاکەکەی هەردەم لە هزر و بیریدا نەچووەتەوە و بە خەیاڵی ئەوە بووە رۆژێک لە رۆژان کوردستان و خاکەکەی بە سەربەخۆیی و ئازادی ببینێت، وەک هاتووە سوێند دەخوات و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت بە هەموو شتێک هەوڵی رزگاربوون و سەربەخۆیی بۆ بدات، وەک دەڵێت:

**نیشتمانی کورد، گەلێک پیرۆزی، سوێندت پێ ئەخۆم**
**بۆ سەربەخۆییت، بە گیان و بە ماڵ، بە قوربانی تۆم**
**هەر تۆی مەبەستم، تۆی خۆشەویستم، تۆی بیرو هەستم**
**چی دێ لە دەستم، هەرگیز ناوەستم، وڵات پەرستم**

[هەژار، ٢٠٠١، ١٦٨]

یان دەڵێت :

**من رۆڵەی کوردم، بۆ نیشتمانم سەرم دائەنێم، ئەبەخشم گیانم**
**لە رێی شۆڕشا خوێنم ئەڕژێنم ئالای ئازادی پێ دەرەنگێنم**

[هەژار، ٢٠٠١، ١٦٧]

**د : کاکەی فەلاح (١٩٢٨ - ١٩٩٠) :**

حەمە حەمەئەمینی شاعیریش، کە بە شاعیری چینی کرێکار و جوتیاران ناسراوە و کاکەی فەلاحیان پێ گوتووە، بەهەمان شێوەی شاعیرانی سەردەمی خۆی و پاش ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەر گەلەکەیدا هاتووە و خاکەکەی لێ داگیر و زەوتکراوە، هاتووە خۆشەویستیی خۆی بۆ دەردەبڕێت ودەڵێت :

**خۆشم ئەوێ ولاتەکەم، کانگای هیواو ئاواتەکەم**
**خۆشم ئەوێ، خۆشم ئەوێ ئەم نیشتمانەم خۆش ئەوێ**
**تا لێدانی دڵ ئەسرەوێ هیچ لەبەرچاوم ناکەوێ**
**کوردستانە خۆشەویستم هەتا ماوم ئەیپەرستم**

تا دەگاتە ئەوەی بڵێت:

**خۆشەویستی نیشتمانم بۆتە سەرلەوحەی ئیمانم**

[فەلاح، ٢٠٠٤, ٧٠]

یان دەڵێت :

**سەربەستی ئەتپەرستم تۆی تاقە خۆشەویستم**
**تۆی وێردی سەر زوبانم تۆی ئامانجی ژیانم**
**تۆی ئاینم تۆی بڕوام تۆی ئاواتم تۆی هیوام**
**تۆی قیبلەگا و نیازم بۆ تۆ ئاواتەخوازم**

[فەلاح، ٢٠٠٤، ٣٦]

## بەشی دووەم

### تەوەری یەکەم - خاکپەرستی لە شیعری شاعیرانی شاری هەولێردا

ئاوڕدانەوە و بەسەرکردنەوەی شیعری شاعیرانی شاری هەولێر، ئەگەرچی لە رووی روخسار و ناوەرۆکەوە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شاعیرانی تری کوردیدا نییە، بەڵام لە رووی شوێنی جوگرافی و ئەو بارە هەڵکەوتەی کە شاعیرەکەی تێدا دەرکەوتووە لەچاو شاعیرانی تردا جیاوازی هەیە، رەنگە ئەمەش بۆ ئەو دابەشبوون و تێکەڵاویـیە ئیتنییە بگەڕێتەوە کە لە دابەشبوونی هاونیشتمانەکەیدا بەرچاو دەکەوێ و وایکردووە زیاتر لە زمانێک و نەتەوەیەک تێکەڵ بە یەکتری ببن، ئەمەش لە شارەکانی تری کوردستاندا بەرچاو ناکەوێت، بۆیە دابەشکردنی شاعیرانی شاری هەولێر بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافی و بەپێی ناوچەکانیان کارێکی ناوازە نییە، هەروەک دابەشکردنی شاعیرانی ناو شاری هەولێریش لەگەڵ شاعیرانی دەرەوەی شارەکە پێویستییەکی زانستی و رەخنەییە، بەهۆی بوونی تێکەڵاوی لە زمان و ئاخاوتن و دیالێکتی جۆراوجۆردا، کە وای کردووە تێڕوانین و بیرکردنەوە و دەربڕینیش لەنێوانیاندا جیاواز بێت، بۆیە لەم باسەماندا هاتووین شاعیرانی دەشتی هەولێرمان بە نموونە وەرگرتووە و کردوومانەتە کرۆکی باسەکەمان، کە تێیدا مەبەستمان دەرخستنی ئەو گوڕوتین و هەست و سۆزو خۆشەویستییەیە کە لەناو شیعرەکانیاندا بۆ خاک دەبینـدرێت لەچاو شاعیرانی تری ناو شاری هەولێردا، ئەم دابەشبوونەش بەپێی باری جوگرافی و سروشتی ناوچەکە لەبەرچاو گیراوە، وەک

**یەکەم : شاعیرانی ناو جەرگەی شارەکە.**

**دووەم : شاعیرانی دەرەوەی سنووری شارەکە،** کە مەبەست لە ناوچەی دەشتی هەولێرە .

لێرەدا هەوڵ دەدەین هەریەک لەم شوێنانە بەجیا باس بکەین و رۆڵی شاعیرەکانیان تێدا بخەینە روو :

**یەکەم : شاعیرانی ناو جەرگەی شاری هەولێر :**

شیعر وەک بەهرەیەکی ناسک و جوان، کە لەخودی شاعیرەوە هەڵدەقوڵێت و وشەکان وەک چەپکە گوڵێک لە رستەی مۆسیقادارەوە دەهۆنرێتەوە، هەتا ئەگەر شیعر داهێنانێکی تاکەکەسیش بێ بەڵام بیرو ئەندێشەی ئەو کەسەش دەکەوێتە ژێرباری چەندین هۆکاری سیاسی و رۆشنبیری و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، کە لە کۆمەڵگەکەدا جێگیربووە و سیمای پێشکەوتنی کۆمەڵگەکە دیاردەخەن [فەوزی، ٢٠٠٦، ٨٩]، لە چوار چێوەی ئەم بۆچوونەشدا شاعیرانی ناو شاری هەولێر بە تایبەتی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ئەگەرچی زەمینەیەکی هاندەر بۆ دەرکەوتنی بزووتنەوەیەکی شیعری بەرز نەهاتبووە ئاراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەک لە شاعیرانی بەتواناو لێهاتوو توانییان دەنگی خۆیان بچەسپێنن و کاروانی شیعری کوردی بەرەو پێش ببەن و لە ئاستی کوردستانیشدا جێ پەنجەی خۆیان بکەنەوە .

بەچاوخشاندنێک بەئاستی شیعری شاعیرانی ئەو شارە بۆمان دەردەکەوێت کە شوێنی جوگرافی و کاریگەری مێژوویی هۆکاربوونە بۆ کارتێکردنی تایبەتمەندییەکانی قوتابخانەی شیعری (بابان) بەسەر شاعیرانیدا، بەتایبەتی لە بوارەکانی : دڵداری و سیاسی و نەتەوەیی و ستایش و وەسف و لاواندنەوە و ئاینی و داشۆرین و شانازی و هی تریش، بۆ نموونە ئەگەر لە بواری شیعری نیشتمانی و نەتەوەیی وردببینەوە دەبینین کە چەندین شاعیری بەتوانای ئەم شارە لەسەر رێچکەی شاعیرانی تری کوردستان هەست و سۆزو خۆشەویستی خۆیان بۆ خاک و نیشتمان دەربڕیوە و لە ناوەرۆکی شیعرەکاندا بەجوانترین و ناسکترین وشەی کاریگەر دەریانبڕیوە، شاعیرانی وەک : مەلا حوسێن شێخ سەعیدی فانی (١٨٨٣ - ١٩٨٣)و عەبدولجەبار ئاغای کانی (١٨٩٧- ١٩٥٧)و ناسیح حەیدەری (١٨٩٨- ١٩٨٦)و محەمەد میهری (١٩٠٣- ١٩٤٢)و شێخ جەلال شێخ جەمیل نوری (١٩١٢ -

١٩٩٥)و ئیبراهیم هوشیار (١٩١٦ - ١٩٩٤)و بورهان جاهید (١٩١٨ - ١٩٩١)و مەلا مەسعوود بێبەش (١٩٣٢ - ١٩٩٨)و پیربال مەحموود (١٩٣٤- ٢٠٠٤)و مەدحەت بێخەو (١٩٣٤ - ؟)و عەبدوڵڵا هەرشەمی و نەژاد بەرزنجی و مەلا شەریف رەنگەڕێژانی و رەشاد موفتی و مەغدید سۆران و زۆرانی ترن، بۆ نموونە :

**أ : کانی (١٨٩٧ - ١٩٥٧) :**

عەبدولجەبار کوڕی مەلا عەبدولرەحمانی دۆغرەمەچی، کە لە بەگزادەکانی جافە و لە قەڵاتی شاری هەولێر لە دایک بووە، کانی بە شاعیرێکی هەست ناسک و زمانپاراو ناسراوە و زۆربەی شیعرەکانی لە چوارچێوەی دڵداری و خۆشەویستیدا دەسووڕێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێبەش نەبووە لە دەربڕینی هەست و سۆزو خۆشەویستی بۆ خاک و نیشتمانەکەی، وەک دەڵێت :

**خزمینە وەرن تاکو بە قوربانی وەتەن بین**
**قوربانی چیا و دەشت و بیابانی وەتەن بین**
**تا کەی لە کون و قوژبنی وێرانە بمێنین**
**با ئیدی لەسەر کۆششی عومرانی وەتەن بین**

تا دەگاتە ئەوەی بڵێت :

**تاکەی ئەدوێی (کانی) لە ئەوسافی خەت و خاڵ**
**وا چاکە لەمەولا کە غەزەلخوانی وەتەن بین**

[کانی، ١٩٨٠، ٢٨]

یان لەو شیعرەی کە لە وەڵامی ئەو نامەیەی (بورهان جاهید)و (دڵدار)ی شاعیری دۆستی کە بە یەکەوە نووسیویانە تیایدا بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز رەخنەیان لە(کانی) گرتووە بەوەی تەنها شیعری دڵداری دەنووسێ و سەرەتای نامەکەشیان بەم دێرە دەست پێکردووە :

**ئەنفییەت (کانی) دەڵێن مسک و گوڵاوی تێکەڵە**
**دارعەکازیشت، لە دارستانی گوندی هەرتەلە**

[شارەزا، ١٩٧٣، ٢١]

(کانی) لە وەڵامیاندا دەریدەبڕێت، کە هەر تەنها شیعری دڵداری نییە، بەڵکو لە شیعری نیشتمانی و خۆشەویستی بۆخاک و نیشتماندا دەستێکی باڵای هەیە و کەمتەرخەم نییە لەم بوارەدا، وەک دەڵێت :

**عاشقم عیشقی وەتەن شەوق و نووری چاومە**
**کورد و کانی ئەی رەقیب وردی شانمە**
**عیشق و وەتەن عەرد و بەدەن قەت لە جەستەم نابنەوە**
**دڵ لە شاخانە عەزیزم، یان لە رۆح و جانمە**
**رۆڵە بورهان عیشقی چی ناحەزی ئەقوام دەزانێ**
**دوژمنی کورد دوژمنی خۆم کەس و ئەولادمە**

**ب : محەمەد میهری (١٩٠٣ – ١٩٤٢):**

محەمەد شەریفی میهریش، وەک هەر شاعیرێکی تری شاری هەولێر، بێبەش نەبووە لەم بوارەدا و لە شیعرەکانیدا هەوڵیداوە هەستی نەتەوایەتی و خۆشەویستی ئەم خاک و نیشتمانەی لەسەری دەژیت لە دڵ و دەروونی لاواندا بڕوێنێت، وەک دەڵێت :

**وەتەن ماتم، وەتەن بۆ تۆ حەزینم**
**وەتەن بمرم، وەتەن بۆ تۆ نەمێنم**
**فیدای تۆیە هەموو لاوی وڵاتم**
**بەبێ تۆ ئەی وەتەن بۆ چیمە ژینم**

لە کۆتاییشدا روو لە لاوانی نیشتمانەکەی دەکات و پێیان دەڵێت :

**لەگەڵ (میهری) وەرن با دەست لە دەست کەین**
**لە دڵسۆزی هەمووتان من ئەمینم**

[هیرانی، ٢٠١٣، ٩٢]

لای شاعیر نیشتمان لە هەموو شتێک بەنرخترو پیرۆزترە، هەتا لە گیان و رۆحیشی بێت، وەک دەڵێت :

**وەتەن دوڕی، وەتەن جانی، وەتەن رووحی رەوانم**
**وەتەن بۆ من ئەتۆی سەروەر، ئەتۆی روئیا و نیشتمانم**

[فەیزی، ٢٠٠٥، ١٧٣]

**ج : بورهان جاهید (١٩١٨ - ١٩٨١) :**

بورهان حاجی محەمەدی دۆغرەمەچی ناسراو بە جاهید، یەکێکی ترە لە شاعیرانی ناو شاری هەولێر لە بارەی شیعری نیشتمانی و خۆشەویستیی خاک لای ئەو شاعیرە خۆی لە گفتوگۆیەکی ئەدەبیدا کە لە ساڵی (١٩٧٣) ورووژاندوویەتی تێیدا دەڵێت : من ئەگەرچی زۆربەی شیعرەکانم لەبابەتی دڵداری و وەسف و تەسەوفەوەیە، بەڵام هەرگیز بابەتی نیشتمانی و نەتەوەییشم فەرامۆش نەکردووە، وەک دەڵێت :

**هەتاکەی ئاو و خاکی تۆ نەسیبی خوێن مژی خۆت بێ**
**هەتاکەی دووری یاری ئەغیار لەگەڵتا هەمدەم و جۆت بێ**
**هەتاکەی نایەڵی ئەم جەننەتە بێ ئاگر و سۆت بێ ؟**
**هەتاکەی چاوی غەیرە هەر لە نان و لەززەتی دۆت بێ**

[ شارەزا، ١٩٧٣، ٢٥]

یان لەو شیعرەی کە لە هاوینی (١٩٥٦)دا بە هاوبەشی لەگەڵ هاوڕێ و دۆستی نزیکی (مەدحەت بێخەو)ی شاعیر لە شەقڵاوە و لە شیعرێکی (٢٩) دێڕیدا، کە لە ژمارە/٧٢ ی ڕۆژی ١٩٥٦/٩/١٠ی گۆڤاری هەتاودا بڵاو کراوەتەوە تیایدا خۆشەویستی و دڵسۆزیی خۆیان بۆ نیشتمان و خاکەکەی دەردەبڕن و تێیدا دەڵێن :

**پێکەوە دیسان بنووسین باسی ژینی دەردەدار**
**جا برا مەعلوومە ئێمەش هەر ئەچین بۆ نێو مەزار**
**کەی دەبێ ئەم ئێش و زارە دوایی بێ لە نیشتمان**
**نیشتمانی بێ کەس و پڕ ئەزیەت و پڕ خاکەسار**
**خاکی کوردان زێڕو زیوە گەر بزانین قیمەتی**
**گەنجینەی ئەم خاکە تەنیا غەیرەیە ئەیکا ژمار**

[ شارەزا، ١٩٧٣، ٢٥] [بێخەو، ٢٠١٣، ٧٢]

**د : مەسعوود بێبەش (١٩٣٢ - ١٩٩٨) :**

مەسعوود کوڕی مەلا عەبدوڵلای شەناغەیی، وەک شاعیرێکی هەستناسکی ناو شاری هەولێر لەژێر کار تێکردن و کاریگەری

شـاعیرانی پـێش خـۆی و هـاوەڵانی، توانیـویەتی جـێ پەنـجەی خـۆی لە بواری شیعری نیشتمانیدا بکاتەوە و دەنگی خۆی بگەیێنێتە هەوادارانـی، بە ئـاوڕدانەوە لە شـیعرەکانی دەبینـین : شـیعرە نیشـتمانییەکانی لەو شیعرانەیە کە گیانی نەتەوەیی و سۆزو خۆشەویستی کوردستان لەدڵ و دەروونـی لاوانـی شـاری هەولێـری سـاڵانی پەنجـا و شەسـتەکانی سـەدەی بیسـتەمدا دەڕوێنـێ، وەک لەم رووەوە گـوتراوە ((ئەم شـیعرە نیشـتمانی و نەتەوەییـانەی بێـبەش لە سـەردەمی فەرمـانڕەوایی و دکتـاتۆری و رەشـبگیری حـوکمی عـورفی هەرچەنـدە قەدەغە بـوون و بڵاوکردنەوەیـان ئاسـان نەبـوو، بەڵام لەنـاو خەڵکـی بە ئەزبەر دەخوێندران و لەبەردەکران)) [خەزنەدار، ٢٠٠٧، ٦٢٨]، وەک لە شیعری (پیرۆزبـایی جەژنـی نەورۆز)دا دەردەکەوێـت کە لە سـاڵی (١٩٦٨)دا گوتراوە، شاعیر تیایدا ئەو پەڕی دڵسۆزی و وەفاداری بۆ نیشتمانەکەی دەردەخات و داوا لە لاوانی وڵات دەکات هەوڵی رزگاربوونی لەدەست دوژمنانی بۆ بدەن، وەک دەڵێت :

**لاوی کورد نەورۆزە ئیمڕۆ جەژنتە دوژمنت جەرگی لە داخا لەت لەتە**
**بەرگی زستانیت فڕێدە داکەنە تێبکۆشە ئیمڕۆ رۆژی هیممەتە**
**تۆش وەکو کاوەی نەبەز دەستکە چەکوچ لێدە سەر زەححاکی ئەمڕۆت فرسەتە**
**نیشتمانت چاوەنۆڕی تۆ دەکات تۆی هەیە رزگاری کات لەم زیللەتە**

[خەزنەدار،٢٠٠٧، ٦٣٣]

**هـ : مەدحەت بێخەو (١٩٣٤ – ؟)**

مەدحەت کـوڕی خـدری عەبـدوڵڵای ناسـراوە بە (بـێخەو)، وەک هەموو شاعیرانی تری ئەم ناوچەیە خاوەن هەستێکی بەرزی کوردانەیە و وەک کەسێکی دڵسۆزی خاک و نیشتمان لە زۆربەی شیعرەکانیدا لە پـاڵ شـیعری دڵداری وەک خەمخۆرێک و دڵسـووتاوێکی گەل و خـاک خۆی نیشاندەدات، ئەمەش لە چەندین نموونەدا بەرچاو دەکەوێت، وەک لە شیعری (کوردستان)دا دوای دەرچوونی لە بەندیخانەدا، دەڵێت :

**هەست و ئاین و بیرم　　کوردستانی بەهادار**
**لانەی باب و باپیرم　　خاکی کوردی شکۆدار**
**کوردستان تۆی ئاواتم　　هەڵمەتم بۆ شادیتە**
**رەنج و هەوڵ و خەباتم　　بۆ بەرزی و ئازادیتە**

[بێخەو، ٢٠١٣، ٤٢]

شاعیر لەم شیعرەدا زۆر بە راشکاوانە وشەی پەرستن بۆ خاک و نیشتمان بەکاردێنێ و خۆشەویستیی خۆی بە وشەی کاریگەر و مانادار دەردەبڕێت، وەک دەڵێت :

**چۆن نەتپەرستم هەردەم　　هێرش نەبەم بۆ دوژمن**
**چۆن سەرکزو مل کەچ بم　　بێ مافی گەل وەرگرتن**
**گیانم خوێنم ئێسقانم　　هی تۆیە من بێبەشم**
**تۆی مایەی ژین و مانم　　تۆی هیوای روونی گەشم**

[بێخەو، ٢٠١٣، ٩٨]

یان لە شیعری (نیشتمانی خۆشەویست)دا بەهەمان شێوە ئەو گڕوتینەی لە ناخ و دڵ و دەروونیەوە پەنگی خواردووە، دێت بەو پەڕی ئازادی و راستگۆیانەوە ئەو هەست و نەستە دەردەبڕێت، وەک دەڵێت :

**رووحەکەم ئەی نیشتمان هەست و نەست و بیری من**
**کوردستانی زێڕ و زیوم خاکەکەی باپیری من**
**تۆی هیوای شادی ژیانم جەننەتی دڵگیری من**
**بۆ رووناکی تۆیە هەردەم گیان و شیرو تیری من**
**خۆشەویستی تۆ ئیمانە هۆیە بۆ تەنویری من**

[بێخەو، ٢٠١٣، ٥٥]

شاعیر لێرەدا پێمان دەڵێت : نیشتمان رۆح و گیان و هەست و نەست و سۆزو بیرە، لە هەمان کاتدا هیواو ئاوات و شادی ژینە، بۆیە ئەگەر بشپەرسترێت هێشتا زامی دڵ ناسڕێتەوە، بەڵام بە رزگاربوونی دەکرێت ئەم زام و برینە بسوێتەوە و دڵ و دەروون ئارام بگرێت و هیواو ئاوات بێتە دی .

**تەوەری دووەم - خاکپەرستی لە شیعری شاعیرانی دەشتی هەولێردا**

سەرهەڵدانی هەر بزووتنەوەیەکی ئەدەبی، یان رۆشنبیری پێویستی بە بارودۆخێکی تایبەتی یان پێش خانێک هەیە، ئەمەش زیاتر خۆی لە دروستبوونی بارێکی سیاسی، یاخود نەتەوەیی دەبینێتەوە، چونکە باری رۆشنبیری و سیاسی راستەوخۆ کار لەیەکتری دەکەن و پێکەوە هۆکاری سەرەکین بۆ بەرەوپێش چوونی بزووتنەوەکەیان و لە هەندێ باردا شۆڕشە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکە پێش شۆڕشە سیاسییەکە دەکەوێ و ئاووهەوای تەقینەوەکەی بۆ دەستەبەر دەبێت، پاشان رووداوە سیاسی و نەتەوەییەکە دەنگدانەوەیەکی زیاتری بۆ پەیدادەبێ و رەنگدانەوەی بەسەر ژیانی میللەتەکەیدا دەبێت [فەیزی، ٢٠٠٦، ٩]، ئەم بارە ئەدەبی و رۆشنبیرییەش لە ژیان و بەرهەمی شاعیرانی دەشتی هەولێردا زۆر بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت، پاش ئەو هەموو رووداو و بەسەرهاتە سیاسییەی بەسەر کوردستان و ناوچەکەدا هاتوون، شاعیرانی ئەم دەڤەرەش وەک ناوچەکانی تر هەستاون بە نیشاندانی هەست و سۆزو خۆشەویستی بۆ خاکەکەیان، شاعیرانی وەک : مەلا تاهیر مەلا مەعروفی پاکی (١٨٩٦ - ١٩٨٠)، مەلا ئەسعەد حەمەدەمینی هەوایی (١٩٠٣ - ١٩٤٤)، ئەحمەد چووکل ئاغای دزەیی (١٩٠٧ - ١٩٩٢)، مەلا خدری دەشتی (١٩٠٩- ١٩٥٧)، مەلا خەلیلی موخلیس (١٩١٠ - ١٩٨٥)، مەلاساڵحی کۆزەپانکەیی، مەلا عەبدوڵلای فەرهادی (١٩١٨ - ٢٠١٠)، بێدڵ (١٩٢٦ - ١٩٨٦)، عەلی فەتاح دزەیی (١٩٢٨- ١٩٩٢)، سەید عەبدوڵلای عاجز (١٩٢٩ - ١٩٦٧)، ئەحمەد رەشوانی (١٩٤٢- ١٩٦٨)، ئاواز ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی (١٩٤٦ - ؟)، مەدحەت بێخەو (١٩٣٤ - ؟)و زۆرانی تر، بۆ نموونە :

**أ : ئەحمەد چووکل ئاغای دزەیی (١٩٠٧ - ١٩٩٢) :**

ئەحمەدی چووکل ئاغای دزەیی، یەکێکە لەو شاعیرانەی دەشتی هەولێر کە جگە لە مەستبوون بە سروشتی کوردستان و ئاووهەوا سازگارەکەی، نرخ و بەها و پیرۆزی خاکەکەشی هۆکار و سەرچاوەی

تەقینەوەی کانی شیعرەکانیەتی و لە ڕێگەی ئەو شیعرانەوە خۆشەویستی خۆی پێ دەربڕیوە، وەک لە شیعری (دیاری نەورۆز) [موکریانی، ١٩٨٦، ٣٢] و(خاکی کوردەواری)دا دەردەکەوێت، وەک دەڵێت :

**هەمیشە جەننەتە خاکە وڵاتی کوردەواری من**
**بە وێنەی کەوسەرو تۆبایە کانی و دارچناری من**
**مەکە باسی حەیاتی بۆسفۆر و دەردەنیل جاریّ**
**ببینە وەختی ناوکەتن حەیاتی کوهساری من**

شاعیر لەسەر پێداهەڵدانی سروشتی خاکی کوردستان و جوانی و پیرۆزییەکەی بەردەوام دەبێت و بەراوردیان دەکات لەگەڵ ناوچە و شوێنە ناسراوەکانی تری جیهان، کە بەلای ئەو هێشتا ناگەنە ئەو سروشتە جوانەی خاکی کوردستان، وەک تیایدا هاتووە و دەڵێت :

**مەڵێ خۆشە (سویسرا) ئەو لە هاوینە بەکوێستانی**
**(سپی ڕێزم) ببینە بەینی ئەو ڕێزە و هەواری من**
**لە دارڕانا خەجاڵەتبار ئەبن ئەستێرەکان وەختێ**
**ببینن ئاوی (بێخاڵم) کە دەڕژێتە رووباری من**
**یەمەن وەختی سبأو جەنەتەینی باس و خواسێکە**
**لە گەشتوزاری دەشت و کێوەکانی میوەداری من**
**مەگەر ئاوی حەیات و شیری جەننەت پێ کەون (ئاغا)**
**بەسافی ئاو کەوا دەڕوا لە بەفری شەو بەساری من**

[دزەیی، ١٩٤٠، ٥٣]

**ب- دەشتی (١٩٠٩ – ١٩٥٧) :**

خدری کوڕی ئەحمەدی نانەکەلی ناسراو بە دەشتی، بەحوکمی ئەوەی لە دەشتی هەولێر لەدایک بووەو ژیاوە نازناوی دەشتی بۆخۆی هەڵبژاردووە، لە رووی ناوەرۆکەوە شیعرەکانی بەزۆری دڵدارین و ئەوانی تریشی نیشتمانپەروەری و کوردایەتینە، لەم بوارەشدا تا رادەیەک داهێنانی تێدا کردوون (( ئەگەرچی دەشتی هەموو ژیانی لە حوجرەی مزگەوت بردۆتەسەر و مامۆستای زانستەکانی شەریعەتی

ئیسلام و زمانی عەرەبی بووە، کەچی هەندێ لە شیعرەکانی بەڵگەی ئەوەن کە هوشیارانە و مۆدێرنیزمانە بیری لە مەسەلەی رزگاری نەتەوەی کورد کردووە [خەزنەدار، ٢٠٠٧، ١١١] لەبارەی سۆزو خۆشەویستی بۆ خاک و نیشتمان، شاعیر بەچەند شیعرێک خاکی کوردستانمان بۆ بەسەر دەکاتەوە و پێمان دەڵێت : ئەی کوردی بەدبەخت و خۆشی و خێر لەخۆ نەدی بەسیەتی ناکۆکی و دووبەرەکی کە سەرچاوەی هەموو نەهامەتیەکانتە، تێبکۆشن و یەکگرتوو بن تاکو نیشتمان و خاکتان لەدەست نەچێت، وەک دەڵێت :

**ئەی گەلی ئەشرافی کوردان بۆ غەریقی زیللەتن**
**بۆچی وا دائیم خەریکی قووتی مولک و میللەتن**
**حەیفە پاشی تۆ بمێنن کوردەکانی بێ حەشەم**
**چوو لەدەستیان مەعدەنی عیززو شەرەف بەینەلکەرەم**

تا دەگاتە ئەوەی بڵێت :

**بابە گوڕگوڕ تاوەکو ئێستاکە پیری ئێوە بوو**
**خانەقاو و تەکیە و ڕێبازی شێخی ئێوە بوو**
**جێگەیی مەولود و سەد ئیحسان و خێری ئێوە بوو**
**ئێستاکەش وا پێی خەنی بوون عارەب و تورک و عەجەم**

[دەشتی، ٢٠٠١، ٧١]

یان لەشیعری (بۆ نیگبەتی ئەم میللەتە)دا شاعیر ئاهـ و ناڵینیەتی لەدەست نەبوونی هێزو دەسەڵات بۆ پاراستنی خاک و وڵات، بۆیە هاتووە بابەگوڕگوڕی کردۆتە رەمزی کوردستان و بەهۆیەوە پێمان دەڵێت :

**بۆ نیگبەتی ئەم میللەتە بێ جانە دڵی من**
**بۆ میللەتی ئازوردە لە زەلیانە دڵی من**
**کوردینە وەرن شەربەتی رێکی بە دەماکەن**
**ئەم موڵکە لەدەست عالەمی بێگانە رەهاکەن**
**خاکی وەتەنی ئێوەیە هەردەم کە دەناڵی**
**سەد حەیفە کە ئەم مەعدەنە ئەڕوا بە بەتاڵی**

**لۆکەی وەتەنی ئێوەیە ئەمڕۆ بووە دینار**
**رووحی وەتەنی ئێوەیە ئەم فلسی خەریدار**

[دەشتی، ۲۰۰۱، ۸۵]

**ج – مەلا خەلیلی موخلیس (۱۹۱۰ – ۱۹۸۵) :**

مەلا خەلیلی موخلیس وەک یەکێک لە شاعیرە ناسراوەکانی شاری هەولێر و دەشتەکەی رۆڵەیەکی بە وەفا و ئەمەکداری کوردستان و شارەکەی بووە و هەمیشە خۆی بە قەرزاریان زانیوە، چونکە بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە کە خزمەتی خاک و گەل و میللەتەکەی بکات و بەزەقیش لەناو شیعرەکانیدا هەستی پێ بکرێت، بۆیە هاتووە لە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ خاک و نیشتمان خۆی بە یەکێک لە شاعیرە دڵسۆزەکانی میللەتەکەی دەزانێت، بەوەی کە سەری وەک گۆ بۆ بەرزی گەل و نیشتمانەکەی لە مەیدانە و هەردەم خۆی بە قوربانی نیشتمان و گەلەکەی کردووە(٦)، وەک لەم دێرانەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت :

**لە بۆ سەربەرزی قەومی خۆم سەرم وەک گۆ لە مەیدانە**
**کە من خۆم ئاشکرا ناکەم بە گۆتە هەر لە داخانە**
**بە قووەی کارەبا گەر بێی بکەی تەفتیشی قەلبی من**
**دەزانی دەردی من نمرەی لە فەوقی کوللی دەردانە**

[ ئەحمەد، ۱۹۹۷، ۱۲۳]

شاعیر غەریبی و ئاوارەیی کردووەتە هەوێنی خۆشەویستی خۆی بۆ خاک و نیشتمان و دوورکەوتنەوەکەی وەکو کوورەی ئەڤینی دەروونی جۆش دەستێنێ و چاوەکانی پڕدەبێت لە فرمێسک بۆ بست بە بستی خاکی کوردستان و زێدی باب و باپیرانی، بە تایبەتی لەو کاتەی کە گوندەکەی (دووسەرە) جێدێڵێ و بەرەو شام کۆچ دەکات و بە یادکردنەوەی ئەو هەست و سۆزە دەردەبڕێت و دەڵێت :

**لێرەوە یاران شەو و رۆژ یادی کوردستان دەکەم**
**زۆر غەریبی خاک و خۆڵ و سێبەری داران دەکەم**
**من نەخۆشم بای وەتەن کە هات بە چاکی پێی بڵێن**
**ئارەزووی سێو و گەراز و مژمژ و خۆخان دەکەم**

[ شوان، ۲۰۱۰، ۲۷۳ ]

لە شیعری (وڵات هەی وڵات)یشدا پێمان دەڵێت هەر لە منداڵییەوە هەستم بەبوونی وڵات و خۆشەویستی خاکم کردووە و کەوتووەتە خەیاڵم و هەردەم ویستوومە شتێک بکەم بۆ ئەوەی ئەو خاکەی کە من هەمە و کەوتۆتە دەستی بێگانە و داگیرکراوە، لە ژێردەستەیی رزگاری بکەم و منیش وەک کەسانی تر دڵ و دەروونم پێی شاد و ئارام بێت و ببمە خاوەنی خاکی خۆم، وەک دەڵێت :

| | |
|---|---|
| **من وەک ئێستا کووم، هەر بە منالی** | **خاک و نەتەوەم کەوتە خەیالی** |
| **دیتم کە خاک و نەتەوەی وا چاک** | **بوویتە ژێردەستی دوژمنی ناپاک** |
| **وڵاتمان خۆشە هیچ عەیبی نییە** | **بستە خاکێکی بێ فایدە نییە** |
| **وڵاتی ئێمە وەک دار گوێز وایە** | **گوڵ بۆ بێگانە، خار بۆ ئێمەیە** |
| **بێگانە وایکرد نابێ وەتەنمان** | **بەزمانی کوردی بدوێ لەگەڵمان** |
| **بست بە بست خاکمان کەشفی کرایە** | **نموونەی ئێستا وا لە ئەوروپایە** |

[شوان، ۲۰۱۰، ۲۸۰]

**د : بێدڵ (١٩٢٦ - ١٩٨٦) :**

مەلا عەبدوڵڵای شەناغەیی (بێدڵ) یەکێکە لە شاعیرانی دەشتی هەولێر، کە زۆربەی ژیانی لە گوند و لادێکانی کوردستاندا بەسەر بردووە، شاعیر هەوڵیداوە زانست و زانیارییەکانی لەخزمەت دێهات و ژیانی لادێیەتی بەکاربهێنێ و نەتەوەی کوردی پێ هوشیار بکاتەوە، بۆیە دەبینین ناوەرۆکی زۆربەی شیعرەکانی لە چوار چێوەی نیشتمانی وخۆشەویستی بۆ گەل و خاکەکەی دەسووڕێنەوە، چونکە بەڕای ئەو دەبنە هۆی هاندانی لاوان و گەنجانی کورد و چاندنی تۆوی خۆشەویستی نیشتمان لە دڵ و دەروونیان، بۆیە لەم بوارەدا بانگی ئازادی و سەربەخۆیی بە گوێی کورداندا دەدات و داوایان لێ دەکات قوربانی بدەن لەپێناویدا، وەک لە شیعری (نیشتمان)دا دیاری دەکات و دەڵێت :

| | |
|---|---|
| **ئەو نیشتمانەی من هەمە** | **بێ شک لە عالەم یەکەمە** |
| **هەندە بە پیت و بەرهەمە** | **چەندی باسی کەم هەر کەمە** |

پاشـان بە وەسـفکردن و پێداهەڵـدانی خـاکی کوردسـتان لە رووی سروشتی و جوانییەوە یەک یەک شـوێنەکان دەڕازێنێتەوە و دەیچـوێنێ بە بەهەشتی سەر ئەم دونیایە، وەک لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت :

**دار گوێز و خۆخ و سێوەکەی بەهێ و هەنار و مێوەکەی**
**چی ئارەزووکەی لێی وەکەی دەڵێی بەهەشتی ئادەمە**

[ بێدڵ، ١٩٩٩، ٥٥]

یـان لە شـیعری (خـۆزگە)دا شـاعیر گیـانی بەرگـری و فیـداکاری دەخاتە ناو شیعرەوە و خۆی وەک رزگارکەرێکی نیشتمان پیشـاندەدات و دەیەوێت هانی میللەتەکەی بدات بۆ چەک هەڵگرتن و فیداکاری، وەک دەڵێت :

**خۆزگە دەبووم بە شمشێر یا سەربازێکی دلێر**
**بۆ فیداکاری وەتەن دوشمنم دەکرد بە پەن**
**یا دەبینم خوێنی خۆم لەسەر عەرد دەڕژێ بە گۆم**
**یا دوشمن دەبەزێنم سەری پێ دادەنوێنم**
**بەیداخ بشەکێنمەوە هۆزم بحەسێنمەوە**
**وەکو گەلانی جیهان ببمە خاوەن نیشتمان**

لە کۆتاییشدا دەڵێت :

**ئەوا رۆژم لێ هەلات شەو و رۆژ دەکەم خەبات**
**لە رێگای نیشتمانم بەخت ئەکەم روح و گیانم**

[ بێدڵ، ١٩٩٩، ٢٢]

**ئەنجام:**

پاش خستنە رووی گشت لایەنەکانی باسەکە، لە کۆتاییدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە :

١- سۆز وەک رەگەزێکی ئەدەبی و خۆشەویستی نیشتمان وەک بابەتێکی شیعری، هەر لە کۆنەوە لای شاعیران بە گشتی و شاعیرانی کورد بە تایبەتی ئاوڕی لێ دراوەتەوە، شاعیرانی شاری هەولێریش لەم بوارەدا بێبەش و کەمتەرخەم نەبوونە، نەخاسمە شاعیرانی دەشتی هەولێر، کە بەهۆی بارە سیاسییەکە و ئەو هەڵکەوتە جوگرافییەی تێی کەوتوون لە بایەخنەدانی دەسەڵاتداران بە ناوچەکانیان و بەهەند وەرنەگرتنی خواست و هیوای ئاواتەکانیان لە ژیانێکی ئاسایی دوور لە ژێردەستەییدا، یان داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی خێرو بێری خاکەکەیان و بێبەشکردنی خاوەنەکانیان لە کەمترین پێداویستییەکانی، شاعیرانیان وەک رێبەر و چاوساخ و خەمخۆری میللەتەکەیان هاتوون بەزمانێکی ئاشکراو دلێرانە هانی گەل و میللەتەکەیان داوە کە خاک و نیشتمانەکەیان خۆش بوێ و بیپارێزن و خۆشیان لەریزی پێشەوەی گەلەکەیان بینیوەتەوە و بوونەتە هۆکارێک بۆ هاندان و جۆشدانی لاوان و گەنجانیان، تاکو لەم رێیەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە بەکاریان بهێنن و بەهۆیەوە ئازاد و سەربەست بن .

٢- سروشت وەک کەرەستەیەک و هۆکارێک بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی مرۆڤ لەسەری، هەر لە کۆنەوە لەلایەن شاعیرانەوە هەوڵی پاراستن و خزمەتکردنی بۆ دراوە و هەموو جۆرە شێواز و رێگایەکی پاراستنی بۆ گیراوەتەبەر، تاکو بە زیندوویی و هەمیشەیی بمێنێتەوە، بۆیە هەندێک جار لە رێگەی وەسفکردن و رازاندنەوە و پێداهەڵدانی، یان چواندنی بە شتە پیرۆز و بەها بەرزەکانی وەک: بەهەشت و دین و ئیمان و قیبلە و رۆح و گیان، یان هەندێک جار وەک دایک سەیر بکرێت و بە دایک بچوێندرێت، کە لە رێگەی ئەمانەوە کارتێکردن و کاریگەری بەسەر ویژدان و دڵ و دەروونیان هەبێت و

بەهۆیەوە بیرو باوەڕیان بەهێز بکات و هانیان بدات تاکو ئامادە بن بە گیان و رۆح خۆیان بەخت بکەن و خاکەکەیان رزگاربکەن، چونکە سەرچاوەی بوون و مان و ژیانیانە .

٣- لە رووی مێژووییەوە شیعری خاکپەرستی زۆر کۆنە و رەگی لە مێژووی نیشتماندایە و نەمرە و لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخدا ناگۆڕێ، گرنگترین ئەو سەرچاوانەی باس لەو هوشیاری و هەستە نیشتمانییەوە دەکەن دەیگەڕێننەوە بۆ دوای شەڕی چاڵدێران لە (١٥١٤)ی زایینی و دابەشکردنی کوردستان، ئەگەرچی وەک هەستکردن مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆر پێش ئەم مێژووەش .

**پەراوێزەکان:**

(١) لە ئەدەبی کوردیدا دوو زاراوەی نیشتمانی و نەتەوەیی زۆر جاران بە یەکەوە بۆ مەبەستێک بەکاریان دێنین : یەکەمیان خۆشەویستی خاکی باب و باپیران دەگرێتەوە، دووەمیشیان پەیوەندیی تاکە بە کۆمەڵێک خەڵکەوە کە نەتەوە پێکدێنن ؛ لە راستیدا مانای نیشتمانی لە جەوهەردا جیاوازی نییە لەگەڵ هەستی نەتەوایەتیدا، چونکە خۆشەویستی نیشتمان خۆی لەخۆیدا دەبێت بەخۆشەویستی ئەوانەی لەسەر ئەو خاکەن، هەروەک خۆشەویستی نەتەوەش خۆشەویستی ئەو ئەرزەیە کە لەسەریدا دەژی [پێشڕەو، ١٩٧١، ٦]، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە خاکپەرستی و نیشتمانپەروەری هەر یەک مەبەستن .

(٢) لەبارەی وشەی (پارەپەرستی)یەوە، بێکەسی شاعیر ئەم وشەیە بۆ ئەو کەسانە بەکاردێنێ کە پارەیان لا خۆشەویستە و هەردەم وێڵ و سەرگەردانی بوون، وەک لەم کۆپلەیەدا دەریدەخات و دەڵێت :

**ئەشرافمان هەموو بێ روح و سستن**
**دەخیلە پشتیان هیچ پێ مەبەستن**
**هەموو ناکۆک و پارە پەرستن**

[ ئاشنا، ٢٠٠٥، ٦٤]

(٣) لەبارەی وشەی (نەزانپەرستی)یەوە، هەژاری موکریانی ئەم وشەیە بۆ ئەوکەسانە بەکاردێنێ کە نەزان و بێئاگان و بەدوای ژیان کەوتوون و بەدەست نەهامەتییەکانییەوە وێڵ و سەرگەردانن، وەک لەم دێڕانەدا دەردەکەوێت و دەڵێت :

**چەپ گەردی گەردوون گەڕان کوشتمی    نەزان پەرستی بۆ نان کوشتمی**
**هەر چەوسانەوەی بێ حەسانەوە    ئەی مردن لە کوێی ژیان کوشتمی**

[هەژار، ٢٠٠١، ١٣٩]

(٤) بە بۆچوونی زۆر لە رەخنەگران و ئەدەبدۆستان : هەستی ناسیۆنالیزمی یان نەتەوەپەرستی، نیشتمان پەروەری، کە لە زمانەکەماندا وشەی (کوردایەتی) بۆ بەکاردێت، بە مانای بوونی بنەماکانی دەوڵەت و قەوارەیەکی سیاسی دێت لەناو گەلاندا، ئەمەش لەگەڵ بابەتەکەمان لە خاڵی جوگرافیا (خاک و سنوور و نیشتمان)دا یەکدەگرێتەوە، چونکە وەک

ڕەگەزێک لە ڕەگەزەکانی بوونی دەوڵەت لەگەڵ ئەوانی تری وەک [زمان (ناسنامە)، مێژوو (ڕووداوی کۆن)، ڕەمز (ئاڵ)، سەرکردە (لەقەب)، سوپا (هێزو دەسەڵات و لەشکر)] وڵات پێکدەهێنن [ئەمین، ٢٠٠٦، ١٩].

(٥) ئەم شیعرەی کانیی شاعیر لە دیوانەکەیدا نییە، بەڵکو لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لە بەرنامەی قەلەندەر خانەدا لە ڕۆژی (٢٠١٧/١١/١٩)و لە تەلەفزیۆنی (کوردستان/٢٤)دا بڵاوکرایەوە و لەلایەن ئەحمەد کانی کوڕەزای شاعیر خوێندرایەوە .

(٦) لە ساڵی (١٩٤٠) بەهەشتی گیوی موکریانی نامەیەکی بۆ مامۆستا خەلیلی موخلیس نووسیبوو بەم جۆرە: (جەنابی مەلا خەلیل لطفا، ئێوە چ کارەن ؟ وە لە کوێ دادەنیشن ؟ ئەگەر شیعری وەتەنیشتان هەیە بۆمانی ڕەوانە بفەرموون)، لە وەڵامدا مامۆستا موخلیس پاش سڵاو و ڕێز چوارینەکەی بۆ مامۆستا گیو نووسیبوو [موکریانی، ١٩٨٦، ٣٧]، ئەم زانیارییانە لە ساڵی (١٩٨٥) لە بەڕێز د . کوردستانی گیوی موکریانی وەرگیراون [ ئەحمەد، ١٩٩٧، ١٢٣] .

## سەرچاوەکان:

**یەکەم : بە زمانی کوردی :**

**أ : کتێب :**

١- ئاشنا، ئومێد، ٢٠٠٥، دیوانی بێکەس، چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، هەولێر .
٢- ئاگرین، عبداللـە، ١٩٨٨، دیوانی شوکری فەزڵی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، سلێمانی .
٣- ئەبریشەیی، عبدالله، ٢٠٠٦، نەتەوەخوازی، و : سەلاحەدین ئاشتی، چاپی یەکەم، شڤان، سلێمانی .
٤- ئەحمەد، ئەفراسیاب، ١٩٨٦، دیوانی ئەحمەد موختار جاف، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الادیب)، بەغداد . ٥- ئەمین، کاوە، ٢٠٠٦، ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر .
٦- ئوسمان، ئەمینێ، ١٩٩٠، مەم و زین، چاپا ئێکێ، مطبعة الجاحظ، بغداد .
٧- بێ دڵ، کەمال ڕێناس، ١٩٩٩، دیوانی بێ دڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر . ٨- بێخەو، مەدحەت، ٢٠١٣، دیوانی بێخەو، چاپی یەکەم، چاپخانەی : حاجی هاشم، هەولێر .
٩- خەزنەدار، مارف، ٢٠٠٥، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر .
١٠- خەزنەدار، مارف، ٢٠٠٦، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر .
١١- خەزنەدار، مارف، ٢٠٠٧، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر .
١٢- خۆشناو، ئەبوبەکر، ٢٠٠٢، شیعری بەرەنگاری کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕووناکبیری، سلێمانی.
١٣- دەشتی، ئەحمەد، ٢٠٠٣، دیوانی دەشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر .
١٤- دۆسکی، تحسین ئیبراهیم، ٢٠٠٥، دیوانا مەلایێ جزیری، چاپا دوێ، چاپخانا پەروەردێ، هەولێر .
١٥- رسول، شوکریە (دکتۆر)، ١٩٨٩، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، مطبعة (التعلیم العالي)، أربیل.
١٦- زێوەر، مەحموود، ٢٠٠٨، دیوانی زێوەر، چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، هەولێر.
١٧- شارەزا، کەریم،١٩٧٣، دیوانی بورهان جاهید، چاپی یەکەم، چاپخانەی حوادث، بەغداد .

١٨- شارەزووری، بێدار، ٢٠١٣، گوڵزاری شاعیرانی کورد، بەرگی یەکەم، چوارچرا، سلێمانی .
١٩- عەلائەدیــن، دلاوەر عەبــدولعەزیز (پرۆفیســۆر)، ٢٠١٣، نیشــتمان ســازی و سیســتەمی فەرمــانڕەوایەتی خۆمــاڵی لە هەرێمــی کوردســتان، چــاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر .
٢٠- علاءالدین، عبدالخالق، ١٩٨٥، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، طبع في مطابع (دار آفاق عربیة)، بغداد
٢١- فەلاح، کاکەی، ٢٠٠٤، دیوانی کاکەی فەلاح، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری، سلێمانی .
٢٢- فەیزی، گۆران سۆران، ٢٠٠٦، باری ئەدەبی کوردی لە شاری هەولێر لەنێوان ساڵانی ٩٣٥ - ١٩٥٨، چاپی یەکەم، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر .
٢٣- قاســملو، عبــدالرحمن، ١٩٧٣، کوردســتان و کــورد، و : عبــدالله حســن زادە، چاپخانەی (الجاحظ) بەغداد .
٢٤- قــانع، بورهــان، ٢٠٠٠، دیــوانی قــانع، چــاپی ســێیەم، ئۆفســێتی ســەرکەوتن، سلێمانی.
٢٥- کانی، موەفەق ئەکرەم،١٩٨٠، دیوانی کانی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغداد .
٢٦- مدرس، مەلا عبدالکریم، فاتح عبدالکریم، ١٩٧٦، دیواني نالي، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا .
٢٧- موکریانی، کوردستان (د.)، ١٩٨٦، کەشکۆڵی گیو، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، (مطبعة علاء)، بغداد .
٢٨- میران، سەردار حەمید و کەریم مستەفا شارەزا، ١٩٨٦، دیوانی حاجی قادری کۆیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الحوادث)، بغداد .
٢٩- هیرانــی، مــحەمەدی مەلا مســتەفای،٢٠١٣، دیــوانی میهــری، چــاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر
٣٠- هێمن، ٢٠٠٦، بارگەی یاران، سەرجەمی شیعری هێمن، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، هەولێر .

**ب : گۆڤار :**

٣١- ئەحــمەد، جەلال مەولــود، ١٩٩٧، بــاغی لاوان، شــاکاری مەزنــی مەلا خەلیلــی موخلیس، گۆڤاری رامان، ژمارە/١٧، تشرینی دووەم، ل : ١٢٣ .
٣٢- (پێشڕەو)، صباحی غالب ١٩٧٤، کورتە باسێکی هەستی نەتەوەیی لای شێخ رەزای تاڵەبانی، گۆڤاری بەیان، ژمارە /١٤، ل : ١٤.

٣٣- دزەیی، ئەحمەد چوکل ئاغا،١٩٤٠، خاکی کوردەواری، گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە/٤، ساڵی یەکەم، ل:٥٣
٣٤- رەسول، شوکریە (دکتۆر)، ١٩٧٩، کورتەیەک دەربارەی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی، گۆڤاری بەیان، ژ/٦٢، ل : ٣ .
٣٥- کاروانی، بەکر شاکر، ٢٠٠٠، مەلا ئەحمەدی جزیری سەرئامەدی شیعری سیاسیی کوردی، گۆڤاری مەتین، ژمارە/١٠٤، ل : ٥٤ .

**ج : نامەی ئەکادیمی :**

٣٦- ئاگرین، عبدالله عزیز، ١٩٩٤، شیعری سیاسی کوردی لە خوارووی کوردستان (١٩١٨-١٩٣٠)، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر، بەشی زمانی کوردی، هەولێر .
٣٧- ئیسماعیل، نەسرین رەئووف، ٢٠٠٧، ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردیدا ساڵانی١٩٢٠ - ١٩٥٨، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی کۆیە، بەشی زمانی کوردی، هەولێر .
٣٨- حەوێز، ماکۆک مەولود، ٢٠٠٨، لێکۆڵینەوەیەک لە شیعرەکانی هەژار، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردی مرۆڤایەتی، زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر، بەشی زمانی کوردی، هەولێر .

**د : فەرهەنگ :**

٣٩- رەشید، یوسف، ٢٠٠٣، فەرهەنگی ئەناهیتا، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، خانەی موکریانی، هەولێر.

**دووەم : بە زمانی عەرەبی :**

**ا- کتاب :**

٤٠- أحمد، جمال رشيد ٢٠٠٣، ظهور الكرد في التأريخ، جزء الأول، الطبعة الاولى، وزارة التربية، أربيل .
٤١- رسول، عزالدين مصطفى، ١٩٧٩، أحمدي خاني، شاعراً ومفكراً وفيلسوفاً ومتصوفاً، الطبعة الاولى، مطبعة الحوادث، بغداد .

**ب- گۆڤار :**

٤٢- شارەزا، كريم، ١٩٩٣، شعر المقاومة والشاعر الوطني : علي فتاح دزە يی، مجلة القافلة، العدد/١ .

**ملخص البحث**

## حب الوطن في شعر الشعراء الكلاسيكيين الكورد، (شعراء سهل أربيل) انموذجا:

في بداية النصف الثاني من القرن التاسع عشر وبضعف وانتهاء سلطة الامارات الكوردية، تعرض الادب الكوردي ومن ضمنه الشعر الكوردي الى حالة غير اعتيادية وجعلت الشعراء والكتاب يتوجهون الى الحياة السياسية والاجتماعية والاقتصادية لذلك الزمن، هذا من جانب ومن جانب آخر فقد اختاروا المسائل الوطنية والقومية في كتاباتهم للتخلص من تلك المآسي التي تعرضت لها امتهم، ومراعاة لتلك الحالة فقد كان هذا الامر لذلك الزمن أمراً ملفتا للنظر، لهذا جعل الشعر الكوردي يخطو خطوة أخرى نحو مرحلة جديدة من الادب ؛ ولكن نشوب الحرب العالمية الاولى كان سببا في اسراع استحداث أغراض شعرية وابداعية، وكان الشعراء الكورد بصورة عامة وشعراء سهل أربيل بصورة خاصة لهم دور في ذلك، والحديث عن دور كل شاعر في تلك المرحلة يحتاج الى حلقات ودراسات أدبية، ولهذا حاولنا في بحثنا هذا التركيز على بعض شعراء سهل أربيل وذلك لاعادة النظر في كتابة تاريخ الادب ودورهم فيها بصورة أكثر .

وان سبب اختيار بحثنا هذا يعود إلى عدم وجود معلومات كافية ومصادر معتمد حول بعض شعراء مدينه أربيل بصورة عامة وشعراء سهل أربيل بصورة خاصة، وكذلك عدم وجود دراسات علمية وأكاديمية حولهم، وكان ذلك بسبب عدم وجود ديوان مطبوع لهم وعدم الاهتمام بهم من قبل الكتاب والنقاد الكورد .

ويتكون البحث : من مبحثين، وكل مبحث يتكون من محورين، ففي المبحث الأول ومن محور الأول : حاولنا أن نعرض بعض تعاريف ومفاهيم ومصطلحات عن الفكر الوطني أو حب الوطن، أما في المحور الثاني فقد عرضنا تاريخ ل(حب الوطن، أو عاطفة حبه) في ألادب الكوردي بصورة عامة وعند الشعراء الكلاسيكيين بصورة خاصة، والمبحث الثاني الذي خصص ل(حب الوطن) عند شعراء أربيل، فقد قسم الى محورين، في المحور ألاول تحدثت عن (حب الوطن) عند شعراء مدينة أربيل بصورة عامة، وفي المبحث الثاني ألقيت الضوء على دور شعراء سهل أربيل وموقعهم في هذا الميدان مقارنة بنظرائهم من الشعراء الكورد في بقية أجزاء كوردستان بصورة خاصة .

## Abstract

The love of the homeland in poetry The poets of the Kurdish classics, (poets of Erbil plain) Growth:

At the beginning of the second half of the 19th century and with the end of the authority of the United Republic of Kurdistan, the Kurdish literature was subjected to a non-traditional role and made the poets and writers go to the political, social and economic life of their writings and on the other hand they chose the national and national side to get rid of the tragedies that have been exposed

But the first world war was caused by the rapid development of poetic and creative purposes. The Kurdish poets in general and the poets of Erbil in particular have a role in discussing and discussing the role of every poet who needs seminars and literary studies. In this research we tried to focus on some poets of Erbil To review the history of Kurdish literature and its role

And that the reason for choosing this research is due to the lack of sufficient information and reliable sources about some of the poets of Erbil in general and the poets Erbil in particular, and as a lack of scientific and academic studies about them, and was because of the absence of a printed paper for them, and lack of interest by the writers and critics .

This research consists of two topics, each research consists of two axes, in the first and the first axis. We tried to define my concept (emotion) or love in literature, after which we tried to present some terms of national thought. In the second axis, (Love of the homeland) in the Kurdish literature in general and at the poets classical in particular, and the second subject devoted to the (love of the homeland) when the poets of Erbil, was divided into two axes, in the first axis talked about (Love of the homeland) when the poets of the city of Erbil in general, In the second section, we highlight the role of poets in Erbil and their position in this field compared to their peers Poets of the Kurds.

# گونجانی تیۆری شێوازگەریی (بۆزیمان) بۆ ڕەخنەی شیعری نوێی کوردی شێوەی کوردیی ناوەڕاست

## لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی شێوازگەرییە

م.ی.محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم
پەیمانگای راهێنان و گەشەپێدانی پەروەردەیی- هەولێر

**پێشەکی:**

شێوازگەری وەک میتۆدێکی ڕەخنەیی، پێویستیی زۆری بە ئامراز و یاسای سەلمێنراو هەیە بۆ پێوانەکردنی زمان و شێوازی شیعر. ئەمەش چونکە ئەو میتۆدە لەسەر بنەمای خوێندنەوەی ئاماری و مامەڵەکردن لەگەڵ ژمارە بنیادنراوە.

یەکێک لەو تیۆرانەی بە ئامار و ژمارە مامەڵە لەگەڵ زمان و شێوازی دەق دەکات، تیۆریی زانای ئەڵمانی (بۆزیمان)ە. تیۆرەکە ڕادەی هەڵچوون و سۆز لە زمانی دەق دەپێوێت، لەو ڕوانگەیەشەوە بڕیار لەسەر ڕادەی شیعرێتیی دەقەکە دەدات.

گرنگیی لێکۆڵینەوەکە: ساغکردنەوەی ڕادەی گونجانی ئەم تیۆرە بۆ زمانی ئەدەبیی کوردی، کارێکی گرنگە، چونکە لە ڕەخنەی ئەدەبیی کوردیدا بۆ لێکۆڵینەوەی شێوازناسی زیاتر پەنا براوەتە بەر هونەرەکانی ڕەوانبێژی و باسی چەشەی دەق و سەلیقەی شاعیر. لەکاتێکدا لێکۆڵینەوەکانی بواری شێوازگەری، پێویستییان بە کەرستەی زانستیی زۆر هەیە تا مەبەستە زمانییەکان بە شێوەی ئاماری دەرببڕن. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ ساغکردنەوەی ڕادەی گونجانی تیۆرەکە لەگەڵ زمانی ئەدەبیی کوردی شێوەی کوردیی ناوەڕاست. ئەگەر گونجانی تیۆرەکەش بۆ زمانی کوردی بسەلمێت، ئەوا کاری ڕەخنەی شێوازگەریی کوردی بە بەکارهێنانی تیۆرەکە بەرەو پێشەوەتر دەڕوات.

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە: بەپێی ئەو هۆکارانەی بۆزیمان دەستنیشانی کردوون، دەقی شیعریی شاعیران خراوەتەڕوو، پاشان هاوکێشەی بیرکارییانەی بۆزیمان لەسەر

هەردەقێک جێبەجێ کراوە. دواتر تێکڕای ئەنجامەکان دەرکراوە، ئینجا ئەنجامەکان لەکاتی پێویستدا بەراوردکراون.

گرفتەکانی لێکۆڵینەوە: گرفتی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەڵبژاردنی نموونە کردارییەکانییەتی. چونکە پێویستە هەر شاعیرێک لە شاعیرەکان، هەم نووسینی پەخشانی هەبێت و هەم شیعریشی زۆر بێت. ئینجا دەبێت شیعرەکانی دابەشی سەر ماوەیەکی دووروودرێژ بووبن، بۆئەوەی کاریگەریی تەمەن بە وردی ڕوون ببێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە شاعیرانێکمان هەڵبژاردووە کە هیچ نەبێت ماوەی (٣٥)ساڵێکی تەمەنیان شیعری چاپکراویان هەبێت. پاشان بۆ کاریگەریی ڕەگەز، بەدوای ئەو شاعیرە ئافرەتانەدا گەڕاوین کە شیعرەکانیان دەربڕینێکی ئافرەتانەی هەیە و بە نەفەسێکی ژنانە نووسراون. ئەوانیش ژمارەیان کەمە و زۆرجار هەمان شاعیر چەند دەقێکی ژنانەی هەیە و دەقەکانی تری لە نووسینی پیاوانەوە نزیکن. بۆیە هەوڵی ئەوپەڕی وردبوونەوەمان داوە لە دەقەکان، ئینجا هەڵمانبژاردوون.

لێکۆڵینەوەکانی پێشووتر: تا نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لێکۆڵینەوەی تایبەتی بۆ ساغکردنەوەی ڕادەی گونجانی تیۆری شێوازناسیی بۆزیمان لەگەڵ زمانی کوردی ئەنجام نەدراوە. تەنیا وەک هاوکێشەیەکی پراکتیکیی سەلمێنراو سوودی لێ بینراوە.

پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە: لێکۆڵینەوەکە کراوەتە دوو بەش. بەشی یەکەم ناساندنی تیۆرەکە و ڕێکارەکانی گونجاندنییەتی لەگەڵ زمانی کوردیدا. بەشی دووەم جێبەجێکردنی تیۆرەکەیە لەسەر شیعری کوردیی شێوەی کوردیی ناوەڕاست.

## بەشی یەکەم

## "ناساندنی تیۆری (بۆزیمان) و ڕێکارەکانی گونجاندنی لەگەڵ زمانی کوردیدا"

### ١-١ پوختەی تیۆری بۆزیمان [1] :

ئەم تیۆرییە و هاوکێشەکەی، سەرەتا لە بواری زمانەوانی دەروونی بۆ پێوانەی ڕادەی هەڵچوون و هاوسەنگیی سۆزداری کاری پێکراوە. بۆزیمان لە ساڵی (١٩٢٥) بۆ پێوانەی ئاستی ئەدەبی زمانی دەق بەکاری هێنا. تیۆرەکە لەسەر بنەمای زمانی ئەڵمانی دانراوە. لە زمانەکانی تردا گرفتی هەیە و هەر زمانێک بۆ ڕێزمانی خۆی، هەلومەرجی کرداریی بۆ داناوە و گونجاندوویەتی.

(بۆزیمان) پێی وایە دەتوانین دەقی ئەدەبی لە جۆرەکانی تری دەق جیا بکەینەوە بە بەراوردکردنی ڕێژەی (دەربڕین بە ڕووداو) بەرانبەر ( دەربڕین بە وەسف)، واتا پێوانەی ڕێژەی ڕووداو بۆ ڕێژەی وەسف لەناو دەقەکەدا. بەپێی تیۆرەکە، تا ژمارەی دەربڕینی ڕووداو لە وەسفکردن زۆرتر بێت، زمانی دەقەکە سۆز و هەڵچوونی زیاتر تێدایە. بەمەش ڕادەی ئەدەبیبوونی دەقەکە زیاترە.

بە بۆچوونی بۆزیمان، سێ هۆکار دەبنە هۆی بەرزیی ئەو ڕێژەیە:

١- شیعرێتی زمانی دەق: تا شیعرێتی زمانی دەق زۆرتر بێت، ڕێژەکە بەرزتر دەبێت. دەقی شیعری گۆرانی، بەرزترین ڕێژەی هەیە، دواتر جۆرەکانی دیکەی شیعر. وەک شیعری شانۆیی و شیعری داستان و .....تاد. لەدوای شیعر، ئینجا دەقی پەخشان دێت، پاشان قسەکردنی ئاسایی.

٢- تەمەن : تا تەمەنی شاعیر بچووکتر بێت، ڕێژەکە بەرزترە. هەرچەندیش تەمەنی شاعیر هەڵکشێت، ڕێژەکە لە نووسینەکانیدا دادەبەزێت.

٣- ڕەگەز : لە هەمان جۆری دەقدا، ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لای ئافرەتان زۆرترە لەچاو پیاواندا. واتا لە دەقێکی شیعریی گۆرانیدا، ئەو شیعرەی شاعیرەکەی ئافرەتە، ڕێژەکەی بەرزترە لەچاو ئەو شیعرە گۆرانییەی شاعیرەکەی پیاوە.

ئەم تیۆرە لە زمانی عەرەبیدا لەلایەن (د. سعد مصلوح) کاری لەسەر کراوە، کتێبێکی لەم بارەیەوە بەناوی (الاسلوب) نووسیوە. دوای ئەو، لێکۆڵەرەکانی تر لەسەر هەمان بنەمای کارکردنی ئەو ڕۆیشتوون و تیۆرەکەیان لەسەر دەقی تر جێبەجێ کردووە.[2]

**٢-١ ڕێکارەکانی گونجاندنی تیۆرەکە لەگەڵ ڕێزمانی کوردی:**

تیۆری بۆزیمان لە زمانەکانی تردا، لەسەر زۆر جۆری جیاوازی دەقی ئەدەبی (جۆرەکانی پەخشان و شیعر) پەیڕەو کراوە. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنیا شیعر هەڵدەبژێرین. ئەمیش چونکە بەشێکی هەرە سەرەکی تیۆرەکە پەیوەندی بە شیعرێتیی زمانەوە هەیە. کاتێکیش کە لەسەر دەقی پەخشان پەیڕەو کراوە، لە ڕادەی شیعرێتیی زمانی پەخشانەکە کۆڵراوەتەوە.

ڕێکارەکانی گونجاندنی تیۆرەکە لەگەڵ زمانی کوردی، لەم تەوەرانەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە:

**١-٢-١ دەربڕینی (ڕووداو) لە زمانی کوردیدا:**

لە زمانی کوردیدا دەربڕینی ڕووداو بە بەکارهێنانی (کار) دەکرێت. کاریش تەواو و کاری ناتەواوی هەیە. کاری تەواو واتای کات و ڕووداوی تێدایە. بەڵام کاری ناتەواو لە هەموو بارێکدا ڕووداوی تێدا نییە. کاری ناتەواو لە هەندێ بار، لەجیاتی گەیاندنی ڕووداو، ئەرکی (وەسفکردن) لە کاتێکی دیاریکراو دەداتە پاڵ کەسێک یان شتێک.

بەگشتی کاری ناتەواو لە شێوەکانی ( ە ، بوو ، دەبێت ) بەپێی دەم و دۆخە جیاوازەکان دەردەکەوێت. بۆنموونە:

ئەو کوڕە زیرەکە. ( ە : کاری ناتەواو بۆ کاتی ئێستا)[٣] .

منداڵەکە گەورە دەبێت. ( دەبێت : کاری ناتەواو بۆ کاتی ئایندە).

گوڵەکە سیس بوو. ( بوو : کاری ناتەواو بۆ رابردوو).

کاری ناتەواوی کاتی ئێستا، هەمووجار ڕووداوێک ڕاناگەیەنێت، پشت بە تەواوکەرەکەی دەبەستێت. ئەگەر تەواوکەرەکەی ( ناو ، جێناو ، چاوگ ، جێناوی پرس) بوو، ئەوا ڕووداو دەگەیەنێت. وەک:

ئەو کوڕە برامە. ( ە : کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا، ڕستەکەش بەگشتی ڕووداوێکی گەیاندووە)

بەڵام ئەگەر تەواوکەرەکەی (هاوەڵناوی چۆنییەتی، هاوەڵناوی پرس ) بوو، ئەوا ڕستەکە بەگشتی وەسفی بکەرەکەی دەکات. وەک:

ئەو کوڕە زیرەکە.

کاری ناتەواوی ڕابردوو و ئایندە، دەکرێت وەک کارێکی لێکدراوی تێنەپەڕ دابنرێن . ئەوکات دەچێتە ڕیزی کارە تەواوەکانەوە. وەک ( سیس بوون ، گەورەبوون ، .... ) [٤].

بەگشتی، لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەگەر کاری ناتەواو مەبەستی وەسفکردنی دروستکرد، لەگەڵ هاوەڵناو دەژمێردرێت. ئەگەر وەسفیشی دروست نەکرد، لەگەڵ کار دەژمێردرێت.

بۆیە :

- لە هاوکێشەکەدا، کاری ناتەواو بەپێی تەواوکەرەکەی مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. ئەگەر تەواوکەرەکەی وەسفکردنی دروست نەکرد، ڕاستەوخۆ لەگەڵ کاری تەواو دایدەنێین. ئەگەر وەسفیشی دروستکرد، بەجیا دەینووسین و دواتر لەگەڵ هاوەڵناوەکان کۆیان دەکەینەوە.
- هەموو جۆرەکانی کاری تەواو لە دەقەکەدا دەژمێرین.
- هەرجۆرێکی کار بەهۆی دووبارەبوونەوەوە کەوتبێت (کرتابێت)، لە هاوکێشەکەدا ژمێردراوە.

**٢-٢-١- وەسف لە زمانی کوردیدا:**

لە زمانی کوردیدا کەرەستەی سەرەکیی وەسفکردن، هاوەڵناوی چۆنییەتییە. پاشان کەرەستەی تر بۆ وەسفکردن بەکاردێن، وەک پاڕستەی هاوەڵناوی[٥] و (هاوەڵناوی نادیار و هاوەڵناوی ژمارەیی و هاوەڵناوی نیشانە)[٦] و کەرەستەکانی فراوانکردنی سەرەی گرێ و .....تاد.

ئێمە لەو کارەدا تەنیا هاوەڵناوی چۆنییەتی وەردەگرین. چونکە لە زمانەکانی تر هەمان گرفت هەیە و سەرنجی ئەو مەسەلەیە دراوە. بۆیە لێکۆڵەرانی شێوازناسی هاوزەمانی بۆزیمان، لەجیاتی ڕووداو، (کار) یان هەڵبژارد و لەجیاتی وەسفکردنیش (هاوەڵناوی چۆنییەتی) یان هەڵبژارد. دانەکانی تری وەسفکردنیان فەرامۆش کردووە. هەروەها دانەی وەک (چاوگ) کە ڕووداو دەگەیەنێت بەڵام کار نییە، ئەویش فەرامۆش کراوە، چونکە لە ڕووی ڕێزمانەوە وەک ناو ڕەفتار دەکات.

کەوابێ هاوکێشە ی بیرکارییانەی تیۆرەکە، بەم جۆرە دەنووسرێت :

( ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو )

## بەشی دووەم
## "جێبەجێکردنی تیۆری بۆزیمان
## لە شیعری کوردیی شێوەی کوردیی ناوەڕاستدا"

ئەم تیۆرە بە هەرسێ هۆکارەکەیەوە، شیعرێتیی زمان و تەمەنی شاعیر و ڕەگەزی شاعیر، لەم باسانەی خوارەوە جێبەجێ دەکرێت:

**١-٢- هۆکاری ڕادەی شیعرێتیی زمانی دەق:**

لە تاقیکردنەوەی ئەم هۆکارەدا، دوو شاعیر ( گۆران ، هێمن ) وەک ئەزموون وەردەگرین. بۆ هەر یەکێک لەم شاعیرانە دەقێکی پەخشان و دەقێکی شیعر وەردەگرین، پەخشانەکەی هەر یەکەیان، لەگەڵ شیعرەکەی بەراورد دەکەین. ئەگەر ڕێژەکە لە شیعرەکەدا بەرزتر بوو، ئەوا گونجانی تیۆرەکە لەگەڵ زمانی ئەدەبیی کوردی دەسەلمێنێت.

**١-١-٢- ئەزموونی ( گۆران ) :**

**١-١-١-٢- دەقی پەخشان : پێشەکیی بەهەشت و یادگار**(٧) :

لەم دەقەدا ژمارەی کار و هاوەڵناو بەم جۆرەن:

کاری تەواو: ٣١

کاری ناتەواو : ١٠

هاوەڵناو: ٣٢

وەک باس کرا، کارە ناتەواوەکان بەگشتی وەسفی بکەری ڕستە دەکەن، بۆیە لەگەڵ هاوەڵناوی چۆنییەتی کۆیان دەکەینەوە. بەمەش ژمارەی هاوەڵناو دەبێتە (٤٢).

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٣١ ÷ ٤٢ = ٠,٧٣

**٢-١-١-٢- دەقی شیعر:** شیعری ( بۆ جوانی سەرەڕێ)(٨) لە بەرهەمی بەهەشت و یادگاردا:

کاری تەواو: ٢٣

کاری ناتەواو: ٢

هاوەڵناو: ٨

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٠

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٣ = ١٠ ÷ ٢٣

وەک دیارە، لە پەخشانەکەدا ڕێژەکە (٠،٧٣) بوو، لە شیعرەکەدا ڕێژەکە (٢،٣) یە. بەو پێیە، تیۆرەکە لە ئاست ئەم ئەزموونەدا لەگەڵ زمانی ئەدەبیی کوردی گونجاوە.

**٢-١-٢- ئەزموونی ( هێمن ) :**

**١-٢-١-٢- دەقی پەخشان:** پێشەکیی تاریک و ڕوون[9] ( تەنیا بەشی کۆتایی پێشەکییەکە وەرگیراوە کە وەک پارچە پەخشانێکی سەربەخۆ دەردەکەوێت و لە -٢٦١- وشە پێکدێت).

کاری تەواو: ٤٤

کاری ناتەواو: ١٩

هاوەڵناو: ٢٤

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٢٤+ ١٩ = ٤٣

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٠٢ = ٤٣ ÷ ٤٤

**٢-٢-١-٢- دەقی شیعر: شیعری ( عیشق و ئازادی )**[10] :

کاری تەواو: ٣٥

کاری ناتەواو: ٧

هاوەڵناو: ١٢

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٧+ ١٢ = ١٩

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٨٤ = ١٩ ÷ ٣٥

لە ئەزموونی دووەمیشدا، تیۆرەکە پشتڕاست بوویەوە لەگەڵ ئەوەی جیاوازی ڕێژەکە لە نێوان دەقی پەخشان و دەقی شیعرەکەدا کەمە.

کەمیی جیاوازییەکە بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە:

- زمانی پەخشان و زمانی شیعری لای هێمنی شاعیر، لەیەکترەوە نزیکن. هەم پەخشانەکانی بە زمانێکی دەوڵەمەند دەنووسێت و هەم شیعرەکانی بە زمانێکی سادە دەنووسێت. بۆیە زمانی پەخشانەکانی لە زمانی ئاسایی پەخشان باڵاترە و زمانی

شیعرەکانیشی زمانێکی سووک و ڕەوانە. ئەمەش وایکردووە ڕێژەی هەردوو هونەرەکە لەیەکتری نزیک بن.

- ئێمە بەشێکی کەمی پەخشانەکەمان وەرگرتووە، ڕەنگە ئەگەر هەموو پەخشانەکە وەرگیرابا، ئەو ڕێژەیە جیاواز با و زیاتر لە بەرژەوەندیی گونجانی تیۆرەکە دەردەکەوت.

- هێمن لە شیعر و پەخشانەکانیدا، کاری ناتەواو زۆر بەکاردێنێت و زۆرینەی ڕستەکانی ڕستەی وەسفین. ئەمەش دەبێتە هۆی لەیەکتر نزیکبوونەوەی ژمارەی کار و هاوەڵناوەکان. بەمەش ڕێژەکان لەیەکتری نزیک دەبنەوە.

وەک لە هەردوو ئەزموونەکەدا ڕوون بوویەوە، تیۆرەکە لە بڕگەی یەکەمیدا (ڕادەی شیعرێتیی زمانی دەق) لە ئەدەبی کوردیدا، دەکرێت ببێتە پێوەر بۆ ڕادەی شیعرێتیی زمانی دەقێک.

**٢-٢- هۆکاری تەمەنی شاعیر:**

بەپێی تیۆری بۆزیمان، تا تەمەنی شاعیر بچووکتر بێت، ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لە دەقەکەدا بەرزتر دەبێت. بۆ تاقیکردنەوەی ئەو بۆچوونە، پێنج شاعیر وەردەگرین لە هەمان ڕەگەز بن، بۆئەوەی کاریگەریی جیاوازیی ڕەگەز نەهێڵین. بۆ هەر شاعیرێک سێ بەرهەمی قۆناغی جیاجیای تەمەنی شاعیریەتی وەردەگرین. دەقێکی سەرەتاکانی شاعیریەتی، دەقێکیش لە ناوەڕاستی تەمەنی شاعیریەتی، دەقێکیش لە کۆتا نووسینەکانی. ئەگەر ڕێژەکان زانیارییان وەک پێویست نەگەیاند، ئەوا دەقی چوارەم و پێنجەمیش وەردەگرین. ئەو شاعیرانەش :

( گۆران، هێمن، نەوزاد ڕەفعەت، جەلال بەرزنجی، سەباح ڕەنجدەر ) ن.

**١-٢-٢- ئەزموونی یەکەم لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر)، گۆران:**

**دەقی یەکەم:** شیعری (هەوری پایز)[١١]، لەساڵی (١٩٣٣) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢٥

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٢٢

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٢٢

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ١٣ = ٢٢ ÷ ٢٥

**دەقی دووەم:** شیعری ( بۆ جوانی سەرەڕێ): ئەم دەقە لە کۆمەڵە شیعری بەهەشت و یادگارە و ئەم کۆمەڵە شیعرە لە ساڵی (١٩٥٠) چاپ کراوە.

کاری تەواو: ٢٣

کاری ناتەواو: ٢

هاوەڵناو: ٨

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٠

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٣ = ١٠ ÷ ٢٣

**دەقی سێیەم:** شیعری (نەورۆز)[١٢] ساڵی نووسینی (١٩٦٠):

کاری تەواو: ١٩

کاری ناتەواو: ٢

هاوەڵناو: ٣

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٣, ٨ = ٥ ÷ ١٩

دوای وەرگرتنی سێ دەق، ژمارەکان پێچەوانەی ئەوەیە کە لە تیۆرەکەدا هەیە. بۆیە دەقی چوارەمیش لە کۆتایی تەمەنی شاعیر وەردەگرین.

**دەقی چوارەم:** شیعری (وەڵامی پرس)[١٣] لە (١٩٦٢) نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٢

کاری ناتەواو: ٤

هاوەڵناو: ٤

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٨

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٥ = ٨ ÷ ١٢

پاش وەرگرتنی دەقی چوارەم، ڕێژەکان بەپێی ساڵ بەم چەشنە دەرکەوتن:

دەقی یەکەم ، ساڵی (١٩٣٣) ، ڕێژە (١٣, ١)

دەقی دووەم ، ساڵی (١٩٥٠) ، ڕێژە (٣, ٢)

دەقی سێیەم ، ساڵی (١٩٦٠) ، ڕێژە (٨, ٣)

دەقی چوارەم ، ساڵی (١٩٦٢) ، ڕێژە (٥, ١)

تێکڕای ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لە شیعرەکانی گۆران دەکاتە: ( ١٨ ,٢)

وەک لە ژمارەکاندا دەردەکەوێت، ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو بەپێی گەورەبوونی تەمەنی شاعیر لە زۆربووندایە. ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونی بۆزیمانە. تەنیا لە ساڵی کۆتایی تەمەنیدا ڕێژەکە دێتە خوارەوە. ئەمەش هۆکارەکەی تەمەن نییە، چونکە ئەگەر تەمەن کاریگەری هەبا، دەبوایە لە دەقەکانی تر جیاوازییەکە پێچەوانەی ئێستا بێت. بە بۆچوونی ئێمە، کەمبوونەوەی ڕێژەکەی لە دەقی چوارەمدا هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو شیعرە وەسفی میهرەبانی و جوانیی زیاتر تێدایە، چونکە شاعیر لە نەخۆشخانە بەرانبەر پەرستارێکی میهرەبان نووسیویەتی.

کەواتە بۆچوونەکەی بۆزیمان لەبارەی تەمەنی شاعیرەوە، لەگەڵ ئەزموونی (گۆران) ساغ نەبوویەوە.

**٢-٢-٢- ئەزموونی دووەم لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر): هێمن :**

**دەقی یەکەم:** شیعری ( کوردم ئەمن) [١٤] لە ساڵی (١٣٢١ک.هەتاوی — ١٩٤٢ز) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٧

کاری ناتەواو: ٥

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٠

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٠,٧ = ١٠ ÷ ٧

**دەقی دووەم :** شیعری (کیژی لادێ) [١٥] لەساڵی (١٣٢٤ک.هەتاوی — ١٩٤٥ز) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٩

کاری ناتەواو: ١٠

هاوەڵناو: ١٤

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٢٤

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٠,٧٩ = ٢٤ ÷ ١٩

**دەقی سێیەم :** شیعری (ماچی شیرین) [١٦] لەساڵی (١٣٣٨ک.هەتاوی-١٩٥٩ز) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٨

کاری ناتەواو: ٤

هاوەڵناو: ٧

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١١

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١٨ ÷ ١١ = ١, ٦٣

**دەقی چوارەم :** شیعری (بەرەو ئاسۆ) [١٧] لەساڵی (١٩٧٥ز ) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٣٣

کاری ناتەواو: ١١

هاوەڵناو: ٣

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٤

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٣٣ ÷ ١٤ = ٢, ٣٥

دەقی پێنجەم : شیعری (شین گێڕی) [١٨] لەساڵی (١٩٨٤ز) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٤٧

کاری ناتەواو: ١٤

هاوەڵناو: ١٢

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٢٦

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٤٧ ÷ ٢٦ = ١, ٨

دوای وەرگرتنی پێنج دەقی شیعری (هێمن)، ڕێژەکان بەپێی ساڵ بەم چەشنە دەرکەوتن:

دەقی یەکەم ، ساڵی (١٩٤٢) ، ڕێژە (٠, ٧)

دەقی دووەم ، ساڵی (١٩٤٥) ، ڕێژە (٠, ٧٩)

دەقی سێیەم ، ساڵی (١٩٥٩) ، ڕێژە (١, ٦٣)

دەقی چوارەم ، ساڵی (١٩٧٥) ، ڕێژە (٢, ٣٥)

دەقی پێنجەم ، ساڵی (١٩٨٤) ، ڕێژە (١, ٨)

تێکڕای ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لە شیعرەکانی هێمن دا دەکاتە: ( ١, ٤٥ )

دیارە لە چوار دەقی یەکەمدا ڕێژەکە لە هەڵکشاندایە. ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونەکەی بۆزیمانە. لە دەقی پێنجەمدا نزمبوونەوەیەکی ڕێژەیی ڕوویداوە، بەڵام بایەخی ئاماریی نییە، چونکە هێشتا زۆر زیاترە لە ڕێژەی یەکەمین شیعرەکانی سەرەتای شاعیریەتی.

سەرنجێکی تر لە شیعرەکانی هێمن دا ئەوەیە: ڕێژەکە لە هەندێ لە شیعرەکانیدا لە ژمارە (یەک) کەمترە، ئەمیش واتا کاری کەمتر بەکارهێناوە لە چاو هاوەڵناو. ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونی بۆزیمانە، چونکە بەو پێیە بێت، زمانی دەقەکە هەڵچوونی تێدا نییە، کەچی دەقەکەش شیعرە.

کەواتە بۆچوونەکەی بۆزیمان لەبارەی تەمەنی شاعیر، لەگەڵ ئەزموونی (هێمن) پشتڕاست نەبوویەوە.

**٣-٢-٢- ئەزموونی سێیەم لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر): نەوزاد ڕەفعەت:**

**دەقی یەکەم** : شیعری (بینین) [19] لەساڵی ( ١٩٦٦) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢١

کاری ناتەواو: ٤

هاوەڵناو: ١١

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٤ = ١٥ ÷ ٢١

**دەقی دووەم:** شیعری (مەرگ لە زامی مندا دەڕوێت )[20] لەساڵی ( ١٩٧٤)دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢٩

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٦

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٦

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٤, ٨٣ = ٦ ÷ ٢٩

**دەقی سێیەم :** شیعری (مەهاباد)[٢١] لەساڵی (١٩٨٠) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١١

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ١

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١١ ÷ ١ = ١١

**دەقی چوارەم:** شیعری ( باڵ گرتنەوە ) [٢٢] لەساڵی ( ١٩٩٠) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٣

کاری ناتەواو: ٣

هاوەڵناو: ٧

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٠

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١٣ ÷ ١٠ = ١, ٣

**دەقی پێنجەم:** شیعری ( پەڕەمووچەی سیمرخ)[٢٣] لەساڵی ( ٢٠٠٢) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٨

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١٨ ÷ ٥ = ٣, ٦

دوای وەرگرتنی پێنج دەقی شیعری (نەوزاد ڕەفعەت)، ڕێژەکان بەپێی ساڵ بەم چەشنە دەرکەوتن:

دەقی یەکەم ، ساڵی (١٩٦٦) ، ڕێژە ( ١, ٤)

دەقی دووەم ، ساڵی (١٩٧٤) ، ڕێژە ( ٤, ٨٣)

دەقی سێیەم ، ساڵی (١٩٨٠) ، ڕێژە ( ١١)

دەقی چوارەم ، ساڵی (١٩٩٠) ، ڕێژە (١, ٣)

دەقی پێنجەم ، ساڵی (٢٠٠٢) ، ڕێژە ( ٣, ٦)

تێکڕای ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لە شیعرەکانی نەوزاد ڕەفعەت دەکاتە: (٤, ٤٢)

وەک لە ڕێژەکاندا ڕوون دەبێتەوە، سێ ڕێژەی یەکەم پێچەوانەی بۆچوونی بۆزیمانە، بەڵام لە ڕێژەی سێیەم بۆ چوارەم و سێیەم بۆ پێنجەم دابەزینی بەرچاو هەیە. کەچی لە ڕێژەی چوارەمەوە بۆ پێنجەم دووبارە بەرزبوونەوە ڕوودەداتەوە، بەمەش بۆچوونەکەی بۆزیمان لەبارەی تەمەنی شاعیرەوە، لەگەڵ ئەزموونی (نەوزاد ڕەفعەت) پشتڕاست نەبوویەوە.

**٤-٢-٢- ئەزموونی چوارەم لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر): جەلال بەرزنجی:**

**دەقی یەکەم:** شیعری (ئارەزوویەکی کۆن)[٢٤] لەساڵی (١٩٦٩) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٧

کاری ناتەواو: ٣

هاوەڵناو: ٠

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٣

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٣ = ٣ ÷ ٧

**دەقی دووەم:** شیعری (سرووودی ئاوابوون) [٢٥] لەساڵی (١٩٨١)[٢٦] دا بڵاوکراوەتەوە:

کاری تەواو: ٢٢

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٨

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٨

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٧٥ = ٨ ÷٢٢

**دەقی سێیەم:** شیعری (شەڕ) [٢٧] لەساڵی ( ١٩٩٣) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢٩

کاری ناتەواو: ٩

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٤

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٠٧ = ١٤ ÷ ٢٩

**دەقی چوارەم:** شیعری (چوومەوە پایز)[٢٨] لەساڵی ( ٢٠٠٨) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢٢

کاری ناتەواو: ١

هاوەڵناو: ٢

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٣

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٧, ٣٣ = ٣ ÷ ٢٢

دوای وەرگرتنی چوار دەقی شیعری ( جەلال بەرزنجی )، ڕێژەکان بەپێی ساڵ بەم چەشنە دەرکەوتن:

دەقی یەکەم ، ساڵی ( ١٩٦٩) ، ڕێژە ( ٣ ,٢)

دەقی دووەم ، ساڵی ( ١٩٨١) ، ڕێژە ( ٧٥ ,٢)

دەقی سێیەم ، ساڵی ( ١٩٩٣) ، ڕێژە ( ٠٧ ,٢)

دەقی چوارەم ، ساڵی ( ٢٠٠٨) ، ڕێژە ( ٣٣ ,٧)

تێکرای ڕێژەی شیعرەکانی جەلال بەرزنجی دەکاتە: ( ٦١ ,٣)

وەک دیارە بە شێوەیەکی گشتی سێ ڕێژەی یەکەم لای جەلال بەرزنجی لەیەکتری نزیکن. لە یەکەمەوە بۆ سێیەم بەرزبوونەوە هەیە و لە سێیەمدا نزمبوونەوە بە ڕێژەیەکی کەم هەیە. ئەم بەرزبوونەوەیە پێچەوانەی بۆچوونەکانی بۆزیمانە لە بارەی تەمەنی شاعیرەوە.

ئەوەی لە ڕێژەی چوارەمی شیعرەکانی جەلال بەرزنجی دەدیترێت، بەرزبوونەوەیەکی زۆر بەرچاوی ڕێژەکەیە کە لە ئەزموونی پێشتری ئەو ڕێژەیە بەو چەشنە لەناکاوە بەرز نەبووەتەوە. بەمەش بەتەواوی لە بۆچوونی بۆزیمان دوور دەکەوێتەوە.

کەواتە بۆچوونی بۆزیمان لەبارەی تەمەنی شاعیرەوە، لەگەڵ ئەزموونی جەلال بەرزنجی پشتڕاست نەبوویەوە.

**٥-٢-٢- ئەزموونی پێنجەم لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر): سەباح ڕەنجدەر:**

**دەقی یەکەم:** شیعری ( زێوان ) [٢٩] پارچەی دووەم، لەساڵی (١٩٨٣) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٨٥

کاری ناتەواو: ١٣

هاوەڵناو: ٢٢

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٣+ ٢٢ = ٣٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٤٢ = ٣٥ ÷ ٨٥

**دەقـــی دووەم:** پـــارچەی ژمـــارە (٢٠) لە شـــیعری (مەرگی ئـــاوێنە)[٣٠] لەساڵی (١٩٩٣) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٢٦

کاری ناتەواو: ١

هاوەڵناو: ١٧

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ١٨

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٤٤ = ١٨ ÷ ٢٦

**دەقـی سـێیەم:** پـارچەی ژمـارە (١٩) لە شـیعری ( بلـیمەت )[٣١] لەسـاڵی (٢٠٠٣) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٥

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٩

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٩

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١, ٦٦ = ٩ ÷١٥

**دەقـی چـوارەم:** شـیعری ژمـارە (١٦٦)[٣٢] لە دیوانی (سـاڵی سـفر) لەسـاڵی (٢٠٠٩) دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ١٤

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢, ٨ = ٥ ÷ ١٤

**دەقی پێنجەم:** شیعری (بەرەو ساکاربوونەوە)[٣٣] لەساڵی (٢٠١٣)دا نووسیویەتی:

کاری تەواو: ٣٨

کاری ناتەواو: ٢

هاوەڵناو: ١

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٣

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١٢, ٦ = ٣ ÷ ٣٨

دوای وەرگرتنی پێنج دەقی شیعری ( سەباح ڕەنجدەر )، ڕێژەکان بەپێی ساڵ بەم چەشنە دەرکەوتن:

دەقی یەکەم ، ساڵی ( ١٩٨٣) ، ڕێژە (٢, ٤٢)

دەقی دووەم ، ساڵی ( ١٩٩٣) ، ڕێژە ( ١, ٤٤)

دەقی سێیەم ، ساڵی (٢٠٠٣) ، ڕێژە ( ١, ٦٦)

دەقی چوارەم ، ساڵی (٢٠٠٩) ، ڕێژە (٢, ٨)

دەقی پێنجەم ، ساڵی (٢٠١٣) ، ڕێژە ( ١٢, ٦)

تێکڕای ڕێژەی شیعرەکانی سەباح ڕەنجدەر دەکاتە: (٤, ١٨٤)

وەک لە ڕێژەکانـدا دیـارە، دە سـاڵی دووەم لەچـاو دە سـاڵی یەکەم نـزم بووەتەوە، ئەمەش لەگەڵ بۆچوونی بۆزیمـان دەگونجێت. بەڵام لە ڕێـژەی سـێیەمەوە بەرزبوونەوە بەردەوامە تا لە ڕێژەی پێنجەم و دوای سی ساڵ شیعر نووسین، ڕێژەکە دەگاتە بەرزییەکی نائاسایی.

بۆیە دەڵێین: بۆچوونی بۆزیمان لەبارەی تەمەنی شـاعیرەوە، لەگەڵ ئەزمـوونی سەباح ڕەنجدەر پشتڕاست نەبوویەوە.

بەگشتی : ( هەر پێـنج ئەزمـوونەکە ئەوەیـان سـەلماند کە بۆچـوونی بۆزیمـان لەبارەی ژیانی شـاعیرەوە بـۆ شـیعری کـوردیی شـێوەی کـوردیی ناوەڕاسـت، گونجـاو نییە).

**٣-٢- هۆکاری ڕەگەزی شاعیر:**

بۆزیمان پێی وایە لە هەمان جۆری دەقدا، ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لای ئافرەتان زۆرترە لەچاو پیاواندا.

بـۆ تـاقیکردنەوەی ئەم هۆکـارە، دەقـی شـیعری پێـنج شـاعیری ئـافرەت[٣٤] وەردەگرین. بەراوردی ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناوی دەقەکـان لەگەڵ ئەو دەقـانە دەکەیـن

کە لە ئەزموونەکانی پێشوودا سوودمان لێ وەرگرتن. پاشان بڕیار لەسەر ڕادەی گونجانی بۆچوونەکە لەگەڵ شیعری کوردیدا دەکەین.

**١-٣-٢- شیعری (وەشان) [٣٥] ی (نیگار نادر):**

کاری تەواو: ٥١

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٣

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٣

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

١٧ = ٣ ÷ ٥١

**٢-٣-٢- شیعری (دوورم کەرەوە لە با) [٣٦] ی (تیشکە محەمەدپوور ):**

کاری تەواو: ٢٧

کاری ناتەواو: ١

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٦

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٤,٥ = ٦ ÷ ٢٧

**٣-٣-٢- شیعری (ماڵەکەم لەگەڵای خەمە ) [٣٧] ی ( چنوور نامیق):**

کاری تەواو: ٧٧

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٢٠

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٢٠

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٣,٨٥ = ٢٠ ÷ ٧٧

**٤-٣-٢- شیعری (کەنارەکانی ئەودیو هەڵچوونـم) [٣٨] ی (کەژاڵ ئیسماعیل):**

کاری تەواو: ٧٠

کاری ناتەواو: ٠

هاوەڵناو: ٥

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٥

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٧٠ ÷ ٥ = ١٤

**٥-٣-٢- شیعری (سەنتووری دەستی با و ئیقاعی ترپەی باران )[٣٩]ی (شیرین ئیبراهیم حەیدەری):**

کاری تەواو: ٢٢

کاری ناتەواو: ١

هاوەڵناو: ٦

کاری ناتەواو+ هاوەڵناو = ٧

ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو = ژمارەی کار ÷ ژمارەی هاوەڵناو

٢٢ ÷ ٧ = ٣,٦

ڕێژەی دەقەکانی شاعیرە ئافرەتەکان بەپێی ریزبەندی دەقەکان، بەم جۆرەن:

دەقی یەکەم : ١٧

دەقی دووەم: ٤,٥

دەقی سێیەم: ٣,٨٥

دەقی چوارەم: ١٤

دەقی پێنجەم: ٣,٦

بۆ بەراوردکردنی ڕێژەکان لەرووی ڕەگەزی شاعیرەکانەوە، تێکڕای ڕێژەی هەریەکە لە شیعری شاعیرە پیاوەکان بەرانبەر تێکڕای ڕێژەی شیعری شاعیرە ئافرەتەکان دەخەینەڕوو:

| ناوی شاعیر | تێکرای رێژە | ناوی شاعیر | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| گۆران | ٢,١٨ | نیگار نادر | ١٧ |
| ( هێمن) | ١,٤٥ | تیشکە محەمەدپوور | ٤,٥ |
| نەوزاد رەفعەت | ٤,٤ | چنوور نامیق حەسەن | ٣,٨٥ |
| جەلال بەرزنجی | ٣,٦١ | کەژاڵ ئیسماعیل | ١٤ |
| سەباح رەنجدەر | ٤,١٨ | شیرین ئیبراهیم حەیدەری | ٣,٦ |
| تێکرای ڕێژەکە لای پیاوان | ٣,١٦ | تێکرای ڕێژەکە لای ئافرەتان | ٨,٥٩ |

ئەم سەرنجانەی خوارەوە لە ڕێژەکاندا دەردەکەون:

- بەگشتی ڕێژەی کار بۆ هاوەڵناو لە شیعری ئافرەتاندا بەرزترە لەچاو شیعری پیاوان.

- تێکڕای ڕێژەکە لای ئافرەتان (٨, ٥٩) نزیکەی سێ بەرانبەر ڕێژەکەیە لای پیاوان (٣, ١٦).

کەواتە: هۆکاری ڕەگەز لە تیۆرەکەی بۆزیمان، لەگەڵ شیعری کوردی شێوەی کوردیی ناوەڕاست دەگونجێت.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە:

- تیۆرەکەی بۆزیمان لە شێوازگەریدا، لە هەردوو هۆکاری (شیعرێتیی زمان) و (ڕەگەزی شاعیر) بۆ شیعری کوردی شێوەی کوردیی ناوەڕاست گونجاوە. بەڵام لە هۆکاری (تەمەنی شاعیر) دا لەگەڵ شیعری کوردیی شێوەی کوردیی ناوەڕاست ناگونجێت چونکە دەرەنجامەکان پێچەوانەن.

- دەکرێت سوود لەو تیۆرە وەربگیرێت بۆ ڕەخنەی بواری زمانی شیعر و کارەکانی ئەو بوارە زانستییانەتر ڕێکدەخات.

- ناتوانین بەکاری بهێنین بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی دەقێکی دیاریکراو خاوەنەکەی ئافرەتە یان پیاو. چونکە لە نموونەکانی لێکۆڵینەوەکەدا، دۆخی لەیاسالادەر لە هەردوو ڕەگەزەکەدا هەبوو.

**پەراوێزەکان:**

١- بڕوانە: الاسلوب ، د. سعد مصلوح،ط٢، عالم الکتب، القاهرة، ١٩٩٢. ص ٧٣ — ٨٤.

٢- بڕوانە: عبدالعزیز الفارسي فـي روايه (تبكي الارض يضـحك زحل) فـي ضـوء معادلـة بوزيمان: الارشيف . نزوى: http://www.nizwa.com

٣- بڕوانە: چەند باسێکی وردی زمانەوانیی کوردی، عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول (پ.د) ، ب١، ناوەندی ئاوێر، ٢٠١٥، ل ٦.

٤- وشـەڕۆنان لە ڕێزمـانی کوردیـدا، ئەورەحمـانی حـاجی مـارف (پ.د)، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، ل ١١٠.

٥- ڕستەسازی ڕۆنانکاری و گوێزانەوە، عبدالواحد مشیر دزەیی (پ.د)، ناوەنـدی ئـاودێر بـۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠١٣، ل ٧٦.

٦- بڕوانە: ڕێزمانی ئاخـاوتنی کـوردی بەپێـی لێکـۆڵینەوەی لیـژنەی زمـان و زانسـتەکان لە کۆڕی زانیاری کورد، دەزگای ئاراس، چ٢، ٢٠١١، ل ٦٦-٧٩.

٧- دیوانی گۆران، محەمەدی مەلا کەریم، چ٢، ل ٣.

٨- هەمان سەرچاوە، چ٢، ل ٢٦.

٩- دیوانی هێمن، پەخشانگای ئازادی، سلێمانی، ٢٧٠٨ ک. ل ٨٥-٨٦.

١٠- هەمان سەرچاوە، ٢٧٠٨ ک. ل ٣٠١.

١١- دیوانی گۆران، ل ١٦٥.

١٢- هەمان سەرچاوە، ل ٣١٠.

١٣- هەمان سەرچاوە، ل ٢٢١.

١٤- دیوانی هێمن ، ل ٨٩.

١٥- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٦.

١٦- هەمان سەرچاوە، ل ١٨١.

١٧- هەمان سەرچاوە، ل ١٩٢.

١٨- هەمان سەرچاوە، ل ٣٧٠.

١٩- پەرییەکان هەڵدەفڕێنمەوە، نەوزاد ڕەفعەت، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٤. ل٢١٠.

٢٠- هەمان سەرچاوە. ل ٣٩.

٢١- هەمان سەرچاوە. ل ٨٤.

٢٢- هەمان سەرچاوە. ل ١٠١.

٢٣- هەمان سەرچاوە. ل ٢٥٣.

٢٤-هەوڵدانێکی تر بۆ گرتنی مەوداکان و سەرجەم شیعرەکانی تر، جەلال بەرزنجی، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٩، ل ٣٤٠.

٢٥-هەمان سەرچاوە، ل ٣٦٨.

٢٦- لە دیوانەکەیدا ئاماژەی بە ساڵی نووسینی ئەم شیعرە نەکردووە، بەڵام هەمان شیعر لە گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (٧)ی خولی دووەمی ١٩٨١ دا بڵاوکراوەتەوە.

٢٧- هەوڵدانێکی تر بۆ گرتنی مەوداکان و سەرجەم شیعرەکانی تر، جەلال بەرزنجی، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٩، ل ٢٨١.

٢٨- هەمان سەرچاوە، ل ٨٥.

٢٩-سی ساڵ شیعر، سەباح ڕەنجدەر، ل ١٩ .

٣٠-هەمان سەرچاوە، ل ٤٨

٣١-هەمان سەرچاوە، ل ٣٧٠

٣٢-هەمان سەرچاوە، ل ٣١٩

٣٣- حەزدەکەم ئەوەندە بژیم، سەباح ڕەنجدەر، ل: ٢٥

٣٤-بۆ ئەوەی شیعرەکان شیعری ژنانە بن و ئەنجامەکان وردتر دەرکەون، نموونەکان لە گۆڤارەکانی دوای ساڵانی (٢٠٠٠) ەوە وەردەگرین.

٣٥- گۆڤاری شین، ژ: ٩ ، شوباتی ٢٠٠٥، ل ٣٩.

٣٦- گۆڤاری شین، ژ: ١٤، تەمموزی ٢٠٠٥، ل ٤٧.

٣٧- گۆڤاری شین، ژ : ٨، کانوونی دووەمی ٢٠٠٥، ل ٦١.

٣٨- گۆڤاری نووسەری نوێ ژ: ٥٣، تشرینی دووەمی ٢٠١٠، ل١٣٨.

٣٩- گۆڤاری نووسەری نوێ، ژ: ٤٧، ئەیلوولی ٢٠٠٩، ل ١٦٤.

## ملخص البحث

هذا البحث الموسوم ( ملائمة نظرية بوزيمان في الأسلوبية مع النقد الأسلوبي في الأدب الكوردي، اللهجة الكوردية الوسطى)، يحاول الوصول الى مدى ملائمة النظرية المذكورة مع قواعد اللغة الكوردية ولغتها الأدبية. تأتي أهمية البحث في أن الدراسات الأسلوبية في النقد الأدبي الكوردي خاصة والنقد الأدبي عامة، بحاجة إلى معادلات علمية تزود الباحث والقارئ بنتائج رقمية قابلة للحساب المنطقي وذات دلالات إحصائية. وهذه النظرية هي واحدة من المحاولات لقياس الأدب بالمعادلات الإحصائية.

تشير النظرية الى ان اللغة في الأدب، لغة ذات إنفعالات عالية. وتأتي الإنفعالات في الكلام على صيغه الأفعال. بينما تأتي الكلام العادي على صيغة الوصف. فتقيس معادلة بوزيمان نسبة الأفعال إلى الأوصاف في النص، و تقرر بأن:

- النسبة في النص الشعري أعلى منها في النص النثري.
- النسبة عند الشباب أعلى منها عند الكبار في السن.
- النسبة عند الإناث أعلى منها عند الذكور.

يعمل هذا البحث على تجريب مدى ملائمة هذه المقررات مع اللغة الكوردية من خلال اخذ عينات عشوائية بين الشعراء ذات شروط عمرية و كتابية و جنسية.

ويقارن البحث النتائج فيما بينها. و يتوصل الى نتائج البحث. وهي:

- المعادلة منسجمة مع اللغة الكوردية في قضية مدى شعرية اللغة.
- المعادلة منسجمة مع اللغة الكوردية في قضية جنس الشاعر.
- المعادلة غير منسجمة مع اللغة الكوردية في قضية عمر الشاعر.

و ينتهي البحث بقائمة المصادر.

## Abstract

This research, entitled "The Suitability of Bozeman's Theory in Stylistic Criticism in Kurdish Language Literature, Southern Kurdish Dialect", tries to reach the extent to which this theory is compatible with the Kurdish language and its literary language.

The importance of this research is that the stylistic studies in the literary criticism, especially literary criticism in general, need scientific equations that provide the researcher and the continental results with a logical calculation and statistical significance.

This theory is one of the attempts to measure literature in statistical equations.

The theory suggests that language in literature, a language with high emotions. Emotions come in the form of actions (verbs). Normal speech comes in the description format(adjectives). The Bozeman equation measures the ratio of verbs to adjectives in the text, and decides that:

• The ratio in the poetic text is higher than in the prose text.

• The percentage of youth is higher than that of adults.

• The percentage of females is higher than that of males.

This study attempts to test the suitability of these courses with the Kurdish language by taking random samples among poets with age, written and sex (male/ female) conditions.

The search compares results between them. And reach the search results. Which:

• The equation is consistent with the Kurdish language in the issue of the extent of poetic language.

• The equation is consistent with the Kurdish language in the issue of the sex of the poet.

• The equation is not compatible with the Kurdish language in the case of the age of the poet.

The search ends with the list of sources used.

# ژانره ئەدەبییەکان لە کتێبی (ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب)دا

**م.ی. ڕێبین خەلیل قادر**
بەشی زمانی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

## پێشەکی

ژانرە ئەدەبییەکان (جۆرەکانی ئەدەب) وەکو سیستەم یان جۆرێک لە ڕێبازی ڕێکخستن وایە و ئەرکەکەی بریتییە لە ناساندن و پۆلینکردن و جیاکردنەوەی ژانرە جیاوازەکانی ئەدەب بەگوێرەی بونیادی هونەری و ئەو یاسا و تایبەتمەندییانەی کە هەریەکە لەم ژانرانە هەیانە، بەبێ گوێدانە نووسەری دەق و سەردەمی دەق و زمانی نووسینی دەق، بەشێوەیەکی گشتی ئەدەب بۆ هەردوو جۆری (شیعر و پەخشان) دابەش دەبێت و هەریەکێکیش لەمانە کۆمەڵێک ژانری جیاوازیان هەیە، کە هەریەکەیان تایبەتمەندی و سیما و ڕێسای جیایان هەیە و سنووری ژانرەکان جیادەکەنەوە. ژانرە ئەدەبییەکانیش لە ڕوانگە و سایەی ئەم تایبەتمەندی و خەسڵەتانەوە ژانرەکان پۆلین دەکات و بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە ئایا کام ژانری ئەدەبی شیعرە و کامەشیان پەخشانە. لە سەرەتاوە لە ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا لێرە و لەوێ هەندێ جار لە کتێب و وتار و باس و خواسی ئەدەبی و ڕەخنەییدا باسی هەندێ لە ژانرەکانی شیعر و پەخشان کراوە، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم و لەدوای ڕاپەڕینیشەوە تا دەگاتە ئێستا چەندین نامە و تێز و توێژینەوە و وتار و کتێب لەبارەی ژانرە جیاوازەکانەوە نووسراون، کە زۆربەیان بەجیا لە ژانرەکانیان کۆڵیوەتەوە، کە کتێبەکەی (د. شوکریە ڕەسول)یش دەچێتە نێو ئەم بابەتەوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج بێت، ئەوەیە تا ئێستا دەستی ڕەخنە بەم توێژینەوە و نووسینانە نەگەیشتووە، کە ئەمیش خۆی لە ڕەخنەی ژانرە ئەدەبییەکان دەبینێتەوە و لەنێو جۆر و ژانرە ئەدەبییەکان بە ڕەخنەی ژانرە ئەدەبییەکان ناسراوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەناونیشانی ژانرە ئەدەبییەکان لە کتێبی (ئەدەبی کوردی و هونـەرەکانی ئـەدەب)دا هەوڵێکـە بـۆ توێژینـەوە و ناسـاندن و پـۆلکردنی ژانـرە جیاوازەکانی ئەدەب بە هەردوو جۆری شیعر و پەخشانییەوە، بەتایبـەت لـە کتێبـی (ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب)ی (د. شوکریە رەسوڵ) کە وەکو کەرەستەی لێکۆڵینەوەکە وەرگیراوە و هەوڵدراوە لە ڕوانگەی تیـۆری ژانـرە ئەدەبییەکانـەوە لـەم بابەتە بکۆڵرێتەوە و ئەم هەوڵەی نووسەر هەڵبسەنگێنرێت.

## یەکەم: ژانرە ئەدەبییەکان (ژانرەکانی ئەدەب – جۆرەکانی ئەدەب):

### تەوەرەی یەکەم: چەمکی ژانر:

ژانر (genre) لە بنجدا وشەیەکی فرەنسییە و دواتر پەڕیوەتەوە زمانـەکانی تـر و بۆ واتای جۆر بەکارهێنراوە، کەواتە ((وشەی ژانر genre لە فرەنسییەوە هـاتووە، بەمانای جـۆر، چەشـن، ڕەگـەز، تـوخمی ئـەدەبی. وەک چـۆن لـە سروشـتدا تـوخمی بایلۆجی هەیە، ئاواش لە ئەدەبدا. هەندێ لە ڕەخنـەگرەکان پێیـان وابـوو، کـە دەبـێ ژانر (پاک) بێ، واتە تێکەڵی هیچ جۆرێکی تری ئەدەب نەبێ، بۆ نموونە تێکەڵکردنی تراژیدی و کۆمیدی، هەروەها لایان وابوو کە دەبێ یاسا و ڕێساکانی بونیـاد و سـتایڵ و دەربڕینی هەست و ئەندێشەی هەر ژانرە جیا بێ لە ژانرێکی تر)) (پیتەر هالبێرگ و دانەرانی تر، ٢٠١٠، ل ٥٥)، ئەسڵی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بـۆ زمـانی لاتینـی ((لـە لاتینیـدا Genus یـان Generi کـە چەمکێکـە تیـۆری ئـەدەب لـە زانسـتە وردەکـان بەتایبەتیش زیندەوەرزانی خواستووە کە زیندەواران بۆ جـۆر پـۆلین دەکـات)) (فریزة، ٢٠١٣، ص ١٩). ئەم چەمکە پێشتر لە زانستی زیندەوەرزانیـدا بـەکارهاتووە ((ئەمـە چەمکێکە تیۆریی ئەدەب لە زانستە وردەکان بەتایبـەتی زینـدەوەرزانی خواسـتوویەتی کە ئـەم زانسـتە زینـدەوەرەکان بـۆ جۆرەکـان Espese و چەشـنەکان Types دابـەش دەکات. ئەو پێوەرانەش کە تیۆری زیندەوەرزانی پشتی پێ بەست ڕێگـای گرتـە بـەر بۆ نێو زانستە مرۆڤایەتییەکان و بەتایبەتیش ئەدەب)) (فریزة، ٢٠١٣، ص ١٩-٢٠) لە زمانەکانی تردا وشەی تر هەن کە ماناکانیان لەم وشەیە نزیک دەبێتەوە، ئەم وشـەیە ((پەڕییەوە زمانی ئینگلیزی لەکاتێکدا وشەی تـری وەک (kind ) هەیـە کـە هـەمان واتای هەیە، لە فەرهەنگی ئینگلیزی (فەرهـەنگی زاراوە ئەدەبییـەکان)دا پێناسـەیەک بۆ (genre) دەبینین کە: زاراوەیەکی فرەنسـییە بـەواتای جـۆر kind نەمـەت type یان چینی ئەدەبی دێت)) (یحیاوي، ٢٠١٦، ص ٦). هەردوو وشەی kind و type یش

چەمکەکەیان لە زاراوەی ژانر genre ەوە نزیکە چونکە لە هەمان فەرهەنگدا پێناسەیەکی نزیک لە پێناسەی ژانر بۆ ئەم دوو زاراوەیەش کراوە، لەبارەی زاراوەی kind ((پێناسەیەکی وێکچوو لەگەڵ ژانر دەبینین و بەپێی -فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکان- ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکی فراوان لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا بەکارهاتووە، کە دەلالەت لە type و جۆری ئەدەبی genre دەکات و ڕەخنە لەم ماوەیەدا سیماکانی بەرهەمی (داستان و تراژیدیا و لاواندنەوە)ی دیاریدەکرد و بڕیاری لەسەر ئەوە دەدا کە ئایا بەرهەمەکە دەچێتە ژێر باری یاسا و دابەکان یان نا ... وشەی سێیەمیش لەم فەرهەنگەدا بریتییە لە وشەی type کە بەواتای genre و kind دێت و واتا جۆر)) (یحیاوي، ٢٠١٦، ص ٦-٧). لە زمانی عەرەبیشدا هەردوو زاراوەی (جنس، نوع) بەکاردێت، چەمکی ئەم دوو زاراوەیە لەگەڵ یەکتر جیاوازن ((جنس) گشتیترە لە (نوع) کە بریتییە لە هەموو جۆرێک (چەشنێک) لە شتێک)) (مازوني فريزة، ٢٠١٣، ص ٤٩)، کەواتە (جنس) گشتیترە و (نوع) تایبەتیترە و بەشێکە لە (جنس)، بۆ نموونە ئەگەر بڵێین گیانلەبەران هەموویان (جنس)ن، ئەوا مرۆڤ (نوع)ێکە لەو (جنس)ە، چونکە (جنس) کۆمەڵێک گرووپ دەگرێتەوە کە بە (نوع) ناسراون. لە زمانی کوردیشدا زاراوەکانی (جۆر، چەشن، هونەر، ژانر) بەکارهاتوون، هەریەکە لە (جۆر، چەشن) کوردیین و (هونەر)یش زاراوەیەکە واتا و دەلالەتی تر هەڵدەگرێت و بۆ ناونانی جۆرە ئەدەبییەکان گونجاو نییە، چونکە جگە لەوەی کە زاراوەی هونەر بۆ مەبەستی تریش بەکاردێت، بۆ هونەرە جوانەکانیش بەکاردەهێنرێت، کە بریتیین لە (شیعر، مۆسیقا، پەیکەرتاشی، وێنەکێشان، سەماکردن، بیناسازی) ئەمانە لای یۆنانی و ڕۆمانییە کۆنەکان باو بوون. هەرچی (ژانر)ە ئەوا لە فەڕەنسییەوە وەرگیراوە و لە زمانی کوردیدا بۆ مەبەستی جۆرە ئەدەبییەکان بەکارهێنراوە.

**تەوەرەی دووەم: ژانرە ئەدەبییەکان:**

ژانرە ئەدەبییەکان کە لە زمانی عەرەبیدا (الانواع الادبية، الاجناس الادبية) و لە زمانی ئینگلیزیشدا (Literary Genres)ی بۆ بەکارهاتووە، لە دوو زاراوە پێکهاتووە، (ژانر) و (ئەدەب) کە بەهۆی ئامرازی (ە)ی پێکبەستنەوە بەیەکەوە لکێنراون و زاراوەیەکی نوێیان دروستکردووە، ئەم زاراوە نوێیە بەواتای (جۆرەکانی ئەدەب، جۆرە ئەدەبییەکان، چەشنەکانی ئەدەب) دێت، واتا ئەدەب تەنیا یەک جۆر

نییە و چەندین جۆر و ژانری جیای لێدەبێتەوە کە هەریەکەیان خاوەنی تایبەتمەندی و سیما و بنەما و ڕێسای خۆیەتی. دەشێ بڵێین ژانرە ئەدەبییەکان ((جۆرە ئەدەبییەکان بریتیین لە شێوە یان دارشتنی هونەری گشتی کە تایبەتمەندی و یاسای تایبەتی خۆیان هەیە. ئەم جۆرە ئەدەبییانە بەش و گرووپیان تێدایە کە بەهۆیانەوە بەرهەمە فیکرییەکان ڕێکدەخرێن بەو جیاوازی و ئاڵۆزییەی کە هەیانە. لەمانەش بۆ نموونە کە لای شاعیرەکان دەیبینین کە هەندێکیان داستان و هەندێکیان ئۆد ode و هەندێکیان تراژیدیا و هەندێکی تریان دیوانێک لە شیعری فێرکردن دادەنێن)) (فنسنت، د.س.ط.، ص ٣١). پێناسەکردنی ژانرە ئەدەبییەکان چەمکێکی زیاتر هەڵدەگرێت، چونکە ژانرەکان بۆخۆیان بریتیین لە ((کۆمەڵێک لە سەنعەتی شێوازیی، یان دەستەیەک لە بەرهەمە ئەدەبییەکانن، یان داهێنراوی هونەریین، یان چینێک لە دەقن، یان دارشتەی هونەریین، یان قاڵبی هونەریین، یان جۆرێکن لە جۆرەکانی گوزارشتکردن)) (يحياوي، ٢٠١٦، ص ٩). هەر یەکێک لەم پێناسانە چەمکێکی تایبەت هەڵدەگرێت، دەبێ ئەوە بزانین کە هەر جۆرێکی ئەدەبی شێوە یان جۆرە دارشتنێکی هونەریی تایبەتی هەیە و لە جۆرەکانی تر جیادەبێتەوە، ئەم شێوە یان دارشتنە هونەرییە یاسای تایبەت بەخۆی هەیە و چوارچێوەیەکی بۆ ژانرەکان دیاریکردووە و بەهۆیانەوە نووسەر و ئەدیب دەتوانن هەموو بۆچوون و بیرۆکەیەک دابرێژنەوە. ئەم جۆرانەی ئەدەب وەکو جۆر و پۆلینکردنەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ و شتەکانی تر وان و هەر کۆمەڵێک ژانر و جۆر لەژێر یەک ناونیشاندا کۆدەبنەوە ((جۆرە ئەدەبییەکان تا ڕاددەیەک بە ڕەگەزەکان و خێزانەکان دەچن کە لە مێژووی سروشتیدا بەوە ناسراون کە بریتیین لە کۆمەڵێک لە تاکەکان و لە کۆمەڵێک سیما بەیەک دەچن، کە دەشێ هەر کۆمەڵەیەک لەژێر ناوێکی تایبەتی دابنرێت و لە هەمان کاتیشدا لە کۆمەڵەکانی تر جیادەبێتەوە کە هەندێ سیمایان هەیە لەگەڵ سیما تایبەتییەکانی کۆمەڵەکەی تر یەک ناگرنەوە)) (فنسنت، د.س.ط.، ص ٣٥). ژانرە ئەدەبییەکان یان ژانرەکانی ئەدەب بریتیین لە کۆمەڵێک ژانری لێک جیا و بەسەر چەند گرووپ و کۆمەڵەیەک دابەش بوون و لەمەشیاندا بە گرووپ و خێزانەکانی گیانلەبەران و زمانەکان و ڕووەکەکان دەچن، کە هەر کۆمەڵە سیفەتێکی لەیەکچوو بۆتە بنەما بۆ لەخۆگرتنی کۆمەڵێک ژانر لەژێر یەک جۆری گشتیدا، کە سەرەڕای لێکچوونەکان، لایەنی جیاوازیش لەنێوانیاندا بەدی دەکرێت و تا چەند جیاوازییەکان زیاتر بن ژانرەکان و جۆری پۆلینکردنیان زیاتر لێک دوور دەکەونەوە و دەچنە ژێر

باری جۆری ترەوە. ئەمەش وادەکات کە هەر ژانرێکی ئەدەبی بونیادێکی هونەری تایبەت بەخۆی هەبێت و ژانرە ئەدەبییەکانیش کار بۆ پۆلکردن و ڕێکخستنی ئەم ژانرانە بەگوێرەی ئەو بونیادەوە دەکات ((لێرەدا دەتوانین بڵێین کە (تیۆری جۆرەکانی ئەدەب) ڕێبازێکی ڕێکخستنە، ئەدەب و مێژووەکەی پۆلێن ناکات بەگوێرەی کات و شوێن (ماوە یان زمانی نەتەوایەتی)، بەڵکو بەپێی بنیات یان ڕێکخستنی جۆرە ئەدەبییەکان ڕێکیان دەخات)) (الماضي، ٢٠١٠، ل ٩٤)، لێرەوە تێبینی دەکەین کە ژانرە ئەدەبییەکان وەکو ڕێباز و سیستەمێکی ڕێکخستن و پۆڵێنکردنی ژانرەکان بەکاردەهێنرێت و ئەرکەکەی بریتییە لە پۆڵێنکردنی ژانرەکان بەگوێرەی بونیادی هونەرییانەوە، نەوەک بەگوێرەی کات و شوێن و زمانی نەتەوایەتییەوە، وەک ئەوەی مێژووی ئەدەب کارێکی لەم جۆرە دەکات و بێ گوێدانە بونیادی دەق بەگوێرەی مێژووی سەرهەڵدانی دەقەکانەوە ڕیزبەندییەک بۆ دەقەکان ئەنجام دەدات و لە کۆنترین دەقەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە نوێترین دەق، ئەمەش شتێکی سروشتییە و کاری مێژووی ئەدەبە، بەڵام بۆ ژانرە ئەدەبییەکان ئەمە گونجاو نییە، چونکە ژانر بەگوێرەی کاتی سەرهەڵدان و نووسینی پۆلین ناکرێت، بەڵکو هەر دەقێک کۆمەڵێک تایبەتمەندی و یاسای خۆی هەیە کە ژانرە ئەدەبییەکان لە مەسەلەی پۆڵێنکردن و ڕێکخستنیاندا سوودیان لێوەردەگرن، کەواتە دەتوانین بڵێین ((مەبەست لە جۆرە ئەدەبییەکان بریتییە لەو قاڵبە هونەرییە گشتیانەی ئەدەب وەک جۆری ئەدەبی کە جیاوازن لەنێو خۆیاندا نەک بەگوێرەی دانەرەکەی یان سەردەمەکەی یان پێگەکەی یان زمانەکەی، بەڵکو بەگوێرەی بونیادە هونەرییەکەی و مۆرکە گشتییەکە، و وێنەی کەسێتییە ئەدەبییەکان یان داڕشتە گوزارشتییە بەشەکییەکان کە تەنیا لە سایەی یەکێتی هونەریی ژانرە ئەدەبییەکەوەیە هەرچەندە زمانەکان و ئەدەبەکان و ئەو سەردەمەی ژانرەکە بۆی دەگەڕێتەوە جیاواز بن)) (فريزة، ٢٠١٣، ص ١٧). لەوەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ژانری ئەدەبی کۆمەڵێک قاڵبی هونەریین و سنووریان دیاریکراوە و بەگوێرەی ئەو قاڵب و سنوورە بەرهەمە ئەدەبییەکانیش پۆڵین دەکەن. ژانرە ئەدەبییەکان لای (د. سیروس شمیسا)ی توێژەر و ڕەخنەگری فارسی زانستێکە وەکو زانستێکی ئەدەبی یا وەکو بەشێک لە تیۆری ئەدەبیی ناسێنراوە و پێیوایە کە ((ئەرکی ئەم زانستە بریتییە لە پۆلینکردنی بەرهەمە ئەدەبییەکان لەڕوانگەی ماددە یا وێنەوە بۆ گرووپی دیاریکراو و دەستنیشانکراو، لە ژانری ئەدەبیدا ئەو پرسیارە دەکرێت کە ئایا هەر بەرهەمێکی ئەدەبی لە خودی خۆیدا بوونێکی دابڕاو و سەربەخۆ

و تایبەتی هەیە یان بە بەرهەمە ئەدەبییەکانی ترەوە پەیوەستە، لە ئەنجامدا دەتوانرێ لەنێوان ئەو گرووپانەی بەرهەمی ئەدەبی پەیوەندی و لێکچوون بدۆزرێتەوە؟)) (شمیسا، ٢٠٠٢، ص ١٩) ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر هەن کە ژانرە ئەدەبییەکان لەماوەی کارکردن لەسەر دەقە ئەدەبییەکان و پۆلێنکردنیان وەڵامیان دەداتەوە.

**تەوەرەی سێیەم: پۆلێنکردنی ژانرە ئەدەبییەکان:**

پۆلینکردنی ژانرە ئەدەبییەکان و ڕێکخستن و یەکلاییکردنەوەی سنوور و سروشت و جۆری هەر ژانرێک و دابەشکردنیان بۆ گرووپ و کۆمەڵی جیا جیا کارێکی هەروا ئاسان و ساکار نییە، چونکە ڕاستە ژانرە ئەدەبییەکان یاسا و تایبەتمەندی و سیمای خۆیانیان هەیە کە لە یەکتریان جیادەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ یاسا و سیما هەن کە هاوبەشە لەنێوان هەندێ ژانری سەر بە یەک گرووپە ژانر، بۆ نموونە هەریەکە لە ژانرەکانی (چیرۆک و ڕۆمان) چەند جۆرێکی تریان هەیە و تا ئێستاش مەسەلەی پۆلینکردنیان یەکلایی نەکراوەتەوە، کە ئایا سنوور و جۆر و قەبارە و ژمارەی وشە و چەندێتی و چۆنێتییان تا کوێ دەڕوات و بەر کامیان دەکەون، زۆر نووسەر هەن ڕۆمان وەکو ژانرێکی بەقەبارە گەورە و فراوان و درێژی چیرۆک دادەنێن، هەندێکی تر ناوی دەنێن چیرۆکی زۆر درێژ، یان لە بابەت نۆڤلێتەوە، هەندێ پۆلینکردن دەیخەنە نێو ژانرەکانی چیرۆکەوە و هەندێکی تر دەیخەنە نێو ژانرەکانی ڕۆمانەوە، یان دەوترێت نۆڤلێت لەڕووی قەبارەوە لەنێوان چیرۆک و ڕۆماندایە. ئەم دیاردەیە لە ژانرەکانی شیعریش هەستی پێدەکرێت، بۆ نموونە شیعری لیریکی لە کۆنەوە لای یۆنانییەکان چەندین جۆری هەبووە کە ئێستا هەندێکیان ماون و هەندێکی تریان نەماون، یان شیعری شانۆیی کە دوو جۆری سەرەکی هەیە کە (تراژیدیا و کۆمیدیا)ن، دواتر لە سەدەی هەژدەهەمەوە گۆڕاون و تەنانەت لە سەدەکانی دواتردا تایبەتمەندی و یاساکانی هەردوو جۆرەکە تێکەڵی یەکتر کرا و شیعری درامی نوێتر سەری هەڵدا بەتایبەتیش ژانری (تراژیکۆمیدیا)، لەمەوە لەنێو تیۆری ژانرە ئەدەبییەکاندا دیاردەیەک بەم دواییانە سەری هەڵدا، ئەویش دیاردەی ئاوێتەبوونی ژانرەکان بوو، بەجۆرێک کە ژانری نوێتر سەری هەڵدا، لەبەرئەوەی ((جۆری ئەدەبی بەکراوەیی دەمێنێتەوە بەکرانەوەی مومارەسەی دەقیی و نوێبوونەوەی دەق ئەگەرچیش جۆرەکە پشت بە تایبەتمەندییەکانی جۆرێکی دیاریکراو

دەبەستێت، کەچی سەرلەنوێ خۆی بونیاد دەنێتەوە بگرە بونیاد و تایبەتمەندییەکانیشی دەبڕێت و بۆ ئەوەی ئەم چوونەناویەکە ببێتە یەکێک لە خاڵە سەنتەرییەکان بۆ سەرهەڵدانی چەشنە نووسینی نوێ بۆیە jean Molino پێیوایە کە بەرهەمە هەڵچووەکان لە مەیدانی جۆرەکاندا لە تێکەڵبوونی جۆرەکانی پێشتر دروست دەبن، یان لە ڕەتکردنەوەی سنووری جۆرەکان دروست دەبن کە تەقلید فەرزی کردووە و بە سەرهەڵدانی کاری ئەدەبی تێکەڵاو Mixte جۆری نوێ دادەمەزرێت)) (فریزة، ٢٠١٣، ص ١٧). مەسەلەی تێکەڵبوون و چوونەناویەکی ژانرەکان لە سەدەی بیستەمەوە وردە وردە پەرەی سەند و بوو بە تیۆرێک لەنێو ژانرە ئەدەبییەکاندا، لە ئەنجامی ئەم چوونەناویەکییەی ژانرەکانیشەوە ژانری نوێتر سەریان هەڵدا. جگە لەمەش هەندێ ژانر ئێستا لەناوچوون و نەماون، بەڵکو لە شوێنی ئەواندا ژانری نوێتر سەری هەڵداوە. زۆربەی دابەشکردنەکان ئەدەبیان بۆ هەردوو جۆری سەرەکی (شیعر و پەخشان) دابەشکردووە، کە هەریەکێک لەو جۆرانەش ژانر و جۆری دیکەیان لێدەبێتەوە، کە لەوانیشەوە ژانر و جۆری بچووکتریان لێدەبێتەوە، پێشتریش ڕوونمان کردەوە کە لە ئاوێتەبوونی ئەم دووانەش ژانری نوێتر سەریان هەڵداوە، بۆیە هەر پۆلێنکردن و دابەشکردنێک بۆ ژانرە ئەدەبییەکان هەروا ئاسان نابێت و لە کۆنەوە تا ئێستاش هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ دابەشکردنی ئەدەب بۆ ژانرەکانی، ئەمە لە سەردەمی (ئەفلاتون) لە کتێبی (کۆمار)دا لەسەر بنەمای (گێڕانەوە) و (گفتوگۆ) شیعری پۆلێنکردووە، کە شیعری داستانی لەسەر بنەمای گێڕانەوە و گفتوگۆ و شیعری شانۆیی لەسەر بنەمای گفتوگۆ پۆلێنی کردوون و جۆری سێیەمیشیان تەنیا لەسەر بنەمای گێڕانەوە پۆلین کردووە، کە ئەویش جۆری پیاهەڵدانە (افلاطون، ١٩٧٤، ص ٢٦٧-٢٧٠). چونکە شیعری داستانی ڕووداوەکانی بەهۆی گێڕانەوە و تەنانەت گفتۆگۆش پێشکەش دەکات، بە پێچەوانەی شیعری شانۆیی کە تەنیا لەسەر بنەمای گفتوگۆی نێوان کارەکتەرەکانەوە ڕووداوەکان نمایش دەکات و جۆری سێیەمیشیان کە شیعری پیاهەڵدانە و تەنیا پشت بە ڕەگەزی گێڕانەوە دەبەستێت. هەرچی (ئەرستۆ) لە کتێبی (هونەری شیعر)ەکەیدا جۆرەکانی شیعری لای ئەو بریتیین لە (شیعری شانۆیی (تراژیدیا و کۆمیدیا) و شیعری داستانی)، باسی شیعری لیریکی نەکردووە ڕەنگبێ لەبەر ئەوەی بووبێ کە ئەم جۆرە شیعرە لە مۆسیقاوە نزیک بووە و بە شیعری سەربەخۆی دانەناوە (ئەرستۆ، ٢٠٠٤، ل ١١١). (هۆراس)ی ڕۆمانی کە لەسەر ڕێچکەی (ئەرستۆ)

ڕۆشتووە و لەژێر کاریگەری ئەو (هونەری شیعر)ییەکەی خۆی نووسیوە، کە لە بنەڕەتدا بەناوی (نامەیەک بۆ بنەماڵەی پیزۆ)یە، بەهەمان شێوە باسی شیعری (داستانی و شانۆگەری (تراژیدیا و کۆمیدیا)ی کردووە. لەپاش ئەمانەش زۆر هەوڵی تر هەبوون کە باسیان لە ژانرە ئەدەبییەکان کردووە، لەمانەش (کارل ڤیتر، سی. ڤنسنت، ئۆستن وارین، رینیە ویلێک، تزفتیان تۆدۆرۆڤ، گۆتە، ئیمیل شتایگەر، نورتروب فرای، فێردیناند برۆنتیێر، ت.س. ئەلیۆت ....هتد). هەر یەکێک لەمانە هەوڵیانداوە لە ڕوانگەیەکەوە باسی ژانرەکان بکەن و پۆلێنیان بکەن، بەتایبەتیش ژانرە شیعرییەکان.

دەشێ ژانرە ئەدەبییەکان لەسەر چەندین بنەما و پێوەر پۆلێن بکرێن، وەک:

- بەگوێرەی بونیادی هونەریی هەر ژانرێک
- بەگوێرەی ناوەرۆکی هەر ژانرێک
- بەگوێرەی جیهانبینیی هەر ژانرێک
- بەگوێرەی شێوازی هەر ژانرێک

ئەمانە و چەند بنەما و پێوەرێکی تر هەن کە توێژەر و ڕەخنەگرانی ئەدەب بەمەبەستی پۆلێنکردنی ژانرەکان بەکاریان دێنن. دەکرێت ژانرە ئەدەبییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکەین[1] :

| شیعر | ئەو ژانرانەی لە ئاوێتەبوونی شیعر و پەخشان یان ئاوێتەبوونی ژانری دیکەوە دروست بوون | پەخشان |
|---|---|---|
| ● شیعری لیریکی:<br>— گۆرانی (سروود): سروودەکانی ئایینی و هاوسەرگیری و پیاهەڵدان و سەرکەوتووەکان و کشتوکاڵ و... هتد<br>- پۆیەما (شیعری درێژی | ● پەخشانە شیعر<br>● چیرۆکە شیعر<br>● ڕۆمانە شیعر<br>● تێکستی واڵا (کراوە)<br>● تراژیکۆمیدیا: لە تێکەڵبوونی تراژیدیا و کۆمیدیا پەیدا بووە | ● چیرۆک:<br>- برووسکە چیرۆک<br>- کورتیلە چیرۆک (کورتە چیرۆک)<br>- چیرۆکی مام ناوەندی<br>● نۆڤلێت (چیرۆکی درێژ)<br>● ڕۆمان |

[1] لە ئامادەکردنی ئەم پۆلێنکردنەدا سوود لەو سەرچاوانە وەرگیراوە کە لەم توێژینەوەیەدا بەکارهاتوون.

| | | |
|---|---|---|
| لیریکی)<br>- ڕۆمانی لیریکی<br>- ئێلێجی (ماتەمنامە)<br>- ئۆدە (قەسیدە)<br>- نامەی شیعریی<br>- ئێپیگرام<br>- شیعری یامبیک<br>- داشۆرین Satire<br>- ئیبیتافیا<br>- مادریجال<br>- سۆنێتە<br>- ترۆبادۆر<br>● شیعری داستانی:<br>● شیعری شانۆیی:<br>- تراژیدیا<br>- کۆمیدیا<br>جگە لەم دوو جۆرە هەندێ جۆری تریش هەن کە لە شیعری شانۆیی دەبنەوە و لای یۆنانییەکان باو بوون، وەک:<br>- میمیَ Le Mime<br>- بوکۆلیک Bucolique<br>- ئەپۆلۆگ Apologue<br>● شیعری فێرکردن | ● لیرۆئێپیکی: ئەو ژانرانەی تێکەڵن لە لیریک و ئیپیک:<br>- بالاد ballad<br>- فابلیَ fable<br>- باسنیا | ● ژیاننامە (بایۆگرافی)<br>● شانۆنامە:<br>- تراژیدیا<br>- کۆمیدیا<br>- شانۆگەری بورژوازی<br>- میلۆدراما: کە دواتر ڕۆمانسزمەکان سوودێکی زۆریان لێی بینی.<br>● وتار<br>● گوتار<br>● نامەی ئەدەبی |

## دووەم: ژانرە ئەدەبییەکان لە کتێبی (ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب)دا

### تەوەرەی یەکەم: پێناسەی ئەدەب:

لە کۆنەوە وتوویانە ئەدەب جۆرێکە لە هونەرە جوانەکان و ئەوەی لە هونەرە جوانەکانی تر جیای دەکاتەوە بریتییە لەو کەرەستەیەی کە ئەدەب بەکاری دێنێت، ئەویش زمانە و ئەدەب بەهۆی زمانەوە پەیام و مەبەستی خۆی دەگەیەنێت. ئەم زاراوەیە بۆ زۆر مەبەست بەکارهێنراوە و بەپێی سەردەمەکان واتا و مەبەستەکەی گۆڕاوە، لەمانەش بۆ مەسەلەی ئاکار و خووڕەوشتی چاک و باش و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەر بەهۆی خووڕەوشتێکی بەرزەوە، هەروەها بەمانای زانیاری و فێرکردن و هەندێ لە زانستە جیاوازەکانیش هاتووە، هەروەها بەواتای قسەکردن بەشێوازێکی هونەری بەرزیش دێت، جگە لەمانەش ئەدەب بەمانا باوەکەی بریتییە لە بەرهەمە ئەدەبییەکان جا چ شیعر بن، یان پەخشان کە ئەمانە بەهۆی چۆنێتی بەکارهێنانی زمانەوە بەشێوەیەکی هونەری بەرز لەلایەن ئەدیب و نووسەرانەوە بەرهەم دێت. کەواتە چەمکی ئەدەب فراوانە و جگە لە دەقی ئەدەبی بۆ زۆر واتای تر بەکارهاتووە. پێناسەکردنی ئەدەب کارێکی ئاسان نییە، چونکە لە ڕوانگەی زۆر ڕێبازی ئەدەبی و تیۆر و مێتۆدی جیاوازەوە پێناسە کراوە، بۆ نموونە (ئەمیرسۆن Emerson ) دەڵێت: ((ئەدەب بریتییە لە تۆمارکردنی بیری چاک و پەسند)) (الشایب، ١٩٩٤، ص ١٧). ئەم پێناسەیە بەشێوەیەکی گشتی چەمکی ئەدەب ڕووندەکاتەوە و مەبەستی هەموو ئەو زانست و زانیارییانەیە کە مرۆڤ تۆماری کردوون. یان (ستۆپفۆرد برۆک Stopford Brooke) دەڵێت: ((مەبەستمان لە ئەدەب بیر و هەستی زیرەکانە کە بە شێوازێکی وا نووسراوەتەوە چێژ بە خوێنەر دەگەیەنێت)) (الشایب، ١٩٩٤، ص ١٧)، ئەم پێناسەیەش لە ڕوانگەی جوانی و شێوازێکی هونەریی بەرز و کاریگەر و چۆنێتی چێژبەخشین بە خوێنەرەوە دەڕوانێتە ئەدەب و زیاتر لەو چەمکە نزیک دەبێتەوە کە ئێمە مەبەستمانە. (د. شوکریە ڕەسول) لەم کتێبەیدا کاتێک دەیەوێت پێناسەیەک بۆ ئەدەب بکات، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پێناسەیەکی تێر و تەسەل و پڕ بە پێستی ئەدەب کارێکی ئاسان نییە، ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆ ((جیاوازیی بیروباوەڕ و ڕادەی بەرز و نزمی ڕۆشنبیریی مرۆڤ و بارودۆخی جۆراوجۆر و دەورو پشت بوونەتە هۆی لەدایکبوونی پێناسەی جیا جیا لە یەکتر)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٧). هەر بۆیە لە پێناسەکردنی ئەدەبدا سوودی لە هەندێک سەرچاوەی کوردی و عەرەبی و ڕووسی وەرگرتووە و چەند پێناسەیەکی

بۆ ئەدەب هێناوەتەوە، کە هەندێک لە تایبەتمەندییەکانی چەمکی ئەدەبییان هەڵگرتووە و دەکرێت لەم چەند خاڵەدا کورتیان بکەینەوە:

١- ئەدەب شێوازێکی هونەریی — ئیستاتیکی زۆر جوانی هەیە و زمان و شێوازەکەی جیایە لەگەڵ نووسینی زانستی و قسەی ئاسایی ڕۆژانە.

٢- ئەدەب وێنەی ژیان و کۆمەڵگا دەکێشێت.

٣- ئەدەب گوزارشتکردنە لە کۆمەڵێک هەست و سۆزی جیاواز و لە ناخ و دەروونی ئەدیبەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەم سۆزە هەڵچووانەن پاڵ بە ئەدیبەوە دەنێن بۆئەوەی ئەدەب بەرهەم بێنێت.

٤- ئەدەب بەشێکە لە هونەرە جوانەکان.

٥- ئەدەب گوزارشتێکە و ناخی مرۆڤ پیشان دەدات بەرامبەر ئەو دیمەن و شتانەی دەیوروژێنن.

پاشان نووسەر خۆی پێناسەی ئەدەب دەکات و دەڵێت: ((ئەدەب وەک لە ژیانە واقیعیەکەدا دەبینین بریتییە لە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی جوانی و شێوەیەکە لە شێوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و هۆیەکیشە بۆ گەشەپێدانی ژیانی کۆمەڵ)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٩). ئەگەر لە پێناسەکە وردبینەوە دەبینین کە نووسەر ئەدەب بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دادەنێت و وەک هۆیەکیش بۆ گەشەپێدانی ژیان و کۆمەڵگا مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ئەم بۆچوونەش زیاتر لە ڕێبازی (ئەدەب بۆ کۆمەڵگا) نزیک دەبێتەوە، کە ئەدەب بە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگا دادەنێت و جۆرێک لە پەیامداری بە ئەدەب دەبەخشێت و داوا لە ئەدیب دەکات کە هەمیشە بەتەنگ کۆمەڵگاوە بێت و ئەرکی پەیامداری خۆی بەجێ بێنێت و لە ئاست واقیع و کۆمەڵگا کەمتەرخەم نەبێت.

**تەوەرەی دووەم: ڕەگەزەکانی ئەدەب:**

هەڵبەت ئەدەب لە کۆمەڵێک ڕەگەزی جیاواز پێکهاتووە، کە هەر یەکەیان ڕۆڵ و گرنگی و تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە و ئەرکی خۆیان لە بونیادنانی دەقی ئەدەبیدا بەجێدێنن و هیچیان بەبێ ئەویتر ناتوانێت بەتەنیا ئەرکی خۆی بە تەواوی لەنێو دەقدا جێبەجێ بکات ((تێبینی دەکرێت کە هەر یەکێک لەم ڕەگەزانە بەتەنیا نابێت لەو کاریگەرییە ئەدەبییەی کە مەبەستە، بەڵکو هەریەکەیان پشت بەوانیتر دەبەستێت، هەروەها توێژینەوەی هەریەکێکیان بەمانای جیاکردنەوەی نییە لەوانیتر

مادام بەیەکەوە لکاون و کاریگەرییەکەیان بەشێوەیەکی ئالوگۆڕکراوە لەنێو خۆیاندا وەکو ئەندامەکانی جەستە کە ئەگەر یەکێکیان لەکارکەوت ئەوانیتریش بەدوایدا دەچن)) (الشایب، ١٩٩٤، ص ٣١). ئەم ڕەگەزانە لە هەموو ژانرێکی شیعریی و پەخشانیدا بوونیان هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێژەیی، واتە ڕێژەی بەکارهێنانیان لە ژانرێکەوە بۆ ژانرێکی تر جیاوازە، بۆ نموونە شیعر زیاتر پێویستی بە خەیاڵە وەک لەو ژانرانەی گێڕانەوەیان تێدایە، هەروەها ڕۆمانێکی خەیاڵی زانستی زیاتر خەیاڵی تێدا بەکاردێت، وەک لە ڕۆمانێکی واقیعی، کەواتە هەریەکە لە جۆرەکانی ئەدەب (بە ئەدەبی فۆلکلۆریشەوە) ڕێژەی بەکارهێنانی ڕەگەزەکان تیایاندا وەک یەک نییە. ڕەگەزەکانی ئەدەب لای زۆربەی نووسەر و توێژەران بریتیین لە (بیر thought، سۆز emotion، ئەندێشە imagination، شێوەی هونەری یان ڕوخسار (بونیادی هونەری) form)).

(د. شوکریە ڕەسول) ڕەگەزەکانی ئەدەب بۆ چوار ڕەگەز دابەش دەکات، کە بریتین لە:

١- بیر
٢- سۆز
٣- ئەندێشە
٤- شێوە = ڕوخسار (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١١).

نووسەر دوای ئەوەی بەکورتی پێناسەی هەر چوار ڕەگەزەکە دەکات، پاشان دێتە سەر باسی گرنگیی ئەم ڕەگەزانە لە ئەدەبدا و دوو بۆچوونی جیاواز لەبابەت ڕۆڵ و گرنگیی هەریەکە لەم ڕەگەزانە دێنێتەوە و دەڵێت: ((کەسانێک هەن پێیان وایە شێوە یان (ڕوخسار) ئەوەندە گرنگ نییە و نووسەر پێویستە هەموو وزەیەکی لە ناوەرۆکدا بەکار بهێنێ)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٢). لێرەدا مەبەستی ئەو نووسەر و ڕەخنەگرانەن کە (ناوەرۆک) بەسەر (ڕوخسار)دا زاڵ دەکەن. لەبابەت بۆچوونی دووەمیشەوە دەڵێت: ((کەسانی تریش هەن بە پێچەوانەی ئەمانەوە تەماشای مەسەلەکە دەکەن)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٢). لێرەدا مەبەستی ئەو نووسەر و ڕەخنەگرانەن کە (ڕوخسار) بەسەر (ناوەرۆک)دا زاڵ دەکەن. (د. شوکریە ڕەسول) دژی هەردوو بۆچوونەکە دەوەستێتەوە و لەگەڵ ئەوەدایە کە دەقی ئەدەبی سەرکەوتوو لە یەکگرتنی (ڕوخسار و ناوەرۆک)دایە و نابێت هیچ ڕەگەزێک بەسەر ئەوانیتردا زاڵ بکرێن و دەڵێت: ((بەرهەمی ئەدەبی سەرکەوتوو ئەو بەرهەمەیە کە

بڕوای بە یەکگرتوویی و گرنگی هەموو ڕەگەزەکان بێت)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٢). ئەم بۆچوونەی نووسەر تەواو زانستییە و ناشێ لەکاتی نووسین یان توێژینەوەی هەر دەقێکی ئەدەبی یەکێک لەم دووانە بەسەر ئەویتردا زاڵ بکرێت، چونکە ئەوەتا خودی ڕەگەزە ئەدەبییەکانیش دەچنە نێو ڕوخسار یان ناوەرۆکەوە، تەواو بەیەکەوە لکاون و یەکانگیرن و ڕێگەی پەرتەوازەیی لەنێو دەقدا نادەن.

**تەوەرەی سێیەم: جۆرەکانی ئەدەب (ژانرە ئەدەبییەکان) لەم کتێبەدا:**

نووسەر وەکو زۆربەی نووسەر و توێژەران، ئەدەبی بۆ هەردوو جۆری سەرەکی (شیعر – پەخشان) دابەش کردووە، ئەمەش دابەشکردنێکی شێوە تەقلیدییە کۆنەکەی ئەدەبە و لەم بارەیەوە دەڵێت: ((ئەم ئەدەبەش بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بە دوو بەشی هونەری سەرەکی کە ئەویش:

یەکەم: هونەری شیعر

دووەم: هونەری پەخشان)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٣). زۆربەی نووسەران و ڕەخنەگران ئەدەب بۆ ئەم دوو جۆرە سەرەکییە دابەش دەکەن، دەکرێت بڵێین ئەم دابەشکردنە تا ڕادەیەک گونجاو و ورد نییە، چونکە لە لایەک زۆرێک لە ژانرەکان ناگرێتە خۆی، لەلایەکی تریش ئەم شێوە دابەشکردنە کۆن و تەقلیدییە کە ڕاستەوخۆ ئەدەب بۆ (شیعر و پەخشان) دابەش دەکات. پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە چەند بنەمایەک هەن بۆ دابەشکردن و پۆلێنکردنی جۆرەکانی ئەدەب پشتیان پێ بەستراوە، لەمانەش (بونیادی هونەری، ناوەرۆک، جیهانبینی، شێواز) یان دەشێ بەگوێرەی پەیدابوونی ژانرەکە و ئەو گۆڕانکارییانەی بەدرێژایی مێژووی پەرەسەندنی بەسەریدا هاتووە و گۆڕانکاری بەسەر شێوە و بونیادەکەیدا یان هەندێک جار لەگەڵ شێوە و بونیادەکەی بەسەر ناوەرۆکیشیدا هێناوە)، لەم ژانرانە بکۆڵینەوە و دابەشیان بکەین. چونکە ژانرەکان چەسپاو نین و بەمەش گۆڕانکاری بەسەر ژانرەکاندا هاتووە، پەیڕەوکردنی ئەم بنەمایەی دواییان لای توێژەرانی سۆڤیێتی پێشوو زیاتر باو بووە، هەروەک (ئی. ئیلسبۆرگ) دەڵێت: ((شێوە تایبەتەکانی ژانرە ئەدەبییەکان، کە بەدرێژایی مێژوو دروستبوون بە حوکمی ئەوەی گوزارشتیان لە کۆمەڵێک حەزی بنچینەیی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی لە شێوەی پەرەسەندنێکی ئەدەبیی هونەری کردووە، ئەم شێوانە هەیکەلی تایبەتی خۆیان ون ناکەن، بەڵکو بەشێوەیەکی بەهێز پارێزگاری لە سیما بنچینەییەکانی خۆیان دەکەن، سەرەڕای ئەوەی هەر شێوەیەک

لەم شــێوانە ڕوخســارەکەی بەگــوێرەی هەر قۆناغێــک لە قۆنــاغە مێژووییەکــان گۆڕاوە)) (عـــدد مـــن البـــاحثين الســـوفييت، ١٩٨٠، ص ١١). کە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەشدا هەندێک ژانر و جۆر پەیدا دەبن، کە هەمان سیماکانی ژانری سەرەکییان هەڵگرتووە و سیما و تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکان هەرگیز ون نابن. لەم جۆرە توێژینەوە و دابەشکردنانەدا ژانرەکان ڕاستەوخۆ بەگوێرەی پەیدابوون و ئەو گۆڕانکارییــانەی کە بە درێژایــی مێــژوو بەســەریدا هــاتووە وەردەگیرێــت و لێیدەکۆڵرێتەوە، کە لێرەدا مەبەستمان سەرهەڵدان و پەیدابوونی ژانرەکەیە، نەک بەرهەمە ئەدەبییەکە بەو مانایەی کە مێژووی ئەدەب لێیدەکۆڵێتەوە، کە ئەمەیان باسێکی ترە.

لە لایەکی تریش ئاشکرایە بـە تێپـەڕبوونی کـات و گـۆڕانی سـەردەم و جۆراوجۆری پێویستییە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئیستاتیکی و خودییەکانی مرۆڤ سنووری ئەم دوو جۆرەی ئەدەب بە ڕادەیەک تێکەڵبوون کە ژانری نوێتر سەری هەڵــداوە و سیما و تایبەتمەندی و تـوخم و ڕەگـەزی هـەردوو جـۆری (شـیعر و پەخشان) لەخۆی دەگرێت، بۆ نموونە ژانرەکانی (پەخشانە شیعر، چیرۆکە شیعر، ڕۆمانە شیعر، دەقی والآ... هتد)، ئەگەرچی لەوانەیە سیما و تایبەتمەندی و توخمی یەکێک لەم دوو جۆرە سەرەکییەی ئەدەب بەسەر ئەم ژانرە نوێیانەدا زاڵ بن، بەڵام ئەمە هیچ لەو مەسەلەیە ناگۆڕێت کە ئەم ژانرە نوێیانە سیما و تایبەتمەندی و تەکنیکی تایبەت بە خۆیانیان هەیە، چونکە لە ئەنجامی نزیکبوونەوە و ئاوێتەبوونی ڕەگەز و سیما و تەکنیک و لایەنی هونەری شیعر و پەخشان دروستبوون. (د. شوکریە ڕەسول) دوور و نزیک هیچ ئاماژەیەکی بەم مەسەلەیە نەداوە، تەنانەت کە جۆرەکـانی ئـەدەبیش دابـەش دەکـات بـەهیچ شـێوەیەک ڕوونکردنـەوە لەسـەر دابەشکردنەکە نادات. دەکرا نووسەر جۆری سێیەمی ئەم پۆلینکردنەشی زیاد بکردایە و تایبەتمەندی ئەو ژانرانەی بخستایەتە ڕوو کە سوودیان لە تایبەتمەندی و توخم و ڕەگەزەکانی شیعر و پەخشان وەرگرتووە و جۆرێک لە تایبەتمەندییان بەم دەقانە بەخشیوە کە تا ڕادەیەک لە ژانرە جیاوازەکانی شیعر و پەخشان جیاوازترن.

لەبارەی سەرهەڵدانی شیعر و پەخشانیشەوە، (د. شوکریە) باوەڕی وایە کە شیعر پێش پەخشان سەری هەڵداوە (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٤). هەڵبەت لەم بارەیەوە دوو بۆچوونی جیاواز هەیە کە ((ئایا هۆنراوە و پەخشان کامیان کۆنترە، ئەمە جێگای گفتوگۆیە. دوو ڕای جیاواز لەم بارەیەوە هەیە:

ڕای یەکەم: دەڵێ هۆنراوە پێش پەخشان هاتووە. لایەنگرانی ئەم ڕایە بەڵگەیان ئەمەیە:

١- هۆنراوە زمانی هەست و سۆزە، کەچی پەخشان زمانی هۆش و ئاوەزە، جا لەبەرئەوەی سۆز پێش هۆش پەیدا بووە، دەبێ هۆنراوە پێش پەخشان هەبووبێ.

٢- کۆنترین دەقی ئەدەبی کە لە کۆنەوە مابێتەوە، لای هەر نەتەوەیەک، دەقی هۆنراوەیە نەک پەخشان.

ڕای دووەم: دەڵێ پەخشان پێش هۆنراوە هاتووە. لایەنگرانی ئەم ڕایە بەڵگەیان ئەمەیە:

١- مرۆڤ یەکەم جار کە زمانی پڕاوە بە پەخشان زمانی پڕاوە نەک هۆنراوە، واتە لەپێشدا قسە هەبووە ئینجا مرۆڤ هەوڵیداوە ئەم قسەیە بخاتە قاڵبی کێش و ئاواز و سەروا و هۆنراوە بێنێتە کایەوە.

٢- مرۆڤ یەکەم جار ئەدەبی بەهۆی ئەو خوتبانەوە داهێناوە کە لە مەیدانی شەڕ وتراون. بەڵام بۆچی ئەو خوتبانە بە ئێمە نەگەیشتوون و هۆنراوەکە پێمان گەیشتووە؟)) (گەردی، ١٩٨٧، ٣-٤). لەگەڵ ئەمەشدا شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەدەبی هەموو نەتەوەیەک بە شیعر دەستی پێکردووە، بۆیە (د. شوکریە)ش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدایە کە دەڵێت شیعر پێش پەخشان سەری هەڵداوە.

### - پێناسەی شیعر:

لەڕووی زاراوەییەوە لە ئینگلیزیدا زاراوەی (Poetry) و لە عەرەبیدا زاراوەی (شعر) و لە زمانی کوردیشدا زاراوەکانی (شیعر، هۆنراوە) بەکارهاتوون. چەمکی شیعر قسە و باسی زۆر هەڵدەگرێت و چەمکێکی فراوانە و تا ئێستا زۆرێک لە نووسەر و ئەدیب و توێژەران بەگوێرەی ئایدۆلۆژیا و ڕێبازە ئەدەبی و تیۆرە ئەدەبییەکان و گۆڕانی سەردەمەکانەوە پێناسەی چەمکی شیعریان کردووە، هەیانە لەڕوانگەی تیۆری لاساییکردنەوەوە هەیانە لە ڕوانگەی تیۆری گوزارشتکردن، هەیانە لە ڕوانگەی تیۆری ڕەنگدانەوە، هەیانە لە ڕوانگەی تیۆریی داهێنانەوە، یان لە ڕوانگەی تیۆرەکانی (هونەر بۆ هونەر) یان (هونەر بۆ کۆمەڵگا) ئەم چەمکەیان لێکداوەتەوە. شیعر ئەو ژانرە ئەدەبییەیە کە پانتاییەکی فراوانی لەنێو ئەدەبیاتی جیهانیدا هەیە و لە ئەدەبی میللەتاندا پێش پەخشان سەری هەڵداوە. لە کۆنەوە کاتێک پێناسەی شیعریان کردووە بە وتەیەکی کێشداری سەرواداریان ناساندووە،

هەروەک (قودامەی کوڕی جەعفەر) دەڵێت: ((شیعر وتەیەکە کێش و سەروا و واتای هەیە))(بن جعفر، ١٩٦٣، ص ١٥). لێرەدا شیعر بەهۆی چەند تایبەتمەندییەکەوە پێناسە کراوە، کە بریتیین لە بوونی (کێش، سەروا) پاشان بوونی (واتا). هەڵبەت شیعر ژانرێکە بەهۆی چڕی و پوختی و کورتی و تۆکمەیی و ئیستاتیکیی زمانەکەیەوە جیادەکرێتەوە، کە بەهۆیەوە جۆرە تایبەتمەندییەک بە شیعر دەدات و دەکرێت بڵێین ((شیعر جۆرێکە لە زمان، هەموو کەس دەستی پێناگات، تەنیا ئەوانە نەبێت کە توانایەکی نموونەیی تایبەتیان هەیە))(السامرائي، ١٤٠٤، ص ١٥)، شیعر خۆی بریتییە لە بەکارهێنانێکی تایبەتی زمان، یان بەکارهێنانی هونەری و ئیستاتیکانەی زمان، کە تیایدا هەست و سۆز و نائاگایی و خەیاڵ و سروشت و جوانی و هەموو شتێک ڕەنگدەداتەوە، بۆیە (ڕەسافی) دەڵێت: ((شیعر بریتییە لە ئاوێتەیەک لە هەست و نەست، هەموو ئەوانەی لە سروشتدا هەن لە واتا و وێنە و هەرچی هەیە لەڕێگەی واژەوە تێیدا ڕەنگدەدەنەوە، ئەم ڕەنگدانەوەیەش کاریگەری دەخاتە سەر دەروون جا یان دڵ و دەروون ڕوون دەکاتەوە و دەیگەشێنێتەوە، یان دڵ و دەروون تەنگ دەکات و وێکی دەنێتەوە))(الجوزو، ١٩٨١، ص ١٥١). کەواتە شیعر هەست و سۆز دەوروژێنێت و ناخ و دەروون دەخاتە جووڵەوە، ئەویش لەڕێگەی هەموو ئەو ڕەگەزانەی کە لەخۆی دەگرێت، کە بەهەموویانەوە جیهانێکی پڕ لە نهێنی و نامۆ و سەیروسەمەرە دروست دەکات و سەرنجی وەرگر بەلای خۆیەوە ڕادەکێشێت.

(د. شوکریە) کاتێک پێناسەی چەمکی شیعر دەکات، لە ڕوانگەی دوو ڕێبازی ئەدەبییەوە پێناسەی شیعری کردووە، کە هەردوو ڕێبازی (کلاسیزم و ڕۆمانسیزم)ن. لەنێوان ئەم دوو ڕێبازەشدا بۆچوونی کۆمەڵێک فەیلەسوف و ڕەخنەگری وەرگرتووە و لە ڕوانگەی ئەوانەوە چەمکی شیعری ڕوونکردۆتەوە. دەبوایە نووسەر پێناسەی چەمکی شیعری لە ڕوانگەی ڕێبازەکانی تری وەک (ڕیالیزم و سیمبۆلیزم و سوریالیزم و .... هتد) بکردایە، بۆ ئەوەی باشتر چەمک و پێناسەی شیعری بەگوێرەی ئەم ڕێبازانەشەوە دەستنیشان بکردایە.

لە بابەت پێناسەی شیعر لای یۆنانی و ڕۆمانییەکانەوە، نووسەر سەرەتا لە بۆچوونەکانی (ئەفلاتون)ەوە دەست پێدەکات، دوای ئەوەی چەمکی شیعری بەگوێرەی (تیۆری لاساییکردنەوە و سەرچاوەی شیعر)ەوە ڕوونکردۆتەوە، ئەو جۆرە شیعرەی هەست و سۆز و ناوەوەی مرۆڤ دەوروژێنێت ڕەتدەکاتەوە (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٦-١٧). پاشان دێتە سەر بۆچوونەکانی (ئەرستۆ) و دیسانەوە بەپێی (تیۆری

لاساییکردنەوە و سەرچاوەی شیعر) باسی چەمکی شیعر دەکات و جیاوازییەکان لەگەڵ بۆچوونەکانی (ئەفلاتون) دەخاتەڕوو، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە (ئەرستۆ) بە پێچەوانەی (ئەفلاتون) زیاتر باوەشی بۆ شیعر و شاعیران کردۆتەوە (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٧-١٩). لای (هۆراس)یش بەگوێرەی (تیۆری لاساییکردنەوە و ئەرکی شیعر و ورووژاندنی خوێنەر)ەوە باسی چەمکی شیعر دەکات (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٩-٢٠). پاشان چەمکی شیعر لە سەدەکانی شانزەهەم و حەڤدەهەم تا سەدەی هەژدەهەم بەگوێرەی (تیۆری لاساییکردنەوە و ئەرکی شیعر)ەوە ڕووندەکانەوە، بۆچوونی هەندێک لە ڕەخنەگر و نووسەر و شاعیری ئەو سەردەمانەی بە نموونە هێناوەتەوە (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٠-٢٢). نووسەر هەوڵیداوە گۆڕانی چەمکی لاساییکردنەوە بە تێپەڕبوونی کات و گۆڕانی سەردەم دەستنیشان بکات، بەڵام بە وردی گۆڕانەکانی باس نەکردووە. جگە لەمەش نووسەر کە باسی شیعر دەکات ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە کە مەبەستی کام ژانری شیعرییە، بەڵکو بە گشتی باسی شیعری کردووە، دەبوایە لە ڕوانگەی ژانرەکانی (تراژیدیا و کۆمیدیا و داستان)ەوە باسی چەمکی شیعری بکردایە، چونکە کە باسی بۆچوونی کلاسیزمەکان دەکەین لەبابەت شیعرەوە دەبێت ئەوە بزانین کە لەم ڕێبازەدا ژانرەکانی (تراژیدیا و کۆمیدیا) بە پلە یەک و (داستان) بە پلە دوو دێت و هەموو بنەما ڕەخنەییەکانی ئەم ڕێبازە لە دەوری ئەم ژانرە شیعرییانە دەخولێنەوە.

نووسەر کاتێک پێناسەی شیعر بە گوێرەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم دەکات، باس لەوە دەکات کە ڕۆمانسیزمەکان بە پێچەوانەی کلاسیزمەکانەوە لە ڕوانگەی گوزارشتکردن لە خود و ناخ و هەست و سۆز و خەیاڵەوە لە شیعر دەڕوانن و دەڵێت: ((کە پێناسەی شیعر دەکەن لەو ڕوانگەیەوە بۆی دەچن کە شیعر گوزارشتە لە خودی شاعیر خۆی یان شیعر کاری خەیاڵە وێنەکانی ناو مێشکی شاعیر کە پەیوەندی بە سۆزەوە هەیە دەگونجێنێ و سەر لەنوێ بنیاتی دەنێتەوە)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٣). بۆ ئەم مەبەستەش بۆچوونی هەندێک لە شاعیر و نووسەرانی ڕۆمانسیزم بە نموونە دەهێنێتەوە. پاشان خۆی پێناسەیەک بۆ شیعر دەکات و دەڵێت: ((شیعر بەرهەمی مرۆڤێکی بەهرەداری بە ئەندێشەیە، کە بە ترپە و ئاواز تاقیکردنەوەکانی خۆی وەکو مرۆڤێکی ئەندامی کۆمەڵگایەک لە دووتوێی چەند وشە و ڕستەیەکی پڕ واتا و خەیاڵێکی فراواندا تۆمار دەکات)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٥). ئەم پێناسەیە لەژێر کاریگەریی تیۆری گوزارشتکردنی ڕۆمانسیزمەکانەوەیە و چەند بنەما

و رەگەزێکی شیعری لەخۆ گرتووە، کە لای رۆمانسیزمەکان وەکو دەستوری شیعر وان، کە بریتیین لە (گوزارشتکردن، خەیاڵ، هەست و سۆز، شێوازێکی چڕی جوان و واتادار).

### - جیاوازیی نێوان شیعر و پەخشان:

لەبابەت جیاوازیی نێوان شیعر و پەخشانەوە بۆچوونی جیاواز هەیە، ئەم دوو هونەرە سەرەکییەی ئەدەب بەگوێرەی چەندین پێوەر و تایبەتمەندییەوە لەیەک جیا کراونەتەوە، دەکرێت بڵێین ((ئەدەب بەشێوەیەکی گشتی بۆ شیعر و پەخشان دابەش دەبێت، و ئەو بنەما تەقلیدییەی کە ئەم دابەشکردنەی لەسەر ئەنجامدراوە بریتییە لە هۆنراو (النظم) و موسیقا، شیعر وتەیەکی کێشداری سەرواداره و پەخشانیش کێش و سەروای نییە. کەچی (ئەرستۆ) کە کتێبەکەی (هونەری شیعر) کۆنترینە کە بە ئێمە گەیشتبێ لە کتێبی ڕەخنەیی، بنەمای ئەم دابەشکردنە لای ئەو ناوەرۆکە نەک هۆنراو. پەخشان لای ئەو گرنگی یان وەسفی ئەوە دەکات کە ڕوویداوە، و هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە تاکن (ڕاستی تاک)، لەکاتێکدا شیعر گرنگی بە ڕاستییە گشتیەکان و هەموو ئەوانە دەدات کە دەشێ ڕووبدەن)) (مصطفى و علی، ١٩٨٩، ص ١٠٥). کەواتە بنەمای جیاکردنەوەی شیعر و پەخشان زیاتر بریتیین لە لایەنەکانی (مۆسیقا و ناوەرۆک و زمان).

(د. شوکریە) لە کتێبەکەیدا لە دوو شوێنی جیاوازدا باسی جیاوازیی نێوان شیعر و پەخشانی کردووە و هەوڵیداوە دیارترین جیاوازییەکانی نێوانیان بخاتە ڕوو (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٦، ل ١٢١-١٢٤). دەکرێت دیارترین جیاوازییەکانی نێوان شیعر و پەخشان لەم کتێبەدا لەم سێ خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- لایەنی مۆسیقا
٢- لایەنی ناوەرۆک و دەربڕین
٣- لایەنی زمان

نووسەر جیاوازیی نێوان شیعر و پەخشان زیاتر لە مەسەلەی (ریتم و مۆسیقا)دا زەق دەکاتەوە و دەڵێت: ((سنووری جیاکردنەوەی قاڵبی شیعر لە قاڵبی پەخشان ئەو مۆسیقایەیە کە ئاخافتنی شیعر بە ئیقاعە هەمە جۆرەکانی ڕێک دەخات و سەرواکانی دەوەستێتە سەر دەنگی ئەو پیتانەی لە کۆتایی دێرەکان یاخود نیوە دێڕەکانیدا دەلەرێنەوە و ئەم سنوورە مۆسیقایەی کە کاری شیعری لە کاری پەخشاناوی جیادەکاتەوە بناغەی قووڵ و پتەوی ئەوتۆی هەیە بە ئاسانی ناتوانین

دەست بەرداری بین)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٦-٢٧). هەرچەندە نووسەر باس لەوەش دەکات کە هەریەکە لە شیعر و پەخشان لە مەسەلەی ناوەڕۆک و ئەو چوار ڕەگەزەش کە لە دروستبوونی هەردووکیاندا هەن، جیاوازن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی ئەو جیاوازییانەی کە باسیکردوون لەو سێ خاڵەدا کۆدەبنەوە.

**- ژانرەکانی شیعر:**

شیعر لە چوار ژانری سەرەکی پێکهاتووە، کە بریتیین لە (شیعری لیریکی، شیعری داستانی، شیعری شانۆیی، شیعری فێرکردن). هەریەکێک لەم جۆر و ژانرانەی شیعر خاوەنی تایبەتمەندی و سیمای جیاوازن کە سروشت و سنووری هەر یەکێک لەم ژانرانەی دیاریکردووە.

(د. شوکریە) لە ژێر ناوی (هونەرەکانی شیعر)دا، وەک زۆربەی نووسەر و ڕەخنەگرانی تر ژانرەکانی شیعری بۆ چوار جۆرە سەرەکییەکەی شیعر دابەش کردووە، کە ئەوانیش بریتیین لە شیعری (گۆرانی، داستانی، شانۆیی (درامی)، فێرکردن) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٨٧). لەم کتێبەدا لەجیاتی وشەی (ژانر) یان (جۆر) وشەی (هونەر)ی بەکارهێناوە. دەکرا نووسەر هەریەکە لە وشەکانی (ژانر یان جۆر)ی بەکاربهێنایە، چونکە (هونەر) بۆ واتا و مەبەستی تر لەنێو ئەدەبدا بەکاردێت و لەوانەیە بۆ ژانر و جۆرەکانی شیعریی گونجاو نەبێت. لەبابەت ژانرە شیعرییەکانیشەوە بەم شێوەیە باسی کردوون:

**١- شیعری ویژدانی (لیریکی، گۆرانی):**

بۆ ئەم ژانرە شیعرییە زاراوەی جیاواز بەکارهاتووە، لە زمانی عەرەبیدا زاراوەکانی (الغنائي، الوجداني) و لە زمانی کوردیدا زاراوەکانی (گۆرانی، لیریکی، ویژدانی) بەکارهاتوون. بنچینەی زاراوەی (لیریک) بریتییە لەوەی ((Lyric لە وشەی یۆنانی Lyra ەوە هاتووە، ئامێرێکی مۆسیقا بووە، شیعری بە گۆرانییەوە پێ وتراوە)) (هالبێرگ و دانەرانی تر، ٢٠١٠، ل ٣٦). کە شیعرێکە زادەی ناخ و هەست و سۆزی شاعیرە و ((لێشاوێکە لە هەستە کەسییەکان، بابەتەکەی کەسییە، کە شاعیر وەسفی بارودۆخە دەروونییەکەی دەکات یان بەواتایەکی تر گوزارشتی لێوەدەکات بەهۆی ڕاناوی قسەکەری (من)، گۆڕەپانەکەی بریتییە لە خەونەکان و ئازارەکان و خۆشییەکان. هەڵوێستی شاعیر لێرەدا نەرێنییە بەواتای ئەوەی ڕووداوەکان کاری لێدەکەن، بۆخۆی کار لە ڕووداوەکان ناکات، هەروەکو (مالبرانچ Malberanche) دەڵێت شاعیر کارتێکراوە)) (فنسنت، د.س.ط، ص ٣٢) شیعری ویژدانی بە یەکێک لە

کۆنترین ژانرەکانی شیعر دادەنرێت، کە هەر لەوکاتەی مرۆڤ هەست و سۆزی جووڵاوە و ویستوویەتی گوزارشتی لێوە بکات، ئەم شیعرەش بوونی هەبووە. شاعیر لەم شیعرەدا گوزارشت لە خود و ناخ و دەروون و هەست و سۆزەکان دەکات، هەربۆیە بە شیعری خودیش ناسراوە و لەنێو ژانرەکانی شیعردا تاکە ژانرە کە هەست بە بوونی شاعیر دەکرێت لەنێو دێرە شیعرییەکاندا.

لەبارەی ئەم شیعرەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((ئەو شیعرەیە کە لە ناخ و دڵ و دەروونی شاعیر هەڵدەقوڵێ لە باسی ئازایەتی و ترس، شەڕ و خێر، خۆشی و ناخۆشی دەخولێتەوە. هەڵبەتە بەهۆی ئەوەی شاعیر لە ناخییەوە وشە دەردێنێ بەشێوەیەکی ڕوون و ئاسایی وێنەی شاعیر لەودیو دەربڕینەکاندا بەدی دەکرێت)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٨٧). نووسەر دوای ئەوەی هەندێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شیعرە بە کورتی باس دەکات، دواتر شیعری ویژدانی لەڕووی ناوەرۆکەوە ڕووندەکاتەوە و بۆ هەر ناوەرۆک و بابەتێکیش نموونەی شیعری کوردی دێنێتەوە، بەشێوەیەکی گشتی ناوەرۆکی شیعری ویژدانی بۆ ئەمانە دابەش دەکات:

١- شیعری شانازی: (شانازی کەسی، شانازیکردن بە نەتەوە).
٢- شیعری ستایش: (ستایش بەمەبەستی قازانج وەرگرتن، ستایشی پاک و بێ خەوش (ڕاستگۆیانە)).
٣- شیعری دڵداری: (دڵداری ئاسایی، دڵداری پاک و دڵداری ئاشکرا).
٤- شیعری داشۆرین: (داشۆرینی پێکهاتووەکانی لەش، داشۆرینی سیفەتە دروستکراوەکان).
٥- شیعری دلێری.
٦- شیعری وەسف: (وەسفی گوێزانەوە، وەسفی تەنی، وەسفی دیاریکردن، وەسفی هێمادار).
٧- شیعری لاوانەوە: (شین و شەپۆڕ، دەستوری شین، پرسە) یان (لاوانەوەی تایبەتی، لاوانەوەی گشتی).
٨- شیعری مەینۆشی.
٩- شیعری ڕامیاری.
١٠- شیعری کۆمەڵایەتی.
١١- شیعری نیشتیمانی (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٢٨-٨٧).

ئەمەیان پۆلینکردنی شیعرە لەڕووی مەبەست و ناوەڕۆکەوە، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ پۆلینکردنی شیعر لەڕووی بونیادی هونەرییەوە.

### ٢- شیعری داستانی:

ئەم ژانرە کۆمەڵێک ناوی جیای بۆ بەکارهاتووە، لە زمانی ئینگلیزیدا (Epic)ی بۆ بەکارهاتووە، کە ((Epic ئێپیک لە وشەی یۆنانی (Epos)ەوە هاتووە بەواتای (وشە، ئەوەی وتراوە یان دەگێڕێتەوە)))(هالبێرگ و دانەرانی تر، ٢٠١٠، ل ٣٦). لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (الشعر الملحمي) و لە زمانی فارسیدا زاراوەی (شعر حماسی) و لە زمانی کوردیشدا زاراوەی (شیعری داستانی، داستانە شیعر) بەکارهاتووە. ئەم شیعرە بە شیعرێکی بابەتی دادەنرێت و شاعیر بۆی نییە باس لە هەست و سۆزە تایبەتییەکانی خۆی بکات ((داستان چیرۆکێکی شیعریی پاڵەوانێتی نەتەوەییە و لەڕێگەی کاروباری نائاسایی و لە رادەبەدەر بونیاد دەنرێت، و تیایدا ڕاستییەکان و ئەفسانەکان، و بیروباوەڕە ئایینی و گیانییەکان تێکەڵ دەبن))(مصطفى و علی، ١٩٨٩، ص ١١٣). لەنێو داستانەکاندا و لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکان واقیع و خەیاڵ، کردەوەی ئاسایی و نائاسایی و سەرووی هێزی مرۆڤ، بیروباوەڕی جیاواز، مرۆڤی ئاسایی و مرۆڤی خەیاڵی تێکەڵی یەکتر دەبن و شاعیر باس لەو شتانە دەکات کە لە دەرەوەی خودی خۆیەتی ((باسی پاڵەوانێتی نەتەوایەتی دەکات و ڕووداوەکانی لە راستی و خەیاڵەوە ئاوێتەن. کەسانی ناو داستان، لەبارەی لەش و ئاوەزەوە لە کەسانی ئاسایی جیان، لەوان بەرزترن. زۆرجار پاڵەوانەکان لەگەڵ خواوەندەکان دەکەونە زۆرانبازی. داستان ئەفسانە و هەقایەتی میللی و شارستانێتی نەتەوایەتی و مێژووی دێرین و شەڕوشۆڕ و داب و نەریت و گیروگرفت و بیروباوەڕی سروشتی و ئەودیو سروشتی تێدایە))(ئەرستۆ، ٢٠٠٤، ل ١١٢). ئەم بابەتانە لە سەدان و هەزاران دێرە شیعر باسدەکرێن و لەگەڵ خەیاڵ و مێتافیزیکا و بە زمانێکی بەرزی هونەریی و تۆکمە ئاوێتەی یەکتر دەکرێن.

لەبارەی ئەم جۆرە شیعرەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((شیعرێکی چیرۆک ئامێزە، سەرگوزەشتەیەکی ڕووداو دەگێڕێتەوە کە بە ژیانەوە بەستراوە، ڕاستی ژیان لە دەروونی خاوەن بەرهەمەکە دێنێتە دەرەوە و وێنەی قارەمانێتی و ئازایەتی مرۆڤ پیشان دەدات))(رەسول، ١٩٨٩، ل ٨٨)، پاشان کورتەیەکی مێژوویی لەبارەی کۆنترین و بەناوبانگترین داستانەکانی جیهان دەخاتە ڕوو و هەندێک لە

تایبەتمەندییەکانی داستان دەخاتە ڕوو. نووسەر داستان لەڕووی (دروستبوون) و (مەبەست)ەوە بەم جۆرە دابەش دەکات:

- داستان لەڕووی دروستبوونەوە: (داستانی خۆکرد، داستانی دەستکرد)
- داستان لەڕووی ناوەرۆکەوە: (داستانی قارەمانێتی، داستانی دڵداری) (رەسول، ١٩٨٩، ل ٩٠).

**٣- شیعری شانۆیی (درامی):**

لەڕووی زاراوەییەوە ((Drama هەر یۆنانیە و لە Drao وەیە بەواتای (پێشکەشکردن، هەڵدەسووڕێنم، کاردەکەم))) (هالبێرگ و دانەرانی تر، ٢٠١٠، ل ٣٦). لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (الشعر الدرامي، الشعر المسرحي) و لە زمانی فارسیدا زاراوەی (شعر دراماتیک، شعر نمایشی) و لە زمانی کوردیدا (شیعری شانۆیی، شیعری درامی) بەکارهاتوون. شیعری شانۆیی ((ئەو شیعرەیە کە دەهۆنرێتەوە نەک بۆ خوێندنەوە یان وتن، بەڵکو بۆ نمایشکردن لەسەر شانۆدا)) (مصطفی و علی، ١٩٨٩، ص ١١٧). واتە ئەم ژانرە شیعرییە بۆ گێڕانەوە و خوێندنەوە نییە، بەڵکو بۆ نمایشکردن و پێشکەش کردنیەتی لەسەر دەپی شانۆدا کە ((گوزارشتە لە کردەوە و نمایش..... لەم جۆرەدا کەسێتی لە گۆشت و خوێن دەبینین لەبەر دەممانـدا جووڵە دەکەن. و بابەتی ئەم جۆرە بریتییە لە ئیرادەی مرۆڤایەتی، کە تیایدا یان ڕووداوە دەرەکییەکان یان سۆزە کەسییەکان نمایش دەکرێن، دراما لە بنەڕەتدا گوزارشتە لە جەنگ)) (فنسنت، د.س.ط، ص ٣٢). ئەم شیعرە تایبەتمەندی خۆی هەیە و لە شیعری داستانی جیاوازە، ڕاستە هەردووکیان ڕووداوەکان پێشکەش دەکەن، بەڵام ئەوەی شیعری داستانی بەهۆی گێڕانەوە دەبێت، کەچی ئەوەی شیعری شانۆیی بەهۆی پێشکەشکردنەوە دەبێت لەڕێگەی جووڵەی کۆمەڵێک کارەکتەر و دیمەنی جیاواز و گفتوگۆی نێوان کارەکتەرەکانەوە، وەک ئەوەی بینەر خۆی لەنێو واقیعی ڕووداوەکان بژیت و بەچاوی خۆی بیانبینێت.

لەبارەی شیعری درامییەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((واتای شیعری درامی شیعری جموجووڵەیە ئەو شیعرەیە کە بەشێوەی گفتوگۆ دەنووسرێ و لەسەر شانۆ تەمسیل ئەکرێ)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ٩١). پاشان دابەشکردنە کۆنەکەی یۆنانییەکان بۆ شیعری شانۆیی دێنێتەوە و ئەم جۆرە شیعرە بۆ دوو جۆر دابەش دەکات:

- شیعری تراژیدیا (مەرگەسات).
- شیعری کۆمیدیا (بەزمەسات). (رەسول، ١٩٨٩، ل ٩١).

نووسەر پێناسەیەکی سادە بۆ هەردوو جۆری شیعری شانۆیی دەکات و هەوڵیداوە هەردوو زاراوەی (مەرگەسات و بەزمەسات) لەجیاتی (تراژیدیا و کۆمیدیا) بەکاربێنێت، بەڵام ئەم دوو زاراوەیە پڕ بە پێستی (تراژیدیا و کۆمیدیا) نین.

نووسەر باسی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی ئەوروپیدا دەکات و بنچینەکەی بۆ ئەو جەژنانە دەگەڕێنێتەوە کە یۆنانییە کۆنەکان لە وەرزی میوە چنیندا بۆ (دیۆنیزیۆس)یان سازکردووە و سەرەتا لەنێو باخچە و کێڵگەکاندا ئەم جۆرە شیعرە نمایش دەکران و سەرەتا لەژێر سایەی ئایینەوە سەری هەڵداوە، دواتر وردە وردە ئەم جۆرە شیعرە بە هەردوو جۆرەکەیەوە پەرەی سەندووە، بەتایبەتیش بەگوێرەی ڕێبازە ئەدەبییەکانی ئەوروپا ئیدی یاسا و ڕێساکانی ئەم ژانرە شیعرییە گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە، نووسەر هەوڵیداوە زۆر بەکورتی پەرەسەندنەکانی شیعری شانۆیی بەگوێرەی ڕێبازە ئەدەبییەکانی (کلاسیزمی تازە، ڕۆمانسیزم، ڕیالیزم، سیمبۆلیزم، سوریالیزم، بونگەرایی، ناماقوڵ (عەبەسییەت))ەوە دەربخات (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٩١-٩٢). نووسەر دەیەوێت ئەوە ڕوونبکاتەوە کە لەگەڵ گۆڕانی سەردەم و هاتنەکایەی بارودۆخی نوێ و پێداویستی خودی و دەروونی و کۆمەڵایەتی لە ئەوروپا، شیعری شانۆیی گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە و یاسا و دەستوورەکانی تەواو گۆڕاون.

(د. شوکریە) باسی شانۆ و درامای کوردی دەکات و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بنچینەی ئەم شیعرە (یان شانۆ بە گشتی) بۆ بۆنە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردەواری دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی لە ئاهەنگی شەوارە و ساوەر کوتان و بووکە بە بارانە و سەمەنی و دروێنە و....هتد، کە هەندێک کەس خۆیان بۆ شێوەی ئاژەڵ و دێو و شوان و پاشا و .....هتد دەگۆڕی و لاسایی دەنگ و جووڵەی ئەمانەیان دەکردەوە، ئیتر ئەمە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و پەرەی سەندووە و لە سەیران و لەنێو قوتابخانەکانیشدا چالاکی شانۆیی ئەنجامدراوە، پاشان ناوی هەندێک شاعیر و نموونەی شیعری شانۆیی لە ئەدەبی کوردیدا دێنێتەوە، بۆ نموونە شاعیرانی وەک (پیرەمێرد و بێکەس و سەلام و گۆران) ڕۆڵی بەرچاویان لەم جۆرە شیعرەدا هەبووە. نووسەر گرنگییەکی تایبەت بە (گۆران)ی شاعیر دەدات و سێ نموونەی شیعری لای (گۆران) باس دەکات، کە ئەوانیش بریتیین لە (شۆڕشگێڕ، ئەنجامی ئەژدەهاک، گوڵی خوێناوی) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ٩٥-١٠٤). لێرەدا نووسەر کە

بنچینەی شیعری شانۆیی لە ئەدەبی کوردیدا بۆ بۆنە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێنێتەوە، ئاماژەی بە کاریگەریی ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی بێگانە بۆ سەر شیعری شانۆی کوردی نەداوە، چونکە ڕاستە بۆنە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگای کوردی ئەوسا هۆکارێک بوون بۆ سەرهەڵدانی ئەم ژانرە شیعرییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت کاریگەریی شیعری شانۆیی لە ئەدەبی ئەورووپی و ئەدەبی نەتەوەکانی دراوسێی کورد لەبیر بکەین، چونکە ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر شەنوکەوکردن و گۆڕان و جێگیربوونی ئەم ژانرە شیعرییە لە ئەدەبی کوردیدا هەبووە.

### ٤- شیعری فێرکردن:

لە ڕووی زاراوەییەوە لە زمانی ئینگلیزی زاراوەی (Didactic Poetry)ی بەکارهاتووە ((ئەم وشەیە Didaktos یۆنانییە و مانای فێرکردن، فێرکاری دەگەیەنێت. ئەم بەشەی ئەدەب بیری فەلسەفی، ئایینی، ئەخلاقی و زانستی لە فۆرمێکی ئەدەبیدا پێشکەش دەکات)) (هالبێرگ و ئەوانیتر، ٢٠١٠، ل ٥٣). لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (الشعر التعليمي) و لە زمانی فارسیدا (شعر تعلیمی) و لە زمانی کوردیدا (شیعری فێرکردن)ی بۆ بەکارهێنراوە. شیعری فێرکردن ((وەکو هۆکارێک بۆ فێرکردن بەکارهێنراوە و هەواڵ و زانیاری لەبارەی ئاکار یان ئایین یان کشتوکاڵ یان مێژوو و شتی تر لەخۆی دەگرێت. کۆنەکان شیعریان وەک هۆکارێکی گونجاو و ئاسان بۆ فێرکردن بەکارهێناوە چونکە بۆ لەبەرکردن ئاسان بووە بەهۆی کێش و سەرواکەیەوە، مرۆڤ لەکاتێکا هێشتا نووسینی نەزانیوە پێیوابووە کە زانست و زانیاری بگوازێتەوە بەم هۆکارە بڵاوی بکاتەوە. مەبەستی سەرەکی لە شیعری فێرکردن وروژاندنی هەست و سۆزەکان و کاریگەری خستنە سەر دەروون نییە، وەک ئەوەی لە شیعرەکانی تر هەیە، بەڵکو بریتییە لە لەبەرکردنی زانیاری و ڕاستییە زانستی و ئاکارییەکان)) (مصطفى و علی، ١٩٨٩، ص ١٢٣). لەم ژانرە شیعرییەدا جیاواز لە ژانرەکانی تر شاعیر بۆی نییە باس لە هەست و سۆز و دەروون و ناخ بکات و گوزارشت لە ئێش و ئازارەکانی خۆی یان مرۆڤ بکات، چونکە ئەم جۆرە شیعرەی بۆ پاراستن و بڵاوکردنەوە و لەبەرکردنی زانست و زانیارییەکان بەکارهێناوە، ئەمە تا سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، کەچی لەم سەدە بەدواوە زۆربەی

زانستەکان بەزمانی پەخشان نووسرانەوە و مرۆڤی ئەو سەردەمە دەستبەرداری ئەوە بووە کە بەشیعر زانیارییەکان تۆمار بکات.

(د. شوکریە) لەبارەی ئەم جۆرە شیعرەوە دەڵێت: ((ئەو شیعرەیە کە سوود بە خوێنەر ئەگەیەنێ، لە هەڵسوکەوت و ژیانی ڕۆژانەیدا. لەڕێگەی دەربڕینی ڕایەک یان پەندێک یان ڕاسپاردنێک یان ئامۆژگارییەک، لە چەند دێڕێکی ئاشکرا و دیاریکراودا بە زووترین کات لەبەر ئەکرێت و ئەوترێتەوە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٠٦). پاشان بە کورتی باسی چەند شاعیرێکی کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی و ئەورووپی دەکات و لە ئەدەبی کوردیشدا چەند نموونەیەکی شیعری ئەو شاعیرانە دێنێتەوە کە شیعری فێرکردنیان هەیە، بۆ نموونە شیعری فێرکردنی هەریەکە لە (ئەحمەدی خانی و شێخ مارف نۆدێیی و گۆران و کاکەی فەللاح و زێوەر)ی بە نموونە هێناوەتەوە و بەگوێرەی قۆناغەکانی تەمەنی منداڵان (کە چوار قۆناغی دیاریکردووە) باسی شیعرەکانی کردووە (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٠٧-١١١). گوایە منداڵان لەهەر قۆناغێکی تەمەنیاندا پێویستییان بە جۆرێک شیعر هەیە کە لەگەڵ عەقڵ و توانا و دەروونیاندا بگونجێت. نووسەر زیاتر گرنگی بەو جۆرە شیعرانە داوە کە بۆ منداڵان نووسراونەتەوە، بەڵام شیعری فێرکردن تەنیا بۆ منداڵان نییە، بەڵکو ئەم جۆرە شیعرە بۆ گەورانیش نووسراوە و لایەنێکی فیکری فەلسەفی یان پەند و ئامۆژگاری و زانیارییەکی وای تێدابێت کە ڕێگای ڕاستی ژیان بۆ گەورەکانیش ڕوونبکاتەوە و بۆیان ببێتە بەرچاوڕوونی. هەر خودی ئەم شیعرە بۆ مەسەلەی فێرکردن و پێدانی زانیاری لەسەر شتە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ نووسراوە، نەک ئەوەی تەنیا بۆ منداڵان بنووسرێت تا فێری زانیاریی نوێ ببن، وەک ئەوەی نووسەر بۆی چووە.

## دووەم: پەخشان و ژانرەکانی پەخشان

- پێناسەی پەخشان:

لەڕووی زاراوەییەوە لە ئینگلیزیدا زاراوەی (Prose) و لە عەرەبیدا زاراوەی (نثر) و لە کوردیشدا زاراوەی (پەخشان) بەکارهاتوون. پەخشان لەڕووی بونیادی هونەری و شێوازەوە جیایە لەگەڵ شیعر، ئەو سیما و تایبەتمەندییانەی پەخشان هەیەتی وایکردووە جۆر و ژانرە پەخشانییەکان لەگەڵ ژانرە شیعرییەکان جیابن. پەخشان پەیڕەوی ئەو دەستور و سیمایانە ناکات کە شیعر هەیەتی. (د. شوکریە)

چەمکی پەخشانی لە دوو ڕووەوە ڕوونکردۆتەوە، سەرەتا هەوڵیداوە لەڕووی فەرهەنگییەوە واتاکەی باسبکات و دەڵێت: ((لەڕووی واتای فەرهەنگییەوە پەخش واتە: بڵاودەکرێتەوە. پرچی بەسەر شانیا (پەخشە). پەخشان واتە (پەخشان بوون) بڵاوبوونەوە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٢٥). بۆ ئەمەش سوودی لە فەرهەنگی (خاڵ، بەشی یەکەم، شێخ موحەممەدی خاڵ) وەرگرتووە. پاشان پێناسەی چەمکی پەخشان دەکات و دەڵێت: ((بە قسەیەکی زۆری هونەری ڕێک نەخراو ئەوترێ کە شیعر نەبێ)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٢٥). ئەم پێناسەیەی نووسەر لەژێر کاریگەریی هەردوو نووسەری کۆنی عەرەب (ئیبن خەلدوون) و (قودامەی کوڕی جەعفەر)ە، چونکە نووسەر پێناسەی ئەوانیشی هێناوەتەوە و هەر لە ڕوانگەی ئەوانیشەوە بۆ پەخشان چووە، یان لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ((پەخشان هونەرێکی وتنە و هۆش و هەستی مرۆڤ پیشان دەدات و دوورە لە کێش و سەرواوە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٢٥). نووسەر هەوڵیداوە لە ڕێگەی دوو تایبەتمەندیی پەخشانەوە (پیشاندانی هۆش و هەست، نەبوونی کێش و سەروا) پەخشان بناسێنێ، بەڵام هەر نووسەر خۆی لە باسی جۆرەکانی پەخشاندا ئاماژە بە دوو جۆری پەخشان دەکات، کە یەکێکیان کێشی هەیە و سەروای نییە، جۆرەکەی تریان تەنیا سەروای هەیە. کەواتە ئەم ڕایەشی لەگەڵ پێناسەی دووەمی بۆ پەخشان ناگونجێت. بەگشتی ئەو پێناسانەی نووسەر بۆ پەخشانی کردووە کۆن و تەقلیدین و زیاتر بۆ مەبەستی جیاکردنەوەی شیعر و پەخشان بەکارهاتوون.

- جۆرەکانی پەخشان:

پەخشان کە جۆرێکی سەرەکی ئەدەبە، جگە لەم هەموو ژانرە جۆراوجۆرانەی کە هەیەتی وەک (چیرۆک و ڕۆمان و وتار و گوتار و ژیاننامە و نامە و شانۆیی و ..... هتد). چەند جۆرێکی هەیە کە هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە. زۆرێک لە نووسەر و ڕەخنەگران جۆرەکانی پەخشانیان بۆ چەندین جۆر دابەش کردووە، کە دیارترینیان ئەوەیە کە پەخشان بۆ هەردوو جۆری (زانستی و ئەدەبی) پۆلێن دەکات. هەریەکە لەم دوو جۆرەی پەخشانیش لەڕووی زمان و بابەت و شێوازی گەیشتن بە ئەنجام و مەسەلەی هەست و سۆز و عەقڵ و..... هتد لەگەڵ یەکتر جیاوازن.

(د. شوکریە رەسول) لەم کتێبەیدا بەشێوەیەکی گشتی پەخشان بۆ ئەمانەی خوارەوە دابەش دەکات:

پەخشان لەڕووی هونەرەوە



پەخشانی هونەری یان ئەدەبی — پەخشانی زانستی

پەخشانی هونەری/ زانیاری (لەڕووی ڕوخسارەوە)

پەخشانێکی ڕووتی سادە (پەخشانی زانیاری) — پەخشانی خاوەن کێشی بێ سەروا — پەخشانی سەروادراری بێ کێش

پەخشان (لەڕووی ناوەڕۆکەوە)

پەخشانی کۆمەڵایەتی — پەخشانی سیاسی — پەخشانی ئەدەبی

وتار
خوتبە
چیرۆک (چیرۆکی کورت و نۆڤڵ و ڕۆمان)
شانۆگەری
ژیاننامە (یاداشت — بیۆگرافیا)
پەندی پێشینان و قسەی نەستەق
بیرۆکە
دانان
لێکۆڵینەوە
نامە
وەرگێران
مێژوو
وتووێژ (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٣٣-١٣٥)

پاشان بە کورتی پێناسەی هەریەکێک لەم جۆرانەی پەخشان دەکات و نموونە بۆ هەندێکیان دێنێتەوە. ئەوەی زیاتر بەلای نووسەرەوە گرنگ بێت، پەخشانی

ئەدەبییە و پاشان ژانرەکانی پەخشانی ئەدەبی دەستنیشان دەکات، ئەوەی جێگای سەرنج بێت لەم دابەشکردنەی ژانرەکانی پەخشانی ئەدەبی ئەوەیە کە نووسەر (پەندی پێشینان و قسەی نەستەق)ی بە ژانری پەخشان داناوە، دەکرێت بڵێین ڕاستە (پەند و قسەی نەستەق) بە شێوازی پەخشان دەنووسرێن، بەڵام ئەم دووەیان جۆرێک نین لە پەخشان، بەڵکو جۆرێکن لە ئەدەبی فۆلکلۆر و ناکرێت بخرێنە نێو جۆرەکانی یان ژانرەکانی پەخشانی ئەدەبییەوە. ڕاستە هەندێ لەم جۆرانەی ئەدەبی فۆلکلۆری بوونەتە هۆی لەدایکبوونی ژانری نوێتر، وەک ئەوەی چیرۆک و ڕۆمانی ئێستا دەدرێتە پاڵ ئەفسانە و داستان و سەرگوزەشتە کۆن و حیکایەتەکانەوە (چیرۆکی بەرئاگردان)، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەمانە ناچنە خانەی ژانرە ئەدەبییەکانەوە، پێموایە نووسەر کە ئەم جۆرانەی ئەدەبی فۆلکلۆری خستۆتە نێو ژانرەکانی پەخشانەوە ڕەنگبێ کەوتبێتە ژێر کاریگەریی هەندێ لەو نووسەر و ڕەخنەگرانەی عەرەب کە هەمان کاریان ئەنجام داوە، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە زیاتر پۆلینکردنێکە بە مانا ئەوروپییەکەی، چونکە هەر لە کۆنەوە پۆلینکردنی ژانرەکان لای ئەوانەوە دەستی پێکردووە. هەروەها لە بابەتی (چیرۆک)دا هەرسێ ژانری (چیرۆکی کورت و نۆڤڵ و ڕۆمان)ی بەیەکەوە داناوە، کە ئەمەیان ناکرێت، ڕاستە هەرسێ ژانرەکە سەر بە ژانرە گێڕانەوەییەکانن و بونیادی هونەرییان لە یەکەوە نزیکە، بەڵام دیسانەوە خاسیەت و تایبەتمەندی و تەکنیک و بنەمای تایبەت بە خۆیانیان هەیە و ناکرێت تێکەڵ بکرێن و لە ژمارە و جۆر و سروشتی ڕووداو و کەسێتی و کات و شوێن و هەندێ ڕەگەز و تەکنیکی تر و لەڕووی سنوور و قەبارەشەوە جیاوازن، جگە لەمەش نووسەر تەنیا باسی ژانری چیرۆکی کردووە و جۆرەکانی دیکەی چیرۆک و نۆڤڵ و ڕۆمانی فەرامۆش کردووە. دەکرا لە باسی ژانرەکانی پەخشانی ئەدەبیدا شوێنێکی تایبەتی بۆ (ژانرە گێڕانەوەییەکان) تەرخان بکردایە، یان باسی هەریەکەیانی بەجیا بکردایە. پاشان نووسەر هەریەکە لە (دانان و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان و نامە و وتووێژ)یشی خستۆتە نێو جۆرەکانی پەخشانەوە، چونکە خۆی دەڵێت جۆرەکانی پەخشان. کەچی دواتر خۆی دەڵێت (وتار و مێژوو و ژیاننامە و دانان) سەر بە پەخشانی زانیارییین. لێرەدا جۆرێک لە تێکەڵی لە زانیارییەکانیدا هەیە، چونکە جارێ هیچ یەکێک لەمانە (جگە لە وتاری ئەدەبی و نامەی ئەدەبی و ژیاننامە، کە ژانری پەخشانین، هەرچەندە نووسەر ئاماژەی بە جۆری ئەمانەش نەداوە و بەگشتی باسی کردوون) ئەوانیتر ناکەونە نێو ژانرەکانی

پەخشانەوە، دواتر لەم کتێبەدا مەبەست زیاتر بریتییە لەو ژانرە ئەدەبییانەی دەکەونە نێو پەخشانەوە، نەک پەخشانی زانیاری کە بۆ مەبەستی تر بەکاردەهێنرێن و تایبەتمەندییەکانیان لەگەڵ یەکتر جیاوازن، دواتر هەریەکە لە (مێژوو و وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە) ئەمانە بەهیچ جۆرێک ژانری پەخشانی هونەریی نین و ئەمانە زانست و لقی جیاوازی زانیارین، هەرچەندە بەشێوەی پەخشانیش دەنووسرێن، بەڵام جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ ژانرەکانی پەخشاندا هەیە، چونکە ئەمانە دەق نین، بەمانای ئەوەی لەلایەن دەقنووس و ئەدیبەوە دابهێنرێن و مامەڵەی دەقی ئەدەبییان لەگەڵدا ناکرێت.

(د. شوکریە) باسی پەخشانی کوردی و مێژووی پەخشانی کوردی کردووە و بە بڕوای ئەو کۆنترین پەخشان بەدەستی ئێمە گەیشتبێ، پەخشانەکەی (عەلی تەرەماخی)یە بەناوی (دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی) و هەندێ نموونەی پەخشانەکەی هێناوەتەوە. پاشان بەکورتی باسی (عەقیدەی کوردی)ی (مەولانا خالیدی نەقشەبەندی) و مەولودنامەکەی (شێخ حسێنی قازی) و (عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە)ی (مەلا مەحمودی بایەزیدی) کردووە و نموونەی پەخشانەکەیانی هێناوەتەوە. ئینجا بەکورتی باسی ڕۆڵی رۆژنامەی کوردی لە پەرەپێدانی پەخشانی کوردیدا کردووە (رەسول، ١٩٨٩، ١٧٨-٢١٠). لەبارەی یەکەم پەخشانی کوردییەوە، دەشێ بڵێین یەکەم پەخشانی کوردی (هەروەکو د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان پێیوایە) بریتییە لە پەخشانەکانی کتێبی (سەرەنجام)ی ئەهلی حەق، کە لە سەدەی حەفتەم و هەشتەمی کۆچی نووسراون (شوان، ٢٠١٢، ل ٦٨). چونکە ئەم کتێبە لە دوو بەش پێکهاتووە، پەخشان و شیعر، پەخشانەکان زیاتر باسی هەندێ مەسەلەی ئایینی و دروستکردنی گەردوون لە ڕوانگەی ئەهلی حەقەوە دەکەن و دەکرێت ئەمانە بە سەرەتایەک بۆ سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی دابنرێن.

- ژانرەکانی پەخشانی ئەدەبی:

پەخشان چەندین ژانری جیاواز دەگرێتەوە، کە تا ئێستاش توێژەران لە دەستنیشان کردنی سنوور و جۆری هەندێ لەو ژانرانە تەواو یەکلایی نەبوونەتەوە. مەبەست لەو ژانرانە ئەوانەن کە بەشێوەی پەخشان نووسراونەتەوە و پەیڕەوی دەستوور و ڕێساکانی شێوازی پەخشانیان کردووە، ئەمە لەپاڵ ئەوەی کە هەر ژانرێک تایبەتمەندی و دەستوری خۆی هەیە و بەهۆیەوە جیادەبێتەوە لە ژانرێکی تر.

(د. شوکریە) لەبابەت ژانرەکانی پەخشانەوە باسی هەندێکیانی کردووە، بۆ نموونە باسی ژانرەکانی (وتار، ژیاننامە، خوتبە، چیرۆک، گاڵتە و گەپ، شانۆگەری، پەند و قسەی نەستەق)ی کردووە.

**١- وتار:**

وتار کە لە زمانی ئینگلیزی (Essey) و لە زمانی عەرەبی (مقالة) و لە زمانی کوردیدا (وتار)ی بۆ بەکاردەهێنرێت، بریتییە لە ((گرنگترین جۆرەکانی پەخشانی ئەدەبی و بە چێژترینیانە، بریتییە لە داڕشتنێکی پەخشانی کورت و تەواو کە بەزۆری باسی یەک بابەت دەکات بەڕێگایەک کە ناکەوێتە ژێر باڵی هیچ یاسایەک، بەڵکو بەگوێرەی حەزی نووسەرەکە دەنووسرێت، بۆیە ڕێگا بە کەسێتی نووسەر دەدات کە تیایدا دەرکەوێت)) (امین، د.س.ط.، ص ٩٢). ئەم ژانرە لە فەرەنسا سەری هەڵداوە و (مۆنتێین Montaigne)ی نووسەری فەرەنسی ((یەکەم کەس بووە کە هونەری وتاری گەیاندە پۆپە. هەموو وتارەکانی بە دوو بەرگ بڵاوکردەوە بەناوی (هەوڵدان – Les essain))) (گەردی،١٩٨٧، ل ٣٣). لەم ژانرەدا نووسەر بۆچوونەکانی خۆی بەشێوەیەکی کورت و چڕ دەردەبڕێت، هەرچەندە وتار لەڕووی قەبارە و درێژییەوە سنوورەکەی دیار نییە، چونکە هەندێ وتار هەن درێژن و پشوو درێژییەکی باشیان دەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی وتار لەڕووی قەبارەوە کورت و چڕە.

لەبارەی وتارەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((نووسینێکی ئەدەبییە لایەنێ لە لایەنە دیاریکراوەکانی ژیان دەگرێتەخۆ، یا بابەتێکی تەسکی ژیان لێک دەداتەوە)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٣٨). ئەم پێناسەیە تەنیا بۆ وتاری ئەدەبی دەشێت، چونکە چەندین جۆری تری وتار هەن کە ئەدەبی نین و تایبەتمەندییەکانی ئەدەبییان تێدا نییە. لەبارەی خاسیەتەکانی وتارەوە، نووسەر هەندێ خاسیەتی باسکردووە، بۆ نموونە:

- کورتی: وتار پارچە نووسینێکی ئەدەبی کورتە لە چەند پەڕەیەک تێپەڕ ناکات و تێڕوانینێکی تەسکی نووسەر بۆ بابەتەکان دەگەیەنێت.
- پەخشانی کاری: وتار بیرکردنەوەی تێدا زاڵە و ئەمەش سۆز و خەیاڵ لە وتاردا بەلاوە دەنێت و ئەمەش جیای دەکاتەوە لە شیعر.

- تەکنیک: لەبارەی تەکنیکی وتارەوە هەر نووسەرێک ڕێگایەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دابەشکردن و ڕێکخستنی بیروڕاکان و ڕێکخستنی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی بابەتەکان و شێوازی باسکردنی بابەتەکان.

- خودخوازی: نووسەر سۆز و ڕای تایبەتی خۆی دەردەبڕێت و لەمیانەی وشە و دەربڕینەکانەوە کەسێتیی نووسەرمان بۆ دەردەکەوێت (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٣٨-١٣٩). ئەمانە ئەو تایبەتمەندی و خاسیەتانە بوون کە نووسەر پێیوایە هەر وتارێکی ئەدەبی دەبێت بیرۆکەکەی بە کورتی و چڕی دەربڕێت و لە نووسیندا بیر و عەقڵ زیاتر بەسەر هەست و سۆز و خەیاڵدا زاڵبێت و نووسەری وتار ڕێگایەکی تایبەت و تەکنیکی تایبەت بۆ نووسینی وتارەکەی و ڕوونکردنەوەی بابەتەکەی بگرێتەبەر و لەنێو وتارەکەشدا هەست بە بوونی کەسێتی و بڕیار و هەڵوێستی نووسەر بکرێت.

لەبارەی بابەت و جۆرەکانی وتارەوە نووسەر پێیوایە کە وتار هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە و دەڵێت: ((ووتار هەموو ئەم لایەنانە دەگرێت و لە لایەنێکا پڕنابێتەوە، لەگەڵ ئەوەش دەتوانین ووتار بەپێی بابەتەکەی جیابکەینەوە)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٣٩)، بۆیە جۆرەکانی وتار بەگوێرەی ئەو بابەتەی کە نووسەرەکە باسیدەکات دابەشدەکات.




پاشان پێناسەی هەر جۆرێکی بە کورتی کردووە، نووسەر وتار بەگوێرەی بابەتەکانی کۆمەڵایەتی و ڕەخنەیی و زانستی و فەلسەفی دابەشدەکات، باسکردنی ئەم بابەتانە لەنێو وتاردا شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە و هەندێ وتار هەن ئەدەبی نین، بەڵکو لەسەر بابەتی تر نووسراون و ناکرێت ڕەگەزەکانی ئەدەب تێکەڵ بەم وتارانە بکرێن، بۆ نموونە باس لە ڕاستییەکی زانستی دەکەن. بۆیە دەبێ ڕەگەزە سەرەکییەکانی وتار لە هەموو وتارێکدا پەیڕەو بکرێت، بەڵام باسکردنی هەر بابەتێکیش تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە دەبێ نووسەری وتار ئاگاداریان بێت و زانیاری لەبارەیانەوە هەبێت.

**٢- ژیاننامە:**

لە زمـــانی ئینگلیزیـــدا زاراوەی (Biography) و لە زمـــانی عەرەبیـــدا زاراوەی (سیرة) و لە زمانی کوردیدا زاراوەی (ژیاننامە، گەشتی ژیان، یاداشت) بۆ ئەم ژانـرە بەکارهـاتوون. ژیاننامـە یەکێکـە لـەو ژانـرە پەخشـانییانەی لـە سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهەمـەوە سـەری هەڵـداوە و دەکرێـت بڵێـین ژیاننامـە ((جۆرێکـە لـە ئـەدەب گـــەڕانێکی مێژووییـــە، مەبەســـت لێـــی ژیـــانی مـــرۆڤ و وێنەکێشـــانێکی وردی کەســـێتییەکەیەتی)) (البغدادي، ٢٠١٦، ص ١٩١). لـــەم ژانـــرەدا ژیـــانی مـــرۆڤ بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆجی و زنجیرەیی دەنووسرێتەوە و وەکو تۆمارێکی مێژوویـی وایـە کە هەموو ڕووداو و بەسـەرهات و چـالاکی و ئـەزموونێک کـە بەسـەر مرۆڤـدا هـاتبێ، تۆمار دەکرێت. هەڵبەت ئەمەش بە دوو شێوە تۆمار دەکرێت، ئەگەر هـاتوو کەسـەکە خۆی ژیانی خۆی نووسییەوە، ئەوا دەبێتە (ژیاننامەی خـودی)، ئەگـەر کەسـێکی تـر ژیانی کەسێکی تری نووسییەوە، ئەوا دەبێتە (ژیاننامەی بابەتی).

لـەبارەی پێناسـەی ژیاننامـەوە (د. شـوکریە) دەڵێـت: ((ژیاننامـە وەرگێڕانـی ژیانی مرۆڤێکە لە میانەی خستنە ڕووی وێنەیەکی ڕاستگۆ و پڕشنگداری ژیانی خـۆی و کۆمەڵایەتی)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٢). بێگومان ژیاننامە هەر بە ناوەکەیەوە دیارە کە باس لە ژیانی کەسێک دەکات و لەمیانەی ئەم ژانرەوە هەوڵدەدرێت هـەموو کـونج و کەلەبەرێکی ژیانی ئەو کەسـەی کـە مەبەسـتە پیشـان بـدرێت. هەڵبـەت ژانرێکـە و تایبەتمەنـدی و خەسـڵەت و شـێوازی تایبـەت بـەخۆی هەیـە و لـە ژانرەکـانی تـر جیادەبێتەوە.

لەبارەی بابەتی ژیاننامەوە نووسەر دەڵێت: ((بابەتی ژیاننامە کەسێتییەکە کە هـــەموو لایەنـــەکانی جەســـتەیی و کۆمەڵایـــەتی و ژیـــری و ســـۆزی و مێژوویـــی دەگرێتەوە)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٢). بەواتای ئەوەی نووسەری ژیاننامە هەوڵدەدات هەموو لایەنەکانی جەستەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ژیری و سۆزی و مێژوویـی و ئابووری و....هتد بخاتەڕوو. بەڵام نـەک بەشـێوازێک ئـەم لایەنانـە باسـبکات، کـە لـە قاڵبی ژیاننامە وەک ژانرێـک بیباتـە دەرەوە و مـۆرکی ژیاننامـە بـە بابەتەکـەوە دیـار نەمێنێت، بەڵکو دەبێـت ئاگـاداری ئـەوەبێت کـە چـۆن باسـی ڕووداو و بەسـەرهات و زانیارییەکان دەکات و هەموو ئەمانەشـی لـەپێناوی دەرخسـتنی کەسـێتی ئـەو کەسـە بێت کە باسیدەکات.

کە دێتە سەر باسی جۆرەکانی ژیاننامە، ئەوا پێیوایە دوو جۆری ژیاننامە هەیە و دەڵێت: ((ژیاننامەی خود خوازی (زاتی) و ژیاننامەی بابەتی (مەوزوعی)، جۆری یەکەم ئەدیب باسی خۆی دەکا وەکو مامۆستا مەسعودی محەمەد و علاءالدین سجادی (گەشتێک لە کوردستانا) و یاداشتەکانی رەفیق حلمی و جۆری دووەم: باسی یەکێکی تر دەکا وەکو (چیم دی)ی ئەحمەد خواجە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٥). پاشان هەندێک جیاوازی نێوان هەردوو جۆرەکە دەخاتەڕوو. نووسەر لێرەدا یاداشت و گەشتنامەی لەگەڵ ژیاننامەدا تێکەڵکردووە، چونکە ئەو نموونانەی ئەو هێناویەتیەوە یان یاداشتن، یان گەشتنامەن و نووسەرەکانیان هەوڵیان داوە ڕووداوەکان و کەسێتییەکان و مێژووی سەردەمانێک تۆمار بکەن، کە ڕەنگە نووسەرەکە ڕۆڵی تێدا هەبووبێ یان نەبووبێ، بۆیە ئەمە ناچێتە نێو ژیاننامەوە. ئینجا باسی شێوازی نووسینی ژیاننامە دەکات و پێیوایە نووسەران ئەو زانیارییانەی کە هەیانە بە دوو ڕێگا دەیخەنەڕوو:

- گێڕانەوەی چیرۆک ئامێز:
- خستنەڕوو و شیکردنەوە (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٦).

ئەوەی جێی سەرنج بێت، نووسەر تەنیا باسی ڕێگای یەکەمی کردووە و لایەنی باشی ئەم ڕێگایەی خستۆتە ڕوو و نموونەشی بۆ هێناوەتەوە، کەچی باسی ڕێگای دووەمی نەکردووە، کە دەبوو باسی جۆری دووەمیشی بکردایە، لەبریتی ئەمە باسی جیاوازیی نێوان چیرۆک و ژیاننامە دەکات.

**٣- گوتار:**

لە زمانی ئینگلیزیدا زاراوەی (Discours) و لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (خطابة، خطبة) و لە زمانی کوردیدا (گوتار، دواندەری) بۆ بەکارهاتووە، ئەم ژانرە هەر لە کۆنەوە گرنگی پێدراوە و هونەرێکە بۆ ڕازیکردن و قەناعەت پێهێنانی بەرامبەر، (ئەرستۆ) کاتی خۆی کتێبێکی لەسەر ئەم ژانرە پەخشانییە نووسیوە بەناوی (ڕیتۆریک، Rhetoric¬دواندەری، هونەری گوتاردان) و لەوێدا لەبارەی ئەم ژانرەوە پێیوایە کە هێزێکە گوتاربێژەکە لەپێناوی ڕازیکردنی گوێگر و وەرگرەکاندا بەکاری دێنێ، کاتێک دەیەوێت کارێک یان بارودۆخێکیان بۆ باس بکات. هەروەها جۆرەکانی و ڕەگەزەکانی و شێوازی گوتارەکانیشی ڕوونکردۆتەوە و بەو هێزەی چواندووە کە بۆ ڕازیکردن و قایلکردنی خەڵک بەکاردێت و هۆیەکە بۆ گەیاندن و بنەماکانیشی بریتیین لە (قسەکەر و قسە و گوێگر) (ارسطو، ١٩٥٩، ص ٧-٩).

لەبابەت پێناسەی گوتارەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((بریتی یە لە هونەری قسەکردن لەپێناوی قایل کردن و کارتێ کردندا)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٦). ئەم پێناسەیەی نووسەر کاریگەری پێناسەکەی (ئەرستۆ)ی بەسەرەوەیە، چونکە (ئەرستۆ)ش کاتێک پێناسەی (گوتار) دەکات، هەمان چەمک لە قسەکانیدا بەڕوونی دیارە وەک لەسەرەوە باسمانکردووە. پاشان باسی ئەوە دەکات کە (گوتاردان) بۆ خەڵک و جەماوەرە و چەند تایبەتمەندییەک بۆ گوتاربێژەکان دەستنیشان دەکات، کە لە سێ خاڵدا کۆیاندەکاتەوە:

- تایبەتمەندی هۆشەکی
- تایبەتمەندی ڕەوشتی
- تایبەتمەندی جەستەیی (١٤٦-١٤٧).

هەریەکێکیش لەم تایبەتمەندییانە چەندین لایەنی جیاواز دەگرنەوە، کە پەیوەندییان بە گوتار و گوتاربێژەوە هەیە و پێویستە گوتاربێژ ئەم مەرجانەی لێ بێتەدی و گوتارەکەشی جێگای ڕەزامەندی خەڵک و جەماوەر بێت.

لەبارەی بابەتەکانی ئەم ژانرەوە دەڵێت: ((خوتبە بابەتێکی تایبەتی یە و هەموو لایەنێکی ژیان دەگرێتەوە (ئەدەبی و فەلسەفی و هونەری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی و دادگایی)، جیاوازیی بابەتەکان بۆتە هۆی جیاوازیی جۆرەکانی خوتبە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٧). کەواتە گوتار بابەتی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت و بەنێو زۆرێک لە کایەکانی ژیاندا شۆڕبۆتەوە، هەر ئەمەش وایکردووە کە گوتاری جۆراوجۆر هەبێت، بۆیە نووسەر لەبارەی جۆرەکانی گوتارەوە سەرەتا جۆرەکانی گوتاری لای (ئەرستۆ) هێناوەتەوە، کە گوتاری (ئامۆژگاری و دادگایی و سەلماندن)ن، پاشان زۆر بەکورتی باسی چەند جۆرێکی تری گوتار دەکات، وەکو:



(رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٧-١٤٨).

پاشان باسی ئەوە دەکات کە دوو جۆری گوتار لە ئەدەبی کوردیدا باو بووە کە ئەمانیش گوتاری (ئایینی و سیاسی بوون و دەڵێت: ((بەپێ ی ڕەوتی گەشەکردنی کۆمەڵی کوردەواری هەمیشە و هەردەم لە ئارادا بووە)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٤٨).

واتا سەرهەڵدان و چالاک بوونی ئەم دوو جۆرەی گوتار لەنێو ئەدەبی کوردیدا پەیوەندی بە بارودۆخ و کۆمەڵگای کوردییەوە هەیە و ئەمە وایکردووە کە ئەم دوو جۆرە زیاتر لەنێو کۆمەڵگادا باوبن، بەلام دەکرێت بڵێین ئێستا جۆرەکانی تری گوتاریش بڵاون و نموونەیان لە نێو ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا هەیە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەم جۆرانەی گوتار تایبەتمەندی و ڕێککاریی خۆیان هەیە و هەریەکەی بەشێوازێک باسی بابەتەکان دەکات، ئەمەش بۆ زیاتر سەرنجڕاکێشانی خوێنەر و گوێگر.

٤- چیرۆک:

چیرۆک ژانرێکی پەخشانییە و ڕەگ و ڕیشەیەکی کۆنی هەیە، ئەفسانە و داستان و حیکایەتەکانی بەرئاگردان کە لە کۆندا باو بوون، بوونەتە بنچینە بۆ چیرۆک و (تەنانەت ڕۆمانیش). لەزمانی ئینگلیزیدا زاراوەکانی (Fiction,Story) بەکارهاتوون، لەزمانی عەرەبیدا زاراوەی (قصة) و زمانی کوردیشدا زاراوەی (چیرۆک) بەکارهاتوون. ئەم ژانرە پەخشانییە لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا سەری هەڵدا و پەرەی سەند و بەنێو ئەدەبیاتی نەتەوەکانی تردا بڵاوبووەوە. دەتوانین بڵێین ((چیرۆک کۆمەڵە ڕووداوێکە و نووسەر دەیگێڕێتەوە، کە ڕووداوێکە یان چەند ڕووداوێکە و پەیوەستە بە کەسێتییە مرۆڤایەتییە جیاوازەکانەوە)) (حمود، ١٩٩١، ص ٢٣٩). هەر لەبارەی چیرۆکەوە (تشارلتن) دەڵێت: ((چیرۆک حیکایەتێکە بەشێوەی پەخشان ڕوویێک لە ڕووەکانی چالاکی و جووڵانەوە لە ژیاندا دەگێڕێتەوە، باشترە کە چیرۆکێکی ئاسایی لەبارەی مرۆڤی ڕاستەقینەی ئاسایی و ژیانی لە جیهانی واقیعی دووبارەبووەوەی لە هەموو ڕۆژێکدا بگێڕێتەوە)) (سلام، د. س. ط، ص ٤). کەواتە چیرۆک ژانرێکە ڕووداو و چالاکی و جووڵانەوەکانی ژیان دەگێڕێتەوە و هەوڵدەدات دیمەن و ئەزموونە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ و ئەو ڕووداوانەی ڕووبەڕوویان دەبنەوە بخاتە نێو چوارچێوەیەکی ئەدەبییەوە. چیرۆکەکان لە سەرەتادا مۆرکێکی خەیاڵییان بەسەردا زاڵ بووە ئەم ڕەگەزە گرنگەی ئەدەب لەگەڵ واقیع لەنێو چیرۆکەکاندا ئاوێتەی یەکتر کراون ((چیروک تاوەکو سەردەمی هاوچەرخ بەلای خەیاڵدا دەشکایەوە، کە تیایدا ڕاستییە مرۆڤایەتییەکان تێکەڵ بە کارە غەیبییەکان کراون، بە سەیروسەمەرەیی و شتە نامۆکانەوە ڕازێنراوەتەوە، لە بونیادنانی ڕووداوەکاندا بنەمای هۆکاریی نازانرێت، هیچ بەستەرێک نییە ڕووداوەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە)) (مصطفی و علی، ١٩٨٩، ص ١٣١). دواتر لەگەڵ

پەرەسەندنی چیرۆک و گۆڕانی سەردەمدا ئیتر وردە وردە ئەم ژانرە لە واقیع نزیک بووەوە و لە جیهانی سەیروسەمەرەیی و شتە نامۆ و نادیارەکان دوورکەوتەوە و واقیعی کۆمەڵایەتی بوو بە تەوەری سەرەکی زۆربەی چیرۆکەکان.

(د. شوکریە) لە کتێبەکەیدا پێناسەی چیرۆک دەکات و دەڵێت: ((بریتی یە لە گێڕانەوەی چەند ڕووداوێکی یەک لەدوای یەک، کە بەسەر چەند کەسێکی جیاوازدا دێن و تێدەپەڕن لە شوێنەوارێکی دیاریکراودا)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٠). لەم پێناسەیەدا نووسەر چەند توخم و ڕەگەزێکی چیرۆکی دەستنیشان کردووە، کە بریتین لە (گێڕانەوە، ڕووداو، کەس و شوێن) و لە ڕوانگەی ئەم توخم و ڕەگەزانەوە پێناسەی چیرۆکی کردووە. ئەمەش پێناسەیەکی گشتییە بۆ چیرۆک و دەکرێت بڵێین هەموو جۆرەکانی چیرۆک لەم پێناسەیەدا بەشدارن، چونکە سروشتی هەموویان لەیەکەوە نزیکە، هەرچەندە هەریەکەیان هەندێک تایبەتمەندیی تایبەتی هەیە.

نووسەر دواتر جیاوازیی نێوان چیرۆک و ئەو ژانرانە دەخاتەڕوو، کە لە چیرۆک دەچن، بەتایبەتیش (داستان و شانۆگەری) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٠-١٥١). ئاشکرایە هەریەکە لەم سێ ژانرە لە زۆرێک لە توخم و ڕەگەز و تەکنیک و بنەماکان لە یەکتر دەچن، ئەگەرچیش ژانری جیاوازن و یاسا و ڕێسای تایبەت بەخۆیانیان هەیە بۆ ڕێکخستن و گێڕانەوە و پیشاندانی ڕووداوەکان.

- ڕەگەزەکانی چیرۆک:

هەموو چیرۆکێک لە کۆمەڵێک توخم و بنەما و ڕەگەز پێکهاتووە کە بونیادی هونەریی ئەم ژانرەی پێکهێناوە، توخم و ڕەگەزەکانی چیرۆک بریتیین لە (ڕووداو، کات، شوێن، کەسێتی، گێڕانەوە، زمان). هەر یەکێک لەمانەش تایبەتمەندی و جۆر و سروشتی خۆی هەیە و ئەرکێکی دیاریکراویان لەنێو چیرۆکدا هەیە و پەیوەندییەکی بەهێزیش لەنێوانیاندا هەیە، کە هەریەکەیان ئەرکی ئەوەیتر تەواو دەکات. ئەم توخم و ڕەگەزانە لە هەموو جۆرەکانی چیرۆک و ڕۆمانیش بوونیان هەیە و هاوبەشن، تەنیا ئەوە نەبێت کە لە قەبارە و ژمارە و چەندێتی و چۆنێتی بەکارهێنانیان لەم ژانرانەدا جیاوازن.

لای (د. شوکریە)ش چیرۆک پێنج ڕەگەزی هەیە، کە بریتیین لە ((ڕووداوەکان، کەسەکان، شوێنەوار، بیرۆکە، دەرهێنان)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥١). ئەگەر سەیری ئەم ڕەگەزانە بکەین لای نووسەر، دەبینین هەریەکە لە (کات و گێڕانەوە و زمان)ی تێدا نییە. پاشان لە ڕەگەزی (دەرهێنان)دا کۆمەڵێک تەکنیک و

ڕەگەزی تێکەڵ کردووە، کە هەندێکیان پەیوەندییان بە توخم و ڕەگەزەکانی چیرۆک و هەندێکی تریان پەیوەندییان بە تەکنیکەکانی گێڕانەوەوە هەیە.

**٩- ڕووداوەکان:**

یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی چیرۆک و بە ناوەخنی چیرۆک دادەنرێت ((کە تیایدا هەڵوێستەکان پەرە دەسێنن و کەسێتییەکان دەکەونە جووڵەوە و ئەو بابەتەیە کە چیرۆکەکە بە دەوریدا دەخولێتەوە)) (شریبط، ١٩٩٨، ص ٢١). بەهۆی ڕووداوەکانەوە گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوت و هەڵوێست و بڕیار و ئەزموونی کەسێتییەکاندا دێت و ڕووداو لەنێو چیرۆکدا دەبێتە هۆی گۆڕان لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی تر. سەرچاوەی ئەم ڕووداوانەش جیاوازن، لەوانەیە لە داهێنانی خەیاڵی چیرۆکنووس بێت، یان ئەزموون و ژیانی خۆی یان هی کەسانی تر بێت و لە واقیع وەرگیرابێت، یان لە سەرچاوە مێژوویی و کلتورییەکانەوە وەرگیرابێت.

لەبارەی ڕووداوەوە (د. شوکریە) دەڵێت: ((بریتی یە لەو زنجیرە گۆڕانانەی بەسەر ڕەوشتی کەسەکاندا دێت لە پەیوەندی و کارلێک کردنیان لەگەڵ ئەو شوێنەوارەی تێیدا دێن و دەچن)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥١). پاشان نووسەر باسی (دارشتنی چیرۆک) دەکات و دەڵێت: ((دارشتن بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان و پێکەوە بەستنی بەشەکانی و بەدیارخستنی هەڵوێستە لێک جیاکان پێک دێت)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥١). پاشان لەبابەت دارشتنی ڕووداوەکانی نێو چیرۆکەوە باسی کۆمەڵێک تەکنیک و بنەما دەکات کە هەستیان پێدەکرێت، وەک: (پێکەوە نووساوی، ساکاری و ئاڵۆزی، ڕێڕەوی ڕووداوەکان، پەرەپێدانی ڕووداوەکان، یەکێتی کار، ڕاستەقینەی ڕووداوەکان). نووسەر مەبەستی ئەوەیە کە لە چیرۆکدا دارشتنەکەی بەهێز بێت و ڕووداوەکان پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت، پاشان چیرۆکنووس دارشتنی ڕووداوەکان یان بە ساکاری و لەسەر یەک گێڕانەوە ئەنجام دەدات، یان بە ئاڵۆزی و لەسەر فرە گێڕانەوە ئەنجام دەدات. پاشان ئەو ڕووداوانە بەردەوام دەگۆڕێن و لەسەر یەک بار و ئەنجام نامێننەوە و سەرەتا ڕووداوەکان دەردەکەون و پاشان وردە وردە بەرەو ئاڵۆزی و لووتکە دەچن و پاشانیش بەرەو کرانەوە و کۆتایی هەنگاو دەنێن، هەڵبەت ئەو ڕوداوانەش هەموویان بە یەک ڕووداوی سەرەکییەوە پەیوەستن و ئاراستەکانیان بەرەو ڕووداوە سەرەکییەکەوە دەچن. ئینجا سەرچاوەی ئەم ڕووداوانەش جیان، هەیانە لە واقیع و هەیانە لە خەیاڵی نووسەر و ....هتد وەرگیراون (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥١-١٥٥). لێرەدا زیاتر مەبەست بونیادی

ڕووداوەکانە، واتە چۆنێتی بەدوای یەکداهاتنی ڕووداوەکان و زنجیرەی کات و چۆنێتی بەیەکەوە لکانیان. بەڵام نووسەر ئاماژەی بەهیچ یەکێک لە جۆرەکانی بونیادی ڕووداوەکان لەنێو چیرۆکدا نەداوە، چونکە چۆنێتی بونیادنانی ڕووداوەکان بە چەندین شێوە بونیاد دەنرێت، کە بریتیین لە (بونیادی زنجیرەیی، بونیادی تێهەڵکێش، بونیادی هاوتەریب، بونیادی بازنەیی).

**٢- کەسێتییەکان:**

کەسێتییەکان لەنێو چیرۆکدا ڕۆڵ و ئەرکی جیاوازیان هەیە و ((ئەوانەن کە ڕووداوەکانیان بەدەوردا دەخولێتەوە، یان ئەوانەن کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی ڕووداوەکان. کەسێتیی هەموو مرۆڤێکیش پێکهاتووە لە ڕەگەزی سەرەکی کە بریتیین لە لەدایکبوونی و ژینگەکەی و ڕەفتارەکانی، و ئەو بارودۆخەی ڕێگای پێگرتووە.)) (سلام، د.س.ط.، ص ١٤). هەموو ئەم ڕەگەزانە دەبن بە بنەمایەک بۆ بونیادنانی کەسێتییەکان، ئەمە جگە لەوەی کە دەبێت چیرۆکنووس ئاگاداری کەسێتیی نێو چیرۆکەکانی بێت لە ڕووی دەرەوە و ناوەوە (ناخ- دەروون) و هەوڵبدات بەشێوەیەکی لێهاتووانە کەسێتییەکانی بونیاد بنێت، سەرچاوەی کەسێتییەکانیش جیاوازە، دەشێ خەیاڵی بن، یان واقیعی بن.

(د. شوکریە) باسی کەسێتی دەکات و دەڵێت ((ئەوانیش چەند کەسێکن لە چیرۆکەکەدا دێن و دەچن و ئیش دەکەن و هەڵدەچن... ئەو کەسانە سەرچاوەی چێژ وەرگرتنی خوێنەرن)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٥). پاشان لەبارەی کەسێتییەوە ئاماژە بە دوو لایەن دەکات، کە بریتیین لە (ڕاستەقینەی کەسێتییەکان و جۆرەکانی کەسێتی). لەبارەی ڕاستەقینەی کەسێتییەکانەوە دەڵێت: ((بلیمەتی چیرۆکنووس لەوە دایە کەسانی وا دروست بکات لە گۆشت و خوێن کە دەجووڵێنەوە و ئیش دەکەن و وێنەیان لە نێوان کۆمەڵدا وەبەر چاوان دەکەوێ، یان ڕەنگە مرۆڤ تووشی وێنەیان بێت. چیرۆکنووسیش لە دروست کردنیان پشت بە واقیع دەبەستێ و وێنەی فۆتۆگرافیامان پێشان دەدات... بە پێچەوانەشەوە، هەندێک چیرۆک هەن، زۆر لە واقیع دوورن و لەکاتی وێنەکێشانی کەسەکانیاندا لە گێژاوی خەیاڵدا دەخنکێن)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل١٥٥). نووسەر لە هەڵبژاردنی کەسێتییەکانی نێو چیرۆکدا زیاتر لەژێر کاریگەریی ڕێبازی ڕیالیزمە و داوادەکات کەسێتییەکان لە واقیعەوە هەڵبژێردرێن و وێنەیان لە واقیعدا هەبێت، تەنانەت ئەگەر چیرۆکنووس خەیاڵی خۆشی بەکارهێنا، ئەوا هەر دەبێت سەرەتا سوود لە واقیع وەربگرێت.

لەبارەی جۆرەکانی کەسێتیشەوە بەهیچ جۆرێک ئاماژە بە جۆرەکانی کەسێتی ناکات، کە دەبوایە ئاماژەی بە کەسێتی لەڕووی ڕۆڵی لەنێو چیرۆکەوە کە کەسێتی (سەرەکی، لاوەکی) دەگرێتەوە، هەروەها کەسێتی لەڕووی پەرەسەندن و چەسپاوەوە کە کەسێتییەکانی (پەرەسێن، چەسپاو) دەگرێتەوە، بکردایە، چونکە لەنێو چیرۆکدا ئەم جۆرە کەسێتییانە بوونیان هەیە.

**٣- شوێن:**

شوێن بریتییە لەو چوارچێوە جوگرافیەی کە ڕووداوەکان تیایدا ڕوودەدەن و کەسێتییەکانیش جووڵەی تیادا دەکەن، شوێن یەکێکە لە ڕەگەز و بنەما گرنگەکانی چیرۆک و چەمکەکەی فراوانە. دەکرێت بڵێین: ((ئەو شوێنە کۆمەڵایەتیەیە کە پوختەی کارلێکی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی تێدایە)) (یحیی، ٢٠٠٨، ص ٤). واتە لە شوێندا مرۆڤ لەگەڵ کۆمەڵگاکەی خۆیدا کارلێک دەکات و جۆری شوێنەکەش جۆری پەیوەندی و کارلێکی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی دیاریدەکات. چونکە لەنێو چیرۆکدا چەندین جۆری شوێن هەن کە بریتیین لە (شوێنی واقیعی، شوێنی خەیاڵی، شوێنی کراوە، شوێنی داخراو، شوێنی هۆگر، شوێنی ناهۆگر و ... هتد)، کە هەریەک لەم شوێنانەش سنوور و سروشتیان جیاوازە و هەریەکەیان لەنێو دەقدا دەلالەت و ڕۆڵێک دەگێڕێت.

(د. شوکریە) بۆ ئەم ڕەگەزە زاراوەی (شوێنەوار)ی بەکارهێناوە، کە شوێنەوار ڕەهەندێکی تری هەیە و زیاتر لەبواری شوێنەوارناسیدا بەکاردێت، چونکە لەنێو چیرۆک و ڕۆماندا زیاتر شوێن بەکاردێت و هەندێک جاریش ژینگە بەکاردێت. لەبارەی شوێنەوە دەڵێت: ((بریتی یە لە ئاووهەوای چیرۆکەکە و دەوروبەرەکەی لە ڕووی کات و شوێنەوە چیرۆکنووس لە هەردوو لایەنی سروشتی و کۆمەڵایەتی یەوە بایەخ بە دەرخستنی شوێنەوار دەدات)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٦). لێرەدا نووسەر تەنیا هەوڵیداوە چەمکی شوێن بە کورتی ڕوونبکاتەوە و باسی جۆرەکانی شوێنی لەنێو چیرۆکدا نەکردووە، چونکە لەنێو چیرۆکدا تەنیا یەک جۆری شوێن نییە و جاری وا هەیە چیرۆکنووس پەنا دەباتە بەر چەندین شوێنی جیاواز، وەکو: (شوێنی کراوە، شوێنی داخراو، شوێنی هۆگری، شوێنی ناهۆگری، شوێنی مێژوویی)، کە هەر یەکێک لەم شوێنانەش لەنێو ژانری چیرۆکدا مەبەست و مەغزای تایبەتیان هەیە و چیرۆکنووس بێ مەبەست ئەم شوێنانە بەکارناهێنێت.

٤- بیر:

نووسەر لەبارەی بیر لەنێو چیرۆکدا دەڵێت: ((ڕەنگە چیرۆک لە هەموو هونەرەکانی دیکەی ئەدەب کەمتر فکری تێدا بێت لە چاو فراوانی و زۆری کەرەستە فکری یەکەی... دەتوانین بە چەند وشەیەکی زۆر کەم ناوەرۆکی چیرۆک باس بکەین)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٧). ئەم بۆچوونە هەموو ژانرەکانی ئەدەب دەگرێتەوە بێ جیاوازی، نە بەتەنیا چیرۆک، چونکە بیر و ناوەرۆکی هەموو ژانرەکان دەتوانرێت بە چەند وشەیەک باس بکرێت و بگەیەنرێتە خوێنەر، بەڵام کاتێک نووسەر ئەم هەموو ڕەگەز و بنەما هونەرییانە بەکاردێنێت و لە بیر و ناوەرۆکی دەقەکەیدا کەرەستەی زیاتر بۆ واتای دەقەکە بەکاردێنێت، ئەمە لەبەر ئەوەیە سروشتی هەر ژانرێکی ئەدەبی ئەمە دەخوازێت بەگوێرەی دەستوور و یاسا و تایبەتمەندییەکانی هەر ژانرێک گوزارشت لە بیرەکەی بکات. خۆ ئەگەر هەر بیرێک بە چەند وشەیەکی کەم گوزارشتیان لێبکرایە، ئەوکات مرۆڤ پێویستی بەم هەموو ژانرە نەدەبوو.

پاشان نووسەر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی تیۆری (ئەدەب بۆ کۆمەڵگا) و پێیوایە کە دەبێت چیرۆکنووس پەیڕەوی ئیلتیزامبوون بکات و کێشەکانی کۆمەڵگاکەی باسبکات، لەگەڵ ئەمەشدا نابێت لایەنی هونەریی دەق فەرامۆش بکات و هەردووکیان بەیەکەوە کۆبکاتەوە و دەڵێت: ((چیرۆکنووسی شارەزا، دەتوانێ ئیلتزام و هونەری پێکەوە بسازێنێ و بەمە ئەرکە کۆمەڵایەتیەکەشی بەجێ بێنێ و لایەنی هونەریش لەبەرچاو بگرێ)) (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٧). تیۆری (ئەدەب بۆ کۆمەڵگا) نووسەری دەق پەیوەست بە مەسەلەی ئیلتیزامبوون دەکات و وا لە نووسەر دەکات پەیامێکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی یا ئاکاری هەبێت و دەق خزمەت بە مرۆڤ و واقیع و ژیانی مرۆڤ بکات، بۆیە ئەمانە زۆر ناپرژێنە سەر تیۆریی (هونەر بۆ هونەر)، لەگەڵ ئەمەشدا (د. شوکریە) پێیوایە کە ئەدیب و نووسەر کاتێک پەیوەست دەبن بە مەسەلەی ئیلتیزامی ئەدەبییەوە، ئەوا نابێت لایەنی هونەریی دەق فەرامۆش بکەن و خۆیان بە ناوەرۆکەوە خەریک بکەن لەسەر حیسابی بونیادی هونەری دەق.

٥- دەرهێنان:

نووسەر دەرهێنانی پەیوەست کردووە بە گوزارشتکردن لە دەروونی کەسەکان و چۆنێتی دەرخستنی پاڵەوان و کەسێتییەکانی نێو چیرۆک، ئەمەش بە چەند ڕێگایەک دەبێت، لەمانەش (گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ، تەرجەمەی خۆیی یان کەسیەتی، لاڵانەوە و پاڕانەوە، نواندن) ( رەسول، ١٩٨٩، ل ١٥٩-١٦٠). دەرهێنان کە نووسەر لێرەدا وەکو

ڕەگەزێکی چیرۆک پیشانیداوە، مەغزایەکی تری هەیە و دەکرێت بڵێین دەرهێنان زیاتر لە بواری شانۆگەری و فیلم و سینەمادا بەکاردێت. پاشان نووسەر لە دەرهێناندا کۆمەڵێک ڕەگەز و توخمی تێکەڵ کردووە و پێکەوە باسی کردوون و ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە کە مەبەستی لە دەرهێنان چییە؟ تەنیا ئاماژەی بەوە داوە کە زیاتر مەبەستی چۆنێتی دەرخستنی پاڵەوان و کەسێتییەکانی تری نێو چیرۆکە بە یەکێک لەو ڕێگایانەی کە باسی کردوون. بۆ نموونە کە باسی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ دەکات، ئەمەیان زیاتر دەچێتە خانەی (گێڕەرەوەی هەموو شت زان)ەوە کە ئەمەیان جۆرێکە لە جۆرەکانی گێڕەرەوە لە چیرۆکدا. لە وەرگێڕانی خۆیی یان کەسییدا نووسەرەکە لەجێی پاڵەوانەکەیە و ژیانی خۆی بەشێوەیەکی خەیاڵی دەنووسێت، دەبوو نووسەر زیاتر ئەمەی ڕوون بکردایەتەوە لەمەیاندا ئەرکی چیرۆکنووس و پاڵەوان و گێڕەرەوە و گێڕانەوە بە چ ئاراستەیەکدا دەڕوات. لە لاڵانەوە و پاڕانەوەدا باسی ئەوە دەکات کە چیرۆکنووس لایەنی دەروونی کەسێتییەکان پیشاندەدات. ئەم دەربڕینەی نووسەر (لاڵانەوە و پاڕانەوە) ڕوون و گونجاو نییە و ناشێ بۆ لایەنی دەروونیی پاڵەوان و کەسێتییەکان بەکاربێت، چونکە ئێستا لەنێو چیرۆک و ڕۆماندا جۆرە ئاراستەیەک پەیدابووە کە زیاتر گرنگی بەلایەنی دەروونی کەسێتییەکانی نێو چیرۆک و ڕۆمان دەدات و بە (شەپۆلی هۆش) ناسراوە و ژمارەیەکی زۆر نووسەر ئەم جۆرە ئاراستەیە لە چیرۆک و ڕۆمانەکانیاندا بەکاردێنن. لەبارەی نواندنەوەش پێیوایە کە چیرۆکنووس لەڕێی گفتوگۆوە هەوڵدەدات کەسێتییەکان و بیروڕاکانیان بناسێنێت، هەر خۆشی دەڵێت ئەمەیان زیاتر لە شانۆگەری و درامادا بەکاردێت، بەڵام لە چیرۆکیشدا بەکاردێت.

لەبارەی زمانی چیرۆکیشەوە دەڵێت: ((چیرۆک یەکێک لە تایبەتییەکانی ساکاری و وردی و زنجیرەیی بوونە، لەبەر ئەوە پەخشان چاتر لەگەڵیدا دەگونجێ، هەروەها چیرۆک دەربڕینەکانی ئاسانن و نامۆیی و ئاڵۆزی یان تێدا نیە و ڕەوانە و ڕەق نیە و مرۆڤ بێزار ناکات)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٦٠). نووسەر هەر لەگەڵ ڕەگەزی دەرهێناندا باسی زمانی چیرۆکی کردووە، دەبوو وەکو ڕەگەزێکی سەربەخۆی چیرۆک کە پەیوەندی بە بونیادی هونەریی چیرۆکەوە هەیە باسی بکردایە و بە وردی و فراوانی تایبەتمەندییەکانی ڕوون بکردایەتەوە. پاشان زمانی چیرۆک ئێستا گۆڕاوە و شیعرییەت تێیدا زاڵە و جۆرە ئیستاتیکایەکی جوانی بە زمانی چیرۆک بەخشیوە، ئەگەر زمانی چیرۆک لە سەرەتادا سادە و ساکار بووبێت، ئەوا دواتر بەهۆی

گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبییەکانەوە گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا هات و بەرەو بەکارهێنانی ڕەمز و شیعرییەت و تێکشکانی زمانی باو هەنگاوی نا.

لە کۆتایی کتێبەکەیدا (د. شوکریە) باسی چیرۆکی هونەری کوردی و بناغەی سەرهەڵدانی و مێژووی پەرەسەندنی چیرۆکی کوردی دەکات و بە بڕوای ئەو یەکەمین چیرۆکی هونەریی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩١٣) کە چیرۆکی (شویش)ی (فوئادی تەمۆی)یە. ئینجا باسی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب) و (مەسەلەی ویژدان)ی (ئەحمەد موختار جاف) و (سەپان و جوتیار)ی (حوسێن حوزنی موکریانی) و (دوانزە سوارەی مەریوان)ی (پیرەمێرد) دەکات و لایەنی ناوەرۆک و هونەریی چیرۆکەکان بە کورتی دەخاتەڕوو، ئینجا بەکورتی ڕۆڵی گۆڤار و ڕۆژنامەکان (بەتایبەت گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە) و ڕۆڵی وەرگێڕانی چیرۆکی بێگانە لە پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی چیرۆکی کوردیدا دەخاتڕوو (ڕەسول، ١٩٨٩، ٢١١-٢٥٨)، نووسەر زیاتر باسی قۆناغی یەکەم و دووەمی سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی کوردی کردووە و زیاتر ئاماژەی بە هەندێ ناوی دیاری ئەم دوو قۆناغە داوە، بە تایبەتیش قۆناغی یەکەم کە بە قۆناغی سەرەتای سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی بەناوبانگە و ئاماژە بە قۆناغەکانی تر نەکراوە.

**ه- گاڵتە و گەپ:**

نووسەر گاڵتە و گەپی بە یەکێک لە ژانرەکانی پەخشانی هونەریی داناوە، ڕاستە گاڵتە و گەپ بە پەخشان دەنووسرێتەوە (هەندێک جاریش بە شیعر)، بەڵام بەهیچ جۆرێک گاڵتە و گەپ بە ژانرێکی پەخشانی هونەری دانانرێت، چونکە گاڵتە و گەپ جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر و ئەدەبی سەر زاری خەڵکییە (ئەگەرچی ئێستا بەشێکی زۆری ئەم ئەدەبە تۆمارکراوە). ئەوەتا نووسەر خۆشی ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێت: ((گاڵتە و گەپ یا قسەی خۆش، لە جیهانی ئەدەبیاتناسی و فۆلکلۆرناسیدا جێگەیەکی گرنگی هەیە و زۆر لە زانایانی جیهان لە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەیان خەریک بوون، گاڵتە و گەپ بەشێکی بەنرخی سامانی نەتەوەیی و ئەدەبی سەرزاری خەڵکە)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٦١). کەواتە گاڵتە و گەپ کە جۆرێکە لە ئەدەبی فۆلکلۆر، جۆرێک نییە لە پەخشانی هونەری و ناکرێت تێکەڵ بە ژانرەکانی تری پەخشان بکرێت، چونکە جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری کە (ئەفسانە و داستان و حیکایەت و سەرگوزەشتە و گۆرانی و پەند و قسەی نەستەق

و گاڵتـە و گـەپ و نوکتـە) دەگرێتـەوە، جیـاوازە لەگـەڵ ئـەو ژانرانـەی پەخشـان کـە پێشتر ئاماژەیان پێدراوە.

٦- شانۆنامە:

لە زمانی ئینگلیزیدا زاراوەی (Drama, play) و لە زمـانی عەرەبیـدا زاراوەی (مسرحية، النص المسرحي) و لە زمـانی کوردیـدا زاراوەی (دەقـی شـانۆ، شـانۆنامە، درامـا) بەکـاردەهێنرێن. شـانۆگەری ژانرێکـە هـەم لـەنێو شـیعردا بـەناوی (شـیعری شـانۆیی) و هـەم لـەنێو پەخشانیشـدا بـەناوی (شـانۆنامە) هەیـە، ئـەوەی یەکـەمیان بەشێوازی شیعری دەهۆنرێتەوە و ئەوەی دواییشیان بەشێوازی پەخشان دەنووسرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە سەرەتای سەرهەڵدانی شانۆنامەوە ئەم ژانرە بە شـێوازی شـیعری نووسـراوە و ئەمـە درێـژەی کێشـاوە تـا سـەدەی نۆزدەهـەم و سەرهەڵدانی چینی بورژوازی و شانۆنامە بورژوازی و ڕێبازی ڕۆمانسیزم، چونکە ئیدی لە سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە شانۆنامە بەشێوازی پەخشان نووسرا و پێشکەش کرا. کەواتە ژانری شانۆنامە مێژوویەکی کۆنی هەیە و بە گەلێک هەڵبەزین و دابەزینـدا ڕەت بووە و پەرەی سەندووە و لەسەر یەک شێواز و بونیاد نەماوەتـەوە و ئێسـتا چەنـدین ڕێبـاز و قوتابخانـە و ئاراسـتەی جیـاواز لەبابـەت شـانۆنامەوە هـەن و تیـۆری نـوێتر لەبارەی ئەم ژانرەوە سەری هەڵداوە. دەتوانین بڵێین ((شانۆ —لەواتا گشتییەکەیدا- شێوەیەکە لە شێوەکانی گوزارشتکردن لە بیرەکان و هەست و سۆزە مرۆڤایەتییەکان، هۆکاریشی بۆ ئەمە بریتییە لە هونەری قسە و هونەری جووڵە لەگەڵ پشتبەسـتن بـە هەندێک لە کارتێکەرە فراوانەکانی تر)) (زلط، ٢٠٠١، ص ٨٥). کەواتە تاکە هۆکار بـۆ ئـەوەی کـە شـانۆنامە پەیامەکـەی بگەیـەنێت بریتییـە لـە جـووڵەی کارەکتـەرەکان و گفتوگۆی نێوانیان.

لە باسی شانۆنامە (بەشـێوەی پەخشـان)دا هـەر لـە پێناسـەوە تـا بنـەماکانی شانۆنامە نووسەر بـە تـەواوی کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەریی بۆچوونـەکانی (ئەرسـتۆ)وە. نووسەر دەڵێـت: ((شـانۆگەری هـەروەکو ئەرسـتۆ پێناسـەی ئـەکات، چیرۆکێکـە بـۆ نواندن ئامادەکراوە، کردارەکانی مـرۆڤ، هـەڵچوونی سـۆزی تیـا ئـەبینرێ)) (ڕەسـول، ١٩٨٩، ل ١٧٠). پاشان نووسەر پێیوایـە کـە (نوانـدن) لـەنێو شـانۆدا سـێ ڕەگـەزی سەرەکی دروست دەکات، کە بریتین لە:

١- ئەکتەر

٢- کامیرا یاخود بینەر

٣- شانۆ یان ژووری نواندن و پیشاندان (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٧٠).

ئەم سێ ڕەگەزەی کە نووسەر باسی کردووە، هەریەکەیان ڕۆڵ و سروشتیان جیاوازە لەکاتی نواندن لەنێو شانۆدا. ئەکتەر بە یەکێک لە ڕەگەزە گرنگەکانی شانۆ دادەنرێت، چونکە ڕووداوەکان لەم ژانرە پەخشانییەدا لەڕێگەی جووڵە و گفتوگۆی نێوان کارەکتەرەکانەوە بەڕێوە دەچێت و بینەر خۆی هەڵسوکەوت و دیمەنەکان دەبینێت، وەک ئەوەی لە واقیعدا دەیبینێت. هەر ئەم نواندنە پێویستی بە بینەریش هەیە، کاتێک لەنێو هۆڵی شانۆکەدا بەرامبەر شانۆکە دادەنیشن و سەیری دەکەن، هەر ئەم نواندنەش دەبێ لە شوێنێک ئەنجامبدرێت، کە دەبێ شانۆ یان شوێنی نمایشکردنی ڕووداوەکانە. واتە بۆ نواندن لە شانۆدا پێویستی بەم رەگەزانە هەیە.

نووسەر گرنگی بە ڕووداو لەنێو شانۆدا داوە و زاراوەی (کار)ی بۆ بەکارهێناوە، کە لەڕووی چەمکەوە ئەمە هەڵەیە، چونکە کار هەمان چەمکی ڕووداوی نییە و بۆ مەبەستی تریش بەکاردێت و باشتر وابوو نووسەر هەر ڕووداوی بەکار بهێنایە. هەر لەبارەی ڕووداوەکانی نێو شانۆ و چۆنێتی هەڵسووڕانیان لەنێو شانۆدا، نووسەر پێیوایە دەبێت لە ڕوانگەی (دەستنیشانکردنی ڕووداوەکە و بەشەکانی ڕووداوەکە و درێژیی ڕووداوەکە و یەکێتی ڕووداوەکە و یەکێتی کات و شوێن و ڕاستیی ڕووداو)ەکەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٧١). لە باسکردنی ئەم خاڵانەشدا بە وردی و ڕوونی شۆڕ نەبۆتەوە بۆ نێو باسەکان و ڕوونی نەکردوونەتەوە، لەبەرئەوە لە هەندێ شوێندا تێکەڵی و ناڕوونییەک لە زانیارییەکان دەبینرێن، جگە لەمەش لەو هەموو ڕەگەزانەی کە شانۆ هەیەتی، نووسەر تەنیا باسی (ڕووداو و کەسێتی) کردووە، بۆ نموونە لەبارەی ڕووداوەوە لە بەشەکانی ڕووداودا (بەشەکانی کار) باسی ماوە و سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی ڕووداو دەکات، کە دەبووایە لە یەکێتی کات باسی ئەمەی بە وردی بکردایە. یان لە دەستنیشانکردنی ڕووداوەکە (دەستنیشانکردنی کارەکە)دا نەهاتووە باسی جۆر و سروشت و تایبەتمەندی ڕووداوی شانۆ بکات، لەجیاتی ئەمە تەنیا پێناسەیەکی سادەی ڕووداوی کردووە. جگە لەمانەش لە ڕاستیی ڕووداو (ڕاستیی کار)دا لە باسی جۆرەکانی ڕاستیی ڕووداوەکانەوە لە جۆری (ڕاستیی مێژوویی)دا پێیوایە کە ڕووداوەکانی شانۆگەری دەبێت لە مێژووەوە وەربگیرێت، بەڵام سەرچاوەکانی بابەت و

ڕووداوی شانۆ تەنیا مێژوو نییە، دەشێ واقیع و خەیاڵ و شارستانیەت و بیری نووسەریش بێت.

لەبارەی کەسێتییەکانەوە لە سەرلەبەری شانۆنامەکەدا پێیوایە کە دەبێت ((یەک سیفەتی بەدرێژایی شانۆگەرییەکە هەبێ نابێ لە سەرەتادا بە بەزەیی و میهرەبان و پاشان ببێتە مرۆڤێکی دڵ رەق وە یان کەسێکی نیشتیمانپەروەر بێت و پاشان ببێتە کەسێکی خۆفرۆش و نیشتیمان فرۆش)) (ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٧٢). ئەم بۆچوونە لەژێر کاریگەریی بۆچوونێکی (ئەرستۆ)وەیە کاتێک لەبارەی سیماکانی کەسێتیی شانۆنامەوە دەڵێت: ((کەسێتی دەبێ چەسپاو بێ و بە درێژایی شانۆگەرییەکە لەگەڵ خۆیدا کۆک بێت)) (ئەرستۆ، ٢٠٠٤، ل ٥٥). ئەگەر کەسێتییەکە لەگەڵ خۆیدا کۆک نەبوو و گۆڕانکاری بەسەر کەسێتی و ڕەفتاریدا هات، ئەوا بەلای (ئەرستۆ)وە ئەمە خەوشە و نابێت شانۆنووس بکەوێتە هەڵەی وا، هەڵبەت (ئەرستۆ) ئەمەی بۆ سەردەمی خۆی وتووە کە دواتریش بوو بە یاسا لای کلاسیزمە نوێیەکان، بەڵام ئێستا ئەم یاسایەی (ئەرستۆ) گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

**- جۆرەکانی شانۆنامە:**

لە کۆنەوە لای یۆنانییەکان شانۆنامە بەسەر دوو جۆردا دابەش کراوە، کە (تراژیدیا و کۆمیدیا)ن، ئەم دابەشکردنە تا سەدەی نۆزدەمیش بەردەوام بوو، کە دواتر جۆری نوێتر پەیدابوون، وەکو (شانۆی فرمێسکاوی و شانۆی ماریڤۆیدی و شانۆی بورژوازی و میلۆدراما، شانۆی هاوچەرخ)، ئەم جۆرانە لە ئەنجامی گۆڕانکاریی سەردەم و بارودۆخە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەوە سەریان هەڵداوە و ئێستاشی لەگەڵدا بێت شانۆنامە لە پەرەسەندنی بەردەوامدایە و وەکو ژانرێکی پێویستی سەردەم بەردەوام ئامادەیی هەیە.

(د. شوکریە) پێیوایە لە شانۆنامەدا دوو جۆرە بابەت هەن کە تراژیدیا و کۆمیدیان بەهۆی ئەم بابەتانەوە دوو جۆری شانۆنامەی دەستنیشان کردووە، کە بریتیین لە:

١- شانۆگەری تراژیدی (مەرگەسات).

٢- شانۆگەری کۆمیدی (بەزمەسات). ( ڕەسول، ١٩٨٩، ل ١٧٢).

ئەمەش هەمان ئەو دابەشکردنەیە کە پێشتر نووسەرانی تر لە کۆندا کردوویانە، نووسەر پێیوایە ئەم دوو جۆرەی شانۆگەری بەهۆی جیاوازیی ئەو بابەت و ناوەڕۆکانەی کە باسی دەکەن، دروستبوون. بۆ نموونە بابەتی تراژیدیا کارەسات و

دیمەنی خەمناک و ناخ هەژێنی تێدایە و کۆمیدیاش بابەتی پێکەنیناوی و گاڵتە ئامێز و خۆشی تێدایە، ئەمە وایکردووە کە سروشتی هەردوو جۆرەکە لەگەڵ یەکتر جیاواز بن.

**٧- پەند و قسەی نەستەق:**

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە نووسەر لە باسکردنی ژانرەکانی ئەدەبدا هەندێ جۆری ئەدەبی فۆلکلۆری هێناوە و بە ژانری ئەدەبی لەقەڵەم داوە، ئەمەش نابێت، چونکە هەر جۆر و ژانرێکی ئەدەبی و تەنانەت جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریش سنوور و تایبەتمەندی و سروشتی تایبەت بەخۆیان هەیە، بۆیە لەکاتی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەدا ناکرێت ژانر و جۆرەکان تێکەڵی یەکتر بکرێن. سەبارەت بە (پەندی پێشینان) و (قسەی نەستەق) کە جیاوازن لە یەکتری، ئەم جۆرانە ناچێتە نێو ژانرەکانی ئەدەبەوە (رەسول، ١٩٨٩، ل ١٧٤-١٧٧)، بەڵکو ئەمەشیان جۆرێکن لە جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری و لە کۆنەوە بۆمان ماوەتەوە و گەلێک پەند و ئامۆژگاری و رێنیشاندان و فەلسەفەی ژیانی بۆ نەوەکانی داهاتوو تێدایە، راستە ئەمانەش هەر بە پەخشان نووسراونەتەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لێرەدا بریتییە لە ژانرە پەخشانییەکان، کە جیایە لەو جۆرانەی ئەدەبی فۆلکلۆر کە ئەوانیش بەشێوەی پەخشانن.

**ئەنجام:**

لەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

• ژانره ئەدەبییەکان وەکو زانستێک یان وەکو سیستەم و تیۆر و قاڵبێکی هونەری ناسێنراوە، کە ئەرکەکەی بریتییە لە پۆلێنکردن و دابەشکردنی جۆر و ژانره ئەدەبییەکان بەسەر گرووپ و کۆمەڵی جیا جیا کە هەریەکە لەو گرووپ و کۆمەڵانە دەستور و بنەما و خاڵی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە، بۆیە لە یەک گرووپدا دانراون و تا جیاوازییەکان زۆرتر بن ژانرەکان دەکەونە نێو گرووپی جیاوازترەوە.

• ژانرەکان لە گۆڕان و پەرەسەندنی بەردەوامدان، بۆیە چەندین ژانری جیاواز سەریان هەڵداوە، ژانری وا هەیە ئێستا نەماوە و لەناوچووە و هەندێ لە رەگەزەکانی لەنێو ژانری تردا هەر ماون و بۆتە بنچینە بۆ سەرهەڵدانی ژانری تر، هەندێ ژانری تر ئاوێتەی یەکتر بوون و ژانری نوێتر سەریان هەڵداوە کە ئەستەمە بخرێتە نێو شیعر یان پەخشانەوە، هەروەها هەندێ ژانر هەن زیاتر لە جۆرێکیان هەیە و تا ئێستاش سنوور و قەبارەیان دیار نییە و کێشەیان لەسەرە، ئەمەش کێشەی بۆ مەسەلەی پۆلێنکردن دروستکردووە.

• (د. شوکریە رەسوڵ) لەم کتێبەیدا تا رادەیەکی باش توانیویەتی زۆر زانیاریی گرنگ لەسەر ئەدەب و ژانره ئەدەبییەکان تۆمار بکات، ئەگەرچیش نووسینەکە بێ کەموکوڕی نییە، بەڵام ئەم هەوڵە بۆ سەردەمی خۆی دەستکەوتێکی یەکجار گرنگ بووە و بە هەوڵێکی نوێ دادەنرێت و ماندووبوون و جێ پەنجەی نووسەری پێوە دیارە، چونکە نووسەر توانیویەتی لە کتێبێکی سەربەخۆدا باسی ژانرەکانی شیعر و پەخشان بکات.

• نووسەر هەوڵی نەداوە پۆلێنێکی ورد بۆ ژانره سەرەکییەکان و جۆر و چەشنەکانیان بکات، تەنیا باسی چەند ژانرێکی سەرەکی شیعر و پەخشانی کردووە. و ئەو ژانرانەی فەرامۆش کردووە کە لە ئاوێتەبوونی هەردوو شیعر و پەخشاندا دروست بوون، وەکو (پەخشانە شیعر و چیرۆکە شیعر و ......). دەبوو باسی ئەم دیاردەی ئاوێتەبوونی ژانرەکانی بکردایە کە لەنێو ئەدەبی کوردیدا هەر لە زووەوە هەستی پێدەکرێت.

• لەبارەی ژانرەکانی پەخشانەوە باسی ژانری رۆمان و رۆمانی کوردی نەکردووە، کە دەبوو وەکو ژانرەکانی تری پەخشان گرنگی بە رۆمانیش بدایە، چونکە

لەنێو ئەدەبی کوردیدا ژانری ڕۆمانیش هەبووە، ئەگەرچی لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی کەمی ڕۆمان هەبووبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ژانرێک بوونی هەبووە.

• هەر لەبارەی ژانرە پەخشانییەکانەوە هەندێ جۆری باسکردووە کە ناچنە نێو پەخشانەوە، بەڵکو جۆرێکن لە جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری، بۆ نموونە باسی (گاڵتە و گەپ و پەند و قسەی نەستەق)ی کردووە، ئەمانە جۆرێکن لە ئەدەبی فۆلکلۆری، تەنانەت لەکاتی پۆلینکردنی ژانرە پەخشانییەکاندا ناوی هەندێ جۆری هێناوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەدەبەوە نییە، بۆ نموونە (دانان، لێکۆڵینەوە، وەرگێڕان، مێژوو، وتووێژ). ئەمانە وەکو دەقی ئەدەبی مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت و هەریەکەیان لە بوارێکی جیاوازی زانست و زانیاریدا بەکاردێت.

• لەبارەی ڕەگەزەکانی چیرۆکەوە باسی ڕەگەزەکانی (گێڕانەوە) و (زمان)ی نەکردووە، تەنیا باسی (ڕووداو و کات و شوێن و بیرۆکە)ی کردووە.

• لە باسی ژانری شانۆگەریدا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی ئەرستۆ و هەمان ئەو یاسایانە باس دەکات کە پێشتر (ئەرستۆ) لە کتێبی (هونەری شیعر)دا باسی کردوون.

• نووسەر پێیوایە کە دەبێت ئەدیبەکان پەیوەست بن بە مەسەلەی ئیلتیزامبوونەوە، بەرهەمەکانیان لە خزمەت مرۆڤ و کۆمەڵگا و واقیع دابێت، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت لایەنی هونەریی دەق فەرامۆش بکەن.

**سەرچاوەکان:**

- **بە زمانی کوردی**
- **کتێب:**

• ئەرستۆ (٢٠٠٤) **هونەری شیعر**. وەرگێڕانی: عەزیز گەردی. چ١. سلێمانی: چاپخانەی گەنج.

• رەسول، د. شوکریە (١٩٨٩) **ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب**. هەولێر: چاپخانەی خوێندنی باڵا.

• شوان، د. ئیبراهیم ئەحمەد (٢٠١٢) ئەدەبی کۆنی کوردی. چ٢. هەولێر: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین.

• گەردی، عەزیز (١٩٨٧) پەخشانی کوردی. هەولێر: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین

• الماضي، د. شكری عزیز (٢٠١٠) **تیۆری ئەدەب**. وەرگێڕانی: د. سەردار ئەحمەد گەردی. چ١. هەولێر: چاپخانەی ماردین.

• هالبێرگ، پیتەر و نووسەرانی تر (٢٠١٠) **تیۆری ئەدەبی و شێوازناسی**. وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر جاف. چ٢. سلێمانی: کتێبخانەی یادگار.

- **بە زمانی عەرەبی**
- **کتێب:**

• ارسطو (١٩٥٩) **الخطابة**. ترجمة: د. عبدالرحمن بدوي. القاهرة: مكتبة النهضة المصرية.

• افلاطون (١٩٧٤) **جمهورية**. ترجمة: فؤاد زكريا. مصر: الهيئة المصرية العامة للكتاب.

• امين، احمد (د. س. ط) **النقد الادبي**. القاهرة: مؤسسة الهنداوي.

• بن جعفر، ابي فرج قدامة (١٩٦٣) **نقد الشعر**. تحقيق: كمال مصطفى. مصر و بغداد: مكتبة خانجي و مكتبة المثنى.

• الجوزو، د. مصطفى (١٩٨١) **نظريات الشعر عند العرب الجاهلية والعصور الاسلامية**. ط١. بيروت: دار الطليعة للطباعة والنشر.

• زلط، د. احمد (٢٠٠١) **مدخل الى علوم المسرح (دراسة ادبية فنية)**. ط١. الاسكندرية: دار الوفاء للطباعة والنشر.

• السامرائي، د. ابراهيم (١٤٠٤) **في لغة الشعر**. عمان: دار الفكر.

• سلام، د. محمد زغلول (د. س. ط) **دراسات في القصة العربية الحديثة**. الاسكندرية: منشاة المعارف.

• الشايب، احمد (١٩٩٤) **اصول النقد الادبي**. ط١٠. القاهرة: مكتبة النهضة المصرية.

• شريبط، احمد شريبط (١٩٩٨) **تطور البنية الفنية في القصة الجزائرية المعاصرة (١٩٤٧–١٩٨٥)**. اتحاد كتاب العرب.

• عدد من الباحثين السوفييت (١٩٨٠) **نظرية الادب**. ترجمة: د. جميل نصيف التكريتي. بيروت: المركز العربي للطباعة والنشر.

• فريزة، مازوني (٢٠١٣) **انفتاح الجنس الادبي وتحولات الكتابة عند ابراهيم سعدي**. جزائر: منشورات مخبر.

• فنسنت، م. لابي سي (د. س. ط.) **نظرية الانواع الادبية**. ترجمة: د. حسن عون. مصر: مطبعة رويال.

• محمود، د. علي عبدالرزاق (١٩٩١) **النقد الادبي الحديث**. بغداد: مطبعة دار الحكمة.

• مصطفى، د. فائق و علي، د. عبدالرضا (١٩٨٩) **في النقد الادبي الحديث**. ط١. موصل: دار الكتب للطباعة والنشر.

• يحياوي، د. رشيد (٢٠١٦) **مقدمات في نظرية الانواع الادبية**. المنهال للنشر.

- **نامەی ماستەر:**

• يحيي، سعدية (٢٠٠٨) **دلالة المكان في رواية (عابر السرير) لأحلام مستغانمي**. رسالة ماجستير. كلية الاداب واللغات. قسم اللغة العربية. الجزائر: جامعة جزائر.

- **گۆڤار:**

• البغدادي، د. عبدالمجيد (٢٠١٦) **فن السيرة الذاتية وانواعها في الادب العربي**. مجلة القسم العربي. ٢٣.

- **بە زمانی فارسی**

- **کتێب:**

• شميسا، د. سيروس (٢٠٠٢) **انواع ادبی**. چ٢. تهران: انتشارات فيردوس.

**ملخص البحث**

ان هذا البحث (الانواع الادبية في كتاب (الادب الكوردي و فنون الادب)) و هو عبارة عن جهد لدراسة الانواع الشعرية واالنثرية في هذا الكتاب. يتكون الادب بصورة عامة من مجموعة مختلفة من الانواع بحيث يتمتع كل نوع بأسس وخصوصية وميزة خاصة به ولديه طبيعته وحدوده الصريح والمختلف، ان لمعظم هذه الاسس والخصائص مع التركيب الفني للانواع. ان تصنيف وتميز الانواع الادبية ليس بالامر الهين، وذلك لان معظم الانواع قد تغير على مدار تاريخ نمو الادب لدرجة ان بعضهم قد اختفوا وحل محلهم انواع اخرى جديدة. هذا وناهيك عن ان البعض قد اندمج مع انواع اخرى مما ادى الى ظهور انواع جديدة لا تمت بصلة لا بالشعر ولا بالنثر. يتكون البحث من جزئين وخاتمة. الجزء الاول عبارة عن ثلاثة محاور، يتطرق المحور الاول الى مفهوم النوع بينما يتحدث المحور الثاني عن الانواع الادبية، لكن المحور الثالث يشير الى تصنيف الانواع الادبية. يتكون الجزء الثاني من ثلاثة محاور ايضا، المحور الاول عبارة عن تعريف الادب، بينما المحور الثاني عبارة عن الحديث حول عناصر الادب، ويدور المحور الثالث حول انواع الادب والانواع الشعرية والنثرية. تليها النقاط المستخلصة من البحث مع قائمة بالمصادر المختلفة وملخص باللغتين العربية والانكليزية.

## Abstract

This Study is entitled (The literary Genres in the book (Kurdish Literature and literature arts)) It is an effort made for studying the poetry and prose genres in this book. Literature is compased of a group of various genres each of which has its own principles, particularity and feature besides its apparent and dissimilar limitation and nature. Most of this principles and features are related to the artistic structure of the genres. It is doubtless that classification and distinctions of these genres are not easy because most of the genres were subjected to a change throughout the history of the development of literature. Some of then are lost while other new genres are originated from others. Som other genres are melted into each other wich caused the existence of other genres the poetry and pros exclude. The study comprises two parts and finally. The first part is divided into three sections; the first of which deals with the concept of genre while the second section tackles the literaray genres, the third section talks about the classification of literary genres. Part two is made of three sections too. Section one definer literature wheraus, section two points out the components of literature, section three deals with the types literature and poetry and prose genres. Finally the lists of the sources and the abstract in Arabic and in English are added.

# کۆڕی زانیاریی کورد
# کار و چالاکییەکانی ١٩٧٠ – ١٩٧٨

**پ. ی. د. ئازاد عوبێد سالح**
بەشی مێژوو– کۆلێژی ئەدەبیات –
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

## پێشەکی

دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کورد داوایەکی رەوا و پێویستی کاروانی رووناکبیریی کوردی بوو، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر سەرئەنجام وەك بەری رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دامەزرا و بووە راستی[1].

ئەم توێژینەوەیە تەرخانە بۆ کۆڕی زانیاریی کورد و کار و چالاکییەکانی ١٩٧٠ – ١٩٧٨ بۆ ئەوەی دەوری ئەم دەزگا زانستییە ناودارە دەربخەین لە بواری رووناکبیریی کوردیدا، لەم توێژینەوەیەدا سەرەتا باس لەو رەخنانە کراون کە لە کۆڕ گیراون، وەك ناو و پێکهاتە و کار و چالاکییەکانی کۆڕ، پاشان باس لە چالاکییە کارگێڕییەکان، تەلاری کۆڕ، کتێبخانەی کۆڕ، چاپخانەی کۆڕ، چالاکییە رۆشنبیرییەکان؛ کارە زمانەوانییەکان، رێنووس، زاراوە و فەرهەنگ، چاپکراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕ، کتێب، کارەکانی دیکەی کۆڕ، رەخنە لە کۆڕ، پەسنی کارەکانی کۆڕ، پەیوەندیی دەرەوە و ئەنجام و پاشکۆیەك بە چاپکراوەکانی کۆڕ کراوە.

بێگومان هەموو توێژینەوەیەك گیروگرفتی خۆی هەیە، بۆ ئەم توێژینەوەش تا رادەیەك کۆچی دوایی یان نەخۆشی هەندێ لەوانەی دەوری دیاریان لە دامەزراندن و کار و چالاکییەکانی کۆڕدا هەبووە، بۆ روونکردنەوەی هەندێك لایەن کە لە سەرچاوەی بەردەستدا نییە، بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکرێت. هەروەها نەبوونی ئەرشیفێکی دەوڵەمەند و رێکوپێك کە رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەت بە ئاسانی دەست بکەوێت، ئەمە سەرباری کتێبخانەکەی کۆڕ ئەگەر مابێت بیبینین.

لـەم توێژینەوەیـەدا بـە پلـەی یەکـەم چـاپکراوەکانی کـۆڕ و بەتایبـەتیش گۆڤـاری کـۆڕ بـەکارهێنراوە لەگـەڵ ئـەو گۆڤـار و ڕۆژنامانـەی کـە لـەو ڕۆژگـارەدا دەرچوون و کار و چالاکی و بابەتـەکانیان لـەبارەی کـۆڕەوە بڵاوکردووەتـەوە. بـۆ نموونە: زانیاری، ڕۆشنبیری نوێ، ئاسۆی زانکۆیی، گۆڤاری کـۆلیجی ئـەدەبیات – زانکۆی بەغدا، هاوکاری، ژین، .... هتد، لەگەڵ یادداشتی هەندێ لە ئەندامانی کۆڕ و ..... هتد.

## ناوی کۆڕ و ڕەخنەلێگرتنی:

لەبارەی وشەی (کۆڕ) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی لە دیدارێکدا دەڵێـت: "کـۆڕ وشـەیەکی زۆر دێرینـە لـە زمـانی پەهلـەوی ئەشـکانیدا کـە دایکـەزمانی کـوردی ڕۆژهەڵاتە زیاتر لە (٥٠٠) پێنج سەد ساڵ (پ. ز) بەکارهاتووە لە زمانی ئەشـکانیدا لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئێران. وشەی کـۆڕ هـەر لەو کاتەوە گەلێ واتای هەبووە، یەکێکیان واتای شوێنێکی پـەنای گـەرم دوور لـە مەترسی و زیان کە ئاژەڵی تێدا کۆدەبێتەوە. لە فۆلکلۆری کوردیدا وتراوە (کـۆڕی بەزمی عاشقان) واتە شـوێنی کۆبوونـەوەیان.... هـەروەها کـۆڕی گـۆرانی، ئێسـتە بەگشتی ناوە بۆ شوێن کۆبوونەوە بۆ هەرچی مەبەستێك بێت. لە سـاڵی (١٩٧٠)دا کـە بیرکرایـەوە لـە ناونـانی ئـەو شـوێنە کـە بڕیـاردرا دابمـەزرێ لـە بەغـدا بـۆ ئەنجوومەنی زانایانی کورد پاش بەیانی یـانزەی ئـازار شـێخ محەمـەدی خـاڵ ئـەم ناوەی هێنا بۆ ئەو شوێنە. وشە[ی] کۆڕ لەو ڕۆژەوە بـوو بـە نـاوێکی تایبـەتی بـۆ شوێنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی زانایانی کورد بەرانبـەر بـە (المجمـع العلمـي) لـە زمانی عەرەبیدا. (المجمع العلمي الكردي) بوو بە (کـۆڕی زانیـاری کـوردی)، بـەڵام ئەم وشەیە لە هیچ فەرهەنگێکی کوردیدا بەدی ناکرێ"[٢].

جێی خۆیەتی سەرەتا ئاماژە بەوە بکەین کە بۆ یەکەمجار جەمال نەبەز زۆر زوو دەستەواژەی "ئەکادیمی – کۆڕی زانیاری" بەکارهێناوە[٣].

مەسعوود محەمەد سەبارەت بەناوی کۆڕ نووسیویە: "مەجمەعی کـوردی لـە دانیشتنێکی دوورودرێژی ئەنجومەنی مەجمەعدا ناوی (کۆڕی زانیـاری کـورد)ی بـۆ پەسـەند کـرا. پەسـەندکردنەکەش لـەوەوەبوو کـە بڕیـاردرا زاراوەی بێگانـەی بـۆ

بەکارنەیەت بۆیە بوو (ئەکادێمی) بەلاوە نرا، لەو وشانەی بەخەیاڵدا هات (کۆڕ) لە هەمووان پوختەتر و گورجتر بووە.. بەگوتار وەڵامی ئەو رەخنانەم دایەوە کە لە ناوەکە گیرابوو تا ئەوەی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە بەهاری ١٩٧٩ چوومە لای لە لەندەن پێمی گوت وەکو محامی دیفاعێکی باشت لە ناوەکەی کۆڕ کرد، بەڵام خۆی هەر رازی نەبوو لە ناوەکەی دڵیشی یەشا کە پێشنیازی ئەو (ئەنجەمەن)مان پەسەند نەکرد، ئێمە (ئەنجومەن)مان بۆ (مجلس المجمع – ئەنجومەنی کۆڕ) دانا[٤].

سەبارەت بەناونانی "کۆڕی زانیاری کورد" مشتومڕێکی زۆر لە نێو رووناکبیران و نووسەرانی کورد هاتووەتە گۆڕێ و رەخنەیان لە هەڵبژاردنی ئەو ناوە گرتووە.

لەم روانگەیەوە مەسعوود محەمەد لە وتارێکی تایبەتیدا سەبارەت بە چۆنیەتی وەرگرتنی ئەو ناوە بە درێژی دواوە[٥].

ئەندامانی کۆڕ چەند بنەمایەکیان بۆ دیاریکردنی ناوی کۆڕ لەبەرچاوگرتووە، وەك بەکارنەهێنانی وشەی بیانی، ناوەکە بۆ شوێنەکەش ببێت و وشەکانیش لە هەموو کوردستان بیستراو و ناسراو بن و وەرگێڕانی پیت بە پیت مەرج نییە و ناوەکەش لایەنی مۆسیقیشی هەبێت[٦].

بۆیە مەسعوود محەمەد وشە بە وشەی دەستەواژەی (کۆڕی زانیاری کورد)ی بە وردی لێك داوەتەوەو لەبەر رووناکایی رێزمانی کوردی و رەچاوکردنی رێساکانی ئەو زمانە و وەك دەڵێت "ئەوەی لێرەدا بە چەند دێرێك نووسین لێی بوومەوە کاتێکی دوور و درێژی خایاند لە زنجیرەیەك دانیشتنی پڕ لە جۆش و هەندێ جار پڕ لە دڵ گەرمی، لەلایەن هەموو ئەندامانی کۆڕەوە، وە بە دەم دوان و دەمەتەقەوە دەربارەی ناوی کۆڕ بە وردی لەوە کۆڵینەوە ئاخۆ دوو وشەی (کۆڕ) و (زانیار) چی و مانای چییە؟"[٧].

مەسعوود محەمەد دەنووسێت: سەرەتا وشەی (کۆڕ) "بەمانای کۆبوونەوەیە بۆ مەبەستێکی تایبەتی لە جێگایەکدا" لە رووی جۆش و خرۆش و ماوەی کۆڕەکە بەردەوامیشی تێدایە. بۆ وشەی (زانیار)یش بەپێی بەکارهێنانی سی – چل ساڵی دوایی وشەی (زانیار) ماناکەی فراوانترە لە مانای (زانست)،..... وشەی (زانیار)

چونکە زانینی (مطلق) رادەگەیەنێ سنوور و پەراوێزی نییە و هەموو جۆرە زانینێك دەگرێتەوە، زانست بێ یا ئەدەب یا هونەر یا پیشەسازی یا کشتوکاڵ... لەم رووەوە وشەی (زانیار) بۆ ناوەکەی (کۆڕ) گەلێ لەبارتر و پەسەندترە لە وشەی (زانست)"[٨].

سەبارەت بە وشەی (کورد)یش "مەبەستی ئەندامانی کۆڕ لە وشەی (کورد) و هەڵاوێردنی بەسەر وشەی (کوردی)دا ئەوەبوو کە کۆڕ بۆ هەموو کوردێکە نەك هەر کوردی زمانە، بەپێی رێزمانی زمانەکەمان چارمان ناچارە دەبێ بڵێین (کۆڕی زانیاری کورد)، ئەگینا کەلەبەرێکی زل دەکەوێتە مانا و مەبەستی ناوەکە"[٩].

بەلای د. مارف خەزنەدار دەبوا ناوی ئەو دەزگایە (المجمع العلمي الكردي – ئەکادیمیەی زانستی کوردی) بوایە[١٠].

د. مارف رەخنەی توند لە ناوەکەی (کۆڕی زانیاری کورد) دەگرێت و ئەم دەستەواژەیەی بەپێی دارشتنی زمانەوانی و مانای تێکستی ئەدەبی پێ هەڵەیە[١١].

سەبارەت بە ناونانی کۆڕی زانیاری کورد نووسەرێکی دیکەش رای خۆی لەم بارەیەوە دەربڕیوە و لە وتارێکیدا بەناوی (ناونانی المجمع العلمي الكردي)دا نووسیویە: "لە کوردەواریدا وتەی (ناوی خۆی بەخۆیەوەتی) باوە، لەسەر ئەم سەرەتایەوە دەخوازین کە ناونانی (المجمع العلمی الکردی)یش لە جێی خۆی بێ و بۆ دروستکردنی رستەی (المجمع العلمي الكردي) پێویستە ئەو وشانە دابنێین کە ئامانجی ئەو ناوە بێننە دی"[١٢].

لەگەڵ ناوهێنانی (المجمع العلمي العراقي) کە پێی وایە وەرگێڕدراوی (Iraq Academy)یە، دێتە سەر پێناسەی وشەی (مجمع العلمي) و (ئەکادیمی)، پاشان رستەی (کۆڕی زانیاری کورد)، وشە بە وشە و بەوردی لەڕووی واتا و رێزمانەوە شی دەکاتەوە، لە کۆتاییشیدا دێتە سەر ئەوەی کەوا رستە کوردییەکە بەم جۆرە بنووسرێت: ((کۆڕی زانستی کوردی Kori zanstî Kurdî))[١٣].

لێرەدا دەردەکەوێت ئەم نووسەرەش دەستەواژەی (کۆڕی زانیاری کورد)ی پێ دروست نییە وەك دەڵێت: ((ناوەکەشی وەك ناوەرۆکەکەی چەوت و هەڵەیە)). وابزانم ئەو بریارلێدانە پێش وەختە لەشوێنی خۆی نییە چونکە هێشتا کۆڕ نەکەوتبووە سەر رێڕەوی کار و چالاکی.

لە دووتوێی وتارێکی زمانەوانیشدا ئەکادیمییەك (کۆڕ)ی پێ هەڵەیە و دەڵێت بەمانای (ئەکادیمی) و (مجمع) نایەت، بەڵکو بەمانای (کۆبوونەوە — اجتماع) بەکاردێت، بۆیە پێی وایە راست وایە (المجمع العلمي الكردي) ناونرابا ((ئەکادێمی زانستیی کوردی))[١٤].

سەبارەت بە ناوەکانی کۆڕ (تۆفیق وەهبی)یش لە نامەیەکیدا بۆ سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد، وێڕای پیرۆزبایی و دڵخۆشی بە دامەزراندنی کۆڕ، نووسیویە: "بەڵام بۆ ناونانی کۆڕ بە (کۆڕی زانیاری کورد)، (المجمع العلمي)تان ناوناوە ((کۆڕی زانیاری))، بم بەخشن ئەگەر بڵێم: من لەم ناو لێ نانەدا لەگەڵتان نیم"، پاشان دێت بە وردی لە وشەکان دەکۆڵێتەوە و دەچێتە بنج و بناوانی وشەکان و ئەو پێی وایە ناوەکە (المجمع العلمي الكردي) دەبێ (ئەنجەمەنی زانستیی کوردی) بێت[١٥].

د. جەمال نەبەزیش لە پەراوێزی توێژینەوەیەکیدا لەبارەی ناوی کۆڕەوە دەڵێت: بریا ئەو ناوە "کۆڕی زانست" بووایە: چونکە وشەی (زانیاری) (wissenschaft) نییە و (معرفة)یە (Kenntnis)، هەروەها لە نێوان وشەی (زانیاری) و (کورد) نیشانەی خستنەپاڵ (اداة الاضافة) "ي" دابندرایە[١٦].

بەڵام وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، د. جەمال نەبەز لەساڵی ١٩٥٧ "کۆڕی زانیاری" داناوە[١٧].

هەر لەبارەی ناوی کۆڕەوە وادیارە سەعید ناکامیش رای لە ناوەکە نییە، بۆیە لە بیرەوەرییەکانیدا بەو شێوەیە نووسیویە: "مەجمەعی عیلمی کوردی"ە بێ ئەوەی رای خۆی دەربڕێت[١٨].

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دواتر سەعید ناکام هەندێ کاری کردووە کە پەیوەندی بە کۆڕەوە هەیە وەك تێبینییەکانی لەسەر لێکدانەوەکەی دیوانی نالی، هەروەها وەرگێڕانی ئەوەی لە سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی پەیوەندی بە کوردەوە هەیە.[١٩].

دواتر لە شوێنێکی دیکەش د. مارف خەزنەدار (مەجمەعی عیلمی کوردی) لە رستەی (کۆڕی زانیاری کورد) وەك دەڵێت پێ راسترە، هەروەها دارشتنیشی لەڕووی دەستووری زمانەوە هەڵەیە، چونکە (کۆڕ) بۆ کۆبوونەوەی بەزم و رەزمی

ڕەندان و لەنێوچەوان دانی عاشقان بەکاردەهێنرێ، هەرچی ((زانیاری))شە نەك ((زانیار)) بەمانای ((معلومات ، الثقافة)) هاتووە، نەوەکو ((علم)) کە لە کوردیدا (زانستی)ی بۆ بەکاردەهێنرێ، جا ئەگەر ئەو وشانەی بۆ ئەم مەبەستانە بەکارهێنراون، واتە ((کۆڕ)) و ((زانیار)) ڕاستیش بن، داڕشتنی ڕستەکە لەڕووی دەستووری زمانەوە هەڵەیە، دەبێ بنووسرێ ((کۆڕی زانیاری کوردی نەوەکو کۆڕی زانیاری کورد))[۲۰].

دیسان د. مارف خەزنەدار لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت "کارەساتی ئەم دەسگایە لە ناوەکەی خۆیەوە دەستی پێ کرد (کۆڕی زانیاری کورد)، ئەم عیبارەتە بە داڕشتنی زمانەوانی و مانای تێکستی ئەدەبی هەڵەیە"[۲۱].

ئەم بیروبۆچوون و ڕەخنانە، زیاتر لایەنی کەسی وەرگرتووە، بۆ هەندێکیان کە ڕایان لە شێوازی دامەزراندنی نەبووە و وەك خۆیان دواتر ئاماژەی پێ دەکەن خەڵکی پسپۆڕ و شیاو بەو دەزگایەی تێدا نەبووە، وەك لە پێشەوە ئاماژەی پێکرا مەسعوود محەمەد زۆر بە وردی وەڵامی داونەتەوە.

## پێکهاتەی کۆڕ و ڕەخنە لێگرتنی:

لە دیاریکردنی ئەندامانی کۆڕ ئەوانەی لە سەرەتاوە بە کردەوە هەوڵی دامەزراندنیان داوە هەموو بەشدار نەبوونە، لەوانەش د. مارف نەبووەتە ئەندام، وەك د. مارف دەڵێت ڕەخنەی لە دەستنیشانکردنی سەرۆکی کۆڕ کە ئیحسان شێرزاد بووە، هەبووە، چونکە ئیحسان شێرزاد مەرجەکانی ئەم کۆڕەی تێدا نەبووە، کە دەبێ کوردێکی پسپۆڕ و لە زمانی کوردی زانا بێ، پەروەردەی کوردی بن، د. مارف هەموو داواکاری کردنی بە ئەندام بوونی ڕەت کردووەتەوە، چونکە وەك نووسیویە: ئەوەی چاوەڕوان دەکرێ بەوانە ناکرێ. "نە فەرهەنگی زمانی کوردی، نە ئینسکلوپیدیا، نە دەستووری زمانی کوردی، نە مێژووی ئەدەبی کوردی، نە هیچ کارێکی تری بنیادنەر نەگەیشتنە ئەنجام"، تەنانەت سامی (محەمەد محمود عەبدوڕەحمان) وەزیری کاروباری ژوورەوەی [باکوور] ئەو سەردەمە زۆری هەوڵ لەگەڵ داوە، هەروەها ئیحسان شێرزاد خۆشی دووجاران قسەشی لەگەڵ کردووە بۆ بە ئەندامبوون، بەڵام ئەو ڕازی نەبووە "دواڕۆژیش

قسەی منی وەك رۆژی رۆشن پیشان دا" [٢٢]. بەڵام هەر د. مارف دواتر لە دیدارێکدا دەڵێت: ناتوانم بڵێم کۆڕ هیچی نەکردووە [٢٣].

د. مارف بەشدارینەکردنی لەو کۆڕە بە یەکێ لە هەڵوێستە چاکەکانی خۆی دەزانێت لە ژیانیدا، هەروەك دەڵێت: ئیحسان شێرزاد دووجار قسەی لەگەڵ کردووم بۆ ئەوەی ببمە ئەندام، بەڵام من رازی نەبووم[٢٤].

ئەگەرچی هەندێ لە نووسەران و رووناکبیران رایان لە دانانی د. ئیحسان شێرزاد نەبووە وەك سەرۆکی کۆڕ، لەبەرئەوەی کوردییەکەی باش نەبووە، کەچی خەڵکی دیکەش هەبوونە پێیان باش بووە "..... جگە لەوەی کە وەزیر بوو، ئەو بە سەرۆکی کۆڕ دانرا. کە ئەمە لەجێی خۆی بوو، چونکە بەڕاستی پیاوێکی عیلمی بە هەموو واتایەك پلەی دکتۆرای لە تەلارسازی جگە لەوەی ئەندازیارێکی بەتوانا و مامۆستا لە زانکۆ و مرۆیەکی لەسەرخۆ و ئیشکەرە[٢٥].

سەبارەت بە پێکهاتەی کۆڕ د. جەمال نەبەزیش رەخنەی لە شێوازی پێکهاتەکە گرتووە و ئاماژە بەوە دەکات کە گەلێك کەس لە عیراق هەبوون دەکرا ببنە ئەندامی کارای کۆڕ[٢٦].

وەك مەسعوود محەمەد نووسیویە هەرکە ناوی ئەندامەکانی کۆڕ راگەیەندرا یەکیەتی نووسەران کە زۆربەیان سەر بە چەپ بوون هەڵرژانە رەخنەی قورس و تا نەمانی کۆڕ بەردەوام بوو... [٢٧]

لەبارەی دامەزراندنی کۆڕەوە نووسەرێکی دیار رەخنە لە شێوازی دامەزراندنی دەگرێت و نووسیویە ساڵەهای ساڵە کورد خەبات دەکات بۆ ئەوەی مافەکانی بەدەست بهێنێ، بەتایبەتیش مافی خوێندن بە کوردی و بووژاندنەوەی زمان و ئەدەب و کەلەپوور و مێژووی کورد، کە یەکێك لەو ئامانجانەی دانانی ((کۆڕی زانستی کورد)) بوو، نەتەوەی کورد بە دڵێکی پڕ لە هیواوە لەو دەسکەوتەی دەڕوانی بۆ ئەوەی ئەو ئاڵۆزی و گرفتی زمانەوانی و ئەدەبی و مێژوویی و دانانی فەرهەنگی هەمەجۆر لەو کۆڕەوە بڕیاری لێ بدرێت[٢٨]. پاشان رەخنە لە شێوازی دانانەکەی دەگرێت، بەوپێیەی هەموو لایەنە زانستییەکانی کوردی بگرێتەوە، کە بەلای محەمەدی مەلاکەریمەوە، پێویست بووە ((بەتەنیا ئەدەب و زمان و مێژوو بێ))[٢٩].

دواتر رەخنە لە چۆنیەتی پێکهاتەی ئەندامەکانی گرتووە کە ئەو پێنج کەسەی کە لە سەرەتاوە هەڵبژێردراون بەپێی مەرجەکانی کۆڕ کە زمانی کوردی باش بزانن و شارەزایی باشیان لە زمانە زیندووەکان یان کۆنەکانمان هەبێت بتوانن زاراوە دیاری بکەن هەڵبژێردرێن، تا چەند ئەوانە ئەو مەرجەیان تێدایە، ئەگەرچی لە هەمان کاتدا خەڵکی زانا و رووناکبیر و دیار هەبووە کە جێیان لە کۆڕ دیار نەبووە. ئەمە جگە لەوەی ئەو رەخنەی لەوەش گرتووە کە بیرورا و شێوازی بیرکردنەوەی ئەوانە ((لەگەڵ تیۆری زانستی و سوودی کۆمەڵایەتی رەنجکێشی کوردستان)) ناگونجێت. لەم رووەوە بەڕای محەمەدی مەلا کەریم، کۆڕی زانستی کوردی لەبەر ئەو هۆیانە سوودێکی وای لێ چاوەڕوان ناکرێت[٣٠].

هەروەك ئاماژەی پێکرا لە چۆنیەتی دامەزراندن و پێکهاتەی کۆڕ رەخنەی زۆر گیراوە، لەسەر داوای سامی عەبدوڕەحمان داوا لە سەعید ناکامیش کراوە لە بناخە دانانی وەك خۆی دەڵێت "مەجمەعی عیلمی کورد" بەشدار بێت، بۆ ئەو مەبەستە وەك نوێنەری شۆڕش لەگەڵ هەژار و فەرەیدون عەلی ئەمین دەچنە بەغدا و لە هۆڵی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا کۆبوونەتەوە و سەعید ناکام داوای کردووە لەوە بکۆڵنەوە کە دامەزرێنەرانی ئەم کۆڕە "کێ بێ و چ تایبەکارێکیان تێدابێ، هەروەها رابردووی خەبات و کوردایەتیان چەند بێت و چۆن بن"[٣١].

دوای ئەوەی ناوی ژمارەیەك کەسایەتی دەهێنێت کە بەشداری کۆبوونەوەکە بوونە، دێتە سەر ئەوەی کە "ئەمە دواکۆبوونەوەی ئەو هەرەمەیە بوو، چونکو مەبەستەکە لە دەسکەوتی زمان و زانستییەوە گوێزرایەوە بۆ بابەتێکی سیاسی، وەزیری کاروباری ژووروو کەسانێکی بۆ ئەم مەبەستە رەچاوکرد کە فریان بەسەر ئەم زانستەوە نییە، لەوانە موهەندیسێکی کوردی نەزان، کوڕە مەلایەکی دەرچووی قاهیرە کە نە دێرێك کوردی نووسیوە و نە کوردایەتی کردووە، لەگەڵ چەند کەسێکی لەم بابەتە، یەك دووانێکیان لێ دەرچێ هیچیان شیاوی ئەم کارە نەبوون، بە بیستنی ناوەکان من دوای قرە و تووڕەیی لەگەڵ وەزیردا خۆم دوورخستەوە و نەچوومەوە بۆ کۆبوونەوەکانی کۆڕ، پاشتریش لە یەکێتی نووسەرانی کوردا بەیانێکی پڕ لە توانج و تووڕەییمان دژی ئەم رەچاوکرانەی کۆڕ بڵاوکردەوە".[٣٢]

یەکێك لەو رەخنە بەرچاوانەی لە دامەزراندن و پێکهاتەی کۆڕ گیراوە، ئەو یادداشتەی یەکێتی نووسەرانی کوردە سەبارەت بە دامەزراندنی کۆڕ کە بۆ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان نێردراوە، یادداشتەکە رووی لە وەزیری کاروباری باکوور و وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی و وەزیری پەروەردە و فێرکردن و وەزیری راگەیاندن و وەزیری دەوڵەت ساڵح یوسفی کردووە و بۆ بارەگای بارزانی، م. س. پ. د. ك، لیژنەی ئاشتی لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی (عێراق)، سەرۆکایەتی کۆڕی زانیاری عێراق و هەموو زانکۆکان و بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی و رۆشنبیری کوردی و یەکێتی و رێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکانی کوردستان و کۆمەڵەکان و هەموو رۆژنامە و لکەکانی یەکێتی نێردراوە. یادداشتەکە بەناوی دەستەی کارگێڕی یەکێتی نووسەرانی کورد مۆرکراوە[٣٣].

لە یادداشتەکەدا سەرەتا ئاماژە بەوەکرابوو کە دامەزراندنی (کۆڕی زانیاری کورد) خەونی لەمێژینەی ئەو نووسەر و رووناکبیرانە بووە کە پەرۆشی بایەخدان بە زمانی کوردین و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رۆشنبیری کوردی بەو کۆڕە گرێدراوە و بە کلیلی هەموو کێشەکانی نووسین و رێنووس و زاراوە و فەرهەنگی گشتی و دانانی رێزمانی ورد و بەشداریی زانستانە بەرەو زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی و بووژاندنەوەی کەلەپوور و ساخکردنەوەی دەستنووس و نووسینی مێژووی کورد بەپێی رێبازێکی زانستانە و زۆر شتی دیکەش[٣٤].

پاشان دێتە سەر هەواری دوای دەرچوونی قانوونی کۆڕ، لەسەر داوای وەزیری کاروباری باکوور ژمارەیەك پیاوی زانست و رووناکبیر بۆ گفتوگۆ لەبارەی بنەما دروستەکانی رێبازی ئەم کۆڕە و ئەرکە هەنووکەییەکانی و چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامەکانی کرا، سەرباری ئامادەنەبوونی ژمارەیەکی زۆر پسپۆڕ و خودان بیروڕا و بیروبۆچوون لەو کۆبوونەوەیە و وێڕای ئەو تێبینی و سەرنجانەی رووبەرووی یاسای کۆڕ کرانەوە، ئەو راوبۆچوونانەی لەو کۆبوونەوە گەڵاڵە بوون، دەکرا ببنە هۆی سەرکەوتنی کۆڕ، ئەگەر لەبەرچاو گیرابان، بەڵام هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆڕ بێ ئەوەی راوێژ بە پسپۆڕان بکرێت و رایان وەربگیرێت، ئەوا هەموو ئومێدەکانی لەباربرد و هەرایەکی زۆری لە ناوەندی رووناکبیری کوردی دروستکرد

و بەلای هەموانەوە ئەوە بە سەرەتایەکی نامۆ و سەرنەکەوتوو داندرا هەروەك لە یادداشتەکەدا هاتووە.[٣٥].

بەلای ناوەندە شارەزا و پسپۆڕەکان ئەرکەکانی کۆڕی زانیاری لەو هەوارەدا و تا سالانێکی زۆریش وەك ئەرکی کۆڕی زانیاری عیراق و عەرەبی و رۆژهەلاتییەکان خۆی لە خزمەتکردنی زمان و ئەدەب و کەلەپوور دەبینێتەوە و هەنووکە وەختی بایەخدان بە زانستە جۆراوجۆرەکانی دیکەی وەك کیمیا و فیزیا و نەوت و کانزاکان نەهاتووە، هەر لەو پێودانگەشەوە پێکهێنانی کۆڕ لە ئەندازیار و نوژدار و ئەفسەر و جوگراف و شارەزایی دارایی و خودان بڕوانامەیەك لە زمانی عبری و قانوونزانێك هیچ سەروکارێکیان بەو ئەرکانەی لەسەرەوە دیارمان کردوون نییە، تەنانەت لەگەڵ دەقەکانی یاسای کۆڕیش ڕێك نایەتەوە، کە دەڵێت ئەو خەڵکانەی دانراوی زانستیان هەیە و زمانی کوردی دەزانن دەبنە ئەندامی ئەو کۆڕە، ئەو جۆرە کۆڕە ناتوانێت ئەرکەکانی بێنێتە دی کە هیچ کەسیان دانراوی لە پسپۆڕییەکانیان نییە و تەنانەت زمانی کوردیش نازانن[٣٦].

وێڕای ئەمانە یادداشتەکە رەخنە لەوەش دەگرێت کە لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆڕ خەڵکانی خاوەن پسپۆڕی زمانەوانی و مێژووی کورد کە بڕوانامەی دکتۆرایان هەیە پشتگوێ خراون، ئەمە وێڕای پشتگوێخستنی نوێنەرانی هزری پێشکەوتنخوازی لە بواری زانستی و هزر و کەلەپوور، تەنانەت وەك دەڵێت رابردووی هەندێ لە ئەندامان دژ بە گەل بووە و مایەی رێزی رووناکبیران و جەماوەری گەل نین، بەمەش کۆڕ دەسەلاتی هزری و کاریگەری و روومەتی خۆی لەدەست دەدات. کۆڕی زانیاری کورد بە ئیفلیجی لەدایك بوو، لەم رووەوە دەستەی کارگێڕی یەکێتی نووسەرانی کورد ناڕەزایی لەسەر ئەو هەڵبژاردنە دەردەبڕێ و داوای هەڵوەشاندنەوەی دەکات و خەڵکانی لێهاتوو و شارەزا و پسپۆڕ بکرێنە ئەندام، بۆ ئەوەی کۆڕ ببێتە دەزگایەك خزمەتی نەتەوەکەمان و پرسە زانستییەکان و هزرییەکانی لەو هەوارەدا بکات[٣٧].

جێی ئاماژەیە لە کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کوردیش جارێکی دیکە پاڵپشتی بۆ ئەو یادداشتە دەربڕاوە وەك هەڵوێست لە کۆڕ.

تەنانەت لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتی نووسەرانی کورد (١٤–١٧ی تەمموزی ١٩٧١) کە لە هەولێر بەستراوە، یەکێك لە بڕیارە گشتییەکانی خاڵی ژمارە (١٣)

وێڕای پشتگیریکردنی یادداشتەکەی یەکێتی نووسەرانی کورد، لە هەمان کات داوای هەڵوەشاندنەوە و جارێکی دیکە دامەزراندنی دەکاتەوە[٣٨].

سەبارەت بە ئەندامانی کۆڕ هەژار نووسیویە: سامی وەك وەزیری کاروباری کوردستان [باکوور] حەزی لەوەبوو خاوەن کارنامەی دکتۆرا زۆرتر بکاتە ئەندام، بەڵام من هەوڵمدا کوردیزانی باشی بۆ هەڵبژێرن، نەك ئەوانەی دکتۆرایان لە زمانی بێگانە هەیە، من حەمەی مەلا کەریم و شوکر مستەفام پێ لە دکتۆراکانی کوردی نەزان پێ چاکتر بوو، پاشان لیستی ناوی ئەندامەکان و بڕوانامەی پسپۆڕیەتییان دەنووسێت و لە ریزی ناوەکاندا ناوی عەبدولحەمید ئەتروشی نووسیوە کە لە لیستی ئەندامانی کارای بڵاوکراوەی کۆڕدا نییە[٣٩].

جەمال بابان ئاماژە بە یادداشتەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد دەکات کە رەخنەیان لە ئەندامەکانی هەبووە وەك دەڵێ بۆ زیاتر لە بیست لایەن و هەرچی رۆژنامە هەیە نێردراوە داوای هەڵبژاردنی ئەندامی کارامە و پسپۆڕ و خاوەن بەرهەمیان کردووە....[٤٠].

د. جەمال نەبەز لەو باوەڕەدایە کۆڕی زانیاری کورد جگە لە تۆفیق وەهبی کەسێکی تێدا نییە بە زمانەوان لەقەڵەم بدرێت و ئەمەش وەك خۆی دەڵێت لە پەرۆشییەوەیە بۆ چارەنووس و دواڕۆژی زمانی کوردی[٤١].

جەمال نەبەز لە وتارێکی دیکەیدا، جارێکی دیکە دەچێتەوە سەر پێکهاتەی کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا و نووسیویە: "زۆربەی ئەوانەی کرابوون بە هاوکار و مووچەخۆری (کۆڕ) کەسانێك بوون کە بەپێی دەسەڵاتی زانستانەیان نەخرابوونە ئەو شوێنە"[٤٢].

لەبارەی دامەزراندن و پێکهاتەی کۆڕ محەمەدی مەلا کەریم، ئاماژە بەوە دەکات کەوا بەشێوەیەکی دیموکراتی ئەو کارە نەکرا، بەڵکو خەڵکانێك داندران کە بە تاك لایەن کەسەکان دیارکراون و کرانە ئەندامی کۆڕ. بەڵام یەکێتی نووسەرانی کورد بەیاننامەیەکی سەبارەت بە دامەزراندن دەرکرد و رەخنەی لێ گرت، بەڵام کەس بە دەنگیانەوە نەچووە. "لەگەڵ هەموو ناتەواویەکیشیا کە ئەتوانرا چار بکرێن و پێویستیش بوو چابکرێن نەکرا، کاری زۆر گرنگی کرد"، دواتر بەپێی بارودۆخەکە کارەکانی تەسکتر دەبوونەوە تا بووە بە دەستەیەك لە کۆڕی زانیاری عێراق[٤٣].

سەبارەت بەو رەخنانە، هەندێکیان لە جێی خۆی بووە کە دەبوا خەڵکی پسپۆڕ و شارەزا لەناو کۆڕ جێیان هەبوایە، دوور لە تێڕوانینی نازانستی، چونکە دەزگایەکی زانستی خەڵکی زانا و شارەزا و کارای چالاکی پێویستە بۆ ئەوەی کارەکەی بە کەمترین کەموکوڕی جێبەجێ بکات، بۆ نموونە دەبوا یەکێکی وەك جەمال نەبەزی تێدابووایە وەك شارەزایەکی زمانەوانی.

بێگومان ئەو رەخنانە، هەیانە رەخنەی تایبەتین، لەبەرئەوەی رەخنەگر خۆی بە شایستە زانیوە بەڵام نەکراوەتە ئەندام، هەشیانە تا ئەندازەیەك لەجێی خۆی بووە، چونکە بەڕاستی هەندێکیان بەپێی مەرجەکانی ئەندامبوون، نەدەکرا ببنە ئەندام ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی لەپشت نەبوایە، تەنانەت هەیانە بە هیچ جۆرێك شوێنی لەم کۆڕە نەبووە، کەچی داندراوە لەوانە: د. ئەحمەد عوسمان کە پزیشك بووە تا لە کۆڕیش بووە هیچ چالاکییەکی وای نەبووە.

## کار و چالاکییەکانی کۆڕی زانیاری کورد

## - چالاکییە کارگێڕییەکان:

### تەلاری کۆڕ:

کۆڕی زانیاری کورد، دوای دامەزراندنی، هەوڵدراوە بارەگایەکی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەوەبوو لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٣ دەست کراوە بە دروستکردنی تەلاری کۆڕ بۆ ئەمەش دەزگای کولبنکیان پەنجا هەزار دیناری (= ١٦٥ هەزار دۆلار) بۆ تەرخان کردووە، سەرۆك کۆماری عیراقیش پەنجا هەزار دیناری بۆ تەرخان کردووە[٤٤]. بەرەبەرە کارەکانی دروستکردنی تەلارەکە بەرەوپێش چووە و تا سەرئەنجام تەواو بووە و چوونەتە ناوی وەك بارەگای کۆڕی زانیاری کورد[٤٥].

### کتێبخانەی کۆڕ:

د. کەمال مەزهەر لە دیدارێکدا ئاماژە بەوە دەکات کە بووەتە سکرتێری کۆڕ، لەگەڵ دامەزراندنی پەیوەندی فراوان، گەلێ کتێبی دانسقە و بەرهەمی دانسقەی کۆکردووەتەوە بۆ کتێبخانەی کۆڕ[٤٦].

سەبارەت بە کتێبخانەی کۆڕ رۆژنامەی (التّآخي) ریپۆرتاژێکی درێژی لەبارەوە بڵاوکردووەتەوە و زۆر پەسنی بەڕێوەبەری کتێبخانەکە (حوسێن فەیزوڵڵا جاف) دراوە، کەوا ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کۆڕ کردووە، تەنانەت د. کەمال مەزهەری سکرتێری کۆڕیش ئەوەی پشتڕاست کردووەتەوە کە ناوبراو زۆر خزمەتی کتێبخانەکەی کردووە و لەماوەی ساڵێکدا بوونی خۆی سەلماندووە و کارێکی وای کردووە کە زمان لە ئاستی لاڵە، تا ئەو کاتە پێنج هەزار کتێبی کوردی و عەرەبی زمانەکانی دیکە تێدابووە، جگە لە کتێبی دەگمەن، وەك چاپی یەکەمی کتێبی (شەرەفنامە) ساڵی ١٨٦٠ – ١٨٦٢، بەرهەمی رۆژهەڵاتناسان و کوردناسان کە لەبارەی کوردەوە نووسیویانە، ئەمە وێڕای گۆڤار و رۆژنامەی کوردی و عەرەبی و ئەوانەی سەردەمی شێخ مەحمود و کۆماری کوردستان و هەروەها بەرهەمی زۆری فۆلکلۆری کوردی تێدابووە[٤٧].

لە راپۆرتی سەرۆکی کۆڕدا ئاماژە بە بایەخدان بە کتێبخانەی کۆڕ کراوە کە تا ئەوکاتە (١٩٧٤) دوازدە هەزار کتێبی جۆراوجۆری تێدایە، لەگەڵ کۆمەڵێك گۆڤار و رۆژنامەی کۆن و نوێ[٤٨].

تەنانەت هەندێ کەسی وەك شێخ مستەفا قەرەداغی کتێبخانەی تایبەتی خۆیان وەك رێزلێنان لە دامەزراندنی کۆڕ کە سەدان بەرگ کتێب بووە لە بوارە جیاجیاکانی ئەدەب، مێژوو، ئایین، فقە، فەلسەفە، ......هتد بە زمانی جیاجیا، (١٢٢) دەستنووسی تێدابووە کە زۆربەیان خەتی زانای کورد (ابن الخیاط) بووە کە لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەی کۆچی ژیاوە و لەوانە کتێبی تێدابووە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی دەیەمی کۆچی و یازدەی کۆچی لەبەرگیراوە، دانراوەکانی زانایانی کوردستانی وەك مەردۆخییەکان و حەیدەرییەکانی تێدابووە، هەروەها نوبهارا ئەحمەدی خانی و دیوانی مەلای جزیری، بۆ ئەمەش سەرۆکی کۆڕ نامەی سوپاسی ئاراستە کردووە کە بەدیاری پێشکەشی بە کۆڕ کردووە[٤٩]، هەروەها کتێبخانەی ئەمین زەکی مێژوونووسی گەورە لەلایەن سانیحەی کچی پێشکەشی کۆڕ کراوە کە (٢٠٠) کتێبی مێژوویی زۆر بایەخدار لەگەڵ هەندێ دەستنووس[٥٠]، تۆفیق وەهبیش هەموو دەستنووسەکانی کتێبخانەکەی خۆی بە

كۆڕ بەخشیوە[٥١]. سەبارەت بە دەوڵەمەندی كتێبخانەی كۆڕ، د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف ئاماژە بەوە دەكات، كۆڕی زانیاری كورد بایەخێكی زۆری بەم لایەنە داوە و بە هەوڵی دڵسۆزانە كۆڕ بووەتە خاوەنی كتێبخانەیەكی رازاوە.[٥٢]

مەسعوود محەمەدیش ئاماژە بەوە دەكات كۆڕ "لە یەكێتی سۆڤیەت بایی كتێبخانەیەكی كتێبی بۆهات د. كەمال مەزهەر دەستێكی باڵای هەبوو"[٥٣]. رەوشەن بەدرخانیش چەند كتێب و نووسراوی بەدیاری داوەتە كۆڕ، تەنانەت لەبەرئەوەی بە پۆستە ترسی لەناوچوونی هەبووە بە پۆستەی دیبلۆماسی نێردراوەتە بەغدا[٥٤].

لەبارەی دەوڵەمەندیی كتێبخانەی كۆڕ هەژار نووسیویە زۆر لە كتێبخانەی كۆڕی زانیاری عارەبان (مەبەستی عیراق) كە تەمەنی چل ساڵ بووە، دەوڵەمەندتر بووە[٥٥].

توێژەر ئەو بۆچوونەی هەژاری بەرەو رووی محەمەد عەلی قەرەداغی كردەوە، ئەویش پشتڕاستی كردەوە[٥٦].

كتێبخانەی كۆڕ بایەخی زۆری پێدراوە و بەردەوام لە ناوەوە و دەرەوە كتێبیان بۆ دابین كردووە، لە زۆربەی ژمارەكانی گۆڤاری كۆڕ ئاماژە بەمە كراوە[٥٧].

سەبارەت بە كتێبخانەی كۆڕ مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی، كە ئاگاداری هەندێ لایەنی كۆڕی زانیاری كورد بووە، نووسیویە: كەوا چ كەمتەرخەمییەك بەرانبەر ئەم كتێبخانەیە كراوە، دوای ئەوەی هەموو ئەو زانا و رووناكبیرانەی كوردستان كتێبخانە دەوڵەمەندەكانیان بە كتێب و دەستنووسی نایابەوە پێشكەشی كۆڕ كردووە، كەچی زۆربەی هەرە زۆریان لەناوبراون و دەستی پیسیان گەیشتووتێ، بێ ئەوەی سڵ لەوە بكەنەوە كە ئەمە سامانی نیشتمانی ئەم نەتەوەیە و بەهیچ جۆرێك بە دارایی دنیا بەراورد ناكرێت، بەداخەوە بێ ئەوەی پێرستیان بۆ بكرێت و بێ ئەوەی لە شوێنی شایانی خۆیان هەڵبگیرێن دەستكاری كراون و بردراون و تەنانەت زۆریان فرۆشراون، كە بەهەق مامۆستا شیوەنێكی بەكوڵ و زۆر گەرمی بۆ ئەو كۆڕە كردووە كە دوای خۆزگەی دەیان ساڵ دامەزرا، بەڵام وەك پێویست سەروكاری نەكراوە و بەڕێوەنەبراوە و

خـەمخۆری خـۆی نـەبووە، تەنانـەت وەك ئـەرکێکی وەزیفیشـی بەرپرسـیاریەتی هەڵنەگیراوە..![٥٨].

**چاپخانەی کۆڕ:**

یەکێك لە کارە دیارەکانی کۆڕ دامەزراندنی چاپخانە بووە، بۆ ئەو مەبەستە کـەڵکیان لـە چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری عـیراق وەرگرتـووە و بەرەبـەرە کەموکورتییەکانیان چارەسەر کردووە، بەکڕینی ئامێری تازە و پێداویستی تایبەت بە چاپخانە و بە داڕشتنی پیتەکانی رێنووسی کۆڕ، لە هەواڵەکانی کۆڕدا ئاماژە بە تەواوکردنی چاپخانە کراوە[٥٩].

سکرتێری کـۆڕ ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە ئـەوان چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری عیراقیان بەدیاری وەرگرتووە کە کۆن بووە، بەتایبەتی چووە بۆ قاهیرە بۆ ئەوەی پیتی کوردی لەوێ دابڕێژێ، بەڵام هەڵسووڕانی چـاپخانە زۆر بـاش بـووە ئەوانـەی کاریـان تێـدا کـردووە خـەڵکی دڵسـۆز و شـارەزا بوونـە و بەرپرسـانی کـۆڕیش زۆر برایانـە رەفتاریـان لەگـەڵ کـردوون و رێزیـان گرتـوون، لـەکاتی پێویسـت بەسـەر کراونەتەوە[٦٠].

**- چالاکییە رۆشنبیرییەکان**

**١- کارە زمانەوانییەکان:**

**أ- رێنووس:**

دانانی رێنووسی یەکگرتووی کوردی و زاراوەی کارگێڕی:

سەبارەت بە دانانی رێبازی نووسینی یەکگرتووی کـوردی کـۆڕ بڕیـاری داوە (چـوکلە – ئەکسـانت) بـەکاربهێنرێت بـۆ ئـەوەی نووسـینی کـوردی بەئاسـانی و خێرایی بنووسرێت[٦١].

بۆ ئەمەش کۆڕ لیژنەیەکی دائیمی داناوە بەناوی لیژنەی زمان و زانستەکانی لەم ئەندامانە: مەسعوود محەمەد، عەبدوڕەحمان هـەژار، نەسـرین فـەخری، نـوری عەلی ئەمین و سادق بەهائەدین و پاش چـەندین کۆبوونـەوە، توانیویـە "بەشـێکی زۆر و گرنگی کێشەکانی رێنووسی زمانی کوردی دیاری بکات"، هەر بەم بۆنەیـەوە

داوا لـە شـارەزایانی کـورد و کوردناسـانی بیـانی کـردووە بـەوردی لـەم بڕیارانـە بکۆڵنەوە و لەماوەی شەش مانگدا بیری خۆیان دەرببڕن، بۆ ئەوەی کـۆڕ دوابڕیـار بدات[٦٢].

هەروەك گوتمـان ڕێنووسـی کـۆڕ تێبـینی و سـەرنج و ڕەخنـەی لـێ گـیراوە، نووسەرێك لەو بارەیەوە رای خۆی دەربڕیوە کە چـوکلەی (–) لـەجیاتی دوو (واو) سەر لە قوتابی پۆلی سێیەمی سەرەتایی دەشـێوێنێت[٦٣]. هـەر لێـرەدا سـەبارەت بە ڕێنووسی کۆڕ وێڕای د. نەبەز هەندێ نووسەری دیکەش ڕەخنەیان لەو ڕێنووسە گرتووە لەوانە د. عزەدین مستەفا ڕەسـوولٚ[٦٤]. هـەروەها د. مـارف خەزنـەداریش بەهەمان شێوە ڕەخنەی لەو ڕێنووسە گرتووە[٦٥].

لە وەڵامی ئەوانەدا د. ئەوڕەحمان ئاماژە بەوە دەکـات کـە ئەمانـە لـە بـری ئەوەی بێن کەموکورتییەکانی ئـەو ڕێنووسـەی کـۆڕ دەستنیشـان بکـەن، هاتوونـە مەبەستی تایبەتی خۆیان خستۆتە ڕوو[٦٦].

دیارە د. ئەوڕەحمان نکۆڵی لەوە نەکردووە، کە ڕێنووسەکە بێ کەموکورتی بێت وەك خۆی دەڵێت: "لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە پاکانە بۆ ڕێنووسی کۆڕ بکەم و بڵێم لەوانە نییە کە ڕەخنەی لێ بگیرێ، من بەش بە حاڵی خۆم بەرانبەر هەنـدێ بەندی، تێبینی و سەرنجم هەیە و دواتر لێیان دەدوێم"[٦٧].

جەمال نەبەز ڕەخنەیەکی زۆر توندیش لە ڕێنووسـی تـازەی کـۆڕ دەگرێـت و دەڵێت: ئەو ئەلفوبێیەی کە زمانی کوردی پـێ دەنووسرێت، ئەلفوبێیـەکی عـەرەبی – فارسـی دەسـکاری کـراوە و کـەموکوڕی زۆرە و هەنـدێکیان بـەهیچ جـۆرە دەستکاری کردنێك چارەسەر ناکرێن. ئەو دەسکاری کردنـەی کـۆڕ زیـاتر سـەر لـە خەڵك شێواندنە و چەند نموونەیەکی هێناوەتەوە[٦٨].

د. جەمال نەبەز لەگەڵ هەڵسەنگاندنی کتێبی (بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی) مستەفا نەریمان کە کۆڕی زانیاری کورد چاپی کردووە، ڕەخنەی لە ڕێنووسی کۆڕ گرتووە و وەك دەڵێت: ئەم ڕێنووسە "یەکجار ناقۆڵا و نالەبار و ئێسـك قورسـە" و لە پەراوێزیشدا نووسیویە "ڕێنووسی کۆڕ زۆر نەزانانە و ناشییانە دانراوە"[٦٩].

لێـرەدا د. ئـەوڕەحمانی حـاجی مـارف لـە وەڵامەکەیـدا دەڵێـت: "د. نەبـەز ئێجگار توندوتیژ بەرەنگاری ڕێنووسـی کـۆڕ بـووە... خۆزگـە د. نەبـەز بـە دڵێکـی

فراوانەوە بە نیازی خزمەت لە کەموکورپییەکانی رێنووسی کۆڕ دەدوا، هەرچەندە هەندێ لەو رەخنانەی لەو بارەیەوە نووسیوێتی راستن، بەڵام هەڵەی گەورەتر هەن و ئەو درکی پێ نەکردوون و سەرەڕای ئەوەش خۆشی تووشی هەڵە بووە"[٧٠].

سەربارى ئەوەش رەخنە لەو وتارە زمانەوانییانە دەگرێت کە لە گۆڤاری کۆڕ ژمارە (١) بڵاوکراونەتەوە و پێی وایە ئەو گۆڤارە دەبێ پێڕەوی دەستووری "نەخت و پوخت" بکات[٧١].

جەمال نەبەز سەبارەت بە رێنووسی کۆڕیش نووسیویە کە بەداخەوە زۆر بە پەلە دانراوە و گەلێ کەموکورتی و ناتەواوی تێدا هەیە و هەر لەبەر ئەوەشە کە تەنیا بە پێشنیازێك دەدرێتە قەڵەم، نەك بە دەستوورێك کە رێزی بگیرێ و پێڕەوی بکرێ"[٧٢].

سەبارەت بە رێنووسی کۆڕ مستەفا نەریمان لەمەڕ ئەو رێنووسە دواوە و بەڵام تەنیا خستنەڕووە و هیچ را و بۆچوون و رەخنەیەکی لێ نەگرتووە[٧٣].

سەبارەت بە رێنووس مەسعوود محەمەد نووسیویە: "...مەیلەو بەدرێژی لەم لایەنانە دواوم،.... ئەو هەرایە بێ جێ و رێیەیە کە یەخەگیری کۆڕ بوو لەسەر رێنووسێك کە ئێستە هیچی لەو چاکتر (وەیا وەکوو ئەویش) نەهاتۆتە کایەوە کەچی پاش نەمانی سەربەخۆیی (کۆڕی زانیاری کورد) کەسێك لەو رەخنەگرانە دەنگی ناڕەزایی بەرز نەکردەوە.

بەڵێ بێگومان خامۆش بوونی رەخنەی ناحەزان رێکەوتێکی چاکە، بەڵام دیاردەکە عەیبدارە"[٧٤].

بێگومان ئەو رێنووسە بووەتە جێی رەخنە و سەرنجی نووسەر و رووناکبیران، تەنانەت دواتر کۆڕ خۆشی وازی لێ هێناوە.

**ب– زاراوە:**

– یەکێك لە کارە گرنگ و لەپێشینەکانی کۆڕی زانیاری کورد، دانانی زاراوە بووە، بۆ ئەم مەبەستەش کۆششی زۆر کراوە و لیستی زاراوە ئامادەکراوە و کە لە ژمارە (١)ی گۆڤارەکەدا زاراوەی کارگێڕی بڵاوکراوەتەوە وەك لیستی یەکەم، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی داوا لە مامۆستا کوردەکان دەکات کە بە وردی سەرنجیان

بدەنێ و لە ماوەی شەش مانگدا بیری خۆیان بە کۆڕ رابگەیەنن لەبارەیانەوە، بۆ بڕیارلێدان و چەسپاندنیان و بۆ دواجار بڵاوکردنەوەیان، ئەم لیستە لە ل (٤٢٣ — ٥٢٥)ی گۆڤارەکەی بردووە[٧٥].

کۆڕ بۆ دانان و داڕشتنی زاراوەیش، هەوڵی داوە بە رێبازێکی زانستی و بەکەڵك وەرگرتن لە ئەزموونی گەلان زاراوە و وشە دابنێ و دابتاشێت[٧٦].

لەبارەی لیستی زاراوەکانی کۆڕ، نووسەران و رووناکبیران سەرنج و را و بۆچوونی خۆیان نووسیوە، سەبارەت بە لیستی زاراوەکان، نەوشیروان مستەفا (١٩٤٤ — ٢٠١٧) لە (ڤیەنا) دەیخوێند، وتارێکی دوورودرێژی لەبارەیەوە نووسیوە و لاپەڕە و نیوێکی رۆژنامەی (هاوکاری) گرتووەتەوە و را و بۆچوونی خۆی سەبارەت بە زاراوەکان دەربڕیوە و نووسیویە ئەو دەستپێشخەرییەی کە داوا لە خەڵك دەکات، لەماوەی شەش مانگ رایان دەربڕن مایەی دەستخۆشییە، بە مەزن و مژدەی پاشەڕۆژێکی روون و پڕکاری پوخت و بەکەڵك بۆ کۆڕ دادەنێت پاشان هەندێ را و سەرنج دەردەبڕێت و بەوە دەست پێدەکات کە (رزگارکردنی زمانی کوردی لە داوی لاساییکردنەوەی زمانانی دراوسێ و سڵ نەکردنەوە لە وشەی بێگانە و داڕشتنی کوردانەی وشە و نێرەمووکی وشە، پاشان هەندێ لە زاراوەکانی لێك داوەتەوە[٧٧].

عەزیز گەردیش بە چوار بەش لەو زاراوانە دواوە و زۆر دڵسۆزانە ئاماژە بە هاتنەدی ئاواتی دامەزراندنی کۆڕ دەکات، وەك نووسیویە: "نەتەوەی کوردیشمان وەك هەموو نەتەوەکانی تری ئەم سەر زەمینە خاوەنی کۆڕی زانیاری خۆی بێت و بتوانێ بەهۆی ئەم کۆڕەوە خزمەتی راستەقینەی زمان و ئەدەب و مێژوو و رۆشنبیری خۆی بکات و لە فەوتان و لەناوچوون و شێواندن بپارێزێ، ئەوەبوو ئەو ئاواتە هاتەدی و — کۆڕی زانیاری کورد — سەری هەڵدا و کەوتە مەیدانی ئیش کردن و جموجۆڵ و چالاکی یەوە، یەکێ لە چالاکی یە چاوەڕوان کراوەکان ئەوەبوو کە گۆڤارێکی ئەکادیمی دەربکات و کەلێنێکی گەورەی پڕ کردەوە"[٧٨].

پاشان دێتە سەر ئەوەی کە لەبەرئەوەی وەك کورد لە سەرەتاداین پێویستە هۆشیارانە هەنگاو بنێین و "دەبێ رێگایەکی ورد و زانستییانە بگرینە بەر...."[٧٩].

بێگومان عەزیز گەردی زۆر دڵسۆزانە و دڵ گەرمانە و وردکارانە و وەستایانە بە پیل داخوازی کۆڕەوە چووە و وەك ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەیی، سەرنج و راکانی خۆی لەمەڕ زاراوەکانی کۆڕ تۆمارکردووە، بەتایبەتی کە ئەو ئەوکاتە لە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی زمانزان بوو [٨٠].

جەمال عەبدول یەکێکە لەو رووناکبیرانەی کە چەند تێبینییەکی لەبارەی زاراوەکانی کۆڕ بڵاوکردووەتەوە و لەسەرەتادا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو کۆڕە کۆڕی هەموو کوردێکە [٨١].

(ع. ع. شەونم)یش بەچەند ئەڵقەیەك لەمەڕ بەشی زمانەوانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، لێکۆڵینەوەی کردووە، بۆنموونە ئەو نووسەرە (وشە)ی پێ لە (ووشە) پێ راستترە [٨٢].

نووسەر و رووناکبیرانی دیکەش را و بۆچوونی خۆیان لەبارەی لیستی زاراوەکانی کۆڕ دەربڕیوە، ئەمەش بەمەبەستی دەوڵەمەندکردن و پوختەکردنیان بوونە [٨٣].

نووسەرێکی دیکەش بابەتێکی بەناوی "پیاچوونەوەیەك بە پەراوێزی زاراوەکانی کۆڕدا" بڵاوکردووەتەوە، تێیدا پەسنی کارەکانی کۆڕی کردووە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زمانی کوردی، وەك دەڵێت: "ئەو راستیەی کە وەك بەفری نزار سپییە لەلام کە هەموو تاقیکردنەوەیەك دوور نیە لە هەڵە و نووچ دان، ئەم دیاردەیەش رووی بارێکی ئاسایی ئەنوێنێ لە دوو توێی هەموو ئەزموونێکدا، بەتایبەتی لە مەیدانی زمان دا کە سروشتێکی ئاڵۆز و پێچەڵی هەیە، بۆیە گەرەکە هەمیشە لە پێداچوونەوە و بەراوردکردن و مشت وماڵ دا بین بەتایبەتی لەنێو قووڵایی راستی و لەسەر رێڕەوێکی مەنهەجی زانیارییانە" [٨٤].

دوای ئەوە نووسەر دێتە سەر ئەوەی کە بوونی چەند زاراوەیەك بۆ زمانی کوردی بەڵگەی دەوڵەمەندی ئەو زمانەیە بۆیە هاتووە هەندێ زاراوەی دیکەی خستووەتە سەر ئەو زاراوانەی کۆڕ پێشنیازی کردوون [٨٥]، پاشان نووسەرێکی دیکە هاتووە سەرنجی خۆی لەبارەی وتاری ناوبراوەوە دەربڕیوە [٨٦]، هەر ئەو نووسەرە (خالد صابر عثمان) جارێکی دیکە دێتەوە سەر زاراوەکانی کۆڕ، روونکردنەوەیان لەبارەوە دەدات [٨٧].

سەبارەت بە لیستی زاراوەکانی کۆڕ پێشتریش ئاماژەمان پێدا زۆر لە رۆشنبیران و نووسەران رای خۆیان دەربڕیوە چ بە نامەی راستەوخۆ بۆ کۆڕ خۆی یان لەسەر رووپەڕی گۆڤار و رۆژنامەکان، دیارە کۆڕ خۆشی داوای لەو توێژە کردبوو کە دەتوانن بۆ ماوەی شەش مانگ سەرنج و تێبینی و پێشنیازەکانیان لەو بارەیەوە بۆ بنێرن، کە ئەمەش بووەتە مایەی دڵخۆشی و دەستخۆشیی نووسەران و رووناکبیران و ئەوانیش بۆ خزمەتکرنی ئەم بوارە را و بۆچوونی خۆیان دەربڕیوە و کۆڕیش لیژنەیەکی تایبەتی بۆ ئەم کارە دامەزراندووە بۆ ئەوەی بەوردی لە هەموو ئەو را و پێشنیار و سەرنجانە بکۆڵنەوە و پوختەی رای خۆشیان بە راپۆرت داوەتە ئەنجومەنی کۆڕ، – تەنانەت ئاماژە بەوەش دەکات کە رۆشنبیرێکی دووروڵات (نەوشیروان مستەفا، ١٩٤٤ – ٢٠١٧) لەو بارەیەوە نووسیوە، ئەم پرسکردنە بە خەڵکی بە دەستپێشخەرییەکی مەزن و مژدەی پاشەرۆژێکی روون و پڕ کاری پوخت و بەکەڵك بۆ کۆڕی زانیاری کورد دادەنێم، – ئەنجومەنی کۆڕیش بەوردی لە راپۆرتی لیژنەکەی کۆڵیوەتەوە و ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەپێویستی زانیون لە لیستی یەکەمی زاراوە بڵاوکراوەکاندا کردووە[88]. لە ژمارەی دووەمیشدا (لیستی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ) بڵاوکراونەتەوە[89].

لە هەمووی زیاتر کە زۆرتر قسەی لەسەر کردووە زاراوەکانی کۆڕە کە ئەو زاراوانە بە لیست و بە چەند بەشێك لە ژمارەکانی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە و دیسان وێڕای باسکردنی هەوڵەکانی خۆی لە سەرەتاوە بۆ زاراوەسازی هاتووەتە سەر زاراوەکانی کۆڕ، نزیکەی (١١) لاپەڕەی گرتووەتەوە[90]. لە تێبینییەکدا نەبەز ئاماژەی بەوەکردووە کە تۆفیق وەهبی سەبارەت بەو رەخنانەی لە کۆڕی گرتووە لەگەڵی هاودەنگ بووە[91].

وەك ئاماژەمان پێکرد د. نەبەز رەخنەی لە لیستی زاراوەکانی کۆڕیش گرتووە کە لە بەرگەکانی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە، لێرەدا د. ئەورەحمانیش لە بەشی چوارەمی وتارەکەیدا بە درێژی وەڵامی داوەتەوە و بەشێکی زۆری دووبەشی چوارەم و پێنجەمی گرتووە، دیارە بەرای خۆی د. ئەورەحمان لەو شوێنانەی کە وەك دەڵێ رەخنەی بەجێی گرتووە ئاماژەی پێ کردووە: "لەگەڵ ئەوەشدا راست نییە ئەوە لەیاد بکرێ کە د. نەبەز چەند زاراوەیەکی لەباری لەجێی زاراوە نادروستەکانی کۆڕ داناوە"[92].

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە ڕووناکبیرانی دیکەش بەدواداچوونیان بۆ زاراوەکانی کۆڕ کردووە، مەسعوود محەمەد بەدواداچوونی بۆ وتارەکەی د. ئەوڕەحمان کردووە لەمەڕ زاراوەکان بەتایبەت ئەوەی لە ژمارە (٧٦) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا بڵاوکراوەتەوە[٩٣].

جارێکی دیکە ئەوڕەحمانی حاجی مارف بەدواداچوونی بۆ وتارەکەی مەسعوود محەمەد کردووە و وەڵامی داوەتەوە[٩٤]. نووسەرێکی دیکەش لەبارەی لیستی سێیەم و چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ وتاری نووسیوە[٩٥].

بێگومان ئەوەی هەموو بەدواداچوون و بەسەرکردنەوەی لیستی زاراوەکانی کۆڕ لەڕووی پەرۆشی بۆ زمانی کوردی و بەدەنگەوەچوونی داواکانی کۆڕە کە داوای لە شارەزا و نووسەران کردووە ڕای خۆیان سەبارەت بە زاراوەکانی کۆڕ دەرببڕن و چەسپاندن و بژارکردنی زاراوەکان بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی، ئەو داوایەی کۆڕ کە لە ماوەی (شەش مانگ) شارەزایان بیر و بۆچوون و پێشنیازی خۆیان بخەنە بەردەمی کۆڕ کارێکی دیموکراتیانە و زانستیانەیە، بەڵام بەداخەوە هەندێ لە نووسەر و ڕووناکبیران ڕەخنەی توندیان لەو زاراوانە و تەنانەت هەموو کارەکانی کۆڕ گرتووە، کە بێگومان جۆرێك بێ ئینسافی تێدایە....! چونکە هیچ کارێك لە هەڵە بەدەر نییە، بەڵام دەکرێ بە گیانی زانستیانە ڕاست بکرێنەوە و ڕای دروست لەبارەیەوە بدرێت.

**ج– فەرهەنگ:**

یەکێك لە کارە گرنگەکانی کۆڕ دانانی فەرهەنگە، بۆیە بڕیار دراوە لە ماوەی پێنج ساڵاندا فەرهەنگێکی کوردی بە کوردی دەربکەن و د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف بۆ سەرپەرشتی ئەو کارە دانراوە[٩٦].

لەبارەی دانانی فەرهەنگی کوردی – کوردی، لیژنەی فەرهەنگ لە کۆڕی زانیاری بانگەوازێکی کردووە و داوای لە خوێنەران کردووە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن، بەناردنی لیستی ئەو وشە کوردییانەی کە بۆ دروستکردنی ئەم فەرهەنگە سوودیان لێ وەردەگیرێت، بۆ ئەمەش پاداشتی داناوە[٩٧].

سەبارەت بە دانانی فەرهەنگ هەژار نووسیویە پێنج ساڵ ماوە دانراوە کە فەرهەنگێکی کوردی – کوردی تەواو دەربکەن و کارەکەش دراوەتە دەست د.

ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە شارەزا و پسپۆڕی ئەم بوارە بووە. بۆ ئەم کارە بیست و شەش فەرهەنگی کوردی بە زمانانی غەیرە کوردی پەیداکراوە و دەست بەکار کراوە، تەنانەت یەکێك بەناوی (مەلا خەلیل سلیمان) لە شێخان فەرهەنگێکی بادینی هەبووە داوای لێ کراوە کە هاوکارییان بکات بەڵام نەیکردووە، تا ئەوەی هەژار بۆخۆی چووەتە لای و رازی کردووە و فەرهەنگەکەی لێ وەرگرتووە[٩٨].

سەبارەت بە فەرهەنگی گیوی موکریانی، مەسعوود محەمەد هەوڵی داوە کە فەرهەنگەکەی چاپ بکرێت و تەنانەت بڕە پارەیەکیشی وەك پێشەکی بۆ ناردووە، بەڵام کە ئەو لە لیژنەی فەرهەنگ نەماوە، ئەوەی جێی گرتووەتەوە بڕیارەکەی هەڵوەشاندووەتەوە و موکریانیش پارەکەی بۆ هێناوەتەوە و دۆخەکە زۆر کاری لێ کردووە[٩٩].

جەمال نەبەز رەخنەی لە کۆڕ گرتووە سەبارەت بە چاپکردنی هەندێ کتێب، لەوانە کتێبی "رێکەوت لە تەرازووی ژیری دا"، بەڵام کۆڕ فەرهەنگی کوردی – عەرەبی گیو موکریانی (١٩٠٣ – ١٩٧٧) بڵاو ناکاتەوە و وەك دەڵێت: "لە هەمووی خراپتر ئەوەیە یەکسەر بە خاوەنەکەشی ناڵێ بڕۆ بەرهەمەکەت بڵاوناکەمەوە، بەڵکو چەند ساڵێك دەیهێنێ و دەیبا و دەستی دەستی پێ دەکا و وێنەی فەرهەنگەکەی دەگرێتەوە و بێ رازی بوونی نووسەرەکەی لای خۆی گلی دەداتەوە و نایندێرێتەوە بۆی. نووسەری نەگبەتیش لە ژێر باری ئازار و خەفەت و پیش خواردنەوەدا دەناڵێنێ. لە نامەیەکدا خوالێی خۆش بوو پێش کۆچی دوایی بە چەند رۆژێك نووسیبووی بۆم، ئەوە دوانامەیە کە لە ژیانیدا نووسیوێتی، دەردی دڵی خۆی گێڕابۆوەوە بۆم و نووسیبووی کە کۆڕ ئاوای پێ کردم، منیش پیر و نەخۆش و بێ کەسم و بەم زووانە دەمرم... ئەم سکاڵایە کسپەی لە جەرگم هەستاند و ......"[١٠٠].

ئەو نامەیە بە نامیلکەیەك بڵاوکراوەتەوە و تێیدا سەرەتا لە (روونکردنەوەیەکی پێویست)دا د. کوردستان موکریانی ئاماژە بە وتارێکی "جەمال نەبەز" دەکات کە دوانامەی گیو موکریانی بۆ "جەمال نەبەز" ناردووە و بڵاوکراوەتەوە، کەوا بۆچی کۆڕی زانیاری کورد (فەرهەنگی نۆبەرە)ی چاپ نەکردووە، ئەو نامەیە (١٨) رۆژ بەر لە کۆچی دوایی گیو موکریانی نووسراوە[١٠١].

پاشان کوردستان موکریانی شەش پرسیار دەکات سەبارەت بەو بابەتە: ئەویش بۆچی کۆڕ بەڵێنی خۆی لە چاپکردنی فەرهەنگەکەی گیو نەهێناوەتە دی، بۆ کۆڕ دوو ساڵ و نۆ مانگ و هەفتەیەك دەستنووسی فەرهەنگی نۆبەرەی لای خۆی هێشتووەتەوە، لەبەرچی سێزدە مەلزەمەی فەرهەنگەکە چاپ کراوە و دواتر وازی لێ هێنراوە، کۆڕ حەوت سەد لاپەڕەی لە فەرهەنگەکە بە دوو کەس نووسیوەتەوە کەچی دواتر بۆ خاوەنەکەی نەگێڕاوەتەوە، ئەمە چ جۆرە هەڵسوکەوتی ئەکادیمیانەیە بەرامبەر بە کەسێکی خزمەتکار بە زمانی کوردی و فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە[۱۰۲] و فەرهەنگی کوردستان چ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە؟[۱۰۳].

لەو نامیلکەیەدا دوو بابەتی سەرەکی لەخۆگرتووە: یەکەمیان ژمارەیەك نووسراوی کۆڕی زانیاری کوردە لە نێوان ۱۹۷۳/۲/۱۰ – ۱۹۷٦/۱۲/۱۹ دا و یازدە نووسراو لەبارەی چاپکردنی فەرهەنگی نۆبەرە و فەرهەنگی کوردستان و بە ئیمزای ئەمانەیە: مەسعوود محەمەد، ئیحسان شێرزاد، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، مەلا شکور و عەبدوللەتیف عەبدولمەجید محەمەد. دووەمینیش دوانامەی گیو موکریانی بۆ کۆڕ لە ۱۹۷۷/٦/۹، واتە (٤٥) ڕۆژ بەر لە کۆچی دوایی کردنی، وەك کوردستان موکریانی دەڵێت وێڕای بەڵێنی چاپکردنی فەرهەنگەکە، کەچی سەرەنجام بۆیان ناردووەتەوە و خۆی داوای لە هەریەك لە مەسعوود محەمەد و ئەوڕەحمان و مەلا شکور کردووە کە هۆی چاپ نەبوونی پێ بڵێن، بەڵام ئەوان هەریەکە خستوویەتیە ئەستۆی ئەوی دیکە و کەس بەرپرسیاریەتی هەڵنەگرتووە[۱۰٤].

هەر لەو ڕۆژگارەدا کوردستان موکریانی وتارێکی سەبارەت بەو بابەتە بە سەرناوی "نامەکانی کۆڕی زانیاری ملکەچن" نووسیویە، وتارەکە پەخشان ئامێزە و زۆر بە دڵشکاوی گلەیی توند لە کۆڕ دەکات کە تەنانەت لەو باوەڕەدایە لەسەر گۆڕی گیو پێی ناخۆشە ناوی کۆڕی زانیاری ببات لەبەرئەوەی ئەو نامانەی کە نووسراون بۆ چاپکردنی فەرهەنگەکە جێبەجێ نەکراون و نامەکان هاواریانە بۆ ئەوەی بەرەو ڕووی خوێنەرانیان بکاتەوە[۱۰٥].

د. جەمال نەبەز پێی وایە فەرهەنگی (هەنبانە بۆرینە)ی هەژار، لەگەڵ ئەوەی گیو موکریانی کە ناوی (کوردستان)ـە "جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە" کە کاتی خۆی بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك زیاتر فەرهەنگەکەی گیو موکریانی لە کۆڕی زانیاری کورد بووە لە بەغدا بۆ چاپکردن، بەڵام چاپ نەکراوە و نەشیان داوەتەوە[١٠٦].

گیو موکریانیش لە دوانامەکەیدا بۆ کۆڕی زانیاری کورد سەرەتا باس لە کۆششی (٦٢) ساڵەی خۆی دەکات لە بواری فەرهەنگنووسی کوردی بەتایبەتی و ڕووناکبیری کوردیدا بەگشتی، بەوردی لەو نامە و گفت و بەڵێنانە دەدوێت کە پێیان داوە بۆ چاپکردنی کەچی سەرەنجام چاپ نەبوو، تەنانەت گیو بەخۆڕاییش فەرهەنگەکەی پێشکەش کردوون[١٠٧].

دواتر سەرنجێکی وا دەردەبڕێت کەوا بەم زووانە دەمرێت و بەناوی کۆڕ و پسپۆڕی زمانەوانییەکانیەوە چاپی دەکەن و شەقێك لەناوی گیو دەدەن، ئەگینا بۆ نامدەنەوە هەروەك دەڵێت[١٠٨].

سەبارەت بە چاپ نەکردنی فەرهەنگەکەی گیو موکریانی، د. ئەورەحمان نووسیویە: "کۆڕ کۆششێکی ئێجگار زۆری بۆ لەچاپدانی فەرهەنگی ناوبراو کرد، بەڵام نەگەیشتنە ئەنجام خوالێخۆشبوو گیوی موکریانی خۆی بوو و گەلێ کەسیش ئاگاداری ئەم ڕاستییەن...."[١٠٩].

لەبارەی وێنەگرتنی فەرهەنگەکەی موکریانی د. ئەورەحمان دەڵێ وێنەی ئەو فەرهەنگە نەگێراوەتەوە....[١١٠].

دواتر د. جەمال ڕەخنە لە ناوەڕۆکی کتێبی (قاموسی زمانی کوردی)ی ئەورەحمانی زەبیحی دەگرێت کە لە ساڵی ١٩٧٧ لە چاپخانەی کۆڕ چاپ بووە[١١١].

بەڵام وادیارە ئەو فەرهەنگە لەسەر ئەرکی کۆڕ چاپ نەبووە، بەڵکو لەسەر ئەرکی خاوەنەکەی چاپ بووە، تەنیا لە چاپخانەی کۆڕ چاپ کراوە، هەروەك د. ئەورەحمانی حاجی مارف لە وتارێکی پێنج ئەڵقەییدا وەڵامی ئەو ڕەخنەیەی د. جەمال نەبەزی داوەتەوە و تێیدا ئاماژە بەوە دەکات وەك پسپۆڕ لە بواری فەرهەنگسازیی بە کارێکی سەرکەوتوو و گەورەی داناوە و بەرپەرچی ڕاکانی د.

جەمال نەبەزیشی داوەتەوە سەبارەت بە ناوەڕۆکەکەی لە وشەی داتاشراو و بێگانە و هەندێ لایەنی دیکەی زمانەوانی[١١٢].

لەبارەی ڕەخنەی د. جەمال نەبەز لە (قامووسی زمانی کوردی) عەبدوڕەحمانی زەبیحی کە لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات بڵاوی کردووەتەوە[١١٣]. عەبدوڕەحمان زەبیحیش وەڵامی داوەتەوە وەك نووسیویە: ئەو بەتەمای "ڕەخنەی زانستی" بووە، بەڵام ئەو هاتووە "پاش حەوت ساڵ بەکارەکانی (کۆڕ)دا دەچێتەوە کە لە ڕۆژی دامەزرانیەوە تا ئێستا کردوویە". لەبەرئەوەی (قامووسی زمانی کوردی)یش لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد چاپ بووە وەك دەڵێت کەوتووەتە بەر ڕەخنەی د. جەمال نەبەز، بەڵام ئەو قامووسە کۆڕ چاپی نەکردووە، بەڵکو تەنیا لە چاپخانەکەی ئەوان چاپکراوە، پاشان بە درێژی وەڵامی ڕەخنەکانی د. جەمال نەبەزی داوەتەوە[١١٤].

## ٢- گۆڤاری کۆڕ:

لە کارە هەرە دیارەکانی کۆڕ دەرکردنی گۆڤارێکی بەبارست و دەوڵەمەند کە تا ئەو ڕۆژگارە لەمێژووی ڕووناکبیریی کوردیدا کاری وانەکرابوو، گۆڤارێکی (٨٠٠) لاپەڕەیی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی تەژی بە لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری زمانەوانی و مێژوویی لەگەڵ یاسا و پێڕەوی ناوخۆی کۆڕ و هەندێ وردەبابەت بە قەڵەمی چەند زانا و ئەکادیمی و پسپۆڕ[١١٥].

ئەم ژمارەیەی کۆڕ (٧٩٩) لاپەڕەیە، (٥٤٢) کوردی و (٢٤٢) عەرەبییە کە گەورەترین گۆڤارە لە مێژووی چاپەمەنی کوردیدا تا ئەو ڕۆژگارە[١١٦].

هەر بەو بۆنەوە سەرۆکی کۆڕ دانەیەك لە گۆڤارەکە بەدیاری لەگەڵ نامەیەك بۆ مەلا مستەفا بارزانیش ناردووە و نووسیویە: "ئەم ئەستێرە نوێ یەی ڕۆشنبیری کورد کە پێشەنگی بەرهەمەکانی کۆڕە لە مەیدانی زانستدا جگە لە ڕاگەیاندنی ئومێد بە گەشانەوەی خوێنەواری کورد لەسەر بناغەیەکی زانستیی نوێ موژدەی هاتنەدی بەڵێنەکانی تری شۆڕشی کوردیش دەدا لەو ڕووەوە کە کۆڕ خۆی یەکێکە لە دەستکەوتە بەنرخەکانی خەباتی پڕ شانازی گەلی کوردمان"[١١٧].

بە دەرچوونی (بیری نوێ)یش وەك بڵاوکراوەکانی دیکە لـە "گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد" دواوە وێـڕای پەسـندان و خسـتنەڕووی نـاوەڕۆکی لەکۆتاییـدا، سڵاوێکی گەرمی شانازی و دەست خۆشییان لە کۆڕ کردووە بۆ ئەو کارە نۆبەرەیە وەك نووسیویە[١١٨].

هەر بەهەمان شێوە، دەرچوونی گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد، ڕووداوێکـی ئاسایی نەبوو، نەخوازە گۆڤارێك بەو بارست و ناوەڕۆکـە دەوڵەمەنـدە کـە تـا ئـەو ڕۆژگـارە، گۆڤـاری لـەو شـێوەیە لـە ڕەوتـی ڕۆشـنبیری و ڕۆژنامـەوانی کـوردی دەرنەچـوو بـوو، بۆیـە سـەرۆکی کـۆڕ ئیحسـان شـێرزاد بەنامەیـەك ژمـارە یـەکی گۆڤارەکەی بۆ سەرکۆماری عیراق وەك دیاری لە ١٩٧٣/٣/١٢ بۆ ناردووە[١١٩].

ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە هەر هـەموویان پێشـوازی گـەرمیان لـە دەرچوونی گۆڤاری کۆڕ کردووە و بەبایەخەوە لێی دواون[١٢٠].

هەر لەبارەی گۆڤاری کۆڕەوە لەڕۆژنامەی (هاوکاری) و (گۆشەی هەرجارەی باسێك)، نووسەرێکی دیکە دوای ئەوەی لە بایەخی ئـەو گۆڤـارە دەدوێـت، گلـەیی لەوە دەکات کـە نووسـەران بـێ دەنگـن لەبارەیـەوە، ئەگەرچـی کـۆڕ خـۆی داوای کردووە، کەم و کوڕییەکانیان بخەنە ڕوو، کـە ئەمەشـی بـە کـارێکی بـاش دانـاوە، بایـــەخی ڕەخنەشـــی بـــۆ دەوڵەمەنـــدکردن و گـــرتنی کـــەلێن و نەهێشـــتنی کەموکوڕییەکانی دەبنە هۆی پەرەسەندن و پێشکەوتن[١٢١].

د. جەمال نەبەز ڕەخنە لـە (گۆڤـاری کـۆڕ)یش دەگرێـت و دەڵێـت: "دەبـوو بەرزترین و باشترین گۆڤاری کوردی بێ، بـەڵام بەداخـەوە وانـی یـە"[١٢٢]، لـەوەوە دەدوێت کە گۆڤارەکە نەخشەی دانراوی وەك گۆڤـارێکی ئـەکادیمی نییـە، چـونکە سەربە دەزگایەکی زانستی بەرزە، دەبـووا بـەدوای بابـەتی پێویسـت و شـایەن بـە کۆڕی زانستیدا بگەڕێیت. هـەر لـەو ڕووەوە ڕەخنـە لـەو دوو وتـارە زمانەوانییـەی مەسعوود محەمەد دەگرێت، یەکیان بەناوی "بەکارهێنانی (ی) لە زمانی کوردیـدا" و ئەوی دیکەیان "سووڕێکی خامە بە دەوری (ڕاناو)دا"، کە لـە ژمـارە (٢، ل ٩ – ١٣٢)ی گۆڤاری کۆڕ بڵاوبوونەتەوە، وەك نووسیویە: "لـەباتی ئـەوەی هەوڵبـدا لـە بابەتەکـەی بـدوێ، دەچـێ هـەزار قسـە و قسـەلۆکی وا دێنێتـە پێشـەوە کـە نـەك پێوەندی یان بە زمانەوانی یەوە نی یە، بە کوردی ووتارێك کە دەیتوانی بە ٣ – ٤

لاپەڕە مەبەستەکەی بەتەواوی بدا بەدەستەوە، ئەو (٧٥) لاپەڕەی لەسەر رەش کردووەتەوە و هێشتا دڵیشی رەحەت نەبووە"، هەروەها رەخنە لەو وتارەی شێخ محەمەد خاڵیش (١٩٠٤ — ١٩٨٨) دەگرێت بەناوی "سەید جەمالودینی ئەفغانی"، لە دوو ژمارەی گۆڤارەکە بڵاوکراوەتەوە و (٨٩) لاپەڕەی گرتۆتەوە کە بەلای د. نەبەزەوە بە زمانی عەرەبی و فارسی زۆری لەسەر نووسراوە و گۆڤاری کۆڕ شوێنی ئەو وتارە نییە، دەکرا لە شوێنی دیکە بڵاوبکرێتەوە. هەروەها رەخنەی لە وتارەکانی د. نەسرین فەخریش گرتووە، کە لەبارەی (پاشگر و پێشگر) و د. پاکیزە رەفیق حیلمیش لەبارەی (دەستوورسازی زمانی کوردی) نووسیوە، گرتووە[١٢٣].

هەروەها رەخنەیەکی توندیش لە د. ئەورەحمانی حاجی مارف دەگرێت سەبارەت بە وتاری "لیکسیۆلۆژی زمانی کوردی" کە پێی وایە وتارێکی زۆر سادەیە، رەخنەی لە وتارەکەی محەمەد ئەمین هەورامانی بەناوی "تەماشاکردنێکی سەرپێ ی زاری سۆرانی و زاری هەورامی"[١٢٤].

سەبارەت بە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد هەندێ لە نووسەران رەخنەیان لە ناوەڕۆکی گرتووە، بۆ نموونە جەمال محەمەد لە وتارێکیدا وێڕای پەسنی گۆڤارەکە لە سەرەتادا پاشان دەڵێت لە کەموکوڕی بەدەرنییە، چونکە وەك دەڵێت کۆڕی زانیاری گەورەترین دەزگای رۆشنبیرییە بۆ راستکردنەوەی ناتەواوییەکانی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد و زمانێکی یەکگرتووی کوردی دابنێ، بەڵام وادیارە وەك دەڵێت ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرا ئەوە نییە، بۆیە هاتووە رەخنەی لە هەندێ لە وتارەکانی گرتووە، لەوانە وتاری د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی، بەناوی (پاشکۆ درا)، هەروەها روونکردنەوەیەکیش بۆ د. نەسرین فەخری راستییەکەی {پاکیزە رەفیق حیلمی} یە، نووسیوە[١٢٥].

هەروەها نووسەرێکی دیکەش روونکردنەوەیەکی سەبارەت بە شیعرێکی بڵاوکراوەی (خەلیل موخلیس) بەناوی (وڵات هەی وڵات) نووسیوە، چونکە نووسەر خۆی پێشتر هەندێ لە شیعرەکەی نووسیوەتەوە و هەروەها دەقی دەستنووسی شیعرەکەی بە خەتی شاعیر کەوتووەتە بەردەست و دوای بڵاوبوونەوەی شیعرەکە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری هاتووە بەراوردی کردووە لەگەڵ

ئەوەی لای خۆی، بەمەش وەك دەڵێت جیاوازی زۆر کەوتووەتە نێوانیان، سەرەتا باسی دەستنووسەکە دەکات لەڕووی قەوارە و شێوازی نووسین و لەوێ شیعرەکە بەناوی (وڵات)ە کە لەگەڵ ئەوەی بڵاوبووەتەوە جیاوازی هەیە، پاشان دێتە سەر دێرە شیعرەکان و پێکیان دەگرێت[١٢٦].

تەنانەت رۆژنامەی (ریاتازە)ش لە ژمارە (٨٢)ی سیازدەی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣، وتارێکی درێژی لەبارەی ناوەڕۆکی گۆڤارەکەوە بڵاوکردووەتەوە: ژمارەیەکی زۆریش لە زانا و رۆژهەڵاتناس و رۆشنبیران بە نامەی پڕ لە سۆز پێشوازی دەرچوونیان کردووە[١٢٧].

ژمارە دووی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بە هەمان بارستی پێشوو و بە قەوارەی (١٠٠٠) لاپەڕە کە هەمووی بە زمانی کوردییە لە ساڵی ١٩٧٤ دەرچووە، لە سەروتاری ئەم ژمارەیەدا سەرۆکی کۆڕ ئاماژە بەوە دەکات کە ژمارە یەکی گۆڤارەکە دەنگێکی باشی لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا داوەتەوە و زۆر بەڕێز و سۆزەوە پێشوازی لێ کراوە و زۆربەی گۆڤار و رۆژنامە کوردی و عەرەبییەکان سەبارەت بە دەرچوونی ژمارە (١) و ناوەڕۆکی وتاریان بڵاوکردووەتەوە، لەگەڵ ئاماژەکردنێکی خێرا بە کارەکانی کۆڕ جارێکی دیکە دووپاتی دەکاتەوە کە ئەم کۆڕە هی هەموو زانا و رووناکبیرەکانی کوردە بۆ هەمووان دەرگای لەسەر پشتە[١٢٨].

لە ژمارەی(٢–٢)ی ساڵی ١٩٧٤ گۆڤاری کۆڕ، وێڕای وتاری سەرۆکی کۆڕ لەبارەی سێ ساڵ لە تەمەنی کۆڕ، چەند بابەتێکی ئەدەبی و زمانەوانی و لیستی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ لە بەشی کوردی و لە بەشی عەرەبیشدا چەندین وتاری مێژوویی زۆر گرنگ و هەواڵەکانی کۆڕ بڵاوبوونەتەوە و ژمارەی لاپەڕەکانی (٣١٠) لاپەڕەیە و لەگەڵ بڵاوکردنەوەی دوو وتار، یەکیان (سەبارەت بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی گەلی کورد و ئەرکەکانی کۆڕی زانیاری کورد) کە د. کەمال مەزهەر ئەحمەد لە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی لە پاریس لە ١٦ – ٢٢ی تەمموزی ١٩٧٣ بەستراوە، پێشکەش کردووە، ئەوەی دیکەش وتاری مەسعوود محەمەدە لە رۆژی پەردەلادان لەسەر کۆتەڵی حاجی قادری کۆیی لە رۆژی ٢٩/١١/١٩٧٣ لە کۆیە[١٢٩].

لەبارەی گۆڤاری کۆڕەوە سکرتێری کۆڕ ئاماژە بەوە دەکات کە گۆڤاری کۆڕ بەو بارستە زۆرەوە لەڕووی ژمارەی لاپەڕەکانیان، ئەم هێشتووە هەڵەیەک رووبدات، خۆی هەمووی هەڵەبڕ کردووە، تەنانەت پوختەی عەرەبی و وتارەکانیش هەر خۆی نووسیویەتی. لەمەدا پشتگیری سەرۆکی کۆڕ ئیحسان شێرزاد زۆربووە. لەبەرئەوەی پیاوێك بووە رەفتاری لەگەڵ کرێکارەکانی چاپخانە زۆر برایانە بووە و بەتایبەت چوونەتە چاپخانە بۆ سوپاس کردنیان[١٣٠].

سەبارەت بە گۆڤاری کۆڕ هەژار ئاماژە بەوە دەدا لە ژمارە (٢)ی کۆڕدا وتارێکی نووسیوە لەمەڕ ئەو وشە بیانیانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هەن، بەمەش کۆڕی زانیاری عیراق تووڕە بوون و پێیان (کوفر) بووە و سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردیش زۆر پێی نیگەران بووە، بەڵام هەژار ئامادەبووە بۆیان روون بکاتەوە کە ئەو کارەی بەپشت بەستن بە چەند سەرچاوەی بەروومەت بەستووە و ئەنجومەنیان گرتووە بۆی روون کردوونەتەوە[١٣١].

کۆڕ ژمارەیەکی دیکەی گۆڤارەکەی دەرکردووە، کە جگە لە سەروتار ژمارەیەك بابەتی ئەدەبی و زمانەوانی و لیستی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ و پوختەی کارەکانی کۆڕ لە بەشی کوردی و لە بەشی عەرەبیشدا چوار بابەتی مێژوویی و شوێنەواری کە هەمووی کاری شایەن و دەوڵەمەندن و نووسەرانی وەك ئیحسان شێرزاد، مەسعوود محەمەد، عەلائەدین سەجادی، قەناتی کوردۆ، پاکیزە رەفیق حیلمی، نەسرین فەخری، سادق بەهائەدین ئامێدی، ئەمینی عەڤدال، عەمید ئەحمەد حەسەن، جەمال بابان، تەها باقر، شێخ محەمەدی خاڵ، ئەورەحمانی حاجی مارف، جەلیلە ناجی هاشمین، کە (٧٥٥) لاپەڕەی گرتووەتەخۆ[١٣٢].

بایەخدانی رۆژنامە و گۆڤارەکان بە دەرچوونی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بۆ نموونە کە بەرگی یەکەمی – بەشی سێیەمی گۆڤار دەرچوووە، هاوکاری ناوەڕۆکی خستووەتە بەرچاوی خوێنەران[١٣٣].

بەرگێکی دیکەی گۆڤاری کۆڕ و دیسان بە چەندین بابەتی جۆراوجۆری ئەدەبی و مێژوویی و جوگرافیایی و ئایینی و زمانەوانی و لیستەی پێنجەمی زاراوە و پوختەی کارەکانی کۆڕ دەرچووە. ئەم ژمارەیەش (٦٣٨) لاپەڕەیە[١٣٤].

کۆڕی زانیاری کورد ئاماژەی بەوە کردووە، لە هەرلا و کەسێکەوە گوتار و بەرهەمی رووناکبیری بۆ بێت کە خزمەتی ئامانجەکانی کۆڕ بکات، رەخنە و نرخاندنیش لە هەر لایەکەوە بێت ئەوا لەلایەن کۆڕەوە سەرنجیان لێ دەدرێت و هەڵدەسەنگێندرێت بۆ پەسەندکردن[١٣٥].

بەرگی چواری گۆڤاری کۆڕیش وەك ئەوانی دیکە چەندین بابەتی مێژوویی و رووناکبیری و ئەدەبی و زمانەوانی و بیبلیۆگرافیا کوردی و عەرەبی تێدا بڵاوکراوەتەوە، ئەمە وێڕای زاراوەی زانستی و پوختەی کارەکانی کۆڕ[١٣٦].

بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕ بە هەمان چەشنی ژمارەکانی پێشتر کۆمەڵێك بابەتی مێژوویی و ئەدەبی و زمانەوانی و بیبلیۆگرافیا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی تێدا بڵاوبوونەتەوە[١٣٧].

دواژمارەی ئەم دەورەیەی کۆڕ وەك ژمارەکانی پێشوو بە چەندین بابەت و توێژینەوەی زانستی و ئەدەبی و زمانەوانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بە (٥٩٨) لاپەڕە دەرچووە[١٣٨].

سەبارەت بە وتارەکانی ناو گۆڤاری کۆڕیش دیسان د. نەبەز رەخنەی گرتووە کە هەندێکیان هەر رەشکردنەوەی لاپەڕەن، هەندێك شیاوی ئەوە نین لە گۆڤاری کۆڕ بڵاوبکرێنەوە[١٣٩].

بە هەمان شێوە د. ئەوڕەحمانیش بە درێژیی وەڵامی رەخنەکانی داوەتەوە، بە پێچەوانەی د. نەبەز پێی وایە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد "گەلێ کاری زانستانەی گەورە و گەلێ نووسینی شاکاری کەم وێنەی بڵاوکردووەتەوە"[١٤٠].

ژمارەیەك زانای عەرەب وتار و توێژینەوەی بەپێزیان سەبارەت بە بوارەکانی رۆشنبیری کوردی لە گۆڤارەکانی کۆڕدا بڵاوکردووەتەوە، بێگومان ئەمەش بایەخی گۆڤارەکە و خزمەتکردنی رۆشنبیری کوردی، دەردەخات. لەوانە: د. جەلیلە ناجی ئەلهاشمی، میرنشینی مەسنەوییە لە دینەوەر و شارەزوور[١٤١]، سەعید دیوەچی، شێخ جەرجسی ئەربلی[١٤٢]، شێخ عەبدوڵلای رەبتەکی ١٠٦٠ – ١١٥٩[١٤٣]، تاها باقر، گەشتی مێژوویی لە نێوان پێگەی شوێنەواری لە باکووری عیراق[١٤٤][١٤٥]، چاخەکانی پێش مێژوو لە دۆڵی دووئاوان لەبەر رۆشنایی پشکنینە شوێنەوارییەکان لە کوردستانی عیراق[١٤٦]، عەباس عەزاوی، خەلیفەکانی مەولانا خالید، مەلاونا خالید نەقشبەندی[١٤٧].

### ٣- کارەکانی دیکەی کۆڕی زانیاری کورد:

حاجی قادری کۆیی (١٨١٦ – ١٨٩٧) شاعیری مەزنی نەتەوەیی، زۆر زوو بووەتە جێی بایەخی کۆڕی زانیاری کورد، بۆیە وێڕای راسپاردنی ئەندامێکی بۆ نووسین لەبارەیەوە، ئەوا بڕیاری دروستکردنی پەیکەرێکیشی بۆ دراوە.

هەواڵی دروستکردن و دانانی پەیکەری حاجی قادری کۆیی بووەتە جێی باسی گۆڤار و رۆژنامە کوردی و عەرەبییەکان وەك یەکێ لە کارەکانی کۆڕی زانیاری کورد کە لە رۆژی ١٩٧٣/١١/٢٩ لە شاری کۆیە دانراوە و ئاهەنگی بۆ گێڕدراوە و چەندین نوێنەری کۆمەڵە و رێکخراو و دەزگاکان ئامادەبوونە و وتاری جۆراوجۆر خوێندراوەتەوە، وەك رۆژێکی شکۆمەندی نەتەوەیی خۆی نواندووە[١٤٨].

لە ئاهەنگێکی گەورە لە شاری کۆیە سەرۆکی کۆڕ ئیحسان شێرزاد پەردەی لەسەر کۆتەڵی حاجی لاداوە و مەسعوود محەمەد ئەندامی کارای کۆڕیش وتارێکی خوێندووەتەوە، لەگەڵ چەند وتاری دیکە و شیعرێکی بەرزی هێمن موکریانی (١٩٢١ – ١٩٨٦) بەناوی (دەسکەوتی خەبات) خوێندراوەتەوە کە لە کۆتاییدا دەڵێت:

بەڵام دڵنیابە پیری دانا ئیتر سەنگەر بەتاڵ کردن مەحاڵە
بناخێکی وەهات بۆ کوردی دانا ئیتر کورد و بەزین خەون و خەیاڵە[١٤٩]

کارێکی دیکەی ناوازەی کۆڕ چاپکردنی کتێبی مێژوویی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەدلیسی بوو، کە هەژار ئەندامی کارای کۆڕ بۆ کوردی وەریگێڕاوە بە پێشەکییەکی فراوان، ژمارەی لاپەڕەکانی (١٠١٦) لاپەڕەیە و گەورەترین کتێبی چاپکراوی کوردی بووە تا ئەوکاتە و دوو هەزار و پێنج سەد دانەی لێ چاپکراوە[١٥٠].

جێی ئاماژەیە هەژار لەو بارەیەوە باسی چۆنیەتی نووسینەوە و بڕیارلێدانی بۆ چاپ و مشتومڕی خۆی لەگەڵ کۆڕ کە کێ هەڵیبسەنگێنێ و دیاریکردنی هەقی نووسەر و دیاریکردنی چاپخانە لە نەجەف و بە زەحمەت هەڵەگیری و تیراژی چاپ و سەرئەنجام لە پایزی ١٩٧٢ تا سەرەتای هاوینی ١٩٧٣ لە چاپ دەرچووە و تەنانەت وەك خۆی دەڵێت ئەمەندە خەڵك عەودالی بوونە بازاڕی رەشی پەیدا کردووە[١٥١].

وێـڕای ئەمانـە کـۆڕ بـۆ پاراسـتنی پاشمـاوەی کـۆنی کـوردەواری درێخـی نـەکردووە و چـەندین بەڵگەنامـە و نموونـەی دەسـتخەت و دانـەی ڕۆژنامـەی پاراستووە لەوانە: وەقفنامەی عەبدوڕەحمان پاشای بابان، دوو دەستخەتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ (١٧٩٣ – ١٨٨٧)، دەستخەتی شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٨ – ١٩١٠)، وێنەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) و ژمارە (٥)، وێنەی بەرگی یەکەم چاپی شەرەفنامە، مۆر و ئۆرگانی کۆمەڵەی کوردستان، یەکەم گۆڤاری منداڵان بە کوردی[١٥٢]، ئەمانە بۆ ئەوسا زۆر گرنگ و هەندێکیان بۆ ئێستاش زۆر ناوازە و دەگمەن و گرنگن.

دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کۆڕ بە وەدەستهێنانی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی کۆن و دەستنووس و کتێبی نووسەرانی بیانی لەبارەی کوردەوە[١٥٣].

بەپێی بڕیاری کۆڕ ئەوانەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا بەرهەمیان نەبووە لە کۆڕ لابراون و خەڵکی دیکە هاتووەتە شوێنیان وەك ئەوەی د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی و شێخ عەبدوڵڵا نەقشبەندی لابراون و حەمەی مەلاکەریم (١٩٣٠–٢٠١٧) و شوکر مستەفا و جەمال بابان و هێمن موکریانی، بوونەتە هاوکاری کۆڕ[١٥٤].

لەم ماوەیەدا ژمارەیەك ئەندامی یاریدەدەر بۆ کۆڕ دانراون لەوانە: ئەبوو زەید مستەفا، تاهیر سادق، د. حیکمەت تۆفیق، عەبدوڕەحمان قاسملو، عەبدولمەجید لوتفی، کەریم شارەزا، محەمەد ئەمین حسەین (هێمن)، محەمەد ڕەسووڵ (هاوار)، نوری عەلی ئەمین[١٥٥].

– دامەزراندنی چاپخانەی کۆڕ و یارمەتیدانی نووسەر و توێژەران بۆ چاپکردنی کتێبەکانیان[١٥٦].

ئەمە سەرەڕای هەوڵی دروستکردنی بارەگای تایبەت بە کۆڕ[١٥٧].

– چاپکردنی کتێبی (حاجی قادری کۆیی) لە نووسینی مەسعوود محەمەد لە سێ بەرگ چاپ کراوە[١٥٨].

## ڕەخنە لە کۆڕ:

نووسەران و ڕووناکبیران ڕەخنەیان لە کارەکانی کۆڕ گرتووە و کارەکانیان هەڵسەنگاندووە، هەریەکەو بەپێی بۆچوونی خۆی.

لەمەڕ چاپکردنی هەندێ بەرهەمی وەك شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی و هـۆزی (گـاوانی)، نووسـەری وەك د. عـزەدین مسـتەفا رەسـوول رەخنـەی لـە بڵاوکردنەوەیان هەیە لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە، لە هەمان کاتدا داوا دەکات بەرهەمی ئەوانەی کۆچیان کردووە چاپ بکرێت. لەگـەڵ ئەمـەش هـەوڵی کـۆڕ بـۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی بەباش دەزانێت، بەڵام چاپ نەکراوە[١٥٩].

لەبارەی کتێبی حاجی قادری کۆیی مەسعوود محەمـەد نووسـیویەتی و کـۆڕ چاپی کردووە، هەندێ لە نووسەران رەخنەیان لە ناوەڕۆکی گرتووە، یـەکێ لـەوان جـەلال دەبـاغ رەخنـەی لـە بـەرگی سـێیەمی گرتـووە و نووسـیویە: "...... لـەم بەرگەشـدا وەك دوو بەرگەکـەی لەوەوبـەری لـەم کتێبـەی بـەناوی (حـاجی قـادری کۆیی) دەرچووە، نووسەر زۆر دوورە لەوەی بە چەشنێکی زانستییانە بنووسـێت و ئەم دانراوە لە رادەیەکدایە کە لەڕاسـتیدا نـەدەبوو کـۆڕی زانیـاری کـورد بڕیـاری بڵاوکردنەوەی بدات، نەك تەنیا لەبەرئەوەی کە دوورە لە شێوەیەکی زانستیانەوە، لە باس کردن و توێژینەوەدا، بەڵکو هەروا چونکە کتێبەکـەی زۆر کـەم خـۆی دەدا لە باسی شاعیری گەورە و ناسراوی کورد حاجی قادری کۆیی"[١٦٠].

نووسەرێك لە وتارێکی رەخنەییدا، ئاماژە بەوە دەکات کە دامەزرانـدنی کـۆڕ داوایەکی ٢٠ بیست ساڵ بە ئێمەشەوە بوو، بەڵام کە لەدایك بـوو ئـەو ئـەکادیمیای راستەقینەی زانستی" نەبوو.... هەروەها ئاماژە بەوەش دەدات کە "گـەلێ کـاری باشیشـی کـردووە و مایـەی شـانازی پێـوەکردنن". بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەش تاقـە ئەندامێکی تێدا نییە لە ساڵانی ئەندامەتیـدا بەرهـەمێکی پێشـکەش کردبـێ، تـەنیا جێگری سـەرۆکی کـۆڕ کـە بەرهـەمی وەك حـاجی قـادری کـۆیی، کـە وەك دەڵێـت هەموو شتێکی تێدا باسی حاجی قادری کۆیی نەبێت کە هەمووی دژی بیروبـاوەڕی پێشکەوتنخوازی و چەوساوەکانە ![١٦١]. ئـەو جـۆرە شـێوازە دەربڕینانـە جۆرێـك بێویژدانی تێدایە.

نووسەرێك رەخنەی لە هەندێ کتێبی چاپکراو گرتووە کە کۆڕ یارمەتی داون بۆ چاپکردنیان لەوانە کتێبی "رێکەوت لە تەرازووی ژیریدا" هەروەها رەخنـەی لـە بڵاوکردنەوەی نامەی دکتۆرایەك گرتووە کە لەبارەی زمانی عەرەبییەوەیە کە پێی وایە هیچ پێویست بە بڵاوکردنەوەی ناکات، هەروەها رەخنەی لە کتێبی (رێنووسی کوردی لەسەدەیەکدا) گرتووە[١٦٢].

لەلایەکی دیکەوە ڕووناکبیرێکیش ڕەخنەی لە زمانی وەرگێڕانی کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەدلیسی گرتووە کە هەژار بۆ کوردی وەریگێڕاوە، ئەو زمانە بۆ خوێنەری ئەو سەردەمە تێگەیشتنی زەحمەت بووە و کوردییەکەی زۆر ڕەقە، وەك نووسیویە[١٦٣].

لە لاپەڕەی کرمانجی سەرووش لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا، نووسەرێك وێڕای دەستخۆشی بۆ دانانی پەیکەری حاجی قادری کۆیی، دەپرسێت "د سەرڤ چەندێ ژی را دڤێ ئەم بپرسین: ئەرێ هەر حاجی قادر بتنێ ژ هەژی هندی یە ئەم پەیکەرەکی بو دروست بکەین ئان جاددەکێ بناڤێ وی ئاڤ بکەین؟.... دیارە باسی زۆر لە شاعیر و ناوداری کورد دەکات کە شیاوی ئەوەن پەیکەریان بۆ بکرێت و شەقام و خوێندنگایان بەناو بکرێ، بەڵام ناکرێ، دیارە گلەییەکە لە شوێنی خۆیەتی[١٦٤].

هەر لەو ژمارەیەدا دیسان بەتەنیا ڕەخنە لە کتێبی (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا) گیراوە "بەناوی ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا یان زانست لە تەرازووی کۆنەپەرستیدا"[١٦٥].

هەر لەبارەی چاپکردنی کتێب، شارەزایەکی ئەم بوارەش ڕەخنەی لە هەندێ لەو چاپکراوانە گرتووە، بۆ نموونە (توحفەی موزەفەرییە)، وەك دەڵێت ئەو کتێبە کۆکراوەتەوە، چ ڕەوای هەقە پێش سەدان دەقی ڕەسەنی کوردی بکەوێت، کە کۆکردنەوە و لەبارەوە نووسینیان زۆر گرنگترە. هەروەها ڕۆمانی (دایك)ی مەکسیم گۆرگی، چ پێویست دەکات لە کۆڕ چاپ بکرێت، کە ئەو چەندین ئەرکی زۆر گەورەتری لەپێشی هەیە[١٦٦]. دیارە ئەمە لە شوێنی خۆیەتی چونکە کۆڕ دەزگای چاپ وبلاْکردنەوە نییە.

نووسەرێکی دیکەش سەبارەت بە ناوەڕۆکی کتێبی "ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا"ی محەمەد سالْح شارەزووری ڕەخنەی توندیان گرتووە، لە هەمان کاتدا گلەییشیان لە کۆڕی زانیاری کورد گرتووە لەمەڕ چاپکردنی[١٦٧].

ڕۆژنامەی (بیری نوێ) پلارێکی لە کۆڕی زانیاری کوردی گرتووە لەژێر ناوی (سەیر و سەمەرە)دا، ئەویش لەبارەی چاپکردنی کتێبی (چیم دی)یە، گوایە کۆڕ لە بڵاوکردنەوەی ئاگادار بووبێت، دیارە وانەبووە، بۆیە ئەو ڕوونکردنەوەیە

نووسـراوە و لـە هـەمان کاتیشـدا کـۆڕ پیرۆزبـایی دەرچـوونی رۆژنامەکەشـی لـێ کردوون[١٦٨].

بەگشتی هەندێ لە رەخنەکان لە جێی خۆیبوونە ، دەبوا کۆڕ زیاتر رەچاوی ئەرك وکارە بنچینەییەکانی خۆی کردبا.

## پەسنی کارەکانی کۆڕ:

ئەوڕەحمانی حاجی مارف دەڵێت: "(کۆڕی زانیاری کـورد) واتـە ئـەو دەزگـا بـەرز و بـاڵا و شـکۆمەندەی کـورد، کـە زانایـان و دانایـانی لـە دەوری خـۆی خـڕ کردبووەوە و لە ماوەیەکی یەکجار کەمـدا گـەلێ کـاری گـەورە و گرانـی بەئـەنجام گەیاند و سەدا و دەنگی گەیشتبووە ئەورووپا"[١٦٩].

رۆژنامە و گۆڤارەکان بەردەوام بەدواداچـوونیان بـۆ هـەواڵ و چـالاکییەکانی کـۆڕ کـردووە، بایـەخی کۆڕیـان بـۆ خزمـەتکردنی زمـان و ئـەدەب و مێـژوو و کەلەپووری کورد دەردەخست[١٧٠].

کـار و چـالاکییەکانی کـۆڕ مایـەی دەستخۆشـی دام و دەزگـا و گۆڤـار و رۆژنامەکان بووە، گۆڤاری بەیان بەبۆنەی تێپەڕبوونی حەوت سـاڵ بەسـەر بڕیـاری دامەزراندنیدا پەسنی کارەکانی کۆڕی داوە و بە بەرهەمە بەنرخەکانی کـۆڕ ناویـان دەبات[١٧١].

نووسـەرانیش کارەکـانی کۆڕیـان بـەرز نرخانـدووە، بـۆ نموونـە نووسـەرێك نووسیویە: دامەزراندنی کۆڕ دەستکەوتێکی گەلێ گـرنگ و لـەماوەی پێـنج سـاڵیدا کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگی ناوە لەڕووی کێشە و گیروگرفتـەکانی زمـان و ئـەدەب و کەلەپوور و دەستنووس و کتێبخانە و بڵاوکردنـەوەی کتێـب و دەرکرنـی گۆڤـار و ..... **هتد**[١٧٢].

کۆڕی زانیـاری کـورد وەك بـەری ١١ی ئـاداری ١٩٧٠، دوای دامەزرانـدنی لـە رێگـای گۆڤارەکـە و چـاپخانەکەی بـە ئەنـدازەی دەسـەڵاتی خـۆی توانیویـەتی بەرهـەمی خـۆی بڵاوبکاتـەوە، ئەنـدامانی کـۆڕی زانیـاری کـورد هـەر لـە رۆژی دامەزراندنیەوە توانیویانە ئـەوەی پێویسـتی سەرشـانیان بـووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی بەرهەمی رۆشنبیران بـەجێی بگەیـەنن، کـۆڕیش بەرهـەمی زۆری بڵاوکردووەتـەوە،

دەرگاشی بۆ رەخنە لەسەر پشتە لەسەر بنەمای زانستی، بۆ بووژاندنەوەی زمان و ئەدەبی کوردی هەمیشە لەخزمەتدا دەبێت[173].

پەسنی رۆژنامەی هاوکاری بۆ ژمارە (۱)ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد کە بە دیاری بۆیان چووە، تێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە لە بەرگێکی قەشەنگ و رازاوە و جوان بە کوردی و عەرەبی دەرچووە و ناوەرۆکی ژمارەکەی خستووەتە روو[174].

هەر لەبابەت نرخاندنی بەرهەمەکانی کۆڕ گۆڤاری (بەیان)یش بەبۆنەی حەوت ساڵ بەسەر بڕیاری دامەزراندنی کۆڕ (۱۸) بەرهەمی کۆڕی ناوهێناون کە تائەوکات چاپی کردوون[175].

### پەیوەندیی دەرەوە:

کۆڕی زانیاری پەیوەندی رۆشنبیریی باش و پتەوی لەگەڵ دەرەوە پەیداکردووە و لە زۆر شوێنەوە دیاری و نامەی بۆ هاتووە، بەتایبەتی یەکێتی سۆڤیەت، مەسعوود محەمەد تەرخان کراوە بۆ سەردانی شام و لوبنان و میسر لە ۱۹۷۱/۷/۱۰ سەردانی شامی کردووە و لەوێ رۆشەن بەدرخان و مەمدوح سەلیم و قەدری جەمیل پاشا و .....هتد بینیوە و هەروەها سەردانی کۆڕی زمانەوانی عەرەبی کردووە و دواتریش سەردانی لوبنانی کردووە، بەڵام بۆی نەلواوە بچێتە میسر[176].

یەکێك لە چالاکییەکانی کۆڕ بەشداریکردنی دوو ئەندامی کۆڕ هەژار و د. کەمال مەزهەر لە کۆنگرەیەکی رۆژهەڵاتناسانی دنیادا و بە هەوڵی ئەو دوو ئەندام و هاوکاری هەندێ لە دۆستانی کورد وەك جویس بلۆ، تۆما بوا، پرۆفیسۆر لازار توانیویانە وەك وەفدێکی کورد و سەربەخۆ بناسرێن و رۆژێك دانی بەیانی بۆ کورد تەرخان بکرێ، کۆڕیش دەستخۆشی لێ کردوون[177].

هەر بەناوی کۆڕ لە پایزی ۱۹۷۳ هەژار و د. کەمال مەزهەر سەردانی فەرەنسا و یەکێتی سۆڤیەتیان کردووە و لەوێ لەگەڵ دەزگا زانستییەکان و زانایانی ئەوێ دیداریان کردووە و کتێب و سەرچاوەیان بۆ کۆڕ پەیدا کردووە و (حاجی جوندی و قەناتی کوردۆ) کراون بە ئەندامی فەخری کۆڕ[178]، بەڵام بەپێی

هەواڵەکانی کۆڕ حاجی جوندی بە ئەندامی یاریدەدەر هەڵبـژێردراوە و قـەناتی کوردۆش بە ئەندامی کارا[١٧٩].

هەروەها کۆڕ پەیوەندی لەگەڵ دەزگا زانستی و روناکبیرییـەکانی نـاو وڵات (عیراق) و هەروەها لەگەڵ کۆڕی زانستی و کوردناسـییەکانی دەرەوەش بەسـتووە و پەیوەندی لەگەڵ زانایانی کورد و بیانی لـە دەرەوە بەسـتووە، هـەروەها پێـنج (زەمالـە)ی خوێنـدن بـۆ خوێنـدنی بـەرز لـە یـەکێتی سـۆڤیەت و هـەروەها بەشـداریکردن لـە کـۆڕ و کۆبوونـەوە نێودەوڵەتییـەکان، وەك بەشـداریکردن لـە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی جیهانی لە پاریس[١٨٠].

هەروەها کۆڕ بەردەوام لە پەیوەندیدا بووە لەگـەڵ کـۆڕ و دەزگـا زانسـتی و رۆشنبیرییەکانی ناوخۆ و دەرەوە[١٨١].

وەك چالاکی جارێکی دیکە لە کۆتایی پایزی ١٩٧٣ کۆڕی زانیـاری سـۆڤیەت بانگهێشتی هەردوو کۆڕی عیراقی و کوردی کردووە، لە کوردان هـەژار و د. کـەمال دیاریکراون و سەردانێکی پڕ چالاکییان کردووە[١٨٢].

د. کـەمال مەزهـەر ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە لـە کـۆڕەوە پەیوەنـدی زۆر فراوانیان دامەزراندووە، بۆ ئەو مەبەستە چووەتە لوبنان، میسـر، سـوریا، یـەکێتی سۆڤیەت، ئەرمینیا، ئازەربایجـان، بـۆ ئـەوەی پەیوەنـدیی زانسـتی لەگـەڵ دەزگـا زانستییەکانی ئەو وڵاتانە دابمەزرێنێت[١٨٣].

## ئەنجام

سەرئەنجام دوای ئەوەی کۆڕی زانیاری کورد بووە راستی و دام و دەزگاکانی وەك بارەگا و کتێبخانە و چاپخانە و دەستەی سەرۆکایەتی و ئەندامەکانی و دیارکردنی لیژنە جۆراوجۆرەکانی دامەزران و پێکهاتن؛ کەوتە کارکردن، لەو ماوەیەی توێژینەوەکەدا کۆڕ هەندێ کار و چالاکی کرد.

– لە سەرەتاوە ناوی (کۆڕی زانیاری کورد) دووچاری رەخنەی زۆر بووەوە، بەو واتای کە ناوەکە دەربڕی ناوەڕۆکەکەی نییە، لەلایەن کۆڕەوە وەڵامێکی دوور و درێژ بۆ چۆنیەتی داڕشتنی ناوەکەی روون کراوەتەوە.

– جگە لەوە رەخنەی توندیش لە پێکهاتەی کۆڕ گیراوە بەتایبەتی لەلایەن یەکێتی نووسەرانی کوردەوە، تەنانەت داوای هەڵوەشاندنەوەشیان کردووە.

– لە کارە رۆشنبیرییەکانی کۆڕ لەلایەنی زمانەوانییەوە، رێنووسێکی تایبەتییان داهێناوە، کە بووەتە جێی مشتومڕی رووناکبیران. هەر لەو بوارە یەکێك لە کارە دیارەکانی دانانی زاراوە بووە کە بەڕاستی لەو لایەنە ئەرکی زۆریانی کێشاوە و داواشیان لە روناکبیران کردووە راوبۆچوونی خۆیان دەربڕن تا ئەوەی مایەی رەزامەندییە، جێگیر بکرێن و کاریان پێبکرێت، کە نووسەرانێکی زۆر بەپیر ئەم داوایە چوونەتەوە.

– هەوڵی دانانی فەرهەنگ و چاپکردنی فەرهەنگ ئەمەیان نەچووەتە بواری جێبەجێکردنەوە.

– چاپکردنی کتێبی کوردی لەسەر ئەرکی کۆڕ کە ژمارەیەکی باشیان چاپکردووە لە سەرووی هەموویان کتێبی مێژوویی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی لە وەرگێڕانی هەژار لە ساڵی ١٩٧٢ چاپ بووە کە تا ئەوکاتە گەورەترین کتێبی کوردی بووە. ئەمە سەرباری یارمەتیدانی نووسەران بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان.

– کۆکردنەوەی دەقی فۆلکلۆری لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان.

– دامەزراندنی کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند و ناوازە.

یەکێك لە کارە دیارەکانی کۆڕ نووسین و چاپکردنی سێ بەرگ لەبارەی حاجی قادری کۆییەوەیە لەلایەن مەسعوود محەمەدەوە، هەروەها دروستکردنی پەیکەرێك بۆ حاجی قادر لە کۆیە کە ڕووداوێکی ڕووناکبیری ناوازەی ئەو ڕۆژگارە بوو.

— چاپکردنی گۆڤاری کۆڕ کە تا ئەوکاتە گەورەترین و دەوڵەمەندترین گۆڤاری کوردی بووە و لەو ماوەیەشدا شەش ژمارەی لێ دەرچووە.

— وەك ئەرکی کۆڕ پەیوەندی لەگەڵ دامودەزگا زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی عیراق بەستووە.

— وێڕای پەسنی کارەکانی کۆڕ لەلایەن نووسەر و گۆڤار و ڕۆژنامەکانەوە، لە هەمان کاتدا دووچاری ڕەخنەش بووەتەوە، چ لە چاپکردنی کتێب چ لە ناوەڕۆکی گۆڤارەکە. کە دیارترینیان د. جەمال نەبەز ڕەخنەی لە زۆر لایەنی گرتووە.

## پەراوێزەکان:

(١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، کۆڕی زانیاری کورد – لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٣٩)، ٢٠١٧، ل ٢٤١–٢٨٠.

(٢)ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧،ل ١٦٩ – ١٧٠.

(٣) بڕوانە: جەمال نەبەز، نووسینی کوردی بەلاتینی، چ. چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٧، ل واو پەراوێز.

(٤) بڕوانە: مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ ١، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢، ل ٥٢٢.

(٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: مەسعوود محەمەد، "کۆڕی زانیاری کورد"، ئەم ناوەی چۆن وەرگرت، "زانیاری" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٤)، سەرماوەزی ١٩٧١، ل ٥٧ – ٧١.

(٦) هەمان سەرچاوە، ل ٥٨.

(٧) هەمان سەرچاوە، ل ٦٠.

(٨) هەمان سەرچاوە، ل ٦٠ – ٦٨.

(٩) هەمان سەرچاوە، ل ٦٩ – ٧١.

(١٠) "دەفتەری کوردەواری"، ژمارە (٢)، مارت و نیسانی ١٩٧٠، ل ١٥٥ – ١٥٦؛ د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من، بەرگی پێنجەم، ل ٧٠ – ٧١.

(١١) د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من، بەرگی پێنجەم، ل ٧٢؛ ئازاد عەبدولواحید، د. مارف ئەزموونێکی تایبەتی لە رۆژگاری نووسیندا، چ. رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل ٦١–٦٣.

(١٢) بەکر دلێر (ئەندازیار)، ناونانی المجمع العلمي الكردي، "رۆژی کوردستان" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢)، تەموزی ١٩٧١، ل ٦٠.

(١٣) بەکر دلێر (ئەندازیار)، ناونانی المجمع العلمی الکردی، ل ٦٠– ٦١.

(١٤) دکتۆر کەمال فوئاد، چەند سەرنجێکی زمانەوانی، رۆژی کوردستان، ژمارە (٢)، تەمموزی ١٩٧١، ل ٥٩.

(١٥) بۆ وردەکاری نامەکە بڕوانە: نامەیەك لە زانای کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی یەوە بۆ: سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد مامۆستا ئیحسان شێرزاد، "هاوکاری"(رۆژنامە)، بەغدا، (ژمارەی تایبەت)، ١٩٧٢/١/١، ل ٣٧.

(١٦) بڕوانە: د. جەمال نەبەز، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد"، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل ٤١٣ – ٤١٤.

(١٧) بڕوانە: جەمال نەبەز، نووسینی کوردی بە لاتینی، ل واو پەراوێز؛ ئەمەش زیاتر لەبەرئەوەیە، رۆژگارێکی زۆر بەسەر ئەو رۆژگارە تێپەڕبووە و لێکدانەوەی دیکەی بەپێی تێگەیشتنی دواتر (١٩٧٤) بۆ کردووە.

(١٨) بڕوانە: بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، ل ١٥٠.

(١٩) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد: بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل ١٧٧ – ٢٣٦؛ بڕوانە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، بەغدا، ١٩٧٩.

(٢٠) عەبدولسەتار تاهیر شەریف، حاجی قادری کۆیی شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتیی نەتەوەی کورد، پێشەکی د. مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری رۆژی کوردستان، (٣)، الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٧٩ (پ).

(٢١) د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من....، بەرگی پێنجەم، ل ٧٢ ؛ ئازاد عەبدولواحید، د. مارف ئەزموونێکی تایبەتی لە رۆژگاری نووسیندا، چ. رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل ٦١– ٦٣.

(٢٢) هەمان سەرچاوە.

(٢٣) "ئاسۆ" (رۆژنامە)، ژمارە(٥٤٧)،١٠/٦/٢٠٠٧.

(٢٤) د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من.....،هەمان سەرچاوە، ل ٧٢.

(٢٥) جەمال بابان، یادداشتەکانم ئەزموونەکانی ژیانم، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرەی ژمارە (٥٥٢)، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٤٧.

(٢٦) د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازەبەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات"، زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٨٥.

(٢٧) مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، ل ٥٢٢.

(٢٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد مەلا کەریم، دوو ووشەی هێمن لەبارەی کۆڕی زانستی کوردەوە، "نووسەری کورد" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١)، مارتی ١٩٧١، ل ٥٣– ٥٤.

(٢٩) محەمەد مەلا کەریم، دوو ووشەی هێمن لەبارەی کۆڕی زانستی کوردەوە، ل ٥٤.

(٣٠)هەمان سەرچاوە، ل ٥٥ – ٥٦.

(٣١) بڕوانە: بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ژمارە (١٧٧)، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ١٥٠– ١٥١.

(٣٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، ل ١٥١.

(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٩. (جێی ئاماژەیە ئەو یادداشتە وەك بەلگەنامە لە کۆتایی بیرەوەرییەکانی ناکام بڵاوکراوەتەوە) ئێمە زۆر بە دوای گەڕاین لەو شوێنانەی کە بە بۆچوونی خۆمان لێی بڵاو کرابێتەوە، بەڵام بێ هیوا بووین تا بەرێکەوت لێرە بەرچاومان کەوت، ئەمەش شارەزایی و لێزانی ناکام دەردەخات لە هەلگرتنی بەلگەنامەی گرنگ و بایەخدار. هەروەها دواتر لە رۆژنامەی (هاوکاری)یش چاومان پێ کەوت. کە لەوێش

وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی. بڕوانە: یادداشتی یەکێتی نووسەرانی کورد دەربارەی ئەکادیمیەی زانستی کوردەوە، "هاوکاری"، ژمارە (٨) ١٩٧١/٣/٦، ل ٤ — ٧.

(٣٤) بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، ل ٢٣٩.

(٣٥) هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٩.

(٣٦) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٠.

(٣٧) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٠.

(٣٨) نووسەری کورد، ژمارە (٣)، ئابی ١٩٧١، ل ٧٣.

(٣٩) هەژار، چێشتی مجێور، پاریس، ١٩٩٧، ل ٥٢٣.

(٤٠) جەمال بابان، یادداشتەکانم.....، ل ٢٤٧ — ٢٤٨.

(٤١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل ١٩.

(٤٢) بڕوانە: جەمال نەبەز، کۆبەرهەم — ٧ زنجیرە وتار و وتووێژ لەگەڵ دەزگای ڕاگەیاندنی گشتی، ژمارە (٢)، چ. منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٣٦١.

(٤٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری ڕۆشنبیری، ل ٣٠١ — ٣٠٢.

(٤٤) اخبار مجمعية، مجلة "المجمع العلمي الكردي"، المجلد الثاني — العدد الثاني، ص ٢٨٩.

(٤٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، ١٩٧٨، ل٤٨٦ .

(٤٦) ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری ڕۆشنبیری، ل ٤٩.

(٤٧) قسم التحقيقات، مكتبة المجمع العلمي الكردي، "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد (١٢٠٩)، ١١ كانون الأول ١٩٧٢، ص ٣.

(٤٨) اخبار مجمعية، المجلد الثاني — العدد الثاني، ص ٢٨٨؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، پوختەی کارەکانی کۆڕ لە خولی یەکەم و دووهەمیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٣٣٦ — ٣٤٢.

(٤٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ل ٤٢ —٤٦؛ الاستاذ مصطفى القرداغي يهدي مكتبته الى المجمع العلمي الكردي، التآخي، العدد (١٢٠١)، ٢ كانون الاول ١٩٧٢.

(٥٠) بڕوانە: چەند هەواڵێك، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل ٩٤٣.

(٥١) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم — بەشی یەکەم، ١٩٧٥، ل ٥٥٦.

(٥٢) ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە، بەغدا، ١٩٧٤،ل٥ پەراوێز.

(٥٣) مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ ٣، کۆیە، ٢٠٠٩، ل ٤٥٦.

(٥٤) هەمان سەرچاوە، ل ٤٥٨؛ سوپاسنامەی کۆڕ بە نووسراوی ژمارە (٢٧) لە ١٩٧٢/١/٥ بۆ ڕەوشەن بەدرخان. جێی ئاماژەیە هەر لەو نووسراوە ئاماژە بە کڕینی کتێبخانەی(مەمدوح سەلیم)یش بۆ کۆڕ کراوە.

(٥٥) هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٢٣. نازانم ئەوە تا چەند لەجێی خۆیەتی، وەك بەراورد بە دوو زمان و نەتەوەی عەرەب و کورد !

(٥٦) چاوپێکەوتن لەگەڵ محەمەد عەلی قەرەداغی،هەولێر ٢٠١٧/١٢/٢٦.

(٥٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣؛ بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤؛ بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤؛ بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، ١٩٧٥؛ بەرگی چوارەم، ١٩٧٦؛ بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧؛ بەرگی شەشەم، ١٩٧٨.

(٥٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی نۆیەم، ل ٣٠٨ – ٣١٧.

(٥٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم – بەشی یەکەم، ١٩٧٣؛ بەرگی دووەم – بەشی یەکەم، ١٩٧٤؛ بەرگی سێیەم – بەشی دووەم، ١٩٧٥؛ بەرگی چوارەم، ١٩٧٦؛ بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، بەرگی شەشەم، ١٩٧٨.

(٦٠) ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری ڕۆشنبیری، ل ٥٠ – ٥١.

(٦١) بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، پوختەی کارەکانی کۆڕ، ل ٣٢٦.

(٦٢) بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، پوختەی کارەکانی کۆڕ، ل ٣٢٨؛ ڕێنووسی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم و بەشی یەکەم، ل ٣٦٤ – ٣٧٩.

(٦٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: انور علی قادر، لەگەڵ "ڕێنووسی" گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، "ژین"، ژمارە (١١١)، ١٩٧٣/٥/١٠، ل ١ – ٨.

(٦٤) د. عزالدين مصطفى رسول، حول المجمع العلمي الكردي، "الثقافة" (مجلة)، بغداد، العدد (٤)، ١٩٧٦، ص ١٤٦ – ١٧٠.

(٦٥) بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا، ١٩٧٧.

(٦٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، بەشی سێیەم، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧٤)، حوزەیرانی ١٩٧٩، ل ١٦ – ١٨؛ بەرهەمە زمانەوانییەکانم (نووسین و وەرگێڕان)، بەرگی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١٤١ – ١٤٣.

(٦٧) بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، بەشی سێیەم، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧٤)، حوزەیرانی ١٩٧٩، ل ١٧.

(٦٨) جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەكی تازەبەكارهاتوو و كۆڕی زانیاری كورد، "گۆڤاری كۆلێجی ئەدەبیات"، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٩٢ – ٩٤.

(٦٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: جەمال نەبەز، بیبلیۆگرافیای كتێبی كوردی، ئاسۆی زانكۆیی (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٤)، كانوونی دووەمی ١٩٧٨، ل ٨٩ – ٩١.

(٧٠) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێكۆڵینەوەی زانستی بگرین،" ڕۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧٤)، حوزەیرانی ١٩٧٩، ل ١٨ – ٢١.

(٧١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جەمال نەبەز، زمانی یەكگرتووی كوردی، ل ١٩ – ٢١.

(٧٢) بڕوانە: جەمال نەبەز، زمانی یەكگرتووی كوردی، ل ٨٢.

(٧٣) بڕوانە: مصطفی نەریمان، ڕێنووسی كوردی لە ڕەگ و ریشەوە، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی كوردی، زنجیرەی زمان (٥)، دار الحریة، بەغدا، ١٩٨١، ل ٤٠ – ٤٨.

(٧٤) مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ ٣، ل ٤٦٤.

(٧٥) بۆ زانیاری پتر لەمەڕ چۆنیەتی دانان و هەڵبژاردنی زاراوە بڕوانە: گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی یەكەم و بەشی یەكەم، زاراوەی كارگێڕی، ل ٤١٩ – ٥٢٥.

(٧٦) گۆڤاری كۆڕی زنیاری كورد، بەرگی یەكەم، بەشی یەكەم، ١٩٧٣، ل ٣٢٦.

(٧٧) بۆ وردەكاری بابەتەكە بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، لە پەراوێزی لیستەی یەكەمی زاراوەی كارگێڕی كۆڕی زانیاری كوردا، "هاوكاری"، ژمارە (١٧٧)، ١٩٧٣/٧/٢٧، ل ٣ – ٧.

(٧٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عەزیز گەردی، چەند سەرنجێك لەبارەی "زاراوەی كارگێڕی كۆڕی زانیاری كورد"، بەشی یەكەم،"هاوكاری"، ژمارە (١٨٠)، ١٩٧٣/٨/١٧، ل٤ – ٧.

(٧٩) هەمان سەرچاوە،

(٨٠) لەبەرئەوەی هەر ئەوەندە دەكرێ ئاماژەی پێ بكرێت، خوێنەری بەڕێز گەر ویستی بڕوانە: بەشی یەكەم، هاوكاری، ژمارە (١٨٠)، ١٩٧٣/٨/١٧، ل ٤ – ٧؛ بەشی دووەم، (١٨١)، ١٩٧٣/٨/٢٤، ل ٤ – ٧؛ بەشی سێیەم، (١٨٢)، ١٩٧٣/٨/٣١، ل ٤ – ٦؛ پاشماوەی بەشی سێیەم، (١٨٣)، ١٩٧٣/٩/٧، ل ٦ – ٧؛ بەشی چوارەم، (١٨٤)، ١٩٧٣/٩/١٤، ل ٤ – ٦.

(٨١) بۆ وردەكاری زیاتر بڕوانە: جەمال عەبدول، چەند تێبینیەك دەربارەی زاراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، "ژین" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (١٢٣)، ١٩٧٣/٨/١٦، ل ١ – ٤؛ ژمارە (١٢٤)، ١٩٧٣/٨/٢٢، ل ٦؛ ژمارە (١٢٥)، ١٩٧٣/٨/٣٠، ل ٣.

(٨٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ع. ع. شەونم، لێکۆڵینەوە دەربارەی بەشی زمانەوانی یەکەم گۆڤارەکەی کۆڕی زانیاری کورد -١- ،"ژین" ژمارە (١١١)، ١٩٧٣/٥/١٠، ل١؛ -٢-، ژمارە (١١٢)، ١٩٧٣/٥/١٧، ل ١،٥؛ -٣-، ژمارە (١١٣)، ١٩٧٣/٥/٢٤، ل ١،٨؛ -٤-، ژمارە (١١٤)، ١٩٧٣/٦/٧، ل ٣؛ -٥-، ژمارە (١١٥)، ١٩٧٣/٦/١٤، ل ١، ٥، ٩، ١٠؛ -٦-، ژمارە (١١٦)، ١٩٧٣/٦/٢١، ل ١٠؛ -٧-، ژمارە (١١٧)، ١٩٧٣/٧/٥، ل ١ — ٥؛ -٨-، ژمارە (١١٩)، ١٩٧٣/٧/١٩، ل ٣؛ -٩-، ژمارە (١٢٠)، ١٩٧٣/٧/٢٦، ل ٣؛ -١٠-، ژمارە (١٢١)، ١٩٧٣/٨/٢، ل ٣-٤؛ -١١- ، ژمارە (١٢٢)، ١٩٧٣/٨/٩، ل ٣-٨؛ -١٢-، ژمارە (١٢٤)، ١٩٧٣/٨/٢٢، ل ١-٦؛ -١٣-، ژمارە (١٢٥)، ١٩٧٣/٨/٣٠، ل ١ — ٤.

(٨٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: طاهر صادق، "ژین"، ژمارە (١١٦)، ١٩٧٣/٦/٢٤، ل ١؛ ژمارە (١١٧)، ١٩٧٣/٧/٥، ل ٢؛ ژمارە (١١٨)، ١٩٧٣/٨/١٢، ل ٢ — ٥؛ خەلیل جندی، پێڕاچۆنەکا بلەز لسەر فەرهەنگا کۆڕا زانیاریا کوردی، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٢)، ١٩٧٣/١١/٩، ل ٥؛ رەئووف پشدەری، زاراوەی کارگێڕی و تێڕوانینێك، "هاوکاری"، ژمارە (١٨٥)، ١٩٧٣/٩/٢١، ل ٦ — ٧؛ غفور رەحیم، تێبینیەك دەربارەی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، "هاوکاری"، ژمارە (١٨٠)، ١٩٧٣/٨/١٧، ل ٦؛ معروف قەرەداغی، سەرنجێك دەربارەی زاراوەکانی دووەم لیستەی کۆڕی زانیاری کورد، "هاوکاری"، ژمارە (٢٥٨)، ١٩٧٥/٣/١٤، ل ٤ — ٧؛ ئەندازیار جەلال خۆشناو، لێدوانێك لەسەر لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، "هاوکاری"، ژمارە (٢٨٦)، ٢٦ — ١٩٧٥/١٠/٣٠، ل ٢-٧.

(٨٤) بڕوانە: رەئووف عثمان، پیاچوونەوەیەك بە پەراوێزی زاراوەکانی کۆڕدا، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٥٠)، حوزەیرانی ١٩٧٦، ل ٣٦.

(٨٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٣٦ — ٤٢.

(٨٦) بۆ وردەکاری پتر بڕوانە: خالد صابر عثمان، سەرنجێك، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٥٣)، ئەیلوولی ١٩٧٦، ل ٣٤ — ٣٥.

(٨٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: خالد صابر عثمان، روونکردنەوەیەك دەربارەی لیستەی سێیەم و چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٦٠)، نیسان و مایسی ١٩٧٧، ل ١٩ — ٢١.

(٨٨) بۆ زانیاری زیاتر و ناوی ئەوانەی رای خۆیان دەربڕیوە بڕوانە: لەبارەی لیستەی یەکەمی (زاراوەی کارگێڕی)یەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل ٨٨٠ — ٨٩٣.

(٨٩) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٨٩٤ — ٩٣٩.

(٩٠) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات"، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٩٥ – ١٠٧.

(٩١) د. جەمال نەبەز، هەمان سەرچاوە، ل ١٠٨.

(٩٢) بۆ زانیاری پتر و وردتر بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با رێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، بەشی چوارەم، "رۆشنبیری نویٚ"، ژمارە (٧٥)، تەمموزی ١٩٧٩، ل ٤٧ – ٥٣؛ دوابەش، "رۆشنبیری نویٚ"، ژمارە (٧٦)، ئەیلوولی ١٩٧٩، ل ١١ – ١٧.

(٩٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەسعوود محەمەد، رەواندنەوەی دوو رەخنە، "رۆشنبیری نویٚ"، ژمارە (٨٠)، ١٩٨٠، ل ٢ – ٨.

(٩٤) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، پێداچونەوەیەکی هەندیٚ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەمەد، بەشی یەکەم، رۆشنبیری نویٚ، ژمارە (٩٠)، ل ١٠ – ١٣، بەشی دووەم، ژمارە (٩٢)، ١٩٨٢، ل ١٣ – ١٨.

(٩٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: خالد صابر عثمان، روونکردنەوەیەك دەربارەی لیستەی سێیەم و چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، رۆشنبیری نویٚ، ژمارە (٦٠)، ١٩٧٧، ل ١٩ – ٢١.

(٩٦) هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٣٧.

(٩٧) بڕوانە: "هاوکاری"، ژمارە (٢٥٩)، ١٩٧٥/٥/٣٠.

(٩٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٣٧ – ٥٣٨

(٩٩) مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، ل ٥٣١ – ٥٣٢.

(١٠٠) جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازەبەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات"، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٨٥ – ٨٦.

(١٠١) بڕوانە: کوردستان موکریانی، دوانامەی گیو بۆ کۆڕی زانیاری کورد، چ. رۆژهەلاَت، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٥.

(١٠٢) ئەم فەرهەنگە هەژار ئامادەی کردووە لەساڵی ١٩٩٠ لە تاران چاپ بووە، هەژار، فەرهەنگی کوردی – فارسی: هەنبانە بۆرینە، سروش، تاران، ١٣٦٩هـ.

(١٠٣) کوردستان موکریانی، دوانامەی گیو....، ل ٦.

(١٠٤) هەمان سەرچاوە، ل ٧ – ٨.

(١٠٥) کوردستان موکریانی، نامەکانی کۆڕی زانیاری ملکەچن، "هاوکاری" (رۆژنامە)، ژمارە (٤١٥)، ١٩٧٨/٢/٢٧، (بە وەرگرتنی لە کوردستان موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦ – ٤٧).

(١٠٦) بڕوانە: جەمال نەبەز، کۆبەرهەم – ٧ –، ل ٣٦١ – ٣٦٢.

(١٠٧) دوانامەی گیو....، ل ٥٠ — ٦٤.

(١٠٨) هەمان سەرچاوە، ل ٦٥.

(١٠٩) بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٧٣)، ل١٩ — ٢٠؛ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەرهەمە زمانەوانییەکانم "نووسین و وەرگێڕان"، بەرگی سێیەم، وتار و لێکۆڵینەوە لەگەڵ پاشکۆیەك، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١١٤.

(١١٠) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، ل ١١٥.

(١١١) د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات"، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٨٦ — ٨٨.

(١١٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٧٢)، شوباتی ١٩٧٩، ل ١٧ — ٢٥.

(١١٣) بڕوانە: د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازەبەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات"، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٧٩ — ١١٥.

(١١٤) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالرحمن زەبیحی، ڕەخنەی زانستیانە یاخود شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧١)، تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٧٨، ل ١٧ — ٢٧.

(١١٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣.

(١١٦) هەمان سەرچاوە، ل ٨٣٣.

(١١٧) "برایەتی"، خولی چوارەم، ژمارە (٤٣)، ١٩٧٣/٣/٢٣، ل ٨.

(١١٨) "بیری نوێ"، ژمارە (٤٠)، ١٩٧٣/٣/٢٧.

(١١٩) "برایەتی"، ژمارە (٤٤)، ١٩٧٣/٣/٣٠، ل ٨.

(١٢٠) ژین، ژمارە (١١٢)، ١٩٧٣/٥/١٧، ل ٨.

(١٢١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: شاسوار جەلال، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد و بێ دەنگی خوێنەرەکانی، "هاوکاری"، ژمارە (١٧٣)، ١٩٧٣/٦/٢٩، ل ٨.

(١٢٢) د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەی ......، ل ٨٩.

(١٢٣) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەی....، ل ٨٩ — ٩٠.

(١٢٤) هەمان سەرچاوە، ل ٩١ — ٩٢.

(١٢٥) بۆ وردەکاری ڕەخنەکان بڕوانە: جەمال محەمەد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد و چەند هەڵەیەك، "هاوکاری"، ژمارە (١٧٨)، ١٩٧٣/٨/٣، ل ٣—٧.

(١٢٦) بۆ زانیاری و وردەکاری پتر بڕوانە: خالد جوتیار، روونکردنەوەیەك بۆ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٤)، ١٩٧٣/١١/٢٣، ل ٣ – ٧.

(١٢٧) بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل ٨٣ پ.

(١٢٨) بڕوانە: ئیحسان شێرزاد، ژمارە دووی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل ٥ – ٨.

(١٢٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووهەم، بەشی دووهەم، ١٩٧٤.

(١٣٠) ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٤٩ – ٥١.

(١٣١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٣٥ – ٩٣٦.

(١٣٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٥.

(١٣٣) هاوکاری، ژمارە (٢٧٧)، ١٩٧٥/٨/٢٥، ل ٨.

(١٣٤) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، ١٩٧٥.

(١٣٥) گۆڤاری کۆڕ، بەرگی چوارەم، ١٩٧٦، ل ٥.

(١٣٦) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، ١٩٧٦.

(١٣٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧.

(١٣٨) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، ١٩٧٨.

(١٣٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی ....، ل ٨٩ – ١٠٧.

(١٤٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، با رێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، بەشی دووەم، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧٣)، ئاداری ١٩٧٩، ل ٢٠ – ٢٧.

(١٤١) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٣ – ١)، ١٩٧٥، ص ٧٢٩ – ٧٤٨.

(١٤٢) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٢ – ٢)، ١٩٧٤، ص ٢٥ – ٥٩.

(١٤٣) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٢ – ٢)، ١٩٧٤، ص ١٨٢ – ٢٢٢" مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٤)، ١٩٧٦، ص ٤٩٥ – ٥١٩.

(١٤٤) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٣ – ١)، ١٩٧٥، ٦٢٢ – ٦٦١.

(١٤٥) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٢ – ٢)، ١٩٧٤، ٢٢٣ – ٢٣٨.

(١٤٦) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٣ – ٢)، ١٩٧٥، ص ٥٩٥ – ٦١١.

(١٤٧) مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٣ – ١)، ١٩٧٥، ص ٧٢٩ – ٧٤٨.

(١٤٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ممتاز حیدری، پەیکەری حاجی قادری مەزن، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٠)، ١٩٧٣/١٠/٢٦، ل ٣.

(١٤٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: کۆڕ و حاجی قادری کۆیی، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد"، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل ٨٥٩ — ٨٧١.

(١٥٠) هەمان سەرچاوە، ل ٨٣٤.

(١٥١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەژار، چێشتی مجێور، چ ١، ل ٥٢٢.

(١٥٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، پاراستنی پاشماوەی کۆنمان لە کاری کۆڕدا، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد"، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣، ل ٣٨٠ — ٤١٨.

(١٥٣) هەمان سەرچاوە، ل ٥٦٠.

(١٥٤) هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٣٧.

(١٥٥) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل ٨٢٩ — ٨٣٢.

(١٥٦) د. کەمال مەزهەر، پوختەی کارەکانی کۆڕ، ل ٣٤٢ — ٣٤٥.

(١٥٧) هەمان سەرچاوە، ل ٣٤٥ — ٣٤٦.

(١٥٨) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٢١٧.

(١٥٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: یەکێتی نووسەرانی کورد چی بەسەرهات؟، بیری نوێ، ژمارە (١٦٩)، ١٩٧٥/١٢/٦، ل ٤؛ عزالدين مصطفى رسول، حول المجمع العلمي الكردي، الثقافة، العدد (٤)، نيسان ١٩٧٦، ص ١٤٩ — ١٥٣.

(١٦٠) (بیری نوێ)، ژمارە (٢٢٠)، ١٩٧٦/١٢/١٨، ل ٤ — ٧؛ ژمارە (٢٢١)، ١٩٧٦/١٢/٢٥، ل ٤ — ٧، بەشی دووەم، هەموو بەیەکەوە و لە نامیلکەش چاپکراوە، بڕوانە: جەلال دەباغ، حاجی قادری کۆیی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی. ن. ک)، زنجیرە (٣٢٠) چ. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.

(١٦١) نووسەرێك، کۆڕی زانیاری کورد و بێ کاری، "بیری نوێ" ، ژمارە (٢١٩)، ١٩٧٦/١٢/٤.

(١٦٢) هەمان سەرچاوە.

(١٦٣) بڕوانە: معروف قەرەداغی، سەرنجێك دەربارەی کتێبەکەی شەرەفنامە، "هاوکاری"، ژمارە (٢٥٢)، ١٩٧٥/١/٣١؛ ئەمە لەکاتێکدا زۆر لە زانا و رووناکبیرانی کورد دەستخۆشییان لەو کوردییەی هەژار کردووە کە بایەخی بۆ زمانی یەکگرتوو زۆرە.

(١٦٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئاڤدەل، پەیکەرێ حاجی قادرێ نەمر و چەند گوتنەکێن پێدڤی، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٦)، ١٩٧٣/١٢/٧ ؛ پەیامنێری برایەتی لە کەرکووك، ئاهەنگی

شاری کۆیە بەبۆنەی لابردنی پەردە لەڕووی پەیکەری حاجی قادرەوە، برایەتی، ژمارە (٧٩).

(١٦٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مامەخەمە، "بیری نوێ"، ژمارە (٢١٩)، ١٩٧٦/١٢/٤، ل ٥.

(١٦٦) محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگای دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی نۆیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١، ل ٣١٤.

(١٦٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کاردۆ گەلاڵی، ڕێکەوت و وەدەنگ هاتنێک، "ڕۆژی کوردستان"، ژمارە (٤٧ — ٤٨)، تەمووزی ١٩٧٧، ل ٥٧ — ٦٠.

(١٦٨) مەسعوود محەمەد، ڕوونکردنەوە و پیرۆزبایی لە کۆڕی زانیاری کوردەوە بۆ بیری نوێ، "بیری نوێ"، ژمارە (٣)، ١٩٧٢/٧/٢.

(١٦٩) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەرهەمە زمانەوانییەکانم "نووسین و وەرگێڕان"، بەرگی سێیەم، ل ٩٠٨.

(١٧٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: "التآخي"، الاعداد، ٤٩٧، ١٩٧٠/٧/٢٨؛ ٥٢٠، ١٩٧٠/٨/٢٥؛ ٥٣٢، ١٩٧٠/٩/٨؛ ٦٧٨، ١٩٧١/٣/١٨؛ ٦٤١، ١٩٧١/١/١٧؛ ٦٥٣/ ١٩٧١/١/٣١؛ ٧٧٩/ ١٩٧١/٧/٨؛ ٨٣٠/ ١٩٧١/٩/٨؛ ١٠٢٦/ ١٩٧٢/٥/٧؛ ١١٩٠، ١٩٧٣/١١/٢٦؛ "هاوکاری"، ژمارەی تایبەت، ١٩٧٢/١/١؛ "ژین"، ژمارە (١١٢)، ١٩٧٢/٥/١٧؛ "ڕۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٢٣)، ١٩٧٤/٧/١.

(١٧١) بەیان، کۆڕی زانیاری کورد و بەرهەمە بەنرخەکانی، "بەیان" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢٨)، ١٩٧٥، ل ٤٨.

(١٧٢) سەربەست بامەڕنی، کۆڕی زانیاری کورد و خزمەتگوزاری زمانەکەمان، "بەیان"، ژمارە (٢٨)، ١٩٧٥، ل ٢٩.

(١٧٣) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، ١٩٧٨، ل ٥ — ٨.

(١٧٤) بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، "هاوکاری"، مانگی ٦ی ١٩٧٣.

(١٧٥) بڕوانە: "بەیان"، ژمارە (٢٨)، ل ٤٨.

(١٧٦) مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ٣، ل ٤٥٦ — ٤٦٢

(١٧٧) هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٢٤ — ٥٢٧، ٥٣٣.

(١٧٨) هەمان سەرچاوە، ل ٥٣٩ — ٥٤٧.

(١٧٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٣٢٤.

(١٨٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٣٣٣ — ٣٣٦.

(١٨١) هەمان سەرچاوە، ل ٥٦٠؛ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل ٤٣٠ – ٤٣١؛ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، ١٩٧٨، ل ٤٨٦ – ٤٩٢.

(١٨٢) هەژار، چێشتی مجێور، ل ٥٢٩ – ٥٤٧.

(١٨٣) ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، ل ٤٩.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**أ- کوردی**

**١- کتێب:**


- ئازاد عەبدولواحید، د. مارف ئەزموونێکی تایبەتی لە رۆژگاری نووسیندا، چ. رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١.
- ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- ئەورەحمانی حاجی مارف (د. )، بەرهەمە زمانەوانییەکانم "نووسین و وەرگێران"، بەرگی سێیەم، وتار و لێکۆڵینەوە لەگەڵ پاشکۆیەك، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- ـــــــــــ، چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە، بەغدا، ١٩٧٤.
- ئەولیاچەلەبی، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێرانی: سەعید ناکام، بەغدا، ١٩٧٩.
- بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ژمارە (١٧٧)، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
- جەلال دەباغ، حاجی قادری کۆیی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی. ن. ك)، زنجیرە (٣٢٠) چ. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- جەمال بابان، یادداشتەکانم ئەزموونەکانی ژیانم، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرەی ژمارە (٥٥٢)، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- جەمال نەبەز، نووسینی کوردی بە لاتینی، چ. چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٧.
- ـــــــــــ، کۆبەرهەم – ٧ زنجیرە وتار و وتووێژ لەگەڵ دەزگای راگەیاندنی گشتی، ژمارە (٢)، چ. منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.
- عەبدولسەتار تاهیر شەریف، حاجی قادری کۆیی شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتیی نەتەوەی کورد، پێشەکی د. مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری رۆژی کوردستان، ز(٣)، الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٧٧.
- کوردستان موکریانی، دوانامەی گیو بۆ کۆڕی زانیاری کورد، چ. رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣.

– مارف خەزنەدار (د. )، (ڕۆژگاری من کەمێك ئاشتی و بڕێك هێمنی ١٩٦٨ – ١٩٧٥)، بەرگی پێنجەم، چ. ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠.
– ــــــــــــ (د. )، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا، ١٩٧٧.
– مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ ١، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢؛ چ ٣، کۆیە، ٢٠٠٩.
– مصطفی نەریمان، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی، زنجیرەی زمان (٥)، دارالحریە، بەغدا، ١٩٨١.
– محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگای دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی نۆیەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١.
– هەژار، چێشتی مجێور، چ ١، پاریس، ١٩٩٧.
– ــــــ، هەنبانە بۆرینە، سروش، تاران، ١٣٦٩ھ.

**٢– گۆڤار و ڕۆژنامە:**

– "ئاسۆ"(ڕۆژنامە)، ژمارە (٥٤٧)، ٢٠٠٧/٦/١٠.
– "برایەتی"(ڕۆژنامە)، خولی چوارەم، ژمارە (٤٣)، ١٩٧٣/٣/٢٣؛ ژمارە (٤٤)، ١٩٧٣/٣/٣٠.
– "بیری نوێ"(ڕۆژنامە)، بەغدا ،ژمارە (٤٠)، ١٩٧٣/٣/٢٧؛ ژمارە (٢٢٠)، ١٩٧٦/١٢/١٨ ؛ ژمارە (٢٢١)، ١٩٧٦/١٢/٢٥.
– "بەیان"(گۆڤار)،بەغدا، ژمارە (٢٨)، ١٩٧٥.
– "دەفتەری کوردەواری"(گۆڤار)، ژمارە (٢)، مارت و نیسانی ١٩٧٠.
– "ڕۆشنبیری نوێ"(گۆڤار)،بەغدا، ژمارە (٢٣)، ١٩٧٤/٧/١.
– "ژین"(ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (١١٢)، ١٩٧٣/٥/١٧.
– "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،" بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣؛ بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤؛ بەرگی دووەم، بەشی دووەم، ١٩٧٤؛ بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٥؛ بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، ١٩٧٥؛ بەرگی چوارەم، ١٩٧٦؛ بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧؛ بەرگی شەشەم، ١٩٧٨.
– هاوکاری، مانگی ٦ی ١٩٧٣؛ ژمارە (٢٥٩)، ١٩٧٥/٥/٣٠؛ ژمارە (٢٧٧)، ١٩٧٥/٨/٢٥.
– "نووسەری کورد"(گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٣)، ئابی ١٩٧١.

**٣– وتار لە گۆڤار و ڕۆژنامە:**

– ئاڤدەل، پەیکەرێ حاجی قادرێ نەمر و چەند گوتنەکێن پێدڤی، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٦)، ١٩٧٣/١٢/٧.

— ئـازاد عوبێـد سـاڵح (د.)، کـۆڕی زانیـاری کـورد — لێکۆڵینەوەیـەکی مێژووییـە، گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (۳۹)، ۲۰۱۷.
— ئیحسان شێرزاد، ژمارە دووی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، "گۆڤاری کۆڕی زانیـاری کـورد"، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ۱۹۷٤.
— ئـەورەحمانی حـاجی مـارف (د.)، بـا رێـزی لێکۆڵینـەوەی زانسـتی بگـرین، "رۆشـنبیری نوێ"(گۆڤـار)، بەغـدا، ژمـارە (۷۲)، شـوباتی ۱۹۷۹؛ بەشـی دووەم، "رۆشـنبیری نـوێ"، ژمارە (۷۳)، ئاداری ۱۹۷۹؛ بەشـی سێیەم،"رۆشـنبیری نـوێ"، ژمـارە (۷٤)، حـوزەیرانی ۱۹۷۹؛ بەشـی چـوارەم، رۆشـنبیری نـوێ، ژمـارە (۷٥)، تـەمموزی ۱۹۷۹؛ دوابـەش، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (۷٦)، ئەیلوولی ۱۹۷۹.
— ـــــــــــــــــــ، پێداچوونەوەیەکی هەندێ بیروڕای زمانـەوانیی مامۆسـتا مەسعوود محەمەد، بەشـی یەکـەم، "رۆشـنبیری نـوێ"، ژمـارە (۹۰)، ل ۱۰ — ۱۳، بەشـی دووەم، ژمارە (۹۲)، ۱۹۸۲.
— انور علی قادر، لەگـەڵ "رێنووسـی" گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد، "ژیـن"، ژمـارە (۱۱۱)، ۱۹۷۳/٥/۱۰.
— بەکر دلێر (ئەندازیار)، ناونـانی المجمـع العلمـی الکـردی،"رۆژی کوردسـتان"(گۆڤار)، بەغـدا، ژمارە (۲)، تەموزی ۱۹۷۱.
— پەیامنێری برایەتی لـە کـەرکوك، ئاهـەنگی شـاری کۆیـە بەبۆنـەی لابردنـی پـەردە لـەڕووی پەیکەری حاجی قادرەوە، "برایەتی"، ژمارە (۷۹).
— جـەلال خۆشـناو (ئەنـدازیار)، لێـدوانێك لەسـەر لیسـتەی چـوارەمی زاراوەکـانی کـۆڕ، "هاوکاری"، ژمارە (۲۸٦)، ۲٦ — ۱۹۷٥/۱۰/۳۰.
— جەمال نەبەز (د.)، بیبلیۆگرافیای کتـێبی کـوردی، "ئاسـۆی زانکـۆیی "(گۆڤـار)، سـلێمانی، ژمارە (٤)، کانوونی دووەمی ۱۹۷۸.
— ـــــــــــــــ، سـەرنجێك لـە چـەند زاراوەیـەکی تازەبـەکارهاتوو و کـۆڕی زانیـاری کورد، "گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات"، زانستگای بەغدا، ژمارە (۲۲)، ۱۹۷۸.
— ـــــــــــــــ، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا، "گۆڤاری کۆڕی زانیـاری کورد"، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ۱۹۷٤.
— جـەمال عەبـدول، چـەند تێبینیـەك دەربـارەی زاراوەکـانی کـۆڕی زانیـاری کـورد، "ژیـن"، سـلێمانی، ژمـارە (۱۲۳)، ۱۹۷۳/۸/۱٦؛ ژمـارە (۱۲٤)، ۱۹۷۳/۸/۲۲؛ ژمـارە (۱۲٥)، ۱۹۷۳/۸/۳۰.

- جەمال محەمەد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد و چەند هەڵەیەك، "هاوکاری"، ژمارە (١٧٨)، ١٩٧٣/٨/٣.
- خالد صابر عثمان، سەرنجێك، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٥٣)، ئەیلوولی ١٩٧٦.
- خالد جوتیار، روونکردنەوەیەك بۆ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،"هاوکاری""، ژمارە (١٩٤)، ١٩٧٣/١١/٢٣.
- خەلیل جندی، پێڕاچۆنەکا پلەز لسەر فەرهەنگا کۆڕا زانیاریا کوردی، "هاوکاری"، ژمارە (١٩٢)، ١٩٧٣/١١/٩.
- رەئووف پشدەری، زاراوەی کارگێڕ و تێروانینێك، "هاوکاری"، ژمارە (١٨٥)، ١٩٧٣/٩/٢١.

رەئووف عثمان، پیاچوونەوەیەك بە پەراوێزی زاراوەکانی کۆڕدا، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٥٠)، حوزەیرانی ١٩٧٦.

- ________ روونکردنەوەیەك دەربارەی لیستەی سێیەم و چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٦٠)، نیسان و مایسی ١٩٧٧.
- سەربەست بامەڕنی، کۆڕی زانیاری کورد و خزمەتگوزاری زمانەکەمان، "بەیان"، ژمارە (٢٨)، ١٩٧٥.
- شاسوار جەلال، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد و بێ دەنگی خوێنەرەکانی، "هاوکاری"، ژمارە (١٧٣)، ١٩٧٣/٦/٢٩.
- طاهر صادق، "ژین"، ژمارە (١١٦)، ١٩٧٣/٦/٢٤؛ ژمارە (١١٧)، ١٩٧٣/٧/٥؛ ژمارە (١١٨)، ١٩٧٣/٨/١٢.
- عبدالرحمن زەبیحی، رەخنەی زانستیانە یاخود شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٧١)، تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٧٨.
- عەزیز گەردی، چەند سەرنجێك لەبارەی "زاراوەی کارگێڕی کۆڕی زانیاری کورد"، بەشی یەکەم، "هاوکاری"، ژمارە (١٨٠)، ١٩٧٣/٨/١٧؛ بەشی دووەم، (١٨١)، ١٩٧٣/٨/٢٤؛ بەشی سێیەم، (١٨٢)، ١٩٧٣/٨/٣١؛ پاشماوەی بەشی سێیەم، (١٨٣)، ١٩٧٣/٩/٧؛ بەشی چوارەم، (١٨٤)، ١٩٧٣/٩/١٤.
- ع. ع. شەونم، لێکۆڵینەوە دەربارەی بەشی زمانەوانی یەکەم گۆڤارەکەی کۆڕی زانیاری کورد –١– ،"ژین" ژمارە (١١١)، ١٩٧٣/٥/١٠؛ –٢–، ژمارە (١١٢)، ١٩٧٣/٥/١٧، ١؛ –٣–، ژمارە (١١٣)، ١٩٧٣/٥/٢٤؛ –٤–، ژمارە (١١٤)، ١٩٧٣/٦/٧؛ –٥–، ژمارە (١١٥)، ١٩٧٣/٦/١٤؛ –٦–، ژمارە (١١٦)، ١٩٧٣/٦/٢١؛ –٧–، ژمارە (١١٧)، ١٩٧٣/٧/٥؛ –٨–، ژمارە (١١٩)، ١٩٧٣/٧/١٩؛ –٩–، ژمارە (١٢٠)، ١٩٧٣/٧/٢٦؛ –١٠–، ژمارە

(١٢١)، ١٩٧٣/٨/٢؛ –١١– ، ژمـــــارە (١٢٢)، ١٩٧٣/٨/٩؛ –١٢–، ژمـــــارە (١٢٤)، ١٩٧٣/٨/٢٢؛ –١٣–، ژمارە (١٢٥)، ١٩٧٣/٨/٣٠.

– غفور رەحیم، تێبینیەك دەربارەی زاراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، "هاوكاری"، ژمارە (١٨٠)، ١٩٧٣/٨/١٧.

– كاردۆ گەلاڵی، رێكەوت و وەدەنگ هاتنێك، "رۆژی كوردستان"، ژمارە (٤٧ – ٤٨)، تەمووزی ١٩٧٧.

– كۆڕی زانیاری كورد و بەرهەمە بەنرخەكانی،" بەیان "، بەغدا، ژمارە (٢٨)، ١٩٧٥.

– كەمال مەزهەر (د.)، پوختەی كارەكانی كۆڕ لە خولی یەكەم و دووهەمیدا، "گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد"، بەرگی یەكەم ، بەشی یەكەم، ١٩٧٣.

– ______________، پاراستنی پاشماوەی كۆنمان لە كاری كۆڕدا،" گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد"، بەرگی یەكەم، ب ١، ١٩٧٣.

– كەمال فوئاد (د.)، چەند سەرنجێكی زمانەوانی، "رۆژی كوردستان"، ژمارە (٢)، تەمموزی ١٩٧١.

– كوردستان موكریانی، نامەكانی كۆڕی زانیاری ملكەچن، "هاوكاری"، ژمارە (٤١٥)، ١٩٧٨/٢/٢٧.

– لیستەی یەكەمی (زاراوەی كارگێڕی)، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی دووهەم، بەشی یەكەم، ١٩٧٤.

– مامەخەمە، "بیری نوێ"، ژمارە (٢١٩)، ١٩٧٦/١٢/٤.

– معروف قەرەداغی، سەرنجێك دەربارەی كتێبەكەی شەرەفنامە،"هاوكاری"، ژمارە (٢٥٢)، ١٩٧٥/١/٣١.

– ______________، سەرنجێك دەربارەی زاراوەكانی دووەم لیستەی كۆڕی زانیاری كورد، "هاوكاری"، ژمارە (٢٥٨)، ١٩٧٥/٣/١٤.

– ممتاز حیدری، پەیكەری حاجی قادری مەزن، "هاوكاری"، ژمارە (١٩٠)، ١٩٧٣/١٠/٢٦.

– مەسعوود محەمەد، رەواندنەوەی دوو رەخنە، "رۆشنبیری نوێ"، ژمارە (٨٠)، ١٩٨٠.

______________، روونكردنەوە و پیرۆزبایی لە كۆڕی زانیاری كوردەوە بۆ بیری نوێ، "بیری نوێ"، ژمارە (٣)، ١٩٧٢/٧/٢.

– ______________، "كۆڕی زانیاری كورد"، ئەم ناوەی چۆن وەرگرت، "زانیاری" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٤)، سەرماوەزی ١٩٧١.

– محەمەد مەلا كەریم، دوو ووشەی هێمن لەبارەی كۆڕی زانستی كوردەوە،"نووسەری كورد "(گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١)، مارتی ١٩٧١.

– نامەیەك لە زانای كورد مامۆستا تۆفیق وەهبی یەوە بۆ: سەرۆكی كۆڕی زانیاری كورد مامۆستا ئیحسان شێرزاد، "هاوكاری"(ڕۆژنامە)، بەغدا، (ژمارەی تایبەت)، ١٩٧٢/١/١؛
– نووسەرێك، كۆڕی زانیاری كورد و بێ كاری، "بیری نوێ" ، بەغدا، ژمارە (٢١٩)، ١٩٧٦/١٢/٤.
– نەوشیروان مستەفا، لە پەراوێزی لیستەی یەكەمی زاراوەی كارگێڕی كۆڕی زانیاری كوردا، "هاوكاری"، ژمارە (١٧٧)، ١٩٧٣/٧/٢٧.
– یادداشتی یەكێتی نووسەرانی كورد دەربارەی ئەكادیمیەی زانستی كوردەوە، "هاوكاری"، ژمارە (٨) ١٩٧١/٣/٦.
– یەكێتی نووسەرانی كورد چی بەسەرهات؟، "بیری نوێ"، ژمارە (١٦٩)، ١٩٧٥/١٢/٦.

**٤– نووسراو و چاوپێكەوتن:**

سوپاسنامەی كۆڕ بە نووسراوی ژمارە (٢٧) لە ١٩٧٢/١/٥ بۆ ڕەوشەن بەدرخان.
چاوپێكەوتن لەگەڵ محەمەد عەلی قەرەداغی، ٢٠١٧/١٢/٢٦، هەولێر.

**ب– عەرەبی**

**١– مقالات في الجرائد والمجلات:**

– اخبار مجمعية، مجلة "المجمع العلمي الكردي"، المجلد الثاني – العدد الثاني، ١٩٧٤.
– قسم التحقيقات، مكتبة المجمع العلمي الكردي، "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد (١٢٠٩)، ١١ كانون الأول ١٩٧٢.
– عزالدين مصطفى رسول (د. )، حول المجمع العلمي الكردي، "الثقافة"(مجلة)، بغداد، العدد (٤)، ١٩٧٦.
– الاستاذ مصطفى القرداغي يهدي مكتبته الى المجمع العلمي الكردي، "التآخي"، العدد (١٢٠١)، ٢ كانون الاول ١٩٧٢.

**٢– الجرائد والمجلات:**

"التآخي"، الاعداد، ٤٩٧، ١٩٧٠/٧/٢٨؛ ٥٢٠، ١٩٧٠/٨/٢٥؛ ٥٣٢، ١٩٧٠/٩/٨؛ ٦٧٨، ١٩٧١/٣/١٨؛ ٦٤١، ١٩٧١/١/١٧؛ ٦٥٣/ ١٩٧١/١/٣١؛ ٧٧٩/ ١٩٧١/٧/٨؛ ٨٣٠/ ١٩٧١/٩/٨؛ ١٠٢٦/ ١٩٧٢/٥/٧؛ ١١٩٠، ١٩٧٣/١١/٢٦.
مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٢ – ٢)، ١٩٧٤؛ العدد (٣ – ١)، ١٩٧٥؛ العدد (٣ – ٢)، ١٩٧٥؛ العدد (٤)، ١٩٧٦.

## پاشکۆ

### چاپەمەنییەکانی کۆڕ

١– شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی، هەژار کردوویە بە کوردی، چ. نعمان، نەجەف، ١٩٧٢ – ١٩٧٣، ١٠١٦ل.
٢– مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣، ٤٠٤ ل.
٣– د. نەسرین فەخری، چاوگی بیّ واتا لە زمانی کوردیدا، چ. ئاداب، نەجەف، ١٩٧٣، ١٠٢ل.
٤– قەناتی کوردۆ، هەندێك بیروباوەڕی هەڵە لەبارەی زمان و مێژووی کوردەوە، و: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٣– ١٩٧٤، ١٦٦ل.
٥– د. مستەفا جەواد، هۆزی لەبیرکراوی گاوان، و: هەژار، ١٩٧٣، ١٠٨ل.
٦– د. مصطفى جواد، جاوان القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجاوانيين، ١٩٧٣، ٤٨ص.
٧– زاراوەی کارگێڕی، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. کەمال مەزهەر، ١٩٧٣، ١٦٩ل.
٨– مەسعوود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی، ١٩٧٤، ١٨٠ ل.
٩– مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧٤، ٣٣٥ ل.
١٠– زاراوەی هەمەچەشنە، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکان، بەغدا، ١٩٧٤، ٥٦ ل.
١١– ئەورەحمانی حاجی مارف، چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە، بەغدا، ١٩٧٤، ٧٠ل.
١٢– محەمەد ئەمین هەورامانی، فۆنەتیکی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٤، ٧٢ل.
١٣– قەناتی کوردۆ، د. ئەورەحمانی حاجی مارف و د. جەمال نەبەز، بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپادا، ١٩٧٤، ١٦٠ ل.
١٤– لیستەی چوارەمی زاراوەی کۆڕ، ١٩٧٥، ٤٦ ل.
١٥– جەمیل صائب، لەخەوما، لێکۆڵینەوەی: جەمال بابان، ١٩٧٥، ٧٨ل.
١٦– د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، بەغدا، ١٩٧٥، ٢٠٠ل.
١٧– خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، محمدی مەلا کەریم ساغی کردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ ڕێکخستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٧٥، ٩١٣ ل.
١٨– ئۆسکارمان، توحفەی موزەفەریە (تحفة مظفرية)، ساغکردنەوەی: هێمنی موکریانی، بەرگی یەکەم، ١٩٧٥، ٤١٣ ل، بەرگی دووەم، ١٩٧٥، ٣٦٣ ل.
١٩– ابن الحاج، مەهدی نامە، پێشەکی و ساخکردنەوەی: محەمەد عەلی قەرەداغی، ١٩٧٥، ٧٢ ل.

۲۰– عەرەبی شەمۆ، داستانی قەڵای دمدم، و: شوکر مستەفا هێناویەتیە سەر ڕێنووسی کوردی و کرمانجی خواروو، ۱۹۷۵، ۳٦٦ ل .

۲۱– د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ۱۹۷۵، ۱۲۷ل.

– مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، شەریعەتی ئیسلام، چ۲، بەغدا، ۱۹۷٦، ۳۱٤ل.

۲۲– مەسعوود محەمەد، چەپکێك لە گوڵزاری نالی، ۱۹۷٦، ۳۵۰ ل.

۲۳– قەناتی کوردۆ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی، و: شوکر مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد، ۱۹۷٦، ۲۷٤ل.

۲٤– ژیان و هۆنراوەی وەلی دێوانە، پێشەکی و ساخکردنەوەی عوسمان هەورامی، ۱۹۷٦، ۱۰٤ ل.

۲۵– د. موسی بنای العلیلی، الایضاح في شرح المفصل لإبن الحاج (رسالة دکتورا).

۲٦– کەریم شارەزا، پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، ۱۹۷٦، ۱۷۵ ل.

۲۷– د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، بەغداد، ۱۹۷٦، ۸۵ ل.

۲۸– مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ۱۹۷٦، ۹۸ ل.

۲۹– دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم، ۱۹۷٦، ۷۵۲.

۳۰– یاشار کەمال، ئەفسانەی چیای ئاگری، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: شکور مستەفا، ۱۹۷٦، ۱۷۸ل.

۳۱– مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی سێیەم، بەغدا، ۱۹۷٦، ٤۲۰ ل.

۳۲– مەسعوود محەمەد، ڕێنووسی کوردی، بەغداد، ۱۹۷٦، ۱۸ ل.

۳۳– ڕێنووسی کوردی، ۱۹۷٦، ۱۸ل.

۳٤– حامید فەرەج، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا، بەغدا، ۱۹۷٦، ٤۲ ل.

۳۵– لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغدا، ۱۹۷٦، ٤۷۷ل.

۳٦– محەمەد مەلا صالحی شارەزووری، ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا، ۱۹۷٦، ٤۸ ل.

۳۷– لیژنەی زاراوە زانستییەکان، زاراوەی زانستی، ۱۹۷٦، ٤٦ل.

۳۸– د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ۱۹۷۷، ۱۰٤ل.

۳۹– مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەهار و گوڵزار، ۱۹۷۷، ۳٦۷ل.

٤۰– مەلا محەمەدی مەحوی، دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدرس و محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، ۱۹۷۷، ٦۲٤ل.

٤١— ئۆردیخانێ جەلیل، ستزانێ زارگۆتنا کوردا یەتاریقیێ، شوکر مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد هێناویەنەتە سەر ڕێنووسی کوردی ئەمڕۆ و فەرهەنگیان بۆ کردووە، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ٥٢٠ل.
٤٢— دیوانا مەلایێ جزیری، صادق بهاء الدین، ١٩٧٧، ٦٣٩ ل.
٤٣— رەئووف بێگەرد، بوار، ١٩٧٧، ٦٢ل.
٤٤— د. كمال مظهر احمد، كردستان فى سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة: محمد ملا عبدالكريم.مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٧.
٤٥— مستەفا نەریمان، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی، ١٩٧٧، ٢٩٠ل.
٤٦— چیرۆك نڤیس، مەمی ئالان، ئەنوەر قادر محەمەد و سالح عەلی گولی هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، ١٩٧٧، ١٧٠ل.
٤٧— عەقیدەی مەولەوی، ساخکردنەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، ١٩٧٧، ٢٠ل.
٤٨— مەسعوود محەمەد، مرۆڤ و دەوروبەر، بەشی یەکەم، ١٩٧٧ ١٠٨ل.
— عەزیز عەقراوی، گیانی مروڤ، چ٢، بەغدا، ١٩٧٨، ٥٥ل.
٤٩— مەکسیم گۆرکی، دایك، کەریمی حسامی کردوویە بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، ٥٠٢ل.
٥٠— شێرکۆ بێکەس، ئاسك (شیعری شانۆیی)، ١٩٧٨، ٩٢ل.
٥١— کاکەی فەلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، ٢٦٢ل.
٥٢— علاء الدین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، ٢٢٤ ل.
٥٣— حەمیدی ئێزەد پەناه، فەرهەنگی لەك و لوڕ، لێدوان و بەراوردکردنی: مەحموود زامدار، بەغداد، ١٩٧٨، ٢٣٠ل.
٥٤— میرزا عەبدوڕەحیمی سابڵاخی، دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغداد، ١٩٧٨، ٤٠٤ ل.
٥٥— عومەر مەعروف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥ — ١٩٦٩، بەغداد، ١٩٧٨، ٢٢١ل.
٥٦— غەفور میرزا کەریم، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، بەغداد، ١٩٧٨، ٥٦ ل.
٥٧— مەسعوود محەمەد، بەرەو راستەشەقامی ئاخاوتنی کوردی، ١٩٧٨، ٦٤ل.
٥٨— د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨ ، ٣١٦ل.
٥٩— عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، بەغدا، ١٩٧٨، ١٦٠ل.
٦٠— لەتیف هەڵمەت، گەردەلوولی سپی، شیعر، ١٩٧٨، ١٠٤ل.
٦١— محەمەد عەلی قەرەداغی، مەولەوی و سروشت، بەغدا، ١٩٧٨، ٤٤ل.

٦٢– ئەنوەر قادر محەمەد، زریان، ١٩٧٨، ٩٤ل.
٦٣– عبدالرحمن الحاج معروف، ما کتب عن اللغة الکردية، ترجمة: محمد أمين هوراماني، بغداد، ١٩٧٨، ٦٢ص.
٦٤– شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی: الفتح الوامض على المنح الفائض في علم الفرائض، بغداد، ١٩٧٨، ٨٠ل.
٦٥– نوبهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانی، صادق بهاء الدین ئامێدی خرڤەکردن و لەدوی چۆن و تویژاندنا، بەغدا، ١٩٧٩، ٩٥ل.
٦٦– عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٧٩، ٢٣٠ل.
٦٧– سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، بەغدا، ١٩٧٩، ٣٧٥ل.
٦٨– مەلا عبدالکریمی مدرس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٩، ٦٥٤ل، بەرگی دووەم، ٦٦٨ل.
٦٩– کمال جلال غریب، القاموس العلمي عربي – انگلیزی، کردي، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٧٩.

## ملخص البحث


### المجمع العلمي الكوردي
### الاعمال والنشاطات ١٩٧٠ – ١٩٧٨

يعد تأسيس المجمع العلمي الكوردي كأحد منجزات اتفاقية ١١ آذار ١٩٧٠ وصدور قرار خاص بتكوين تركيبة المجمع، بدأ المجمع بتشكيل مؤسساته الضرورية كالمقر والمكتبة والمطبعة وبذلك أهل للبدء بواجباته وجهوده العلمية والثقافية.

بعدما عالجنا مرحلة البداية والتأسيس في بحث سابق، أعد هذا البحث كتكملة لاعمال ونشاطات المجمع خلال فترة البحث.

تحدثنا في البداية عن تعرض اسم المجمع إلى نقد من قبل الكتاب والمثقفين الكورد وكذلك كيفية تشكيل تركيبته، خصوصاً من قبل اتحاد كتاب الكورد.

بعد ذلك تطرقنا الى المنجزات العلمية والثقافية" اللغة واقسامها – الاملاء والمصطلحات والقواميس ثم عرجنا على مطبوعات المجمع من كتب وكذلك اصدار مجلة علمية رصينة متميزة واعمال اخرى للمجمع.

وبالإضافة الى ذلك تطرقنا الى اصداء اعمال المجمع على صفحات الجرائد والمجلات الكوردية وتثمين اعماله وفي النهاية تحدثنا عن العلاقات الخارجية للمجمع والخاتمة.

وفي ختام البحث افردنا ملحقاً خاصاً بمطبوعات المجمع.

# Abstract

## The Kurdish Academy

After establishing of the Kurdish academy as a great achievement of 11th March 1970 agreement between Kurds and Iraqi Government, a special decision has issued for setting up a structure of the Kurdish Academy. Therefore, The Kurdish Academy has installed its significant parts such as library, printing house for starting its academic and intellectual events.

Furthermore, the process of establishing The Kurdish Academy was explained in our previous research that is why this one is a complement of the previous paper and also this one emphasized on the Kurdish Academy's activities.

At the beginning, the name of the Kurdish Academy was clarified and also the Kurdish intellectual's dissatisfaction on the name of the Kurdish Academy was revealed. Meanwhile, the Kurdish writers association has criticized the formation of the Kurdish Academy.

The scientific and intellectual activities of the Kurdish Academy was elucidated in this paper. For instance, language and its parts, Kurdish dialects and thesaurus. Also talking about Kurdish author's books in this paper which were printed by the Kurdish Academy .

However, The Kurdish Academy emerged constantly an academic magazine which was played an important role for developing Kurdish language. Also there is a talk about reactions on the Kurdish academy's magazine. In the same time. The internal and external relations of The Kurdish academy was discussed in this paper.

Finally. There is an appendix list of outcomes of the Kurdistan Academy.

# تەتەر بەگێ عەلی بەگێ نێروەیی و پشکداری د بزاڤێن نێریێ و بارزاندا
# ١٨٥٠ - ١٩١٥

**پ.ی.د.عەلی تەتەر تۆفیق**
پشکا مێژوو، کولیژا ئادابێ ، زانکویا دهوکێ،
هەرێما کوردستانێ ، عێراق

**پوختە:**
تەتەر بەگێ کوڕێ عەلی بەگێ کوڕێ تەتەر بەگێ نێروەیی ( ١٨٥٠ ــ ١٩١٥) ژ بنەمالا میرێن نێروەیە، کو د بنەکوکا خۆدا، ژ بنەمالا میرێن بەهدینانن. دووماهیا سەدێ نوزدێ و دەستپێکا سەدێ بیستێ، شورشگێر و تێکوشەرەکێ بزاڤا رزگاریخوازا کوردی دهێتە هەژمارتن. تا نها چ ڤەکولین لسەر کەسایەتی و ددەورێ وی نەهاتینەکرن. ئەڤ ڤەکولینە پشتبەستنە ب مەزبەتا (دیوانا حەرب یا عورفی) و بریارێن ئەنوەر پاشای وەزیرێ جەنگی و محەمەد سەعیدێ سەدر ئەعزەم و سولتان محەمەدێ پێنجێ (رەشاد) لسەر دووسیا ناڤبری. تەتەر بەگێ پشکداریەکا کارا د بزاڤا شێخ عوبەیدوللایێ نێریێ ل سالێن ١٨٧٩ ــ ١٨٨٠ هەبوویە. و پاش سەرهەلدانا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی، ئەو ژی بوو ئێکێ ژ سەرکردێن کاریگەر و پلە ئێکێن وی. ل پرانیا وان بزاڤێن سیاسی و چەکداری و پەیوەندیێن ب کۆڕ و کومەلێن سیاسیەڤە دهاتنە کرن ، دەورەکێ بەرچاڤ هەبوویە. ئێکێ ژ وان کەسان بوو کو سالا ١٩١١ ب تێلگراف داخوازێن کوردی گەهاندینە بابعالی.

د بەرگرییا نیسانا ١٩١٤ دا، فەرماندەییا بەرێ رۆژئاڤایێ د ستوینێ ویدا بوویە، و دووماهی بەرە ژی بوو، کو بەرگرییا وێ هاتیە شکاندن. تەتەر بەگ ناڤەراستا نیسانا ١٩١٤ ل دەڤەرا ولات ژێری ل ناڤ مزوری ژوریان، هاتە دورپێچکرن، و ب ژن و زارو ڤە هاتە گرتن. د دادگەها واندا ل تشرینا دووێ ١٩١٤ پاش شێخ عەبدولسەلام، وەکو کەسێ ژمارە دوو هاتیە هەژمارتن و ل کانوونا

دوویێ ١٩١٥ ل موسل دگەل محمد ئەمین ئاغایێ بابسێڤی هاتیە سێدارەدان. کورێ وی مەجید بەگ دگەل هەردوو کەسێن وی یێن نێزیك خالد شەرەف و رەجەب ئوسمان ژی د زیندانێدا هاتنە کوشتن.

**کورتیەك ژ مێژوویا میرێن نێروە:**

بنەمالا میرێن نێروە د کوکا خۆدا ژ بنەمالا میرێن بەهدینان ل ئامێدیێ دهێنە هەژمارتن. سولتان حەسەن میرێ بەهدینان هەر کورەکێ خۆ هنارتە دەڤەرەکا بەهدینان و ئێخستە د بن کونترولا خۆدا. کورێ خۆ خان ئەحمەد بەگ ژی سالا ١٥١٤ هنارتە کەلا نێروە و دەسەلات ژ میرێن وێ یێن بەری وەرگرت، کو ل دویڤ (دەستنڤیسا زێوکێ) پێشتر ژێر دەسەلاتا میرێن ئێزدینان ئانکو بنەمالا میر عزەدین کورێ نورەدین کورێ بەهائەدین کورێ مەلك خەلیل ژ بنەمالا میرێن بەهدینان بوو. بڤی رەنگی بۆ ماوەیەکێ دەسەلات کەفتە ددەستێ بنەمالا خانیاندا. پاش خان ئەحمەد بەگێ، کورێ وی شاه یوسف بەگێ و دویڤدا میر یەعقوب بەگێ و دویڤدا میر عەبدولعەزیز بەگێ و پاشی وی میر عەبدوللا بەگێ، دەسەلات ل دەڤەرا نێروە گرتیە دەست[1]. عەبدوللا بەگ دگەل سولتان مورادێ چوارێ (١٦٢٣ ــ ١٦٤٠) پشکداری د لەشکرکێشیا بۆ سەر بەغدا ل سالا ١٦٣٨ دا کریە. و کورێن وی ل دەڤەرێن مویسل و دێرەزوور ئاکنجی بووینە. و هندەك بنەمالێن بەرنیاس دویڤ خۆدا ب جه هێلاینە مینا: بنەمالا (ئەبو ریشە)، مەزنێن هۆزێن مەوالی ل ئەنبار و دێرەزوور، و مەزنێن هۆزا (ئالای بەگی) یا ل تەلەعفەر، و هندەك مالێن بەرنیاسێن بەگێن موسل و دیاربەکر[2].

ل دویڤ هوزانێن تومەر خانێ یازجی، سالا ١٦٣٤ میرێ کەلا نێروە میم غازی (غازی بەگێ کەڤن) بوویە، کو پاش چەند شەرەکا دگەل لەشکرێ هەکاریا ب سەرکێشیا میر عیمادەدینێ کورێ یەحیا خانێ هەکاری (١٦٣٤ ــ ١٦٣٩)، کو پێکهاتبوون ژ هێزا هۆز و دەڤەرێن: پنیانشی، دری، سەرانکیلی، دوستکی، جیلو، دیزی، بازی، سلاحی، لیوتبان، ساتاخ، وەستان، کاکان، خانی، قوالیسی، گارسی، تخوبی، لیوین و تیاری، ناچار دبیت کەلا نێروە ب جه دهێلیت و کورێ خۆ یێ زاروك خان بوداغ ددانیتە جهێ خۆ. خەلکێ کەلێ گوه نادەنە کورێ وێ، بەلکو برایێ وی بازید بەگێ ددانتە جهێ وی. و ئەو ژی دچیتە خزمەتا میر

عیمادەدین و ملکەچیا خۆ بۆ دیار دکەت. میر عیمادەدین پێشوازیەکا باش ژی دکەت و دەڤەرا ژێر دەسەلاتا میرێن نێروە بۆ دهێلیت. و فەرمانەکێ "بزمانێ کوردی" دنڤیسیت و تێدا دیار دکەت، کو هەموو ئاخا نێروە دێ ژێر دەسەلاتا بازید بەگێ بیت و هەرکەسێ دژی ڤێ بریارێ راوەستیت، سەرێ وی بهێتە لێدان و نفشێ وی بهێتە ژناڤبرن[٣].

کومەکا میرێن دیتر ل کەلا نێروە دەسەلاتدار بووینە مینا: حسێن بەگێ کو سەربەخۆییا خۆ ژ سەعید خان بەگێ (١٦٨٢ ـــ ١٦٩٩) میرێ بەهدینان راگەهاندیە[٤]. سلێمان بەگێ میرێ نێروە، کەلا نێروە نوژەن کریە و سالا ١٧٦٥ وەغەر کریە. دویڤدا جەوهەر بەگ بوویە میر. جەوهەر بەگ ب فەرمانا بەهرام پاشای میرێ بەهدینان (١٧١٤ ـ ١٧٦٩) شیایە ل سالا ١٧٦٧ ل شەرێ شکەفتێن مێرسیدان ل دەڤەرا شێخان، ئیبراهیم بەگێ بگریت و بزاڤا وی یا دژی بەهرام بەگێ ژناڤ ببەت[٥]. سەرەرای هندێ کو بەهرام پاشای فەرمان دابوو کو ئیبراهیم بەگ ب زیندی بهێتە رادەستکرن، لێ بریڤە ئیبراهیم بەگێ بزاڤا کوشتنا جەوهەرێ بەگێ کر. و د ئەنجامدا ئیبراهیم بەگ هاتە کوشتن. جەوهەر بەگێ گوتە شەرکەرێن خۆ، ئەگەر هاتو میرێ بەهدینان خۆ تۆرەکر و بزاڤا سزادانا مە کر، ئەو دێ ئاماژێ دەتە وان و د جهدا میرێ بەهدینان بکوژن. دەما بەهرام پاشای لسەر چاوانیا روودانا کوشتنا ئیبراهیم بەگێ ئاگەهدار بووی، خۆ بێدەنگ کر. و بۆ ڤێ سەرکەفتنێ هندەك گوند و دەسەلاتداریا پشکەك ژ دەشتا ناڤکورێ دا میرێن نێروە و ل گوندێن زیناڤا، ناوەران، دەڤەرا شەمکانێ، قەسروکێ، گر زەنگل و دیدڤان و چەند گوندێت دیتر، ژلایێ میرێن نێروە ڤە شانە (شەحنە)[٦] و نوێنەر دهاتنە دانان و گوندێ زیناڤا و چەند گوندێن دەوروبەر تا دەستپێکا سەدێ بیستێ ژی مابوونە ددەستێ مالە میرێن نێروەدا[٧].

هەمزا بەگێ و وەلیا بەگێ کورێن جەوهەر بەگێ پاش بابێ خۆ دووماهیا سەدێ هەژدێ و دەستپێکا سەدێ نوزدێ ل کەلا نێروە حکومرانی کرینە[٨]. خالد بەگێ برایێ وەلیا بەگێ[٩]، ل دەستپێکا سەدێ نوزدێ بوویە کەهیایێ زوبێر پاشایێ دووێ (١٨٠٨ ـ ١٨٢٤) میرێ بەهدینان[١٠]. و تەتەر بەگێ کورێ وەلیا بەگێ بوویە میرێ کەلا نێروە. زوبێر پاشای باج و داهاتێ دەڤەرا (نهێل) و

(دەشتازێ) ژی بۆ تەتەر بەگێ لسەر داهاتێ کەلا نێروە زێدەکر[11]. د سەردەمێ حکومرانیا ویدا، میر محەمەد میرێ سۆران ل ئادار ١٨٣٣ هێرش کرە سەر دەڤەرا بەهدینان. و پرانیا وێ ب ئامێدیا پایتەخت ڤە کەفتە ژێر دەسەلاتا ویدا. لێ دەڤەرا نێروە نەکەفتە د دەستێ میرێ سۆراندا و ئیسماعیل پاشای ل سالا ١٨٣٣ بۆ ماوەیەکێ درێژ خۆ ل کەلا نێروە ئاسێ کر[12].

دەما ئیسماعیل پاشای دووماهیا سالا ١٨٣٣، بۆ رزگارکرنا پایتەختێ بەهدینان هێرش بریە سەر کەلا ئامێدیێ، تەتەر بەگێ دگەل شەرکەرێن خۆ، دەرگەهێ زێبار گرت. و پاشی منارا ئامێدیێ ب رێکا شەرکەرەکێ خۆیێ ناڤدار بناڤێ بابێزدین ژ شەرکەرێن سۆران وەرگرتەڤە و سەرکردێ شەرکەرێن سۆران بدەستێ هێزێن تەتەر بەگێ هاتە کوشتن. تەتەر بەگ میرەکێ ب هێز، لێ تا رادەیەکێ یێ ستەمکار و توند بوویە[13].

**میرێ زانا عەلی بەگێ نێروەیی:**

پاش تەتەر بەگێ، سادق بەگێ خان ئەحمەدێ هەمزا بەگێ جەوهەر بەگێ بوویە میر. سادق بەگ ئێکێ ژ وان کەسانە کو ل ئادارا ١٨٣٥ ژ بابعالی، داخوازا زڤراندنا ئیسماعیل پاشای بۆ حوکمرانیا بەهدینان و دەرئێخستنا هێزا میرێ سۆران کریە[14]. پاش وی عەلی بەگێ کورێ تەتەر بەگێ بوویە میرێ کەلا نێروە. عەلی بەگ ئێکێ ژ روشنبیرترین میران ل دەڤەرا بەهدینان دهێتە هەژمارتن. دەمێ گەنجاتیا خۆ ل ناڤەراستا سەدێ نۆزدێ، پاش تەمامکرنا خوێندنا کلاسیك ل نێروە و ئامێدیێ، ل ستەنبولێ بەردەوامی دایە خویندنێ[15]. عەلی بەگ میرەکێ دادگەر و مێهرەبان و زانا و هەروەسا هوزانڤان و نڤیسەرەکێ خودان شیان بوو. تا نسکویا شورشا ئەیلولێ ل سالا ١٩٧٥، هوزانێن ویێن فارسی و تورکی و عەرەبی لبەر دەست بوون[16].

عەلی بەگێ پشتەڤانیا ئیسماعیل پاشای بۆ بەرەنگاربوونا دەسەلاتا راستەوخۆیا ئوسمانیان کر. هەروەسا وی پەیوەندیێن زور خۆش دگەل تەکیا قادری ل بریفکان هەبوو و هەتا بەگیخانا، خۆشکا شێخ عەلی یێ کال شێخێ گەلیێ رومانێ بۆ برایێ خۆ سەلیم بەگێ ئینا. و بۆ برایێ دیتر ئانکو شەرەف بەگێ کچا عەبدی ئاغایێ بێکولی یێ مزووری ئینابوو. بڤی رەنگی دگەل مالا عەبدولعەزیز

ئاغایێ ئامێدی و هەتا دگەل مالا شێخ عەبدولسەلام ژی خزمانی پەیدا دکر. پاش خورتبوونا دەورێ مالا شێخێن نێریێ (نەهری)، پەیوەندیێن وی دگەل سەید تاهایێ نێریێ ل شەمزدینان و تەکیا نەقشەبەندی ژی زور خۆش دبن[17].

ل بزاڤێن ئیسماعیل پاشای بۆ زڤراندنا دەسەلاتا میراتگرییا میرێن بەهدینان، عەلی بەگێ رولەکێ بەرچاڤ هەبوویە. هەتا ئیسماعیل پاشا د نامەیەکا خۆدا ل بوهارا ١٨٤٢ ب زمانێ فارسی بۆ رەسول پاشایێ میرێ سۆران، ئاماژێ ب مێرخاسی و چالاکیا عەلی بەگێ کریە و بزاڤا خۆیا چەکداری ژی بۆ (غیرت *کردستان*)، ئانکو خەبات و تێکوشین بۆ کوردستانێ ناڤبریە[18]. ئەڤە ئێکەم جارە میرەکێ کورد بزاڤا خۆ دژی ئوسمانیان، ب خەبات بۆ کوردستانێ ناڤ دبەت. هەروەسا د نامێن دیتردا ل هاڤین و پاییزا ١٨٤٢، ب زمانێ فارسی هەمان بابەت هنارتیە بۆ: وەلیا بەگێ چەلی و عەلی بەگێ نێرۆەیی و وەلیا بەگێ رێکانی، بەهرام ئاغایێ هەرکی، مار شەمعون، ماقولێن تیاریان[19]، و محەمەد بەگێ میرێ خۆشناو ل کۆیێ و سلێمان بەگێ ل هەمان دەڤەرێ، ئیبراهیم ئەفەندیێ هەولێرێ، حسێن ئاغا و عەلی ئاغایێ مزووری، نوروللا بەگێ میرێ هەکاری، ئاغایێن زێباریان، شێخ یوسفێ عەبدی ئاغایێ زاخویی، شێخ نورەدینێ بریفکی و سەید تاهایێ نێریێ، و داخوازا هاریکاری و پشکداریێ ژ وان بۆ کێشا کوردستانێ کریە و دنڤیسیت: "*رۆژا خزمەتێ ئەڤرۆیە .... و پەندەکا کوردی یا هەی دبێژیت: بلا ژیێ تەیێ کورت بیت بەس سەرێ تەیێ بلند بیت*"[20].

هەروەسا ئەوا ل دەڤەرێ دهێتەگوتن کو عەلی بەگ یێ پشکدار بوویە دگەل خەلکێ ئامێدیێ دکوشتنا (خەندان ئاغا) قایمەقامێ ستەمکارێ ئوسمانیان، کو سالا ١٨٦٢ێ هاتبوو دانان. و دهێتە گوتن کو خوارنا قایمەقامی ئیپراخێن مێوان بوون کو نەگەهشتیە بخوت ، و شەرکەرێن عەلی بەگێ خوارنا وی خوارینە[21].

عەلی بەگ مرۆڤەکی ب غیرەت و خودان کەسایەتیەکا ب هێز بوو. دەما سەرکردەیەکێ ئوسمانیان بناڤێ (ئادەم پاشا) ب کارەکێ ل دەڤەرا نێروە را دەرباز دبوو. جوانی (جەحشەکا) هێسترا عەلی بەگێ دیت کو دگەل دەنگێ ساز و دهولێن لەشکری د لەییست. ئادەم پاشای داخوازا جوانی کر، عەلی بەگێ نەدایێ. پاش دەربازبوونا ئادەم پاشای، عەلی بەگێ جوانی ب دویڤدا هنارت. دەما ئادەم

پاشای پرسیار ژ خزمەتکارێ عەلی بـەگێ کـر کـا بـۆ چـی ل دەڤـەرێ ئـەو جـوانی نەدایێ ، د بەرسڤدا گوت داخوازا تە ژ عەلی بەگێ یا ئامرانـە بـۆ و ئـە ژی بەگـەکێ کوردانە. و دەعیا وی نەئینا بدەتە تە، کو تو هزر بکەی ژ ترسـاندا دایـە. لێ دەمـا تو دەرباز بووی، دەعیا وی نەئینا داخـوازا مێهڤـانی ژی پاشـگوە بێخیـت، کـو تـو هزر کەی بەگەکێ قەلسە. لەورا ئەڤ جوانی بۆ تە هنارتیە[22].

پاش ژناڤبرنا میرنشینا بەهدینان ل سالا ١٨٤٢، بۆ چەند سالەکا عەلی بەگێ ل کەلا نێروە میراتی کریە. لێ دویڤدا دەولەتا ئوسمانی سیستمێ حوکمرانیا کـەڤنا کوردان هەلوەشاند. و نێروە ژی کرە ناحیەکا سەربەخۆ سەر ب قـەزا ئامێـدیێ یـا سنجەقا مویسل گرێدای ب ویلایەتا بەغداڤە. ل دویڤ سالنامەیا ئوسمانی یـا سـالا (١٢٩٢/ ١٨٧٥)، وێ سـالێ عـەلی بـەگ رێڤەبـەرێ ناحیـا نێـروە، ئـانکو ئێکـەم رێڤەبەرێ ناحیا نێروە بوویە[23]. پاش ئێك دوو سالا ناچار بوو کـەلا نێـروە ب جـه هێلا و ل گوندێ زێـوە ل دەڤـەرا نێـروە، ل سـەر رووبـارێ زێ ئـاکنجی بـوو. بڤـی رەنگـی پـاش دەربازبوونـا نێزیکـی پێـنج سـەدەیا، دەسـەلاتداریا بنـەمالا میرێـن ئێزدینان ل کەلا نێروە ب دووماهی هات. لێ بۆ هندێ عەلی بـەگ بشـێت دەسـەلاتا پشکەك ژ ئاخـا نێـروە بهێلیتـە ددەسـتێ خـۆدا، دەڤـەرا نێـروە کـرە دوو بـەیلیك (پشك). و دەستێ خـۆ دانـا سـەر بـەیلیکا مـیرا و دەڤـەرا نهێـل. پاشـی مـالا خـۆ ڤەگوهاستە گوندێ کارە ل رۆژهەلاتا نێروە. پاش دوو سالان مالا خۆ ڤەگوهاسـتە گوندێ سینیا ل رۆژ هەلاتا دەڤەرا نێـروە و لڤـی گونـدی بناغـێ قەسـر و کەلـەکێ دارشـت، لێ نەگەهشـت تـەمام بکـەت. هەروەسـا کـارێ پـەروەردەکرنا کـرمێن ئەبریشەمی (حەریر) دانا و هندەك کارێن جوان لڤی گوندی کرن. هەتا بزاڤ کـر کـو قوتابخانـەکا سـەردەمی بینیتـە دەڤـەرێ، کـو رەخـوڕوو و رەعیـەتێ ب تونـدی بەرهەلستکاری کر و ب کارەکێ کوفر و دەرچوون ژ ئیسلامێ دانـە زانـین و گـەفێن بارکرنێ ژ دەڤەرێ کرن[24].

**تەتەر بەگێ دووێ:**

پاش مرنا عەلی بەگێ ل سالێن هەفتێیان ژ سەدێ نۆزدێ، کـوڕێ وی تەتـەر بەگێ جهێ وی گرت. تەتـەر بـەگ سـالا ١٨٥٠ ل کـەلا نێـروە ژدایك بوویـە، دایکـا تەتەر بەگێ بناڤێ (مەستان پەری) کچا غازی بەگێ سـەرنی، ژنـەکا تێگەهشـتی و

روشەنبیر و ڕێڤەبەرەکا شارەزایا سەردەمێ خۆ بوو. زور جاران کاروبارێ کوچکا میری وێ ب ڕێڤە دبر. و کاریگەری لسەر پەروەردەکرنا تەتەر بەگێ هەبوو. تەتەر بەگێ شیان و زانینا بابێ خۆ نەبوو؛ چونکی مینا وی مفا ل پەروەردا وی سەردەمی وەرنەگرتبوو. لێ کەسەکێ پڕ بزاڤ و چالاك بوو. ئێکەم کارێ وی تەمامکرنا قەسرا عەلی بەگێ بوو، کو دوو بورجێن شەری ژی تێدا هاتبوونە چێکرن. هەروەسا ئاڤ ژ (کانیا ژێرێ) ب ڕێکا سولینان ئینابوو د قەسرێدا. کو ئەڤ سولینە تا سالا ١٩٧٧ دەما وێرانکرنا گوندی ژلایێ حکومەتا عێراقێ ڤە مابوون[٢٥].

تەتەر بەگێ پەیوەندیێن باش دگەل سەرۆك هۆزێن دەڤەرێ، برێکا ژنخوازیێ (مصاهرات سياسية) چێ کربوون. وی سێ ژن هەبوون: ژنا وی یا ئێکێ (بەیان) کچا تەمەر ئاغایێ بێدەیێ ڕێکانی و ژنا دووێ (عەیشا) کچا جهانگیر ئاغایێ مالا زاهرێ ڕێکانی، و ژنا سێیێ (گول پەنبوو) کچا سەعدوللا بەگێ عومەربەگێ بوو کو د وی دەمیدا دەسەلاتدارێ پشکەك ژ دەشتا ناڤکورێ بوو. هەروەسا (عەیشا) کچا غازی بەگێ میر سادق بەگێ ژ مالە میرێن نێروە، دابوونە فەتاح ئاغایێ لاتکا زێباریێ و نەسروللا ئاغایێ لاتکی کوڕێ فەتاح ئاغای خوارزایێ بەگێن نێروە بوو. و بڤی ڕەنگی پەیوەندیێن بەرفرەھ دگەل هۆزێن دەوروبەر، چ د سەردەمێ عەلی بەگێ و چ د سەردەمێ تەتەر بەگێدا پەیدا ببوون[٢٦].

**پەیوەندیێن تەتەر بەگێ و شێخێن نێریێ (نەهری):**

تەتەر بەگێ زور بزاڤ کرن کو پەیوەندیێن خۆ دگەل بنەمالا نێریێ خۆش بکەت؛ چونکی د وی سەردەمیدا بنەمالا شێخێن نێریێ ب هێزترین بنەمال بوون د کوردستانێدا. تەتەر بەگێ د ژیێ لاوینیێدا سالا ١٨٧٨ سەردانا شێخ عوبەیدوللایێ نێریێ کر و پشتەڤانیا خۆ بۆ شێخی دیار کر. دەمێ تەتەر بەگێ سەردانا نێریێ کری، نڤیسەرێن شێخ عوبەیدوللای زانیاریێن تەمام ل دۆر گوند و ژمارا چەکدارێن دەڤەرا نێروە وەرگرتن و ل دەفتەراندا تومارکرن. ل نێریێ ڕێزەکا زور ژ تەتەر بەگێ هاتەگرتن؛ چونکی ئەو ژ دوورترین دەڤەرا باشوورا ڕۆژ ئاڤا ژ نێریێ هاتبوو و شێخێ نێریێ د شیا برێکا وی و عەلی ئاغایێ بنەما بالیلان ئاغایێ نێروە، دەستێ خۆ بگەهینیتە ئامێدیێ پایتەختێ بەهدینان[٢٧].

ئەڤ رێزگرتنا زورا شێخێ نێریێ ژ میرێ نێروە، ئەگەرەکێ دیتر ژی هەبوو؛ چونکی خێزانا شێخ عوبەیدوللای ئانکو دایکا شێخ محەمەد سدیق خوشکا حەسەن بەگێ بەردەسوری[٢٨]، ژ میرێن عەباسیان بوو[٢٩]. کو ئەو ژی ب قنێت پسمامێن تەتەر بەگێ بوون[٣٠]. ئەڤ رێزگرتنە بۆ ئەگەر پلە و پایەیا تەتەر بەگێ د دەڤەرێدا زێدەتر ببیت و خەلك بۆ چارەسەرکرنا کێشێن خۆ و تایبەت بۆ خۆ رزگارکرن ژ زورداریا ئاغاییێن دەڤەرێ، پەنایێ ببەنە بەر تەتەر بەگێ تایبەت ژ زورداریا سیتوییێ ئورەماری، کو دەڤەرەکا بەرفرەها دەڤەرا رێکان و دوسکان و دەوروبەر ئێخستبوو ژێر دەسەلاتا خۆدا. و ب زورداریێ و توندوتیژیێ یێ ناڤدار بوویە[٣١].

ل دویڤ بەلگەنامێن فرەنسی، دەستپێکا بزاڤا چەکداریا شێخ عوبەیدوللایێ نەهری ل بەهدینان دەستپێکر. کو وی دەمی سەر ب ویلایەتا موسل ڤە بوو. لەورا بەلگەنامێن روسی و فرەنسی بەحسێ سەرهلدانا ڤێ بزاڤێ ل دەڤەرا موسل و پشتەڤانیا هندەك خەلکێ دەڤەرێ ژ بزاڤێن شێخێ نێریێ و کۆمڤەکرنا باجێ، ژلایێ زەلامێن شێخی لڤێ دەڤەرێ دکەن. هەروەسا بەحسێ هندەك پێزانینا دکەن، کو شێخی ڤیایە ئامێدیێ ژی بگریت و بکەتە ناوەندا دەسەلاتداریا خۆ[٣٢].

دەولەتا ئوسمانی هێزەکا جەندرما ژ شارێ موسل بەرەڤ ئامێدیێ هنارت. دا رووبەرووی هێزێن پشتەڤانێن شێخ عوبەیدوللای، ب سەرکێشیا عەلی ئاغایێ نێروەیی و تەتەر بەگێ ببیت. هێزا ئوسمانیا بزاڤ کر ب رێکا سەرێ ئامێدیێ دەربازی نێروە و رێکان ببن. کو وی دەمی ژێر دەسەلاتا شێخ عەبدولقادرێ کورێ شێخ عوبەیدوللای و چەکدارێن تەتەر بەگێ و عەلی ئاغایێ نێروەیی بوو. چەکدارێن کوردان ب توندی رووبەرووی لەشکرێ ئوسمانی بوون. و ل چەندین جهان لەشکرێ ئوسمانیان تێکشکاندن. و ب دەیان جەنازێن جەندرمان کەفتنە ددەستێ کورداندا. لێ د وان شەڕاندا، شەکر ئاغایێ برایێ عەلی ئاغای ژی د گەل چەند شەڕکەرەکان د ڤان شەڕاندا هاتنە کوشتن[٣٣].

ژ بەر ڤان شەڕێن چێبووی، شێخ عوبەیدوللای نامەیەك بۆ مونیر پاشای والیێ موسل هنارت. و داخواز ژێ کر کو دەسەلاتا وی لسەر دەڤەرا بەهدینان، ب فەرمی بنیاسیت. و بتنێ باجا سالانە یا ڤێ دەڤەرێ بۆ دەولەتا ئوسمانی رەوانە

بکەت. لێ حکومەتێ جارەکا دیتر، ل تشرینا ئێکێ سالا ١٨٧٩ێ هێزەکا زورتر رەوانەی دەڤەرا ئامێدیێ کر. هێزێن ئوسمانی نەشیان زورتر بچنە پێش و دەڤەرێن نێروە، رێکان، دوسکان و رۆژهەلاتا بەرواری ما ددەستێ هێزێن کورداندا. وی دەمی شێخ عوبەیدوللای ڕاگەهاند کو هێزێن وی دئامادەنە هێرشی ببنە سەر ئامێدیێ. دڤان هێرشاندا زەرەر و زیانەکا زور ب گوند و خەلکێ دەڤەرێ کەفت. شێخ عوبەیدوللای یادداشتەك بۆ بابعالی هنارت و دیارکر کو، هێزێن ئوسمانیان ل دەڤەرا بەهدینان گوند تالانکرینە و سووتینە و خەلکێ وێ کوشتینە و دەستدرێژی لسەر ناموسا خەلکی کرینە(٣٤).

تەتەر بەگێ جارەکا دیتر سالا ١٨٨٠ دگەل کۆمەکا چەکدارێن خۆ، پشکداری ل کونگرا مەزن و گرگرێن کوردان ل شەمزدینان کر. ئەوێن ل دەڤەرا ئامێدیێ دگەل تەتەر بەگێ ل وێ رونشتنێ پشکداربووی و ناڤێن وان لبەر دەستێ ئەڤەنە: تاهر خەمرەڤین سینی نێروەیی، بابێزین سفر حەجی سینی، دەرویش بەگ شێخ سن سینی، پیرەمێر عەزیز بەگ سینی، حەیبەکر سەیدێ سینی، شەنگین مەروان سینی، حەیران جبۆ بادین بێرومانی نێروەیی و سمو بێرومانی. کو ژبەر پێخوشیێ سمو بێرومانی کارێ پوستەچیاتیێ دناڤبەرا شێخ عوبەیدوللای و تەتەر بەگێدا دکر، و بۆ چوون و هاتنێ شەش شەڤ و روژ پێویست بوون. دڤێ کونگرێدا جارەکا دیتر تەتەر بەگێ وەفاداریا خۆ بۆ بزاڤا شێخ عوبەیدوللای دیارکر و پاراستنا بەرێ شەرێ باشوورێ رۆژئاڤا بزاڤا کوردایەتیێ ب تەتەر بەگێ و عەلی ئاغای هاتە سپاردن و ب وەفاداری ئەرکێ خۆ برێڤەبرن(٣٥).

پاش دوور ئێخستنا شێخ عوبەیدوللایێ نێریێ بۆ حیجازێ، تەتەر بەگێ پەیوەندیێن خو دگەل شێخ محەمەد سدیقێ کوڕێ وی بەردەوامی پێدان. و دەمێ تەتەر بەگێ سەرەدانا نێریێ کری، ژلایێ شێخ محەمەد سەدیق ڤە رێزەکا زور ژێ هاتە گرتن، نەخاسمە کو شێخ محەمەد سدیق خوارزایێ بەگان بوو و پشتەڤانیا مالە خالێن خۆ دکر(٣٦). پشتەڤانیا شێخێ نوویێ نەهریێ بوو ئەگەر کو پلە و پایێ میرێ نێروە هەر د گەشەکرنێدا(٣٧).

**تەتەر بەگ و تەکیا بارزان:**

ژ ئەنجامێ گوڕانکارییێن هێزێ و ململانا دناڤبەرا شێخ محەمەدێ بارزانی و شێخ محەمەد سدیق دا، هێزا شێخی بارزان ل دەڤەرا ئامێدیێ خورتتر لێهات. تایبەت پاش خزماییتیا دناڤبەرا مالا ئاغایێن کتان ل شارێ ئامێدیێ دگەل شێخ عەبدولسەلامێ دووێ، دەڤەرا بەهدینان پتر کەفتە ژێر رکێڤا شێخێ بارزاندا. تەتەر بەگ دگەل محەمەد ئاغایێ کوڕێ حاجیێ کوڕێ پیرموسێ نێروەیی، بوونە (تابعێن)[38] شێخێن بارزان. و پەیوەندیێن خورت دگەل شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی چێکرن و بریار و رێنماییێن شێخێ بارزان ل دەڤەرێ ب تەمامی پەیادە دکرن[39].

پەیوەندیێن تەتەر بەگێ دگەل شێخێ بارزان ل دەستپێکا سەدێ بیستێ زور خورتتر لێهاتن؛ چونکی پشتی کو شێخ عەبدولسەلامێ دووێ بوویە شێخی تەکیا نەقشبەندی ل بارزان، چالاکیێن شێخێ بارزان ل دەڤەرا بەهدینان زورتر لێهاتن. و دشێین بێژین کو بوو ب هێزترین کەس ل دەڤەرا بەهدینان. تا سالا ١٩٠٤ پروپاگندە وەسا بەلاڤ ببوون کو شێخ عەبدولسەلام لبەرە بهاریکاریا هێزێن پشتەڤانێن خۆ ل دەڤەرا بەهدینان، وێ دەڤەرێ ب تەمامی بگریت. و حکومەتەکا کوردی لێ ئاڤا بکەت[40]. پرانیا ئەو گەشتێن کو شێخ عەبدولسەلام بۆ دەڤەرا بەهدینان یان هەکاری ئەنجام ددان، تەتەر بەگێ دگەلدا بوویە. پاش هێرشا دەولەتا ئوسمانی ل ئەیلوولا ١٩٠٩ بۆ سەر بارزان و دەما ئاوارەبوون و خۆ ڤەشارتنا شێخ عەبدولسەلام ل دەڤەرا بەهدینان، بۆ ماوەیەکێ شێخ عەبدولسەلام ب نهێنی لایێ تەتەر بەگێ ل گوندێ سینیا بوویە. و خۆ ل شکێرێ (رەڤەلێ) و شکەفتا (ناڤقەشا) ڤەشارتیە. لێ ب ئەگەرا برنا خوارنێ بۆ شکەفتێ، هێدی هێدی هەبوونا شێخێ بارزان لوێ دەڤەرێ کەفتیە سەر ئەزمانان و ناچار شێخ عەبدولسەلام ئەو گوند ژی ب جھ هێلایە[41].

پاشان بۆ ماوەیەکێ ل پاییزا ١٩٠٩ ل شکەفتا (شێخی) ل گوندێ نێروە، مایە لایێ محەمەد ئاغایێ نێروەیی. و پاشان لایێ سەعدی ئاغایێ چەلێ ل زڤستانا ١٩٠٩ ل گوندێن زاویتەیا سەر ب هۆزا تیاریان یا باسکێ راستێ[42]. و دویڤدا ل گوندێ گویزەرەشی لایێ مەلا عەبدوللایێ گویزەرەشی مایە[43]. حکومەتێ زور بزاڤ کر کو سەعدی ئاغای بکێشنە وانێ، لێ ب ئەگەرا سەقایێ نەخوشێ دەڤەرا

زوزانان، سەعدی ئاغای چوونا خۆ بو دوماهیا بەهارا ١٩١٠ پاش ئێخست. ل هـەیڤا گولانا ١٩١٠ێ، حکومەتا ئوسمانی بسەر بازێرکێ (چەلێ)دا گرت. وەهبی بەگێ کورێ سەعدی ئاغای کو گەنجەکێ بیست سالی بوو، پێش چاڤێن بنەمالا وی ب لێدانا داران کوشتن، لێ دیسان ئامادە نەبوو جهێ شێخی ئاشکەرا بکەت. مەلا عەبدوللایێ گویزەرەشی ژی گرتن و ل شارێ جولەمێرگێ د ناڤ (مەدرەسا مەیدانێ)دا ل ٢١ گولانا ١٩١٠، ب لێدانا داران کوشتن. لێ دیسان بزاڤێن ئوسمانیان بۆ ئاشکەراکرنا شێخ عەبدولسەلام سەرنەگرتن(٤٤).

بنەمالا تەتەر بەگێ کو پەیوەندیێن خورت دگەل شێخ عەبدولسەلام هەبوون، و تایەکێ بنەمالا وان ژی ل ستەنبول ئاکنجی ببوون، جارجار عەزیز بەگێ سەعدوللا بەگێ عومەربەگێ سەردانا ستەنبولێ دکر، پەیامێن شێخ عەبدولسەلام د گەهاندنە سیاسیێن کورد، ژ وان ژی شێخ عەبدولقادرێ شێخ عوبەیدوللایێ نێریێ کو سەرۆکێ جڤاتا تەعاون و تەرەقیا کورد بوو. ئەو پەیوەندیێن تەتەر بەگێ دگەل شێخ عوبەیدوللای و بنەمالا نێریێ ببوونە ئەگەر کو باوەریەکا تەمام دناڤبەرا وان دا هەبیت. هندەك ئەو بەلاڤوك و پەیام ب رێکا وان را، دناڤبەرا کوردێن ستەنبولێ، تایبەت بنەمالا شێخێن نێریێ، ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولسەلام ئەنجام ددان. تایەکێ دیتر یێ بنەمالا میرێن نێروە ل موسل ئاکنجی ببوون. و ببوونە پرەك دناڤبەرا شێخ عەبدولسەلام و میرێن نێروە دگەل ئوپۆزۆسیونا ئوسمانی و هێزێن لیبرال ژ تورك و عەرەب، و تایبەت پلەدارێن ئوسمانی. ژ وان ژی باشترین پەیوەندی دگەل تاهر پاشایێ والیێ موسل (١٣ی تشرینا ئێکێ ١٩١٠ ــ ٢٤ی تشرینا ئێکێ ١٩١٢) یێ سەر ب بەرەی حوریەت و ئیئتلاف و سەفوەت بەگێ چێکربوون(٤٥).

ئێکێ ژ بزاڤێن بەرچاڤێن کوردان ل شارێ موسل، دامەزراندنا تایێ جڤاتا تەعاون و تەرەقیا کورد ل وی بازێری بوو. لدویڤ بروسکا وان ئەڤ تایە ل بازێرێ موسل ل ١٧ی کانوونا ئێکێ ١٩٠٨ هاتبوو دامەزراندن. و شێخ عەبدولسەلام و لایەنگیرێن وی، ژ وان ژی تەتەر بەگ ژ پشتەڤانێن ڤێ جڤاتێ دهاتنە هەژمارتن(٤٦). ژ بزاڤ و جموجوولێن تەتەر بەگێ یێن دیتر، پێزانین دکێمن. لێ هندە د زانین کو د ئەنجامێ پشتەڤانیا وییا بەردەوام ژ شێخێ بارزانی، عەزیز بەگێ

کورێ سەعدوللا بەگێ، خەزوور و پسمامێ وی ل سالا ۱۹۰۹ێ کو ئەو ژی ئێکێ ژ کەسێن نێزیك شێخ عەبدولسەلام بوویە دڤان رووداناندا دبیتە قوربانی[٤٧].

پاش شۆرشا کو دژی سەرکردێن ئیتحاد و تەرەقی، ژلایێ لایەنگیرێن سولتان عەبدولحەمیدی دووێ (۱۹۷٦ ـــ ۱۹۰۹) ل ۱۳ ی نیسانا ۱۹۰۹ ێ هاتیەکرن. سولتان عەبدولحەمید ژلایێ ئیتحاد و تەرەقی ڤە هاتە لادان[٤٨]. و حکومەتا نوویا ئیتحاد و تەرەقی، سیاسەتەکا توند بەرانبەر نەتەوێن نە تورك گرتەبەر. و رێ ل هەموو کۆمەلێن کو ئارمانجێن نە تورکی هەی، گرتن[٤٩]. هەروەسا ل ۲۳ ئابا ۱۹۰۹ ێ، یاسایێ قەدەغەکرنا کۆمەلێ و پارتێن خودان ئارمانجێن نەتەوەیی ــ سیاسیێن نە تورکی دەرئێخستن[٥٠]. و دژایەتیا هەر جۆرە بزاڤەکا نەتەوەییا نە تورکی و کەسایەتیێن بەرچاڤ ، دڤان جورە بزاڤاندا کرن.

شێخ عەبدولسەلام د ئاستەکێ بەرتەنگدا سیاسەت نەدکر، بەلکو بزاڤ دکر کێشا کوردان، بگەهینیتە بەر سینگێ گوپیتکا دەسەلاتدارێن جیهانێ. ئەو هەر زوو ب کاریگەریا هێزا بریتانیا د دەڤەرێدا ئاگەهدار ببوو، و د رونشتنەکێدا ل گوندێ (سیریێ) ل (دەشتا زێ) دگەل قەشە (ویگرام) ئامادەبوونا خۆ دەربری، کو بچیتە بریتانیا و دگەل شاە جورج، شاهێ بریتانیا کوم ببیت. و بەحسێ کێشا کوردستانێ و سەربەخۆییا وێ دگەلدا بکەت[٥١]. هەر د بزاڤێن خۆدا بۆ چێکرنا پەیوەندیان دگەل بریتانیا، شێخ عەبدولسلام، پەیوەندی دگەل جێگرێ کۆنسولێ بەریتانی ل مووسل ژی هەبوون[٥٢]. کو د وی سەردەمیدا ئیدوارد ویلکی ( H. W. Wilkie) بوو[٥٣]. د وی دەمیدا ئازراندنا بابەتەکێ بڤی رەنگی، ژلایێ مرۆڤەکێ دیندار د دەولەتا ئوسمانیدا، ب گونەهەکا مەزن دهاتە هەژمارتن، هەروەك د دادگەهکرنا ویدا ژی هاتیە هژمارتن. لێ شێخ عەبدولسەلام کارێ سیاسی ب تێگەهشتنەکا سەردەمیانە دکر و بۆ بەرژوەندیێن ولات و نەتەوێ خۆ، یێ ئامادە بوو هەر پێنگاڤەکێ بهاڤێژیت کو وا ئارمانجان ب جهـ بگەهینیت.

لسەر باوەر و کریارێن شێخێ بارزان، دەڤەرا بارزان سالا ۱۹۰۹ تووشی هێرشا سەربازێن ئوسمانی بوو و زیانەکا مەزن پێ گەهشت. شێخی پاش ڤان هێرشان، نامەیەك ل ۱۲ ی ئادارا ۱۹۱۰ بۆ وەزیرێ ناڤخۆیێ دەولەتا ئوسمانی هنارت و بەحسێ ئەو زۆر و ستەما سەر دەڤەرا بارزان هاتیەکرن کر. و داخواز ژێ

کر کو ب چاڤێ دلوڤانی و دادپەروەریێ بەرێ خۆ بدەنە دەڤـەرا بـارزان. و ئەگـەر حکومەتا ئوسمانی سەر سیاسەتا خۆ یا بەردەوام بیت. *"أنا لله و انا الیه راجعون"* وان مافێ بەرگریا شەرعی ژ خۆ هەیە و هـەتا دوومـاهی کـەس دێ بـەرگریێ ژ خـۆ کەن. و هەموو بەرپرسیارەتی و ئەنجام ژ خۆینرشتنا موسلمانان، دێ کەڤیتە سەر ملێن کاربدەستێن حکومەتا ئوسمانی. و ل دووماهیا نامێ ژی، بەحسـێ سـووتن و وێرانکـرن و تالانکرنـا گونـدێن دەڤـەرا زێبـار، مـزووری بـالا و شـێروان و کوشـتنا خـەلکی وان دەڤـەرا ژلایـێ سـوپایێ حکومـەتێ و هـۆزێن پشـتەڤانێن وان هـاتبوو کرن[٥٤]. ل دویڤ نڤیسینا نازم پاشای والیێ بەغدا ژی، ئۆپەراسیۆنێن لەشـکریێن حکومەتێ، ببوونە ئەگەرێ سووتن و وێرانکرنا پتر ژ ١٣٢٧ خانیا و ٤٤ مزگـەفت و کنیسا. و پارە و مالێ خەلکی هاتبوو تـالانکرن و ئێکـا وەسـا بسـەرێ خـەلکێ وان دەڤەرا ئینابوون، کو هەتا پێچێ نەدبوو نانێ روژانە یێ خۆ دابین بکەن[٥٥].

سیاسەتا تورککرن و دەسەلاتا ناوەندی ژلایێ ئیتحاد و تەرەقی، بوو ئەگـەر کو هندەك کاربدەستێن ئوسمانییێن سـەر ب (حوریـەت و ئیئـتلاف فرقەسـی) کـو پشتگیریا سیاسـەتا (لامەرکـەزی) دکـرن. هاریکاریـا شـێخ عەبدولسـەلامی بکـەن، نەمازە پشتی کو نازم پاشای بوویە والیێ بەغدایێ. و ڤەگوهاسـتنا محەمـەد فـازل پاشایێ داغستانی (٢٢ کانوونا ئێکێ ـ ٢٣ خزیرانـا ١٩١٠)[٥٦]، ژ ویلایـەتا مووسـل کو ب توندی دژی چارەسەرکرنا ئاشتیانەیا کێشا بارزانیان بوو. وێ سـالێ گفتوگـو دناڤبـەرا حکومـەتێ و شـێخ عەبدولسـەلامیدا دەسـتپێکر و لسـەر هنـدەك خـالان گەهشـتنە رێکـەفتنێ و شـێخ عەبدولسـەلام سـالا ١٩١١ ێ پشـتی مشـەختبوونێ و دوورکەفتنێ زڤری دەڤەرا بارزان[٥٧]. ژ تێلگرافێن کو نازم پاشایێ والیـێ بەغـدایێ و محەمەد فازل پاشایێ والیێ موسلێ بۆ بابعالی هنارتینە، دیار دبیت کـو ململانـێ و ناکوکیەکا هزرییا کویر دناڤبـەرا ڤـان دوو والیانـدا هەبوویـە، نـازم پاشـای دڤیـا کێشا بارزان ئاشتیانە چارەسەر بکەت. و فازل پاشای دڤیا لسەر توند و تیژیێ یێ بەردەوام بیت. و بۆ شێخ عەبدولسەلام و هەڤالێن وی دادگەها عورفی ب دانیـت. و ب توندترین شێوە هەموویان سزابدەت[٥٨].

سیاسەتا ئیتحاد و تەرەقی، بوو ئەگەر کو نەتـەوێن نـە تـورك، ژ سیاسـەتا وان دوور بکەڤن، و ل دور جڤـاتێن میانـەرەوتر مینـا (حوریـەت پـەروەر موعتـەدل

فرقەسی) و (حوریەت و ئیئتلاف فرقەسی) کۆمڤە بـبن. کـوردان ژی پشـتگیرییەکا بەرچاڤ ژ ڤان هـەر دوو جڤاتـا کـر. بـۆ مینـاك پشـتی دامەزرانـدنا لقـا (حوریـەت و ئیئتلاف فرقەسـی) ل دووماهیـا سـالا ١٩١١ یَ ل شـارێ مووسـل، گەلـەك کەسـێن کورد و عەرەب دەست ژ کارکێشانا خۆ ژ جڤاتا (ئیتحاد و تەرەقی) ڕاگەهانـدن، و چـوونە دنـاڤ (حوریـەت و ئیئـتلاڤ فرقەسـی)دا[٥٩]، و ڕۆژنامـا وان ژی ب نـاڤێ (ئەلنەجاح)، ب ڕەنگەکێ بەرفرەهتر دناڤ خەلکیدا بەلاڤ بوو[٦٠].

ئـــەڤ گوهورینـــە د سیاســـەتا ئوسمانیانـــدا، و ســـەرکەفتنا سیاســـەتا ئاشتیخوازانەیا نازم پاشای، بوو ئەگەر کو لێبورینا گشتی بۆ بارزانیان دەربچیت و ڕێز ژ شێخ عەبدولسەلام بارزانی ژی بهێتە گرتن[٦١]. بڤی ڕەنگی دەولەتا ئوسمانی ب بـزاڤێن نـازم پاشـای، دڤیـا لوجیکانـە سـەرەدەریێ دگـەل کێشـا کـوردان ب سەرکێشـیا شـێخ عەبدولسـەلامێ بـارزانی بکـەت. بەلگەنامـەکا ئوسمـانی د وی سـەردەمیدا پێشـبینییەکا زۆرا دروست ژ کێشـا بـارزان کربـوو. دڤـێ بەلگەنامێـدا هاتبوو دەڤەرا بارزان زۆرا بێ بەهرە ژ خزمـەتگوزاریا. و هنـدی ئـەو دەڤـەر د وان کاوداناندا دەرباز ببیت، مومکین نینە سەقامگیریێ بخۆڤـە بینیـت، و د ئایەندێـدا، ئـەو گرفـت، دێ بیتـە گرفتـەکا سیاسـی[٦٢]. هـەروەك د ڤـێ بەلگەنامێدا ل سـالا ١٩١٠ێ هاتییە، ڕاپـەڕینا بارزانیـان بـوو کێشـەیەکا سیاسـی و ژ کێشـا دەڤـەرەکا سنووردار بۆ کێشا کوردستانێ.

دەما شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی، سالا ١٩١١ سەردانا شـارێ دهـوك کـری، تەتـەر بـەگ دگەلـدا بـوو. و ل مـالا شـێخ نـور محەمـەدێ بریفکـی ل دهوکـێ و ب ئامادەبوونـا مـەزنێن بەهـدینان مینـا: شـێخ بەهائـەدینێ نەقشـەبەندیێ بامـەرنی، حـاجی ڕەشـید بـەگێ بـەرواری و تەتـەر بـەگێ نێروەیـی و چـەند کەسـێن دیـتر، ئامادەبوویان گەنگەشە لسەر خالێن داخوازەکا ڕەوایا کوردی ژ دەولەتا ئوسمـانی کرن. و شێخ عەبدولسەلامی بناڤێ ئامادەبوویان تێلگراف ئیمزا کر. ئـەڤ تێلگرافـە ل ویستگەها سێمێلێ (ئیسماعیلیە) بۆ بابعالی هاتە هنارتن[٦٣].

ئەو خالێن کو دڤێ تێلگرافێدا هـاتبوون، دیـارترین و بەرچـاڤترین داخـوازێن چاکسازییێیەنە کو ژلایێ کوردان بـۆ حکومەتـەکا داگیر کـەرا کوردسـتانێ هاتبیتـە پێشکێشکرن، و ژ خالێن خوارێ پێکهاتبوو[٦٤]:

١ – زمانێ کوردی ل هەر پێنچ قـەزایێن کـوردان ، دهـوك، زاخـو، ئامێـدیێ، شنگار و ئاکرێ زمانێ فەرمی بیت.

٢ – زمانێ پەروەردێ ب کوردی بیت.

٣ – قایمەقام و رێڤەبەرێن ناحیا ژوان کەسا بن، کو کوردی زان بن.

٤ – چونکی دینـێ فـەرمییێ دەولـەتێ ئیسـلامە ، دڤێـت دەسـەلاّت لـدویڤ شەریعەتێ ئیسلامێ ب رێڤە بچیت.

٥ – دڤێت قازی و موفتی ژ مەزهەبێ شافعی بهێنە هەلبژارتن.

٦ – باج ژوان کەسا بهێتە وەرگرتن کو ل سـەر بیـت و ل دویـڤ شـەرعی. و یێ زێدەتر چێ نابیت ژێ بهێتە وەرگرتن.

٧ – ئەو پارێ بەرانبەر خزمەتا لەشکری دهێتە وەرگـرتن، هـەر بمینیـت. لێ بۆ چێکرنا رێکا بهێتە مەزاختن دڤان قەزادا.

کوپیەك ژڤێ داخوازێ بۆ سەرۆکێن کوردان ل ستەنبولێ هنارتن، مینا: شـێخ عەبدولقادرێ شێخ عوبەیدوللایێ نێریێ، ئەمین عالی بـەدرخان و شـەریف پاشـایێ خەندان[٦٥]. ب ئەگەرا سیاسیبوونا ناڤەروکا ڤێ تێلگرافێ، تایبەت هەرسێ بەنـدێن ئێکێ کو سیمایەکێ نەتـەوەیی ـــ نیشـتیمانی یـێ کـوردی پیڤـە دیـار بـوو. بەنـدا چوارێ دژی کریـار و بـاوەرێن جڤاتـا ئیتحـاد و تـەرەقی، د پـەیرەوکرنا سیاسـەتا رەگەزپـەرسـتی و تـورککرنێ دا بـوو. کـو ئـەو ژی یـا هەماهـەنگ بـوو دگـەل هـزرا سیاسەتمەدارێن لیبرالێن ئوسمانی. بەندا پێنجێ، زۆر زیرەکانە هاتبوو دارشتن کـو ئەو ژی چێکرنا قەوارەیەکێ سیاسی ـ مەزهەبی یێ جودا ژ یێ تـورکێن ئوسمـانی کـو مەزهــەبێ حەنــەفی بـوو. ئەڤـەژی دا تایبەتمەندییـەکا دیـتر دەتـە دەڤـەرێن کوردسـتانێ و جڤاکـەکێ سـەربەخۆتر بەرانبـەر سیاسـەتا ناوەنـدیا تورککرنـێ چێکەتن.

سـەرەرای موناقەشـا مێژوونڤیسـێن کـورد لسـەر سـالا پێشکێشـکرنا ڤـان داخوازیا، سالاّ ١٩١١ دروستترە و دەم ژی یـێ گونجـایتر بوویـە، بـۆ پێشکێشـکرنا ڤان داخوازان. هەروەك مێژوونڤیس و کارمەندێ ئوسمانی یێ هەڤچـەرخی روودانـا سدیق دەمەلوجی دنڤیسیت: کو پاش گرتنا شـێخ عەبدولسـەلامێ بـارزانی ل سـالا ١٩١٤، مالا شێخ نور محەمەدێ بریفکی ل شارێ دهوکێ ب ئەمرێ سلێمان نـەزیف

والیێ مووسلێ هاتە پشکنین. دەقێ وێ تێلگرافێ دیتن کو شێخ عەبدولسەلام و هەڤالێن وی بۆ ستەنبولێ بەری سێ سالان شاندبوون[٦٦]، هەروەك د تێلگرافا سلێمان نەزیف دا دیار دبیت. مالا شێخێ بریفکان ل دهوکێ، ل تیرمەها (تموزا) ١٩١٤ هاتیە پشکنین[٦٧]؛ ئانکو ئەڤ تێلگرافە ل سالا ١٩١١ دڤێت هاتبیتە نڤیسین.

ئەڤ پشکداریێن بەرچاڤێن تەتەر بەگێ، ژ روویێ سیاسی و لەشکریڤە، بوونە ئەگەر کو ئەو ژلایێ کاربدەستێن دەولەتا ئوسمانیڤە، ئێکێ ژ کەسانێن زور کاریگەر، هەروەك د بریار و بۆچوونا دیوانا حەربیا عورفیدا هاتی ژ "*ئاغایێن موتەنەفزێن یلە ئێك*" هاتیە هەژمارتن و د دادگەهێدا وەکو گونەهبارێ وان روودانا، ناڤێ وی راستەوخۆ وەکو ناڤێ ئێکەم پشتی ناڤێ شێخ عەبدولسەلامێ بارزانێ هاتیە ئینان. و پترین ناڤە کو د هەر هەشت لاپەرێن بریارا دیوانێدا هاتیە بکار ئینان و هاتیە گونەهبارکرن[٦٨].

**تەتەر بەگ و سەرهەلدانا ١٩١٤ یا بارزان:**

پشتی کو جڤاتا (ئیتحاد و تەرەقی) بۆ جارا دووێ دەسەلات گرتیە ددەست. داخوازێن تێلگراڤێ ب داخوازێن سیاسی و دەستتێوەردانا کۆمەلێن سیاسیێن کورد هاتە نیاسین[٦٩]. ئەڤ ئەگەرە و گونەهبار کرنا شێخێ بارزان ب هەبوونا پەیوەندیێ دگەل رووسیا، و رەڤینا سەفوەت بەگێ بۆ لایێ شێخێ بارزان[٧٠]، کو پەیوەندیەك دناڤبەرا وان دگەل عەبدولرەزاق بەدرخان و سەید تاهایێ نێریێ دا ژی هەبوو[٧١]. هەروەسا گوتگوتکەك هەبوو کو عەبدولرەزاق، سمکو، حسێن بەدرخان، مار شەمعون، شێخێ بارزان، سەید تاها و رێبەرێن ئێزدیان، دا سەرهەلدانەکا گشتی د وی سەردەمیدا دژی حکومەتا ئوسمانیان کەن. ئەڤ بەرهەڤیە ب هزرا ئوسمانیان بێی هاریکاریا دەولەتا رووسیا و کۆمەلەیەکا سیاسییا کوردی مومکین نەدبوو[٧٢]. لەورا ژی ب توندی دژی ڤێ داخوازا شێخێ بارزان راوەستان و هێرشەکا مەزن ل دەستپێکا مەها نیسانا ١٩١٤ ێ کرنە سەر دەڤەرا بارزان[٧٣]. بۆ هندێ ئەڤ ئۆپەراسیۆنە زۆر ب گرنگ بهێتە وەرگرتن. تەلعەت پاشای وەزیرێ ناڤخۆ، داخواز ژ سلێمان نەزیف والی و قوماندانێ ویلایەتا مووسل کر. کو ئەو ب خۆ دویفچوونا ئۆپەراسیۆنێ بکەت و

ئەگەر پێویست کر، ئەو بخۆ بچیتە مەیدانێن شەڕی و د ماوێ چەند رۆژان دا ب دووماهی بینیت[٧٤].

لەشکرێ ئوسمانی ل ٤ی نیسانا ١٩١٤، ب هەموو لایانڤە هێرش کرە سەر دەڤەرا بارزان. هێزا حکومەتێ دگەل ٦٠٠ چەکدارێن هۆزێن کوردێن لایەنگرێن حکومەتێ، ژ لایێ ئاکرێ و ئامێدیێ و رواندز، هێرشا خۆ دەستپێکرن[٧٥]. لدویڤ ئیفادێن هەڤالێن شێخ عەبدولسەلام د زیندانێدا و ئەنجامێن دادگەهێ، و ئەو گونەهێن بۆ گرتییان هاتینە ئاراستەکرن: بەرەیێ جەنگی یێ روژئاڤا ئاغاییێن نێروەیان: تەتەر بەگێ کوڕێ عەلی بەگێ و محەمەد ئاغایێ کوڕێ حەجی نێروەیی و کەریم ئاغا و برایێ وی ئەحمەد ئاغا و وهاب ژێ بەرپرس بوون. بەرێ باکور قادو ئاغایێ کوڕێ عەبدولرەحمانێ سیری و خوشەڤیێ کوڕێ ئاڤدیشێ سێلکی و برایێ وی عیسا و عەلی کوڕێ محەمەد ئەمین ئاغایێ بابسێڤی و عەبدی ئاغایێ کوڕێ سەلیمێ بێکولی و دینو کوڕێ خوشەڤیێ پالانی و برایێ وی لەشکری بەرپرس بووینە. ل بەرێ رۆژئاڤا ئەحمەد ئاغایێ کوڕێ میرسولتانێ شێروانی و سوار ئاغا و فەیزی ئاغایێ کوڕێ حەسەن ئاغایێ [کانیبوتی][٧٦] شێروانی و خورشید بەگێ کوڕێ مستەفای، میر محەمەدێ کوڕێ زولفەقار و سەلیم ئاغا ژێ بەرپرس بوون. سەعید و عەلی کوڕێن فەق عەبدولرەحمانێ زێباری [یا دروست خەلکێ گوندێ دلانە نێزیك بارزان] ل گوندێ (بلێ) لسەر رووبارێ (زێ) و نەعمان ئاغایێ کوڕێ تاهر ئاغایێ [دودی] زێباری و شەریف مەلا حەسەن [بارزانی] و مستەفا عەلی زیاب [گوندێ هەسنی] "هێز"[٧٧] ل بیرا کەپرا و نزاری کۆمڤەکربوون. ڤان ئاغا هەموویان دەستێ خۆ دابوو ئێك و دژی حکومەتێ راوەستا بوون. ئاغاییێن رێکانیان ب فەرمان و شیرەتێن حکومەتێ رازی بوون و خۆ ژ هێزێن شێخێ بارزان دانە پاش. لێ تەتەر بەگێ و "هێزا" خۆ، ب توندی دژی لەشکرێ حکومەتێ راوەستان و هەتا بنەمالا (عائیلە) خۆ ژی دگەل خۆ بەرەڤ بارزان بربوو[٧٨].

شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی، نامەیەکا بلەز د وان رۆژاندا بۆ تەتەر بەگێ نێروەیی هنارت. و تێدا مەترسیێن سەر ژیانا وی و بنەمالا وی دیارکر. و ژێرا نڤیسی بوو: *"ئەگەر لایەکێ رەمێن خۆ تراشتبیت، لایێ دیتر چێ نەکەت و خۆ*

*بگەهینیتە هێزێن وی ل دەڤەرا بارزان*". د هەمان رۆژدا و بلەز و بەز، تەتەر بـەگێ هێزەکا کـێم کۆمڤـەکر و دگـەل ژن و زارویـێن خـۆ بـەرەڤ بـارزان کەفتـە رێ. ئـەو چەکدارێن کو دگەلدا چووی و ناڤێن وان ماینە دبیرا خەلکێ دەڤەرێدا ئەڤـە بـوون: مەجید بەگێ کورێ تەتەر بەگێ، پیرو عـەزیز بـەگێ سـینی، خـان ئاڤـدەلێ نەسـیر خانێ عەلی بەگێ سەرنی، حەیبـەکر سـەیدو سـینی، حێـرو جبـو بـادین بێرومـانی، خالد شەرەف مالا سامان سینی و رەجەب ئوسمان سارکی رێکـانی[٧٩]. هەروەسـا ئەڤ ناڤە ل تومارێن دادگەهێدا ژی هاتینە، لێ ژبلی ڤان د مەزبەتا دادگەهێدا، ناڤێ کـەرەم ئاغـا و ئەحمـەد ئاغـا و هـابی ژی وەکـو هـەڤالێن تەتـەر بـەگێ هاتینـە ئینان[٨٠].

تەتەر بەگ ل هەفتیا ئێکێ یا نیسانا ١٩١٤ ل پرا (وەربـەخ) لسـەر رووبـارێ (رۆشین) را، دەربازی ولات ژێری بۆ ناڤ دەڤەرا مزووری بالا ل رۆژ ئاڤا بارزان بوو. لێ دەما گەهشتیە سەرێ بازێ ل چیایێ شیرین، دەنگوباسێ شکەستنا بزاڤا شـێخ عەبدولسەلامی گەهشتێ و زانی کو شێخێ بارزان پەنا بریە بەر ئیرانێ[٨١]. ل دویڤ تێلگرافا تەحسین بەگێ (حەسەن تەحسین عوزێر)[٨٢] والیێ ویلایەتا وانـێ، ل ٢١ی نیسـانێ شـێخ عەبدولسـەلام ل بـاژێرێ شـنو بوویـە[٨٣]. و د تێلگرافـا کـو ل ٢٥ی نیسـانا ١٩١٤ ل ئـاکرێ ژلایـێ سـلێمان نـەزیف قومانـدان و والیـێ موسـل ڤـە، بـۆ وەزارەتا ناڤخۆ هاتیە رەوانە کرن. کونترولکرنا هەر سێ قەزایێن ئـاکرێ، روانـدز و ئامێدیێ هاتیە راگەهاندن[٨٤].

هێزا بچووکا تەتەر بـەگێ، ل (سـەرێ بـازێ) تووشـی هێزەکـا ئوسمانیـان و کوردێن پشتەڤانێن حکومەتی، ب سەرکردایەتیا (دینـو هـویکی) یـێ زێبـاری بـوو. پاش شەرەکێ سەخت و دژوار، چەند کەسەك ژ هێزا ئوسمانیان هاتنـە کوشـتن. و تەتەر بەگ بەرەڤ (ولات ژێری)، بۆ ناڤ مـزووری بـالا پاشـڤە زڤـری. ژلایـێ دەڤـەرا رێکـان هێزەکـا مـەزنا ئوسمانیـان، ب سەرکێشـیا ئەفسـەرەکێ بناڤـێ (یوزباشـی عەونی) و ب شارەزاییا سەنعان ئاغایێ کـورێ تەمـەر ئاغایـێ رێکـانی، کـو پێشـتر لایەنگرێ شێخ عەبدولسەلام بوو. رێیا پرا وەربەخ گرتبـوون. و تەتـەر بـەگ ناچـار بـوو، ب خێـزان ڤـە خـۆ ل چـیایێ پشـتا گونـدێ ئـەردێل، ل ولات ژێـری ئاسـێ بکەت[٨٥].

پاش چەند رۆژەکان، ژن و زاروکێن وان چ هەداری ب ئەگەرا تێنیبوون و برسێ نەما. مەجید بەگێ کورێ تەتەر بەگێ، ب نهێنی بزاڤ کر کو خۆ بگەهینیتە گوندێ (تێل) ل دەڤەرا ولات ژێری، دا کو هندەك ئاڤ و خوارنێ پەیدا بکەت. د گوندیدا هێشتا هێزێن حکومەتێ و چەکدارێن کوردان یێن پشتەڤانێن وان مابوون، مەجید بەگ هاتە نیاسین و هاتەگرتن. وی گوت کو بابێ وی ئەو هنارتیە "*دەخالەتێ*". دەما سەربازان د کەیفاندا دهول و زرنا لێداین. تەتەر بەگێ زانی کو مەجید بەگ هاتیە گرتن، و چ رێکێن رزگاربوونی بۆ نەماینە و سەربازان ب هەموو لاڤە ئەو دورپێچ کریە. تەتەر بەگ ناچار بوو ل هەفتیا دووێ یا نیسانا ١٩١٤ێ، خۆ ل نێزیکی گوندێ ئەردێل ل ولات ژێری دا دەست لەشکرێ ئوسمانی. پاش دەربازکرنا وان ل ئاڤا (ڕوشین)، زارۆك و بۆیك و ژنێن تەتەر بەگێ هاتنەجوداکرن و ئەو ب شەرکەرێن ویڤە، بۆ شارێ ئامێدیێ و پاشان بۆ شارێ موسل ڤەگوهاستن(٨٦).

تەتەر بەگ و شەرکەرێن دگەلدا، ب گونەها پشتەرێبوون و سەرهەلدانێ، و شەرێ دەولەت عالیا ئوسمانی ل دەڤەرا ئامێدیێ، بهاریکاریا ئاغایێن نێروەیا کەرەم ئاغایێ کورێ نجو(٨٧) و برایێ وی ئەحمەد ئاغای و هابی [ناڤێ بابێ ناهێتە خواندن](٨٨) ب ئەگەرا لێدانا هێزێن حکومەتێ ل بەرەیێ روژ ئاڤا، ئێخستنە د زیندانێدا. هەروەسا گونەهەکا دیتر کو ئاراستەی تەتەر بەگێ د دادگەهێدا هاتیەکرن ئەو بوو: تەتەر بەگێ کورێ عەلی بەگێ دگەل ئاغایێن نێروە و رێکان، مزووری، شێروانی، زێباری و ئاغایێن دیتر، ل کومبوونێن بارزان ل مالا شێخ عەبدولسەلام پشکدار بوویە و هەموو فەرمان و گوتارێن شێخ عەبدولسەلامی جێبەجێکرینە، هەتا چەك بۆ رووبەڕووبونا حکومەتێ هەلگرتیە(٨٩).

تا گرتن و ڤەگوهاستنا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی، چ دادگەهـ ب تەتەر بەگێ نەهاتنە کرن بەلکو بتنێ ڤەکۆلین دگەلدا هاتیە کرن. ل موسل هەڤالبەندێن وی یێن بەرێ هاریکاریەکا باش بۆ کرن. ژ وان ژی تاهر پاشایێ والیێ بەرێ یێ موسل چەند جاران سەرەدانا تەتەر بەگێ د زیندانێدا کر. و هندەك دراڤێن زێرێن مەجیدی ژی بۆ مەزاختنێن وان دانێ. و سۆزدا کو هەموو شیانا خۆ بکار بینیت بۆ رزگارکرنا وی و هەڤالێن دگەلدا. لێ جارا دووماهیێ دەما سەردانا تەتەر بەگێ

كری، هەیڤا ئابا ١٩١٤ بوو. تاهر پاشای گوت كو نەفیر عامە (سەفەر بەیلیكە) و ئەو دێ بۆ "جیهادێ" چیتە دەڤەرا (خۆی) ل ئیرانێ. ئەگەر ب ساخی زڤری، ئەگەر وەریسێ سیدارێ ل حەفكا ویدا بیت دێ وی رزگار كەت. و ئەگەر نە زڤری ژی، بلا گەردەنا وی ئازا بكەت. پاش چوونا تاهر پاشای بۆ (خۆی) ئێدی چ دەنگوباس ژ وی نەگەهشتن و نە زڤری موسل[٩٠].

د وی دەمیدا سلێمان نەزیف بەردەوام پێزانین لسەر شێخ عەبدولسەلام و هەڤالێن وی كوم دكرن. و بزاڤ دكر ئەوێن نەهاتینە گرتن، بهێنە گرتن. و برێكا حكومەتا ئیرانێ و ب هەماهەنگی دگەل تەحسین بەگێ والیێ وانێ، بزاڤا ڕادەستكرنا شێخ عەبدولسەلامی دكر[٩١]. لدویڤ تێلگرافەكا وەزارەتا ناڤخۆیا دەولەتا ئوسمانی ل ٢ گولانا ١٩١٤ بۆ والیێ وانێ و مویسل، دیار دبیت كو حكومەتا ئوسمانی ب رێكا ( میرزا عەبدولحسێنێ فەرمانفەرما) والیێ ئازەربایجانێ و سەفارەتا ئوسمانی ل تەهران، هەموو بزاڤەك كرینە دا شێخێ بارزان ڕادەستی دەولەتا ئوسمانی بكەن[٩٢]. دویڤ پێزانینێن وەزارەتا ناڤخۆیا حكومەتا ئوسمانی ل ١٩ ی گولانا ١٩١٤ ، شێخ عەبدولسەلام ل گوندێ راژان ل دەڤەرا مەرگەڤەر ل روژئاڤا باژێرێ ئورمیێ، جەم سەید تاهایێ كورێ شێخ محەمەد سدیقێ نێرییێ بوویە. و هندەك جاران ژی خۆ ل گوندێ هولستانە[٩٣]، ل مەرگەڤەر ڤەشارتیە، كو دەرامەدێ وی گوندی ژی ب ئەمرێ سەید تاهای، ژلایێ میرزا حسێن ڤە بۆ شێخێ بارزان هاتیە كومكرن. لێ برەنگەكێ گشتی كاودانێ "دێوانێن" بارزانی، ل وی دەمی ل وێ دەڤەرێ زورێ پەریشان بوویە[٩٤]. هەروەسا سلێمان نەزیف، لسەر گرتن و دویفچوونا پشتەڤانێن شێخ عەبدولسەلام بەردەوام بوو. و لدویڤ ئەو تێلگرافا كو ل ١٨ی تەموزا ١٩١٤ بۆ وەزارەتا ناڤخۆیا ئوسمانی هنارتی، ئاماژێ ب گرتنا شێخ محەمەد نورێ بریفكی ل دهوكێ ددەت[٩٥]. و هەروەسا ئاماژێ ب كومەكا پێرابوونێن دیتر، بۆ نەهێلانا شوێنەوار و شوێنكەفتیێن بزاڤا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی دكەت[٩٦].

**دادگەهكرنا شێخ عەبدولسەلام و تەتەر بەگێ و هەڤالێن وان:**

دەما شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی ژ باژێرێ تفلیس پایتەختێ گورجستانێ یا ژێر دەسەلاتا رووسیا دزڤری، ل گوندێ گەنگەچینێ ل دووماهیا ئابا

١٩١٤ێ[٩٧]،ژلایـێ سـۆفی عەبـدوللایێ کـوڕێ جانگویـێ گەنگەچـینی یـێ کـارداریێ شکاکڤە هاتە گرتن. و هاتە ڕادەستکرن ب دەسـتێ جـەودەت بـەگێ موتەسـەرفێ هەکاری ل سنووریێ (باژارگەهێ) و پاشـی هاتـە هنـارتن بـۆ شـاریێ وانـێ. ل وانـێ ژلایێ تەحسین بەگێ والیێ وانـێ ڤـە ڤـەکولینێن سـەرەتایی دگـەل شـێخێ بـارزان هاتنـەکرن[٩٨]. پاشـان شـێخ عەبدولسـەلام بـۆ مویسـل لسـەر داخـواز و پێـداگریا ویلایەتا مویسل هاتـە هنـارتن دا کـو بهێتـە سـێداردان[٩٩]. تەحسـین بـەگێ والیـێ د تێلگرافەکێ دا بۆ وەزارەتـا ناڤخۆیـا ئوسمـانی ل ٢٧ ی ئـەیلوولا ١٩١٤ چـاوانیا گـرتن و ڤەگوهاسـتنا شـێخێ بـارزان بـۆ شـاریێ موسـل بـەحس دکـەت[١٠٠]. پـاش ڤەگوهاستنا شێخێ بۆ مویسل، دیوانا جـەنگیا یـا عـورفی دژی وی و هـەڤالێن وی هاتە پێکئینان ب سەرۆکاتیا بیکباشیەکێ [ناڤێ وی د مەزبەتێدا ناهێتە خوانـدن] و یوزباشـی عـەونی و یوزباشـی ئیـبراهیم و یوزباشـی [ناڤـێ وی ناهێتـە خوانـدن] میلازم دووەمەکێ [ ناڤێ وی د مەزبەتێدا ناهێتە خواندن][١٠١].

دیوانا جەنگیا عورفی ئەڤ گونەهە ئاراسـتەی شـێخ عەبدولسـەلام و هـەڤالێن وی کرن:"***پیلانگێری و پشتەرێیبوون (تمرد) دژی دەولەتا ئوسمانی، هەبوونا مزرێن فاسد و نەدروست، دامەزراندنا لەشکرەکێ چەکدار بناڤـێ "دێوانـا"، ڕاپـەرینا چەکداری دژی حکومەتـێ و کوشتنا سەربازان ، چ حساب بۆ حکومەتێ نـەکرن و گوهـ نەدانا شیرەتێن حکومەتـێ، بەرفرەهکرنا دەسەلاتا خۆ، تالانکرن و سـووتنا وان گوندێن کـو ملکەچـی بزاڤـا وان نـەدبوون، ناچـارکرنا خـەلکـەکێ ل قـەزایێن ئامێدیێ، دهۆك، ئاکرێ و رواندز ب زوری یان ب رەزامەندیا خۆ کو دگەل بزاڤا وان بکەڤن، پەیوەندیکرن و نامە نڤیسین بۆ کونسۆلێن بیانی و هندەك خائینان کو ئەو ژی تاوانەکا مەزنە و خیانەتکرن ب نیشتیمانی دهێتە هەژمارتن. بەرسڤ نەدان ب نامە و بریارێن حکومەتی کو بۆ دهاتنە هنارتن ب ناوەندگێریا هندەك خێرخوازان. و شەرێ چەکداری و بەرسینگگرتنا وێ هێزا کـو بـۆ سـزادان و گرتنـا وان هاتیـە هنـارتن***"[١٠٢]. ئـەڤ تاوانـە ژلایـێ ئـەنوەر پاشـای وەزیـرێ جـەنگی یـێ دەولـەتا ئوسمانی و سەدر ئەعزەمێ دەولەتا ئوسمانی محەمەد سەعید هاتیـە پەسـەندکرن و دویڤدا ژلایێ سولتان محەمەد رەشاد، محەمەدێ پێنجێ (١٩٠٩ ــ ١٩١٨) ڤـە ژی هاتیە پەسەند و ئیمزاکرن[١٠٣].

دیوانا جەنگیا عورفی ل (٢٧ ذي الحجة ١٣٣٢، ٢ی تشرینا دووێ ١٣٣٠ێ رومی، ١٥ ی نوڤامبر ١٩١٤) ئەڤ بریارە دژی شێخ عەبدولسەلام و هەڤالێن وی دەرئێخستن: بۆ شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی و ***"ئاغایێن کاریگەر و پلە ئێك"*** سەعیدێ کورێ فەق عەبدولرەحمان ، تەتەر بەگێ کورێ عەلی بەگێ نێروەیی، محەمەد ئەمین ئاغایێ کورێ عەزیزێ بابسێڤی، خوشەڤی کورێ ئاڤدیش کچین عومەر سێلکی مزووری بالا، عەبدی ئاغایێ بێکولی، محەمەد ئاغایێ کورێ حەجی نێروەیی، عەلی کورێ محەمەد ئەمین ئاغایێ بابسێڤی و حەجی دوری یێ شێروانی، کو ڤان کەسان رولەکێ سەرەکی هەبووینە د بزاڤێدا. ل دویڤ دیدەڤانیا ٢ جەندرما و ٢٧ کەسێن هوزێن دەڤەرێ، ل دویڤ فەقەرا دووێ مادێ (٥٥) و مادێ (٥٧) ل یاسایا هومایونی یا جەزایا مولکیە بریار لسەر وان کەسا هاتە دان کو ل مالا شێخ عەبدولسەلام کومبیوون و سویند خواربوون، کو دژی حکومەتی راپەرن. و ب کریار ژی راپەرین[١٠٤]. وەکو ل ئیفادێن گرتیان و دیدەڤانان و بریارا دادگەهێ خۆیا دبیت. کو ئەڤ کەسە پێشتر ل مالا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی کومبووینە و سویند خوارینە، کو ب هەموو رەنگا بەرهەنگاری هێرش و هەرەشێن حکومەتێ و لایەنگیرێن وان بین.

*بریارا سێدارەدانێ[١٠٥]، یا رووبەروو (حزوری ــ وجاهەن) ب تەرتیبا ناڤان و گرنگیا رولێ وان بۆ: شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی، تەتەر بەگێ کورێ عەلی بەگێ نێروەیی، محەمەد ئەمین ئاغایێ کورێ عەزیزێ بابسێڤی، عەبدی ئاغایێ بێکولی، محەمەد ئاغایێ کورێ حاجی نێروەیی، عەلی کورێ محەمەد ئەمین ئاغایێ بابسێڤی، و هەروەسا بریارا سێدارەدانێ ب غیابی بۆ سەعید کورێ فەق عەبدولرەحمان، خوشەڤی کورێ ئاڤدیشێ کورێ کچین سێلکی و حاجی دوری کورێ ئیسماعیلێ شێروانی دەرچوو[١٠٦].*

بۆ ئاغا و سەرکردێن پلە دوو، کو کاریگەریا وان کێمتر بوو ژ ئاغا و سەرکردێن ئێکەم، وەکو خالد ئاغایێ کورێ میرو، تەلحە ئیسلام قادر، محەمەدێ کورێ مەلا، محەمەد کورێ زبیر حزوری (وجاهەن) و بۆ قادو ئاغایێ عەبدولرەحمانێ سیری، مستەفا عەلی زیاب [گوندێ هەسنی] و یێن شێروانیان ئەحمەد ئاغایێ کورێ میر سولتان، سوار ئاغای و شەریف کورێ مەلا حەسەن

[بـارزانی](١٠٧) و حەیـدو کـورێ عیـدو ، قورتـاس کـورێ مـەلا موسـا [ گونـدێ کەکلـەیی]، سـەعید کـورێ ئـولی بـەگێ، فـەرزی ئاغایـێ کـورێ حەسـەن ئاغـای، خورشید بەگێ کورێ حاجی مستەفای و عیسا کـورێ عیـدو ب غیـابی ب سـزادانا موئەبەد دگەل (الأشغال الشاقة) هاتە ڤەبڕین.

هەروەسـا بـۆ ئـەو کەسـێن کـو ب هانـدانا ئاغـاییێن "پلـە ئێـك"، چـەك دژی حکومەتێ هەلگرتین، هەر ئێکێ لدویڤ دەورێ وی د وێ بزاڤێدا ، ئـەڤ بریـارە بـۆ هاتنە دەرکرن:

١٥ سال زینـدان بـۆ: عەبـدوللا عەبـدولخالق ئـاکرەیی، عەبـدولهادی و صـالح کورێن گدو، نوری کورێ فەق محەمـەدێ بـارزانی [شـێخێ سورچـیانە و کـور خـالێ شێخ ئەحمـەدێ بارزانیـە]، عـەزیز مسـتەفا [گونـدێ پێنـدرو]، شـێرو کـورێ عمـر موختارێ گوندێ تێل، رەشید ئیسلام ، محەمەد سەلیم کـورێ مـەلا یـونس و تاهـا کورێ حـاجی، ب حـزوری (وجاهـەن) و مـەحمودێ مـەلای و صـالح، خزمـەتکارێن شێخی مـح(١٠٨) و [ناڤـێ بابـێ ناهێتـە خوانـدن رەنگـە مـالخۆ] و ئەسـعەد خـەلکێ گوندێ داویدکا و شێخێ بابسێڤی ب غیابی هاتە دان.

١٠ سال زیندان بۆ: مەجید بـەگێ(١٠٩) کـورێ تەتـەر بـەگێ نێروەیـی و خالـد کـورێ شـەرەف(١١٠) یـێ سـینی نێروەیـی حـزوری (وجاهـەن) و ئەحمـەد عەبدولرەحمانێ بێکـولی و سـەلمان کـورێ قـادو، حسـن و حسـێن خـەلکێ گونـدێ سەفتێ، حەسەن شنگێلی ب غیابی دەرچوو.

٥ سال زیندان بۆ: حەیبەکر کورێ سەیدێ سینی نێروەیی، حێرو کورێ جبو کورێ بادین بێرومانی نێروەیی، پیرو کورێ عـەزیز بـەگێ سـەعدوللا بـەگێ سـینی نێروەیی، عەلی کورێ شـەرەف، شـا [تامیـا نـاڤی د مەزبەتێـدا ناهێتـە خوانـدن] کورێ عەلی، محەمەد نەبی، سالح حەبیب، میرزو عومەر، عەبدوللا حسـێن و شـێرو کورێ عەلی ب حزوری (وجاهەن) و شەکر خەلکێ گوندێ قورانکێ و زەلامـێن دیـتر یێن تەتەر بەگێ : ئەحیا ، کەریم و ئەحمەد کورێ عەبدوللا ب غیابی دەرچوو.

٣ سـال زینـدان دگـەل (الأشـغال الشـاقة) بـۆ عـەزو مـیرو، تاهـا کـورێ محەمەدئەمین ئاغـای و ئەحمـەد کـورێ محەمەدئـەمین ئاکـل و شـێخ هنـور [نـور] کورێ ناڤێ بابێ[ناهێتە خواندن، رەنگە شینك](١١١) ب حزوری هاتە دان.

هەروەسا دادگەهێ بریارا ئازادکرنا هەرئێك ژ: سەنعان ئاغایێ کورێ تەمەر ئاغایێ رێکانی و هابی ئاغایێ کورێ میکائیلێ رێکانی و نەعمان ئاغایێ زێباری و سەلیم خانێ کورێ سلێمان دا ؛ چونکی ڤان کەسان خۆ ژ پشتگیریا شێخ عەبدولسەلام دابوونە پاش و هاریکاریا هێزێن حکومەتێ کربوون بۆ ژناڤبرنا بزاڤا بارزان. و داوا یا گشتی لسەر ئوسمان ئاغای و (مضروی) کورێ ئیبراهیم خان و خازی کورێ ئیسماعیل ب ئەگەرا مرنا وان د زیندانێدا هاتە ڕاکرن[١١٢].

جێبەجێکرنا ڤان بریاران کو ب کودەنگیا ئەندامێن دادگەهێ هاتبوو دان، وەزیرێ جەنگی یێ دەولەتا ئوسمانی هاتبوو راسپاردن کو "ئیرادا سونیە" ب زووترین دەم جێبەجێ بکەت و وەکیلێ سەرکردایەتیا گشتی و وەزیرێ جەنگی ئەنوەر پاشای و سەدر ئەعزەمێ ئوسمانی محەمەد سەعید و سولتان محەمەد رەشاد ئیمزا لسەر کربوون[١١٣].

بابەتێ سەرنجڕاکێش ئەوە سەرەرای هندێ کو، د دەقێ ٨ لاپەرێن مەزبەتێ و بریار و سورەتا ڤەکولینێ یا دیوانا جەنگیا عورفی ل موسل، ل (٢٧ی ذي الحجة ١٣٣٢، ٢ تشرين ثاني ١٣٣٠، ١٥ نوڤامبرا ١٩١٤) و بریارا (نەزارەتا حەربی) و پەسەندکرنا وێ ژلایێ سەدرئەعزەم و سولتان محەمەد رەشاد ڤە ل (٧ موحەرەما ١٣٣٣ ، ١٣ ی تشرين ثانی ١٣٣٠ ، ٢٦ی نوڤامبرا ١٩١٤) هەمی جهان ئاماژێ ب دەورێ بەرچاڤ و کاریگەرێ تەتەر بەگێ هاتیەکرن و ژ سەرۆك و مەزنێن "متنفذ" و خۆدان هێز، پاش شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی هاتیە هەژمارتن و مەجید بەگێ کورێ وی و چەکدارێن دگەل ویدا ب تاوانا پشکداریکرن د بزاڤا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی ب فەرمانا تەتەر بەگێ، دادگەهێ سزا بۆ وان ڤەبرینە، لێ د بریارا سولتانیدا دا ئەوا ل (٧ موحەرەما ١٣٣٣ ، ١٣ی تشرين ثانی ١٣٣٠ ، ٢٦ نوڤامبرا ١٩١٤) دەرچوویە ، چ سزایەك بۆ تەتەر بەگێ و محەمەد ئەمین ئاغایێ باب سێڤی نەهاتیە ڤەبڕین.

ئەوا دناڤ بنەمالا تەتەر بەگێدا بەربەلاڤ ، بەری دەرکەفتنا ڤان بەلگەنامان ئەڤە بوویە، کو تاهر پاشایێ والیێ بەرێ، سەرەدانا تەتەر بەگێ د زیندانێدا دکر و دووماهی جار بەری بەرەڤ دەڤەرا (خۆی) بۆ شەری بچیت هاریکاریا وی و هەڤالێن وی کریە و هەتا جهێ مانا وی ڤەگوهاستیە بۆ جهەکێ باشتر و ب رێکا

هەڤالبەندێن کەڤن ، ئانکو کەسێن سەر ب بەرەی حوریەت و ئیئتلافێن رکابەر دگەل جڤاتا ئیتحاد و تەرەقی، هەولێن سڤککرن و رزگارکرنا وی داینە. لێ هەروەك ل نڤیسینا نەزارەتا حەرب رێڤەبەریا کاروبارێ دادگەهان (امور محاکم مدریتی) د نووسراوەکا فەرمیدا بۆ "در سعادت" ل ٣١ کانوونا ئێکێ ١٣٣٠ (١٣ ی ینایرا ١٩١٥) ئاماژێ ب بریارا دیوانا جەنگیا یا عورفی ل ٧ی تشرینا دووێ ١٣٣٠ (٢٠ی نوڤامبرا ١٩١٤) و ئیرادا سنی ل ٩ ی تشرینا دووێ ١٣٣٠ (٢٢ نوڤامبرا ١٩١٤) ددەت کو بۆ تەتەر بەگێ کورێ عەلی بەگێ و محەمەدئەمین کورێ عەزیز ژی، بریارا سێدارەدانێ دەرچوویە. لێ ل تێلگرافخانێ ب شاشیڤە ئەڤ دوو ناڤە نەهاتینە هنارتن! یان ژێ کەفتینە و ل تێلگرافخانا مویسل نەهاتینە وەرگرتن[114]. ئەڤ نەهنارتنا ناڤان یان نەوەرگرتنا وان ناڤان ل تێلگرافخانا مویسل، جهێ گومانێ یە و ڤێ گومانێ دروست دکەت ، کو مومکینە هندەك کەسان بزاڤا رزگارکرن یان نەسێدارەدانا تەتەر بەگێ و محەمەد ئەمین ئاغای کربیت.

وەزارەتا جەنگ یا دەولەتا ئوسمانی ل ٤ کانوونا دووێ ١٣٣٠ (١٧ ی ینایرا ١٩١٥) داخوازا پەسەندکرنا بریارا سێدارەدانا تەتەر بەگێ و محەمەد ئەمین ئاغای کریە ب گونەها: ***"راپەرین دژی حکومەتێ ، دامەزراندنا هێزا چەکدار، بکارئینانا چەکی دژی حکومەتێ و (شەهیدکرنا) ئەفسەر و سەربازان. و زولم و ستەمکرن ل رەعیەت و بندەستێن خۆ، و پشکداریکرن د هەموو ئەو گونەهێن کو شێخ عەبدولسەلام و هەڤالێن خۆ تووشبووین، و ل نڤیسینا ١٣ی تشرینا دووێ یا ١٣٣٠ [26ی نوڤامبر ١٩١٤]، هەموو ئەو تاوان ب روویەروو (وجاهەتەن) هاتینە ئاراستەکرن، ل دیوانا جەنگی یا عورفی ل مویسل"*** [115].

لسەر داخوازا وەزارەتا جەنگ، ل ٦ی کانوونا دووێ ١٣٣٠ (١٩ی ینایرا ١٩١٥) "ئیرادا سنیە" بۆ سێدارەدانا تەتەر بەگێ و محەمەد ئەمین ئاغای دەرچوویە، ب پشت بەستن ب ئەو گونەهێن کو دیوانا جەنگی یا عورفی ئاراستەی وان کری ل ١٣ی تشرینا دووێ ١٣٣٠ (٢٦ نوڤامبرا ١٩١٤). و داخوازا جێبەجێکرنا فەرمانێ ژ کاربدەستەکێ وەزارەتێ (ناظری ماموری) یێ وەزارەتا جەنگ کریە و وەزیر جەنگی و سەدرئەعزەم محەمەد سەعید و سولتان محەمەد رەشاد ئیمزا لسەر بریارێ کریە[116].

سەرەرای هندێ کو دهاتە گوتن کو رۆژا سێیێ پشتی سێدارەدانا شێخ عەبدولسەلام ل ١ی کانوونا ئێکێ ١٩١٤ تەتەر بەگ ژی ل ٤ کانوونا دووێ ١٩١٤ هاتیە سێدارەدان[١١٧]، لێ هەروەك ژ بەلگەنامێن فەرمیێن دەولەتا ئوسمانی دیار دبیت، تەتەر بەگ تا کانوونا دووێ سالا ١٩١٥ یێ ساخ بوویە و ل دووماهیا هەیڤا کانوونا دووێ سالا ١٩١٥ دگەل محەمەد ئەمین ئاغایێ باسێڤی هاتیە سێدارەدان. ل دویڤ پێزانینێن ئەو کەسێن تەتەر بەگ دیتی دەمێ سێدارەدانێ ژیێ وی نێزیکی ٦٥ سالان بوویە، مروڤەکێ بەژن بلند و یێ بخۆڤە بوویە. جەنازێ وی ژ لایێ جەمیلا خانما خێزانا جەمیل ئەفەندی کو کچا ئوسمان بەگێ و دوتماما تەتەر بەگێ بوویە، هاتیە وەرگرتن و ل گورستانەکا ناڤ بازێرێ موسل هاتیە ڤەشارتن.

**ئەنجام:**

١- ئەڤ ڤەکولینە ناڤێ دروست و جورێ سزادانا هەموو وان کەسان دیار دکەت کو د بزاڤا شێخ عەبدولسەلام دا پشکدار بووینە و تا نها ژلایێ نڤیسەران ڤە ناکوکی لسەر هەبوویە.

٢- دڤێ ڤەکولینێدا زور مێژوو و هەلکەفت و چاوانیا روودانا وان، کو تا نها د مێژوویا کوردستانێدا ب شاشی دهاتنە بەحسکرن هاتینە راستڤەکرن.

٣- تەتەر بەگ مروڤەکێ شورشگێر و گیانباز بوویە و گیانێ خۆ و کەسوکارێن خۆ د رێیا رزگاریا کوردستانێدا بەخت کریە، کو تا نها د مێژوویا کوردستانێدا وەکو پێدڤی نەهاتیە بەحسکرن.

٤- د ڤێ بزاڤێدا زەرەر و زیانەکا زورا مادی و گیانی ب کوردان کەفتیە هەروەك د نامێن شێخێ بارزان و نازم پاشایێ والیێ بەغدا دا هاتینە.

٥- ڤێ بزاڤێ ئارمانجێن نەتەوەیی و نیشتیمانی هەبووینە و ب بەلگەڤە ئەڤ داخوازە ژ دەولەتا ئوسمانی کرینە.

٦- ڤێ بزاڤێ دەڤەرەکا زورا بەرفرەها دەڤەرا بەهدینان بخۆڤە گرتیە و دویڤدا کاریگەری هەبوویە لسەر نەخشەرێیا بزاڤا رزگاریخوازا کوردی ل باشوورێ کوردستانێ.

## ژێدەر و دەهمەن:

(١) بـۆ زانینـا زورتـر بنێـرە: محفـوظ العباسـي: امـارة بهـدينان العباسـية، مطبعـة الجمهوريـة ، (الموصل ، ١٣٦٩) ؛ بابەتێن کەڤن یێن ڤێ ڤەکولینێ، ڤەکولەری مفا ژ پێـزانینێن بنـەمالا خۆ وەرگرتینە کو ب دەربازبوونا سالان لسەر ئێك هاتینـە تەخـەکرن و هنـدەك ژێ وەکـو یادداشت ژلایێ بنەمالا ڤەکولەری دپاراستینە وەکـو شـەجەرا زێـوکێ و شـەجەراتێن بگـێن مویسل و ئاغایێن تەلەعفەر.

(٢) بۆ زانینا پتر بنێرە: محفوظ العباسـي: العباسـيون بعـد أحـتلال بغـداد ١٢٥٨ ــ ١٩٨٩، دار الشؤون الثقافية ، (بغداد ، ١٩٩٠) ؛ و لدویڤ ئەو شـەجەرەنامێن ئاغـایێن ئـالای بـەگیان ل تەلەعفەر و بنەمالا ئەبو ریشەی سالا ٢٠٠٤ تەسـلیمی ڤەکولـەری کـری و کـوپییێن وان بـەر دەستێ ڤەکولەری دپاراستینە.

(٣) دەستنڤیسا : تومر يازجي : منظومة تاريخ امارات هكاري، ص ٦١٢– ٦٢٤ ، لاپەرێن لسەر هێرشا میر عیمادەدین بۆ سەر کەلا نێروە، کوپیەکا ڤان شێعران ژلایێ دکتور نزار گولی ڤـە گەهشتیە ڤەکولەری و دپاراستینە و بۆ پێزانینێن پتر لسەر ڤێ هێرشێ بنێـرە: نـزار ايـوب گولی: امارة هكاري في العهد العثماني دراسة تاريخية وثائقية، دار سپیرێز ، (دهوك ، ٢٠١٧).

(٤) العباسي: المصدر السابق، ص ٧٣.

(٥) بەلگەنامەیـەکا ناڤەراسـتا سـەدێ هـەژدێ لبەردەسـتێ ڤەکولەرییـە کـو ڤـان پێزانینـا بخوڤەدگریت.

(٦) تا نها ژی داوەت ب ڤی شەری دهێتە گوتن و داوەتا (های داوا عەمەرێ من) ب ئێکێ ژ وان شانێن نیروەیی دهێتە گوتن کو ل وێ دەڤەرێ دەهئێك کومڤـەدکر. بـۆ دەقـێ وێ بنێـرە: فەزلەدین نێروەیی: شەهیان سترانێن شـەهیان و گوڤەنـدان ل دەڤـەرا هـەکاری، سـپیرێز ، (دهوك ، ٢٠١١) ، ل ٢٥٦.

(٧) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تۆفیق بـەگێ نێروەیـی ژ بنـەمالا تەتـەر بـەگێ عـەلی بـەگێ نێروەیـی، سـالا ١٩٤١ هاتیـە دونیـایێ و ژ سـالا ١٩٦١ تـا نهـو پێشـمەرگەیە، دچـاڤ پێکەفتنەکێـدا ل ٢٠٠٢/١/١٨ و ٢٠١٥/٨/١٥ و ٢٠١٧/١١/٢٨ ل دهـوکێ. تـاپوییێن دەولـەتا ئوسمانی لسەر هندەك گوندان ل ئەبوماریا ل تەلەعفەر تا دگەهیتە مرێبـا، تـا سـالا ١٩٦٣ لبەردەستێ مالا ڤەکولەری بوون، ژ ئەنجامێ بومبەبارانکرنا زور توندا وێ سالێ و چـولکرنا گوندان ئەو تاپو هاتینە بەرزەکرن.

(٨) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان ل دەڤەرا نێروە ژ دامەزراندنێ تا سـێدارەدانا تەتەر بەگێ کورێ عەلی بەگێ سەدێ ١٣ ــ ١٩١٥، پەرتووکەکا نەبەلاڤکریە، ل ٣٠.

(٩) مەلا خالد بەگێ سەرنی هوزانڤانەکێ دیاری دووماهیا حوکمرانیا میرێن بەهدینانە. گومان دهێتەکرن کو خالد بەگێ کەهیایێ زوبەیر پاشای هەمان مەلا خالد بەگێ سەرنی بیت؛ چونکی تا وی دەمی هێشتا پرانیا میرێن نێروە ل گوندێ سەرنی د ژیان.

(١٠) ل دویڤ پێزانینێن تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ، خالد بەگ مامێ تەتەر بەگێ ئێکێ، کەهیایێ میرێ بەهدینان بوویە بەری هێرشا میرێ سۆران. ل دویڤ نڤیسینا مستر ریچ کەهیایێ زوبەیر پاشای، میرێ نێروە بوویە، لێ ناڤی وی نائنیت، ئەڤ نێزیکبوونا دەمی وێ نیشان ددەت کو خالد بەگ، کەهیایێ زوبەیر پاشای بوویە. چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ ٢٠١٥/٨/١٥ دهوک ؛ کلودیوس جیمس ریچ: گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، وەرگێڕان محەمەد حەمە باقی، (تەورێز ، ١٩٩٢).

(١١) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان... ل ٣١.

(١٢) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٢٠١٥/٨/١٥ دهوک ؛ کاوە فریق احمد شاوەلی ئامێدی: امارة بادینان ١٧٠٠ — ١٨٤٢ دراسة سیاسیة اجتماعیة ثقافیة، مؤسسة موکریانی للطباعة و النشر، (اربیل ، ٢٠٠٠) ، ص ١٤٩.

(١٣) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٢٠١٥/٨/١٥ دهوک ؛ ب مێرانیا بابێزدین تا نها ژی د ناڤ دەڤەرێ و نێروەیاندا ستران و داوەت پێ دهێنە گوتن، بۆ دەقێ وێ داوەتێ بنێرە: فەزلەدین نێروەیی: ژێدەرێ بەرێ ، ل ٢٥٣ — ٢٥٤.

(14) BOA. D.no 448. G.no. 22317-D, ١٢٥٠ ذي القعدة ١٨٣٥، ئادارا

(١٥) ڤەکولەری دوو جارا ل صالح ئاغایێ نێروەیی (ل ئوردوگایێ رەبەت ١٩٧٥ ، و ئوردوگایێ جەهروم ١٩٧٥ — ١٩٧٦) گوهـ لێ بوویە کو: "عەلی بەگێ (٧) زمان دزانین ، و من بخۆ نڤیسنێن عەلی بەگێ ب زمانێن فارسی و تورکی و عەرەبی ل جەم مەلا پیرموسێ نێروەیی دیتینە؛ چونکی ناڤبری ل خواندنگەهێن ستەنبولێ خویندبوو. تەتەر بەگێ کوڕێ وی نڤیسینێن ستەنبولێ ل مووسل د گەهاندنە شێخێ بارزان و بەردەوام دناڤبەرا واندا ب نڤیسین دانوستاندن هەبوو. صالح ئاغا عەبدوڵلا رەجەب نیروەیی (١٩٠٣ ــ ١٩٧٦)، مرۆڤەکێ ژیر و هوشیار بوو، دڤەگێرانا بیرهاتنادا یێ هویربین بوو و بابێ مستەفا نێروەییە.

(١٦) عەلی تەتەر نێروەیی: سەرهەلدان و گەشەکرنا ژیانا حزبایەتی و کومەلە و رێکخراوێن سیاسی ل کوردستانێ و دەورێ شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی تێدا ، لە: کونگرەی یادەوەری سەد سالەی بارزانی نەمر ، بەشی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، (هەولێر ، ٢٠٠٣) ، ل ٢٤ ؛ مستەفا نێروەیی: بۆ ئازادیا ولاتی بیرهاتنێن مستەفا نێروەیی، ئامادەکرن یوسف سەبری و دلوڤان مستەفا ، پشکا ئێکێ ، چاپخانا خانی، (دهوک ، ٢٠١٢) ، ل ٣١.

(١٧) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهوک

(١٨) ناڤەروکا ناما ئیسماعیل پاشای د بەرسڤا ناما رەسول پاشای بۆ ئیسماعیل پاشاییدا دیار دبیت. بۆ دەقێ بەرسڤا نامێ کو د ڤێ پەرتووکێدا ب شاشیڤە بناما ئیسماعیل پاشای تێگەهشتینە بنێرە: سینان هاکان: کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧ — ١٨٦٧ لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا ، و. بەکر شوانی، پێشەکی و پێداچوونەوە جەبار قادر، بلاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر ، ٢٠١٢) ، ل ٣٨٠.

(١٩) دەقێ ناما کو ل ١٣ی شەوالا ١٢٥٨ (١٦ تشرینا دووێ ١٨٤٢) بۆ ئەولیا بەگێ چەلی هنارتیە ل جەم ڤەکولەری یا پاراستیە.

(٢٠) بۆ زانینا زۆرتر ل دور ناڤەرۆکا ڤان ناما و ئارمانجێن ئیسماعیل پاشای بنێرە: هاکان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤ ــ ١٦٠.

(٢١) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهوک.

(٢٢) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان... ل ٣٦.

(٢٣) دەقێ لاپەرێ گرێدای ب بابەتیڤە یێ ڤێ سالنامێ هاتیە د پەرتووکا نەبلاڤکرییا: هێرش کەمال رێکانی: عەشیرەتێن بەهدینان ١٥١٤ ــ ١٩١٩ ز، دانە نیاسینا جوگرافی و کورتیەک ژ دیروکا وان ڤەکولینەکا دیروکی بەلگەنامەیی یە، ل ٢٢٩.

(٢٤) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهوک.

(٢٥) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان، ... ل ٣٩ ؛ ڤەکولەرێ ڤێ ڤەکولینێ ب خۆ ئەو ئاسەوار ب چاڤ دیتینە.

(٢٦) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهوک.

(٢٧) هەمان سەرچاوە ؛ ئەڤ پێزانینە دناڤ پرانیا دانعەمرێن دەڤەرێ د بەربەلاڤن و هەتا تاهرێ خەمرەڤین کو ئێکێ ژ پشکداران بوویە ڤەکولەری دیتبوو، هەروەسا ئەڤ بابەتە ڤەکولەری ژ ئیسماعیل گەیلانی نەڤیێ سەید تاهایێ نەهریێ چەندین جاران گوه لێ بوویە.

(٢٨) میرێن بەردەسور ب میرێن بەگزادێن تەرگەڤەر ل رۆژهەلاتا ئورمیێ دناڤدارن و هەموو دەما رولەکێ سیاسی و لەشکریێ بەرچاڤ ل رۆژئاڤا ئورمیێ و سەر سنوورێن ئوسمانی و تورکیا دیتیە، بەردەسور گوندەکە دکەڤیتە سەر سنوورێ ئیران تورکیا برەخ سیلڤانا ل دەڤەرا تەرگەڤەر و دکتور عیماد عەبدولسەلام ب شاشیڤە بۆ دەڤەرا بەردەرەش هەژمارتیە. عماد عبدالسلام رؤوف: الشجرة الزیوکیة وثیقة نسب أمراء بهدینان و تاریخهم ، مکتب التفسیر للنشر و الأعلان ، (اربیل ، ٢٠٠٩) ، ص ٦٠. بۆ زانین گوندەک بناڤێ بەردە سۆر ل دەڤەرا بەردەرەش هەیە.

(٢٩) چاڤپێكەفتن دگەل عیماد شێخ سالح سەید تاهایێ شێخ محەمەد سەدیقێ نێریێ، دیانا ٢٥ گولانا ٢٠١٤، شێخ عیماد (شێخ شوش) ل سالا ١٩٤٨ ل گوندێ بێسوس ل دەڤەرا سیدەكان ژ دایك بوویە و خویندنا خۆ ل وی گوندی و گوندێ باتاس ل دەڤەرا حەریرێ بەردەوامی دایە، سالا ١٩٧٥ تا نها ل شاروچكێ دیانا دژیت و كومەكا بەلگەنامێن سەردەمێ سەید تاهای و شێخ محەمەد سدیق بەردەستێ وی هەنە.

(٣٠) الشجرة الزیوكیة: المصدر السابق، ص ٦٠ ، و هەروەك شێخ شەمسەدینێ زێوكێ ب پشتبەستن ب شەجەرەناما (بحر الانساب) ــ ئەڤ شەجەرە نامە سالا ١٩٨٨ دگەل ئەنفالێن وێ سالێ هاتیە بەرزەكرن بۆ ڤان چەند سەدێن دووماهیێ باشترین شەجەرە ناما بنەمالا میرێن بەهدینان بوویە ــ گوتیە تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ كو ٢٤ بابا ژ ئێك و دوو دور كەفتینە. چاڤپێكەفتن دگەل تەتەر بەگێ ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك.

(٣١) چاڤپێكەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك.

(٣٢) نەجاتی عەبدوللا: شێخ عوبەیدوللای نەهری لە بەڵگەنامەكانی فەرەنسیدا ١٨٧٩ — ١٨٨٢، (سلێمانی ، ٢٠٠٤) ، ل ٤٧ و ٤٨ ؛ كامیران عبدالصمد أحمد الدوسكي: بهدینان في أواخر العهد العثماني ١٨٧٦ — ١٩١٤ ، مؤسسة موكریاني للبحوث و النشر ، (أربیل ، ٢٠٠٧)، ص ٨٧.

(٣٣) نەجاتی عەبدوللا: سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١ ؛ كامیران عبدالصمد أحمد الدوسكی: المصدر السابق ، ص ٨٨ ؛ عثمان علي: دراسات في تاریخ الحركة الكردیة المعاصرة ١٨٣٣ — ١٩٤٦ دراسة تاریخیة وثائقیة (أربیل ، ٢٠٠٣) ، ص ٦٨ — ٦٩ ؛ چاڤپێكەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٢٠١٥/٨/١٥.

(٣٤) كامیران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق ، ص ٨٨ ؛ نەجاتی عەبدوللا: سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٢.

(٣٥) چاڤپێكەفتن دگەل تەتەر بەگێ ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك ؛ رجب جمیل حبیب: ئامێدی (العمادیة) ١٩٢١ — ١٩٧٥ دراسة في التاریخ السیاسي ، رسالة ماجستیر غیر منشورة ، مقدمة الى مجلس كلیة التربیة في جامعة زاخو، ٢٠١١ ، ص ١١ — ١٢.

(٣٦) هەتا مرنا شێخ محەمەد سدیق ژی ب ئەگەرا سەرمایا دژوار، ئەو بوو كو بەگزادێن تەرگەڤەر دگەل هەركیان تووشی شەر ببوون؛ چونكی هەركی گەلەك ژ بەگزادان زورتر بوون، شێخ محەمەد سدیق بۆ چارەسەركرنا كێشا وان و بەرگریكرن ژ خالێن خۆ ناچار بوو د بەفرو باروڤێدا بدەتە رێ كو د ئەنجامدا سرێ لێدا و وەغەركر. چاڤپێكەفتن دگەل عیماد شێخ سالح سەید تاهایێ شێخ محەمەد سەدیقێ نێریێ ، دیانا ٢٥ گولانا ٢٠١٤،

(٣٧) چاڤپێكەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك.

(٣٨) لسەردەمێ شێخ عەبدولسەلام بۆ کەسێن کو بـاوەری ب رێبـازا وان دئینـا زێـدەتر پـەیڤا (تابع) و سەردەمێ شێخ ئەحمەدێ بارزانی پەیڤا (مورید) دهاتە بکارئینان.

(٣٩) هەموو ئەو بەلگەنامێن دڤێ ڤەکولینێدا هاتینە بکارئینان، لبەر دەسـتێ ڤەکولەرینـە و ب سوپاسیڤە ژلایێ یاشار کاپلان ماموستایێ زانکویا جولەمێرگێ هاتینە هنارتن. BEO(bab-I ali evrak odasi evraki) .DH.MUI(dahiliye muhaberat-I umumiye idaresi evraki) 1-11/26-4 ، تێلگرافناما (باب عالی، داخلیة نظارتی، شیفره قلمـی) بـۆ (وان ولایتـی)، نـومرو ١٤٨، تاریخ ٢٥ تموز ١٣٢٦.

(٤٠) پی رەش: بارزان و حركـة الـوعي القـومي الكـردي ١٨٢٦ – ١٩١٤ ، (د ، م ، ١٩٨٠) ، ص ٩٥.

(٤١) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان، ... ل ٤٩.

(٤٢) دوو زاویتە ل دەڤەرا هەکاری هەنە، زاویتەیا سـەر ب تخوبـێ سـەر ب باسـکێ راسـتێ کـو پنیانشیان سەرکردایەتیا وێ دکر. و زاویتا تیارێ، کـو سـەر ب باسـکێ چـەپێ ڤـە بـوو. و ئەرتوشیان سەرکردایەتیا وێ دکر.

(٤٣) خليل علي مراد و عبدالفتاح علي البوتاني : صفحات من تاريخ الكرد و كوردستان الحـديث في الوثائق العثمانية ١٨٤٠ – ١٩١٥، من منشورات الأكاديمية الكردية ، (اربيل ، ٢٠١٥)، ص ٣١٥ – ٣١٧ ؛ عثمان علي: الكرد في الوثائق العثمانية، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشـر، (اربيل ، ٢٠١٠) ، ص ٣٤.

(44) Ihsan çölemerikli: Mezopotamya uygarliĝi' nda Hakkari, bariş matbaa, (Istanbul , 2006), s 460.

(٤٥) چاڤپێکەفتن دگەل تەتـەر بـەگێ تـەوفیق بـەگێ نێروەیـی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهـۆك ؛ علـی تـتر نێروەیـی: چـەند ڤەکولینــەك ل دور مێـژوویا کـورد و کوردسـتانێ ، دەزگـەها سـپیرێز ، (دهوك، ٢٠١٢) ، ل ١٢٤.

(46) Malmisanij: Kurt Teavun ve Terakki Cemiyeti ve Gazetesi, Avesta, (istanbul, 1999), S.49

دەقـێ تلگرافـێ بنێـرە: کـرد تعـاون و ترقـی غزتەسـی نـومرو (٥)، ١٠ی ذو الحجـە ١٣٢٦ (٢ی کانوونا دووێ ١٩٠٩) ، ل ٣٦، د:

;Kurt Teavun ve Terakki Gazatasi, Govara Kurdi-Tirki 1908 ـ 1909, wergêr ji tipên Latini: M. Emin Bozarsalan (uppsala, 1998).

(٤٧) عەلی تەتەر نێروەیی: مێژوویا میرێن ئێزدینان، ... ل ٥٠.

(٤٨) احمد نوري النعيمي: الحياة السياسية في الدولة العثمانية، (بغداد، ١٩٩٠)، ص٩٢.

(49) Karj J. Bodnarchuk: Kurdistan region under siege, Lenner Publication company (USA, 2000), p. 42

(٥٠) سليمان موسى: الحركة العربية سيرة من الرحلة الأولى للنهضة العربية الحديثة ، ١٩٠٨ – ١٩٢٤، دار النهار للنشر، ط٢، (بيروت ، ١٩٧٧) ، ص ٣٢.

(٥١) بۆ زانينا زۆرتر ل دوور ڤى بابەتى بنێڕە: ويگرام ، دبليو. آى. ويگرام ، أدگار. تى. إس: مهد البشرية الحياة في شرق كردستان ، ت. جرجيس فتح الله ، ئاراس ، (أربيل ، ٢٠٠١) ، ص ١٢٢ ـ ١٢٣.

(52) T. C. Başbakanlik Devlet Arşivleri genel mudur lugu Osmanli arşivi daire başbanligi musul-kerkuk ile iligili arşiv belgeleri 1525-1919, (Ankara, 1993), S. 313-314.

(٥٣) حمد داخل كريم السعدي: المصالح الأجنبية في الموصل ١٨٣٤ ـ ١٩١٤ ، رسالة ماجستير غير منشورة ، كلية الآداب ، جامعة الموصل ، ١٩٩٩ ، ص ٢٣.

(٥٤) ئەڤ نامە ب موهرێن: عبدالسلام النقشبندى الخالدي ، موختار محمد، موختار حسن، موختار خالد و رێدين سپيان: اسماعيل و سلاسى (؟) و فقى احمد و ياسين ڤە هاتيە ختم كرن. DH.MUI 92-1/34 ناما (شيخ عبدالسلام بارزانى) بۆ (در سعادت حضور حضرت جليله داخليه ناظري) ، تاريخ ٢٧ شباط ١٣٢٥، [١٢ ئادار ١٩١٠].

(٥٥) DH.MUI, 1-11 /21 /14 ، تێلگرافناما (عمومى اركان حربيه دائرەسى، اوچنجى شعبەسى، مستعجل، بغداد واليسى ناظم) بۆ (حربيه نظارتي) ، تاريخ ٢٦ مايس ١٣٢٦ [٨ حوزەيرانا ١٩١١]

(٥٦) شذى فيصل رشو العبيدي: الإدارة العثمانية في الموصل في عهد الاتحاديين، ١٩٠٨ – ١٩١٨، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الآداب، جامعة الموصل، ١٩٩٧، ص ٣٦.

(٥٧) بو زانينا زێدەتر بنێڕە: عبدالفتاح علي بوتاني: "حركة الشيخ عبدالسلام البارزانى مقدمة للكفاح الكوردي في مجاليه السياسي والعسكري"، مجلة گولان، العدد (٣٢) ، أربيل ، كانون الثاني ، ١٩٩٨، ص٢٠ – ٢٨ ؛ "حركة الشيخ عبدالسلام البارزاني في جريدة النجاح الموصلية" مجلة متين، العدد (١١٨)، تشرين الثاني ٢٠٠١، دهوك، ص٨٣–٨٧.

(٥٨) BEO.DH.MUI 1-11/15-8 تێلگرافناما (باب عالى ، داخلية نظارتى، شيفره قلمى) بۆ، (موصل واليسى فاضل)، ايچين داخلية نظارتى ، تاريخ ٢٦ مايس ١٣٢٦ [٨ حوزەيرانا ١٩١١] ؛ BEO.DH.MUI 1/11/15-7 تێلگرافناما (باب عالى، داخليه نظارتى، شيفره قلمى) بۆ (موسل والى و قوماندانى محمد فاضل)، ٢٧ مايس ١٣٢٦ [٩ حوزەيرانا ١٩١١].

(٥٩) للتفاصيل ينظر: د.عبدالفتاح علي البوتاني: الحياة الحزبية في الموصل ١٨٢٦ – ١٩٥٨ ، (أربيل ، ٢٠٠٣) ص ٣٨ – ٤٠

(٦٠) نوري أحمد عبدالقادر: الموصل والحركة القومية العربية ١٩٢٠ – ١٩٤١، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الآداب ، جامعة الموصل، ١٩٨٨، ص ٢٢.

(٦١) عەلائەدین سەجادی: مێژووی ڕاپەڕینی کورد، چ ٢، (شهرکرد ، ١٩٩٦)، ص ١٠١.

(٦٢) بو دەقێ بەلگەنامێ بنێڕە:

Başbakanlik Devlet Arşivleri, S. 313 – 314.

(٦٣) صديق الدملوجي: إمارة بهدينان الكردية أو إمارة العمادية، تقديم ومراجعة: عبدالفتاح علي بوتاني، دار ئاراس، (أربيل ، ١٩٩٩) ، ص ١٤٧.

(٦٤) مسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١ – ١٩٥٨، و. سەعید ناکام، (دهوك، ١٩٩٨)، ل ١٨ ــ ١٩ ؛ پی رەش: المصدر السابق ، ص ٩٩ ؛ رابرت أولسن: قيام شيخ سعيد پيران كردستان ١٩٢٥، ت. إبراهيم يونسى ، انتشارات نگاه، (تهران ، ١٣٧٧) ، ص ٤٠.

;MC Duwall, David: A Modern history of Kurds, I. B. Tauris publishers, second edition, Rijswijk, 1992, p. 98.

(٦٥) بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩. ;MC Duwall, Op. Cit. P 98.

(٦٦) الدملوجی: المصدر نفسه ، ص ١٤٧.

(٦٧) BEO.DH.SFR 433/129 تێلگرافناما (موصل واليسى نظيف)، بۆ (داخلية نظارتى) نومرو ١٠٧٣، تاريخ ٥ تموز ١٣٣٠.

(٦٨) BEO, I.HB 165/1 ديوان حرب عرفينن مضبطةسى، ٢ تشرين ثاني ١٣٣٠ ، ٢٧ ذي الحجة ١٣٣٢.

(٦٩) عبد المنعم الغلامي: الضحايا الثلاث الشيخ سعيد برزنجى ، الشيخ عبدالسلام بارزانى والشيخ ضاري الزوبعي ، مطبعة الهدف ، (الموصل ، ١٩٥٥) ، ص ٣٢.

(٧٠) سەفوەت بەگ دوی دەمیدا دەسەلاتدارێ ستەنبولێ بوو و ئەندامەکێ بەرچاڤێ (حوریەت و ئیئتلاف) بوو و دکەڤندا هەڤالینی دگەل شێخ عەبدولسەلام و عەبدولرەزاق بەدرخان هەبوو، ب گونەها کوشتنا مەحمود شەوکەت پاشایی ل ١٤ ی خزیرانا ١٩١٣ رەڤی و پەنابرە بەر شێخ عەبدولسەلام ، پاشی رەڤی و چوو رووسیا. زبیر بلال اسماعیل: ثورات بارزان ١٩٠٧–١٩٣٥، (أربيل، ١٩٩٨)، ص ٥١. Bedirxan, Ebduriizaq: Autobiyografiya ; Ebdurrizaq Berdirxan, Wergêr u amadekar Celilê celil, waşanên kovara Metin, (Duhok, 1999).L36

(71) Bedirxan: Autobiyagrafya..., L. 36.

(72) MC Duwal: Op. Cit. p. 99.

(73) Başbakanlik devlet Arşivleri..., S. 333.

(٧٤) BEO.DH. Ş.F.R(dahiliye nezareti şifre evraki 39/146 تێلگرافناما (باب عالى داخلية نظارتى ، خصوصى قلمى، داخلية ناظرى طلعت) بۆ (موصل ولايتى). نومرو ١١٧٢، تاريخ ١٩ مارت ١٣٣٠.

(٧٥) للمزيد من التفاصيل راجع: خليل علي مراد و عبدالفتاح علي البوتاني: المصدر السابق.

(٧٦) بۆ دەستنیشانکرنا گوندێن ڤان کەسان ئەگەر د دادگەهێدا ئاماژە پێ نەهاتبیتە کرن، پێزانین هاتینە وەرگرتن ژ: (مقداد زیاب درێ خەلکێ گوندێ بارزان ژ دایکبوویێ ١٩٤١ ب رێکا تەلەفونێ ل ٤ی کانوونا ئێکێ ٢٠١٧ و ژ صالح محمود بارزانی کو دەهان سالە کارێ کومڤەکرنا پێزانینا ل دور ڤان بابەتان دکەت ل ٢٠١٧/١٢/٢٢.

(٧٧) دیارە وی دەمی کوردان ئەڤ پەیڤە بکار ئینایە ؛ چونکی پاش پەیڤا قوەت د کڤانێدا پەیڤا (هێز) بو قوەتا کوردان بکار ئینایە.

(٧٨) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك.

(٧٩) هەمان سەرچاوە ، عەلی تەتەر: ژیانا سیاسی ل کوردستانێ، دەزگەها سپیرێز ، (دهوك ، ٢٠٠٢)، ل ٣٠٩ .

(٨٠)BEO, I.HB(irade herbiye) 165/1 دیوان حرب عرفينن مضبطةسى، ٢ تشرين ثانى ١٣٣٠ ، ٢٧ ذى الحجة ١٣٣٢.

(٨١) Osmanli arşivi BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفينن مضبطةسى، ٢ تشرين ثانى ١٣٣٠ ، ٢٧ ذى الحجة ١٣٣٢.

(82) Ibrahim Ozcoşar & Shahab Vali: Osmanli Devleti ve Kurtler,kiyapyayinevi, (istanbul , 2017), S 198.

(٨٣) BEO.DH. ŞFR. 424/62 تێلگرافناما (وان واليسى تحسين) بۆ (داخلية نظارتى)، نومرو ٢٥٥ ، ٨ نيسان ١٣٣٠،

(٨٤) BEO.DH. ŞFR. 424/88 تێلگرافناما (موصل واليسى نظيف) بۆ (داخلية نظارتي)، نومرو ٢٥٥ ، تاريخ ١٢ نيسان ١٣٣٠.

(٨٥) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ تەوفیق بەگێ نێروەیی ٨/١٥/ ٢٠١٥ دهوك.

(٨٦) هەمان سەرچاوە.

(٨٧) بتنێ وی دەمی ل دەڤەرا نێروە کەرەم کورێ زەینێ خەلکێ گوندێ دووتازا هەبوویە و رەنگە ناڤێ وی ل دادگەهێ ب شاشی هاتبیتە تومارکرن و ئەحمەد ژی مامێ وی بوویە ، نە برایێ وی.

(٨٨) ب دیتنا من لڤێرە مەبەست هابی ئاغایێ کورێ میکائیلێ رێکانی بوویە ، چونکێ دناڤ نێروەییاندا چ هابی ئاغا نەبووینە، ناحیا نێروە رێکان زور جاران د تومارێن ئوسمانیدا بوویە ئەگەرێ تێکەلکرنا هەر دوو هوزێن نیروە و رێکان.

(٨٩) Osmanli arşivi BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفینن مضبطه سی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(٩٠) چاڤپێکەفتن دگەل تەتەر بەگێ توفیق بەگێ نێروەیی ١٥/٨/ ٢٠١٥ دهوك.

(٩١) BEO.DH. ŞFR.428/33 تێلگرافناما (موصل والیسی نظیف)، زاخو مخرجی، بۆ (داخلیه نظارتي)، نومرو ٢٢٨، تاریخ ١٦ مایس ١٣٣٠ ؛ BEO.DH. ŞFR. 425/48 تێلگرافناما (وان والیسی تحسین) بۆ (داخلیه نظارتی)، نومرو ٣٦٥، تاریخ ١٦ مایس ١٣٣٠.

(٩٢) تێلگرافناما (داخلیه نظارتی، امنیت عمومیه مدیریتی، قلم) بۆ (وان و موصل ولایتلرینه)، نومرو ١٣٥ ، تاریخ ١٩ نیسان ١٣٣٠.

(٩٣) گوندەکە دکەڤیتە ناڤەراستا دەشتا مەرگەڤەر و کیلومەترەکێ ژ رۆژئاڤا ئوردوگایێ زێوە دوورە ، کو د سالێن هەفتێ و هەشتێیان یێ سەدێ دەربازبوویی پەنابەرێن کوردێن باشوور لێ ئاکنجی ببوون.

(٩٤) BEO.DH. ŞFR. 41/23 ، تێلگرافناما (داخلیه نظارتی، امنیت عمومیه مدیریتی، قلم) بۆ (موصل ولایتی) ، نومرو یوز سکسان [١٠٨٠] ، تاریخ ٦ مایس ١٣٣٠.

(٩٥) سەدیق دەمەلوجی دنڤیسیت دەما گرتنا شێخ نور مالا وی ل دهوك هاتە پشکنین و دەڤا وێ بروسکێ دیتن کو بەری سێ سالا بۆ باب عالی هاتبوو هنارتن. الدملوجی: المصدر السابق، ص ١٤٧.

(٩٦) BEO.DH. ŞFR 433/29 ، تێلگرافناما (موصل والیسی نظیف) بۆ (داخلیه نظارتي)، نومرو ١٠٧٣، تاریخ ٥ تموز ١٣٣٠.

(٩٧) چونکی د بروسکا رێڤەبەرێ گشتی یێ ئاسایشێ ل وەزارەتا ناڤخۆیا دەولەتا ئوسمانی بۆ ویلایەتا مویسل ل ٤ ئەیلولا ١٩١٤ دا هاتیە کو شێخ عەبدولسەلام کو ل وانێ یێ گرتیە ئەو نهو نەشێن فرێکەنە مویسل، ئانکو گرتنا وی و ڤەگوهاستن و گەهاندنا وی بۆ وانێ چەند رۆژ پێچوونە، لەورا گرتنا وی دێ دووماهیا هەیڤا ئاب بیت. BEO.DH. ŞFR 41/195 تێلگرافناما (باب عالی، داخلیه نظارتی، عمومی امنیت مدیریتی) بۆ (موصل ولایتی) ، تاریخ ٢٢ اب ١٣٣٠ (٤ ئەیلول ١٩١٤).

(٩٨) BEO. DH. ŞFR. 442/38، تێلگرافناما (وان والیسی تحسین) بۆ (داخلیة نظارتی) ، نومرو ١٥٤٦ ، تاریخ ١٣ ایلول ١٣٣٠.

(٩٩) BEO. DH. ŞFR. 441/40، تێلگرافناما (موصل ولایتی) بۆ (وان ولایتی)، تاریخ ٥ ایلول ١٣٣٠.

(١٠٠) BEO.DH. ŞFR. 442/38 تێلگرافناما (وان والیسی تحسین) بۆ (داخلیه نظارتی)، نومرو ١٥٤٦ ، تاریخ ١٤ ایلول ١٣٣٠.

(١٠١) I.HB 165/1 , دیوان حرب عرفینن مضبطةسی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(١٠٢)BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفینن مضبطةسی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(١٠٣) BEO.I.HB 163/12 اراده سنیه ، حربیه نظارتي ، تحریرات دائرەسی، تحریرات قلمی ، ٢٢١٣ ، ٧ محرم ١٣٣٣ ، ١٣ تشرین ثانی ١٣٣٠

(١٠٤) BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفینن مضبطةسی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(١٠٥) پاش دەرچوون و جێبەجێکرنا ڤێ بریارێ جارەکا دیتر دیوانا جەنگ یا عورفی ل مویسل ل ١ی ئادارا ١٩١٥ بریارا سێدارەدانێ بۆ حەمو قاسم ئاکرەیی و شەریف مەلا حەسەن زێباری [ب دروستی خەلکێ گوندێ بارزانە] و حەیدو کورێ زوبەیر زێباری ژی هاتە دەرکرن و ئیرادا سنیه ل ٣ی ئادارا ١٩١٥ بۆ دەرچوو. BEO.I.HB 166/56 ، اراده سنیه، حربیه نظارتی، تحریرات دائرةسی، تحریر قلمی ، نومرو ١٠٢٣ ، تاریخ ١٦ شباط ١٣٣٠ ؛ BEO.I.HB 166/56، اراده سنیه، حربیه نظارتی، تحریرات دائرةسی، تحریر قلمی، نومرو ٢٨٠٣، تاریخ ١٨ شباط ١٣٣٠.

(١٠٦) BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفینن مضبطةسی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(١٠٧) د دادگەها دوویدا شەریف مەلا حەسەن بارزانی وەکو سەرکردەیەکێ بەرچاڤێ شێخ عەبدولسەلام، ل ٣ی ئادارا ١٩١٥ ێ، بریارا سێدارەدانێ بۆ دەرچوو. I.HB 166/56 ، اراده سنیه ، حربیه نظارتی، تحریرات دائرةسی، تحریر قلمی ، نومرو ١٠٢٣ ، تاریخ ١٦ شباط ١٣٣٠ ؛ I.HB 166/56، اراده سنیه ، حربیة نظارتی، تحریرات دائرةسی، تحریر قلمی، نومرو ٢٨٠٣، تاریخ ١٨ شباط ١٣٣٠.

(١٠٨) دوو خزمەتکارێن شێخی بناڤێن: محو یێ گوهارێ و محویێ هویکی هەبوون دیار نەبوو کێ ژ وانە.

(١٠٩) د زیندانێدا ل مویسل هاتە کوشتن، و سەرەرای هەموو هەولێن بنەمالا وی، هەتا جەنازێ وی ژی رادەستی بنەمالا وان نەکرن، د هاتە گوتن کو مەجید بەگ ب ئەشکەنجەدانێ هاتبوو کوشتن؛ لەورا ژی جەنازێ وی هاڤێتبوونە د رووبارێ دجلەی دا، مەجید بەگێ بتنێ کچەك لدویڤ خۆ هێلابوو.

(١١٠) د زیندانێدا هاتە کوشتن و چ زاروك لدویڤ خۆ ب جھ نەهێلابوون.

(١١١) دیارە مەبەست شێخ (نور) ێ بریفکی یە.

(١١٢) BEO, I.HB 165/1 دیوان حرب عرفینن مضبطةسی، ٢ تشرین ثانی ١٣٣٠ ، ٢٧ ذی الحجة ١٣٣٢.

(١١٣) BEO.I.HB 163/12 اراده سنیه، حربیه نظارتي ، تحریرات دائرەسی، تحریرات قلمی ، نومرو ٢٢١٣ ، ٧ محرم ١٣٣٣ ، ١٣ تشرین الثانی ١٣٣٠ ؛ Ibrahim Ozcoşar & Shahab Vali: s, 202 – 203.

(١١٤) BEO.I.HB 165/1 نڤیسینا (حربیة نظارتي ، امور محاکم مدیریتی ، تحریرات دائره سی) بۆ (در سعادت) ، نومرو ٧٢٦/٨ تاریخ ٣١ کانون اول ١٣٣٠.

(١١٥) BEO.I.HB. 165/1 ارادة سنیة، حربیة نظارتي، تحریرات دائرةسی، تحریرات قلمي ، نومرو ٨٨١ ، تاریخ ٤ کانون ثانی ١٣٣٠.

(١١٦) BEO.I.HB. 165/1 اراده سنیه، حربیة نظارتي، تحریرات دائرةسی، تحریرات قلمی، نومرو ٢٦١٢ ، تاریخ ٦ کانون ثانی ١٣٣٠.

(١١٧) عەلی تەتەر: بزاڤا سیاسی ... ، ل ٣٠٩.

## ملخص البحث

ينتمي تتر بك بن علي بك نيروي الى اسرة امراء النيروة، ويرجع اصولهم الى امراء بهدينان، ويعد تتر بك من الثوار والمناضلين الكورد في حقبة نهاية القرن التاسع عشر ومطلع القرن العشرين، ومع ذلك فانه لم يتم اجراء اية دراسة مختصة عنه.

اعتمدت هذه الدراسة في الحصول على مادتها العلمية على مضابط (ديوان الحرب العرفي) و قرارات وزير الحرب انور باشا والصدر الاعظم محمد سعيد والسلطان محمد الخامس (رشاد).

شارك تتر بك بفعالية في حركة الشيخ عبيدالله النهري خلال السنوات ١٨٧٩-١٨٨٠، و من بعدها شارك في انتفاضة الشيخ عبدالسلام البارزاني، وكان احد قادة الصف الاول في معظم الحركات السياسية والعسكرية في تلك المرحلة. كما كانت له اتصالات وعلاقات مع الجمعيات السياسية آنذاك، ودور واضح فيها. وفي سنة ١٩١١ كان تتر بك من الذين اوصلوا مطالب الكورد بالتلغراف الى الباب العالي.

كما اخذ على عاتقه قيادة الجبهة الغربية في مقاومة سنة ١٩١٤ وكانت آخر جبهة انتهت فيها المقاومة. تمت محاصرة تتر بك وعائلته في منطقة (ولات ژيرى) في منطقة مزورى بالا في نيسان ١٩١٤، وعندما تمت محاكمتهم في تشرين الثاني ١٩١٤ عُدَّ الشخص الثاني المتهم بعد الشيخ عبدالسلام، وتم اعدامه مع محمد امين اغا في الموصل في كانون الثاني ١٩١٥، كما تم قتل كل من ابنه مجيد بك مع اثنين من اقربائه هما خالد شرف ورجب عثمان في السجن.

## Abstract

Tatar Beg Ali Beg comes from a household of an emirate of Nerwe, and the origin of Nerwey's household claims to be descended from Bahdinan emirate, he is considered as a striver and revolutionist in Kurdish liberal movement at the end of nineteenth century and the beginning of twentieth century, and no reaserch was made yet about his personality, and role. This reaserch is based on divan (Al-Harb Al-Orfi), and decisions of Anwar Pasha who was a minister of war, and Mohammad Sa'eed Sadir Aza'am, and monarch Mohammad fifth (Rashad) on Tater's file.Tatar Beg had an active participation in movement of Sheikh Obeydullah Al-nahri in 1879-1880, after the uprising of Sheikh Abdulselam Barzani, he became an impressive leader, and was made top –ranked commander of Abdulselam Barzani. He had a noticeable role in many political, and military movements, and had relations which were carried out politically. He was one of those people asked for Kurdish requests via telegraph from Bab a'ali in 1911.

In the resistance of April, in 1914, he was responsible for the west frontline and it was also the last frontline, and his resistance was failed .Tater Beg in the middle of April, in 1914, in territory of country's down part he was seized, and arrested with his wife, and children. In their court, in December, 1914, he was numbered as a second person after Sheikh Abdulselam, and he was executed with Mohammad Ameen Agha Babsevi in January, 1915, in Mosul. His son Majeed Beg was killed with his two close friends who were Khalid Sharaf, and Rajab Osman in jail.

# دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا

## توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری هەولێر

پ. ی. د. سەلیم پەترۆس ئەلیاس          ڕۆژگار سەعدی سابیر

کۆلێژی ئەدەبیات / بەشی کۆمەڵناسی

زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی:**

توێژینەوەکە (دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا)، توێژینەوەیەکی زانستیی مەیدانییە، بەمەبەستی دەرخستن و زانینی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی و کاریگەرییان لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

توێژینەوەکە لە دوو دەروازەی سەرەکی پێکدێت، دەروازەی یەکەم تایبەتە بە لایەنی تیۆریی توێژینەوەکە، کە دوو بەشی سەرەکی لەخۆ گرتوون، بەشی یەکەم، یەکەم: چوارچێوەی گشتیی توێژینەوەکە. دووەمیش: دیاریکردن و ناساندنی چەمکەکانی توێژینەوەکەیە. بەشی دووەمیش لە چوار تەوەری سەرەکی پێکدێت، تەوەری یەکەم: دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی؛ تەوەری دووەم: دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی؛ تەوەری سێیەم: دەرهاویشتە ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی.

دەروازەی دووەمیش کە تایبەتە بە لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکە، لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێت، بەشی سێیەم تایبەتە بە چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوەکە هەر لە دیاریکردنی میتۆد و کۆمەڵگای توێژینەوە، نموونەی توێژینەوەکە و قەبارەی توێژینەوەکەی لەخۆ گرتوون، لەگەڵ

ئاماژەکردن بۆ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاریی و چۆنیەتی دانانی پرسیارنامە بە شێوەیەکی زانستی. لە بەشی چوارەمیشدا خەسڵەتە گشتییەکانی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە (گۆڕاوەکان) خراونەتە ڕوو. دواتر هەر لەهەمان بەشدا ئەنجامەکانی توێژینەوەکە خراونەتە ڕوو، هەروەها لەبەر ڕۆشنایی ئامانجەکانی توێژینەوەکە تاوتوێ و لێکدانەوە بە ئەنجامەکانی توێژینەوەکە کراوە لە لایەن توێژەرەوە.

لە بەشی پێنجەمدا، تەوەری یەکەم، ئەنجام و دەرئەنجامەکان ئاماژەیان پێکراوە، لە تەوەری دووەم، پێشنیاز و ڕاسپاردە بۆ لایەنی سوودمەند لە توێژینەوەکە ئاماژەیان پێکراوە. لە کۆتاییدا لیستی سەرچاوەکان و پاشکۆکان خراونەتە ڕوو، لەگەڵ کورتەی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و بە زمانی ئینگلیزی.

## دەروازەی یەکەم- لایەنی تیۆریی توێژینەوەکە

### بەشی یەکەم/ یەکەم/ چوارچێوەی گشتی توێژینەوەکە:

**1-1- گرفتی توێژینەوەکە:**

ململانێی سیاسی پانتاییەکی فراوانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگاکەمانی گرتووەتەوە، خۆی خزاندووەتە ناو بەشێکی زۆر لە کایە گرنگەکانی کۆمەڵگا، بەدرێژایی قۆناغە یەک لەدوای یەکەکانی کۆمەڵگا، بەچەندین شێوە و ئاستی جیاواز خۆی دەرخستووە. دەرهاویشتەکانی بوونی هەیە، بەتایبەت دوای هەڵبژاردنی ئایاری ساڵی (1992) لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، بەدرێژایی (26) بیست و شەش ساڵ لە حوکمڕانیی خۆییدا:

1-1-1- ململانێیەکی نا دیموکراسی بوونی هەبووە لە نێوان حیزبە سیاسییەکان.

1-1-2- دەرهاویشتەکانی ئەم دیاردەیە لەسەر چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگا لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ڕەنگیان داوەتەوە.

1-1-3- دەرهاویشتەی نەرێنی هەبووە لەسەر پێکهاتەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان.

1-1-4- ئەم ململانێیە، بووەتە گرفت بۆ سەربەخۆیی کارکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی.

**2- گرنگیی توێژینەوەکە:**

توێژینەوە لە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی- عێراقدا، بابەتێکی گرنگە، دەشێت لە چەندین بوار و ئاستی جیاوازەوە گرنگییەکەی بخرێتە ڕوو، بەتایبەت کە زۆر بەکەمی توێژینەوە لەسەر دەرهاویشتەکانی ململانێی سیاسی لە کۆمەڵگادا ئەنجام دراوە، بۆیە بەگرنگی دەزانین توێژینەوە لەسەر دەرهاویشتەکانی ململانێی سیاسی لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا و بەشێک لە کایە گرنگەکانی کۆمەڵگا، وەک: لایەنی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە ئەنجام بدەین، لە هەمان کاتدا باسکردنە لەسەر ئەوەی کە ململانێی سیاسی تەنیا خوێندنەوەیەکی ئایدیۆلۆجی سیاسی نییە، بەڵکو خوێندنەوە لەسەر دەرهاویشتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانیش کە پەیوەستن بە ململانێی سیاسی گرنگە. لەگەڵ توێژینەوە لە دەرهاویشتەکانی ئەم دیاردەیە لەسەر هەڵسوکەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی تاکەکانی کۆمەڵگا لە مامەڵەکردن لەگەڵ یەکتردا و گرنگی لەسەر پێکهێنەری دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان. بۆیە بەپێویستی دەزانین هەوڵ بدەین لەم ڕوانگانەوە گرنگیی توێژینەوەکە زیاتر بخەینە ڕوو.

**3- ئامانجەکانی توێژینەوەکە:**

ئامانجەکانی توێژینەوەکە بریتین لەمانەی خوارەوە:

3-1- زانینی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراق.

3-2- ئاشنابوون بە دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراق.

3-3- گەیشتن بە دەرهاویشتە ئابوورییەكانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی كوردستانی عێراق.

**دووەم/ دیاریكردن و ناساندنی چەمكەكانی توێژینەوەكە:**

**ململانێی سیاسی:** (The Political Conflict)

ململانێی سیاسی دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە، بەرهەمی بوونی چین و توێژی كۆمەڵایەتی جۆراو جۆر و بەرژەوەندیی ئابووری و كۆمەڵایەتی سیاسی جیاوازە.

بەهۆی ئەوەی كەمینەیەكی سیاسی دەست بەسەر زۆر لە دەسكەوتەكانی كۆمەڵگادا دەگرێت، لەكاتێكدا جەماوەرێكی بەرفراوان لە هەژاری و نەبوونی دەمێنێتەوە، ئەم نایەكسانییەی لە ئەنجامی ئەم جیاوازییە دێتە دی و ململانێیەكی زۆر قووڵ بەرهەم دەهێنێت (الأسود، 1986، ص: 152).

لە جیهانی ئەمڕۆدا سەرجەم حیزبە سیاسییەكان ئەنجامی ململانێیەكن، كە ئامانجەكەی بۆ فەرمانڕەوایەتییە، جا چ بە ئاشتییانە بێت، یان بە خەباتی چەكداری، ململانێی سیاسی زۆربەی كاتەكان زاڵبوون و شكست بەرهەم دەهێنێت، ئەنجامەكەشی ململانێكە هەر بەردەوام دەبێت لەدوای هەر حاڵەتێک لەم حاڵەتانە ( الطیب، 2007، ص:109).

كەواتە ململانێی سیاسی: بریتییە لە ململانێی نێوان هێزەكان، كە هەر هێزێک هەوڵدەدات كۆنترۆڵی هێزەكانی تر بكات و هەژموونی خۆی بسەپێنێ. لە گرینگترین ئامرازەكانی ململانێی سیاسی وەک: حیزبی سیاسی و سەندیكا و گرووپی فشار و سەركردایەتییە. لە گرینگترین ئامرازە بابەتییەكانیشدا، ئایدیۆلۆژیا و ڕای گشتییە. (عبدالكافي، 2012، ص: 19).

**پێناسەی ڕێكاریی توێژەر بۆ ململانێی سیاسی:**

ململانێی سیاسی بریتییە لە هەوڵدان بۆ سەپاندنی هەژموونی سیاسی، لەنێوان هێزە سیاسییە جیاوازەكاندا، كە هەر هێزەو هەوڵدەدات

بگات بە بەدەستهێنانی دەسکەوت، بەم هۆیەشەوە بەشێکی زۆر لە بەرژەوەندییەکانیان بەدەست دێت.

**دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکان:** (The Social Secretions)

**پێناسەی ڕێکاریی توێژەر بۆ دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکان:**

بریتییە لەم لێکەوتە کۆمەڵایەتییانەی، کە لەمیانەی پرۆسەی بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکان لە کۆمەڵگادا بەدەردەکەون لە نێوان هێز و حیزبە سیاسییە جیاوازەکان، کە ڕۆڵیان هەیە لە بەرەوپێشبردنی کاروباری کۆمەڵگا.

## بەشی دووەم/ باسی یەکەم: دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر

### یەکەم/ ڕەوشی دادپەروەری کۆمەڵایەتی:

(The Reality of Social Justice)

دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، واتە پەیڕەوکردنی یەکسانی لە بەرامبەر ئەرک و مافە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتوورییەکانی تاکەکان، گرووپەکان، نەتەوە و مەزهەبەکان و دەسکەوتە ماددی و مەعنەوییەکانیان کە لەچوارچێوەی کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەژین.

دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دۆخێکی نموونەییە کە تیایدا تاکەکانی کۆمەڵگا یەکسانن لەڕووی ئەرک و مافەوە، هەلی یەکسانی و مافیان هەیە لە پاراستن و یەکسانییان لەڕووی سوودی کۆمەڵایەتی کە بۆیان فەراهەم دەکرێت (الدخیل، 2006، ص: 196).

لە هەرێمی کوردستاندا ململانێی سیاسی، زۆربەی کایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی بە حیزبی کردوون، بەم هۆیەشەوە پەیڕەوکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی تیایدا لاوازە، ئەمەش وای کردووە کە جیاوازی و پلەبەندییەکی زۆر دروست بێت لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا، بەجۆرێک دەستە بژێرێکی سیاسی بەماوەیەکی کورت بتوانن دەسەڵاتێکی زۆری سیاسی و کارگێڕی بگرنە دەست و

لەڕووی ئابوورییەوە سامانێکی زۆر بەدەست بێنن و بۆ بەرژەوەندی تایبەتیی خۆیان و حیزبە سیاسییەکانیان بەکاری بێنن، بێ ئەوەی لێپرسینەوە و بەدواداچوونی تەواویان لەگەڵدا بکرێت، هەلی یەکسانی بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا فەراهەم بکرێت.

**دووەم/ دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی:**

(The Civil Society Institutions)

کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵگایەکی دامەزراوەییە، کە تیایدا بەشداریکردنی هاوڵاتیان بەشێوەیەکی ئازادانە لە بوارەکانی: کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیری بەرجەستە دەکات.

کۆمەڵگای مەدەنی پێکدێت لە کۆمەڵێک لەم دەزگا و کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی کە لەنێوانیاندا پەیوەندی هەیە بۆ فشار دروستکردن بەمەبەستی گەشەپێدانی کۆمەڵگا، کۆمەڵگای مەدەنی وەک بەشدارێک وایە لە حکومەت و بازاڕدا (Pasha, 2004, p .3).

دیارترین قوتابخانە کە ئەم بابەتەی باسکردبێت قوتابخانەی لیبراڵییە، بەهەردوو لایەنی سیاسی و ئابوورییەوە؛ لەڕووی ئابوورییەوە کۆمەڵگای مەدەنی دەوەستێتەوە سەر ئازادیی بازرگانی و دابەشکردنی کار، بەڵام لەڕووی سیاسی، بەرەگەزێکی سەرەکی دادەندرێت لە دەوڵەتی دەستووریدا، کە ڕەوایی هەیە لە ئاست هاوڵاتییەکانی، ئەمەش بۆچوون و ئاراستەی جۆن لۆکە، پاشان قوتابخانەی فریدریک هیگل وکارل مارکس ( قزرون، 2011، ص:41).

لە کۆمەڵگای مەدەنی تاکەکان بەئازادی بیروڕاکانیان دەردەبڕن، تاڕادەی دەربڕینی بۆچوونی نوێ بەرەچاوکردنی بەرژەوەندیی گشتی؛ ئەمیش بەبوونی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی (ڕێکخراوە ناحکومییەکان) دەبێت؛ ئەم ڕێکخراوانە بریتیین لە: سەندیکاکان، گرووپەکان، یەکێتییەکان، یانەکان، پیشەوەران، فیدراسۆنەکان..؛ ئەمانە وەک پردێک دەبن لە نێوان خەڵک و دەسەڵات بۆ ئاراستە کردنی بۆچوون و داواکارییەکانیان.

لە هەرێمی کوردستاندا زۆربەی ئەم ڕێکخراوە ناحکومییانە بەهۆی دەستوەردانی حیزبی، کراون بە پاشکۆیی حیزبی، بەشێوەیەک کە بودجە و خەرجییان لەلایەن حیزبە سیاسییەکانەوە بۆ دابیندەکرێت، بۆیە زۆرجار ئاراستەی کارکردنیان بۆ بەرژەوەندیی حیزبە سیاسییەکانە. ئەگەر داواکارییەکیشیان لە دەسەڵات هەبێت ئەوا پشتگوێ دەخرێت؛ ئەمیش دەرهاویشتەی لەسەر بەمەدەنی بوونی کۆمەڵگا و تەنانەت کۆمیسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانیش هەیە بە حیزبی کراوە، ئەمە مانای سڕکردنی دیموکراسیەت و بەمەدەنی نەبوونی کۆمەڵگاکەمانە.

**سێیەم/ کۆچکردن بۆ دەرەوەی وڵات** (Migration to the Outside Country)

کۆچکردن جێهێشتنی دەوڵەتێکە، یان هەرێمێک کە نیشتەجێیە تیایدا، لەلایەن کەسێکەوە بەرەو هەرێمێک، یان دەوڵەتێکی تر بەشێوازێکی بەردەوام و بەهۆکاری جۆراوجۆری وەک: ئایینی، سیاسی، ڕەگەزی، بە پاڵنەری پەیوەندیدار بە ژینگە و کەش و هەوا، یان بەهۆکاری ئابووری بەمەبەستی بەدەستهێنانی نان و سەرمایە لە وڵاتە دەوڵەمەندەکان (الحمداني، 2012، ص: 384).

کۆچی دەرەکی گواستنەوەی تاکەکانە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، بەمەرجێک سنووری سیاسی ئەم وڵاتە ببڕێت بەمەبەستی جێنشینی. بەپێی فەرهەنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کۆچی نێودەوڵەتی گواستنەوەی تاکەکانە، یان کۆمەڵەکان، لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکی تر بەمەبەستی کارکردن و مانەوە تیایدا، ئەمیش کار دەکاتە سەر پێکهاتەی هێزی دەستی کار لە ئاستی نێودەوڵەتی، لەم وڵاتەی کە کۆچبەر وەردەگرێت بۆ باشکردنی باری ئابووری کرێکارە کۆچبەرەکان و ڕەخساندنی هەلی کار و باشترکردنی ژیان و گوزەرانیان، بەڵام مەرج نییە کۆچکردنەکە بۆ هەمیشەیی بێت، بەڵکو دەوەستێتە سەر بارودۆخی کۆچبەرەکە سیاسی بێت، یان، ئابووری، یان کۆمەڵایەتی (ابراهیم، 2015، ل: 186).

لە هەرێمی کوردستاندا کۆچکردن بۆ دەرەوەی وڵات، بەشێکی دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە کە لەنێوان حیزبە سیاسییەکان بوونی هەیە، بەهۆی ئەوەی بەشێکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵگا نیگەرانن لە زۆریی گرفتە کۆمەڵایەتی و کێشە سیاسییەکان و بێ ئومێدبوون لە چارەسەری؛ بەشێکی تریش پەیوەندیی بەم بۆشاییە ڕوحییەوە هەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگا بۆی دەڕوانن و لێی بێبەشن، ئەمیش پەیوەندیی بەم کولتوورە هەیە کە لە کۆمەڵگاکەماندا بوونی هەیە، بۆیە تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان وا هەستدەکەن بە کۆچکردنیان بۆ دەرەوەی وڵات، لە گرفت و کێشەکان دوور دەکەونەوە و دەگەن بەم فەزا ئازادەی کە خواست و پێداویستییەکانیان تیایدا بەدی دێت.

**باسی دووەم: دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی:**

**یەکەم/ قەیرانی سیاسی: (The Political Crisis)**

قەیرانی سیاسی ناوخۆ دۆخێکی نەخوازراوە، کە ململانێی سیاسی لەسەر بەرژەوەندیی سیاسی و دەسەڵات دەگرێتەوە لەلایەن حیزبە سیاسییەکانەوە، بەهۆی سەپاندنی هەژموونی سیاسی، بەتایبەت کاتێک کە یاسا سەروەریی تەواوی نەبێت.

سیمای قەیرانی سیاسی لەم کۆمەڵگایانەدا ڕوودەدات کە سیستەمی فەرمانڕەوایی بە پڕەنسیپی لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا ناڕوات، بەڵکو جەخت دەکاتە سەر دەسەڵاتێک لە سەرەوە بۆ خوارەوە، گوێڕایەڵی لە خوارەوە بۆ سەرەوە ( إسماعيل، 2001، ص: 72).

کۆمەڵناسی گرنگی بە قەیرانەکان دەدات، کاتێک دووچاری بنیادی کۆمەڵایەتی دەبنەوە، کاریگەری لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و گرووپە جیا جیاکان دەبێت، کاتێک کار دەکاتە سەر دیاریکردنی پەرچەکرداری کاری کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی. هۆکارێکی سەرەکی لە تێکدانی پێویستییەکانی مرۆڤ (البكری، 2011، ص: 19).

قەیرانی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا دەرهاویشتەی ململانێی سیاسی نا دیموکراسیانەیە لەنێوان حیزبە سیاسییەکاندا، بەهۆی بوونی هێزی تایبەت و زاڵکردنی هەژموونی دەسەڵات و قۆرخکردنی سامانی نیشتیمانی و یەکتر قەبووڵنەکردنەوە سەری هەڵداوە و پەرە دەستێنێت، دواجار دەرهاویشتەی لەسەر زۆربەی دامەزراوەکانی تری کۆمەڵگا دەبێت، بەهۆی ئەوەی زۆربەی دامەزراوە نیشتیمانییەکانی وەک: سوپا و ئاسایش سەرچاوەکانی دارایی...، چۆنییەتی خەرجکردنی داهاتەکان، بەدامەزراوەیی، ڕێکنەخراوەتەوە؛

لە هەمان کاتدا "قەیرانی سیاسی" بەشێکی ڕەنگدانەوەی عەقڵی تاکەکانی کۆمەڵگاکەمانن، بەهۆی ئینتمای سیاسییان بۆ حیزبی سیاسی و بەشدارییان لە ململانێی سیاسیدا، بەتایبەت لەکاتی بوونی کێشە و گرفتی سیاسی.

**دووەم/ توندوتیژیی سیاسی: (The Political Violence)**

کوشتن، یان ئازاردانی جەستەیی، یاخود دەروونی دەگرێتەوە، دژی تاکەکەس، یاخود کۆمەڵەیەک کە ئینتیمای سیاسیی جیاوازیان هەیە و ناڕازین لە بەڕێوەبردنی سیستەمی حوکمڕانی و دەسەڵات.

توندوتیژیی سیاسی بەکارهێنانی هێزیش دەگرێتەوە، بەمەبەستی بریندارکردن، یان کوشتن؛ ئەم کەسانە گرووپی دیاریکراون کە ڕۆڵیان هەیە لە کۆمەڵگادا، هەڵدەستن بەئەنجامدانی توندوتیژی دژی کەسانێک کە لە ڕەگەزی ترن، یاخود لە ئاییینی ترن، یان گرووپی سیاسیی ترن و نەیارن (Lauer and Jeanett, 2002, p.182).

توندوتیژیی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا زیاتر توندوتیژییەکی ئایدیۆلۆجی، سیاسییە، کە بەهۆی ململانێی سیاسی سەرهەڵدەدات، لەلایەن تاک و کۆمەڵەکانەوە کە ئینتیمای سیاسیی جیاوازیان هەیە بەرامبەر بە ڕکابەرەکەی. لەلایەن دەسەڵاتیشەوە، ڕووبەڕووبوونەوەیە بەهۆی هێز، بۆ مانەوەو زاڵبوونی هەژموونی دەسەڵات و حوکمڕانی. بۆیە زۆرجار ئەم توندوتیژییە کوشتنی سیاسی لێدەکەوێتەوە، بەتایبەت

کوشتنی رۆژنامەنووسان بەپاڵپشتی کەسانی پاوانخواز، یاخود بەشێک لەم کەسانەی کە پۆستی سیاسی و ئەمنیی کاریگەریان هەیە و نەیاری ئازادی و دەربڕینی راستییەکان و بیروڕا جیاوازەکانن.

**سێیەم/ نامۆبوونی سیاسی:** (The Social Alienation)

بێ ئومێدبوونی تاکەکانی کۆمەڵگایە لە سیستەمی سیاسی و حوکمی دەسەڵات، کاتێک کە نەتواندرێت کێشە و گرفتە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیان بۆ چارەسەر بکرێت.

نامۆبوون بەمانای کێشەی کۆمەڵایەتی ڕۆژ دێت، خەڵک هەست بەنامۆبوون دەکەن لەبەرامبەر کۆمەڵگا و سیستەمە سیاسییەکەیان، بەتایبەت لەنێوەندی فکری و ڕۆشنبیری، کە وەک دیاردەیەکی نوێ مامەڵە لەگەڵ نامۆبوون دەکەن (Reid, 1972, p. 5).

چەمکی نامۆبوون لەساڵی 1844 دا لە نووسینەکانی کارل مارکسدا دەرکەوت. مارکس پێیوایە: دەکرێ بەڵگەی نامۆبوونی مرۆڤ لەم واقیعەوە تێبینی بکرێت کە لە سیستەمی سەرمایەدارییدا هۆکاری بەدەستهێنانی بژێویی تاک لەدەستی ئەوانی دیکەدایە و هێزی نامرۆیی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە (موحسنی، 2007، ل: 372).

لە هەرێمی کوردستاندا بەهۆی ئەوەی سیاسەت لەلایەن دەستەبژێرێکی سیاسی حیزبییەوە بەڕێوە دەبرێت، ئەوانەی بەشدارن تیایدا، چەند کەسێکی شێوە دووبارەن و سیاسەتیان بۆخۆیان و بنەماڵەکانیان کۆنترۆڵ کردووە، زۆرجاریش کۆمەڵێک بەڵێنی گەورە دەدەن، زۆربەیان جێبەجێ ناکەن، سەرەڕای دروستکردنی گرفتێکی زۆری سیاسی، بۆیە بەشێکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵگا متمانەیان بە سیاسەت نەماوە و نامۆ بوون لە سیاسەت.

**باسی سێیەم: دەرهاویشتە ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی:**

**یەکەم/ قەیرانی ئابووری: (The Economic Crisis)**

قەیرانی ئابووری حاڵەتێکی مەترسیدارە، هەڕەشە لە دەوڵەت و دەزگاکانی دەکات، بەتایبەتی لەم دەوڵەتانەی کە زیاتر پشت بە یەک سەرچاوەی سەرەکی داهات دەبەستن، لەکاتی کەمبوونی خواستی کڕین لەسەر ئەم سەرچاوەی داهاتە سەرهەڵدەدات.

زۆربەی زانا کلاسیکییەکان گرینگیان بەلێکدانەوەی قەیرانەکانی (زیادەڕۆیی لە بەرهەمهێناندا داوە)، هەریەک لە زانایانی بەریتانی ئادەم سمیث و داڤید ڕیکاردۆ و تۆماس مالتۆس بڕوایان وایە کە قەیرانی ئابووری بەهیچ شێوەیەک ڕوونادات ئەگەر خستنەڕوو و داوا لە یەک ئاستدابن. بەڵام "کارل مارکس" بۆچوونی کلاسیکییەکانی ڕەتکردۆتەوە لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی و مێژووییەوە، مارکس بڕوای وابوو کە هەموو کەسێک هەوڵی قازانجی تایبەتی خۆی دەدات، ئەمەش بەشێوەیەکی نەرێنی ئەنجامی پێچەوانەی دەبێت (الحقون، 2013، ص: 28).

**دووەم/ قەیرانی دارایی: (The Financial Crisis)**

قەیرانی دارایی بەهۆی نەبوونی هاوسەنگیی دارایی لەنێوان ئاستی داهاتی ناوخۆ و ڕێژەی خەرجکردنی داهاتەوە دروست دەبێت، کاتێک کە پلانێکی تۆکمە دانەنرابێت بۆ مەبەستی ڕێگریکردن لە دروستبوونی، ئەوا وڵات ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

**2-2- گرنگترین دەرهاویشتەکانی قەیرانی دارایی لە هەرێمی کوردستاندا:**

2-2-1- پەککەوتنی خزمەتگوزاریی گشتی.

2-2-2- ناڕوونی (شەفافیەت) لە سەرچاوەکانی داهات.

2-2-3- دابەشکردنی سامان بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە.

2-2-4- کەمکردنەوەی مووچە بەناوی پاشەکەوت.

2-2-5- زیادبوونی بێکاری و هەژاری.

2-2-6- لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان.

2-2-7- کەمبوونەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری

2-2-8- بەرزبوونەوەی ڕێژەی لێکجیابوونەوە.

## دەروازەی دووەم- لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکە

### بەشی سێیەم/ چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوەکە:

**یەکەم/ میتۆدی توێژینەوەکە:** (Reaserch Method)

1-2- **میتۆدی وەسفی**: (Descriptive Method)

لەم توێژینەوەیەدا میتۆدی وەسفی و شیکاریمان بەکارهێناوە، بەهۆی بایەخدانی ئەم میتۆدانە بەڕاستییەکانی (واقع) ئێستا. میتۆدی وەسفی دەوەستێتە سەر وەسفکردنی تایبەتمەندییەکانی دیاردەیەکی دیاریکراو و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەم دیاردەیە (عبدالقادر، 2011، ص: 58). لەم جۆرە میتۆدە زانیاریی جۆراوجۆر کۆ دەکرێتەوە، بەڵام تەنیا لە یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە (خەمەش، 2012، ل: 379).

**دووەم/ دیاریکردنی کۆمەڵگا و نموونە و قەبارەی توێژینەوەکە:**

2-1- **کۆمەڵگای توێژینەوەکە:**

کۆمەڵگای توێژینەوەکە بریتییە لە شاری هەولێر (قایمقامیەتی قەزای ناوەندی)، وەک نموونەی توێژینەوەکە بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق،

**خشتەی** (1)

**ڕێژەی دانیشتوانی کۆمەڵگای توێژینەوەکە، شاری هەولێر بۆ ساڵی** 2016.

| شار | ڕێژەی دانیشتوان |
|---|---|
| هەولێر | 796,076(*) |

لە خشتەی (1) دا دەردەکەوێت، کە کۆی گشتی ڕێژەی دانیشتوانی شاری هەولێر (بەگوێرەی بەڕێوەبەرایەتی ئاماری پارێزگای هەولێر) بریتییە لە (796,076) تاکە، بۆ ساڵی 2016.

---

*بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاماری پارێزگای هەولێر، پێشبینی ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر بۆ ساڵی 2016 ڕووندەکاتەوە.

**2-2- نموونەی توێژینەوەكە:**

نموونە كۆمەڵەیەكە نوێنەرایەتی كۆمەڵگای توێژینەوە دەكات لە هەموو ئەم دیاردانەی كە توێژەرێک لێی دەكۆڵێتەوە، وەک: كۆمەڵە كەسێک، یان شتێک، كە بابەتی توێژینەوەكە بێت (دویدري، 2000، ص: 305). ڕێگەی هەڵبژاردنی نموونەی توێژینەوەكە بەشێوەی هەڕەمەكیی چینایەتییە، ئەم جۆرە نموونەیە لەم حاڵەتەدا سوودی زۆرە، كە یەكەكانی نموونەی توێژینەوەكە خەسڵەتی نا هاوشێوەیان هەبێت لە ڕووی شارەزایی و پسپۆڕی؛ بەشێوەیەک (35) یەكە لە ڕۆژنامەنووس و ڕاگەیاندنكار و (23) یەكە لە پارێزەران و (14) یەكە لە پزیشكان و (39) یەكە لە فەرمانبەران و (19) یەكە لە قوتابیانی زانكۆ و (26) یەكە لە كرێكاران و (35) یەكە لە پیشەوەران و (26) یەكە لە نووسەران و (10) یەكە لە خانەنشینان وەرگیراوە، كە كۆی گشتییان دەكاتە (227). لەگەڵ مامۆستا و فەرمانبەرانی دامەزراوە كۆمەڵایەتییەكانی وەک: قوتابخانە و زانكۆ، بەشێوەیەک (32) مامۆستای قوتابخانە، لەگەڵ (52) یەكە لە مامۆستایانی زانكۆی سەلاحەددین، "هەولێر" و (20) یەكە لە فەرمانبەرانی وەرگیراوە، كە كۆی گشتی دەكاتە (72). لەگەڵ ئەندامانی پەیمانگا و ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی، كە كۆی گشتییان (69) یەكە وەک نموونەی توێژینەوەكە وەرگیراون لە شاری هەولێر، كۆی گشتی نموونەی وەرگیراو (400) یەكەیە. وەک لەم خشتانەی خوارەوە چۆنیەتی نموونەی وەرگیراوی توێژینەوەكە ڕووندەكاتەوە:

**2-3- قەبارەی نموونەی توێژینەوەكە:**

وەک ڕێگایەكی هەمیشەیی لە زانستی كۆمەڵایەتییدا، پەنامان بردووە بۆ هەڵبژاردنی نموونە. وەک ئەوەی هەردوو زانایان (مۆزەر و كاڵتۆن) ئاماژەیان پێكردووە، كاتێک كە قەبارەی كۆمەڵگای توێژینەوە گەورە بوو، توێژەر دەتوانێت نموونە بەكاربهێنێت، وەک ڕێگایەكی زانستی (حسن، 2008، ل: 112). بۆ ئەم مەبەستەش (400) یەكە وەک قەبارەی نموونەی توێژینەوەكە وەرگیراوە لە شاری هەولێر.

**سێیەم/ بوارەکانی توێژینەوەی مەیدانی:** بەمەبەستی خستنەڕووی لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکە بەپێویستی دەزانین ئاماژە بە بوارەکانی توێژینەوەکە بکەین، لەڕووی (مرۆیی، شوێنی، کاتی).

3-1- **بواری مرۆیی:** لایەنی مرۆیی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە دەگرێتەوە، بەتایبەت ئەوانەی تەمەنیان لە سەرووی (18) ساڵیدایە. (400) یەکە وەک نموونەی توێژینەوەکە وەرگیراوە.

3-2- **بواری شوێنی:** توێژینەوەکە، لە شاری هەولێر ئەنجامدراوە.

3-3- **بواری کاتی:** ماوەی ئەنجامدانی لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکە، لە 1/8/ 2016 دەستپێدەکات، تا 1/ 1/ 2017.

**چوارەم/ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری:**

4-1- **پرسیارنامەی ڕاپرسی:** بە بەربڵاوترین ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری دادەنریت لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا، ئەمیش بۆ ئەم تایبەتمەندییانە دەگەڕێتەوە کە ئەم ئامرازە بەدەستی دەهێنێت، وەک: کەمی ئەرک، یان تێچوو، ئاسانی لە بەدەستهێنانی زانیاری بەڕێگای ئاماری (البياتي، 2012، ص: 51). توێژینەوەکە، ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای پرسیارنامەی ڕاپرسییەوە بووە بەسەر یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە، پرسیارنامە لە (5) تەوەر پێکهاتووە، هەر تەوەرەکیش لە چەند بڕگەیەک پێکدێت، کۆی گشتی بڕگەکان (54) بڕگە بووە، بەشێوەیەک داوا لە لێتوێژراوان کراوە بەشێوەیەکی ورد و زانستی بڕگەکان دەستنیشان بکەن. بەم شێوەیەی خوارەوە:

4-1-1- **زانیارییە گشتییەکان:** زانیارییە گشتییەکانی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکەیە سەبارەت بە (ڕەگەز، تەمەن، شوێنی نیشتەجێبوون، ئاستی خوێندن، ئاستی ئابووری، باری کۆمەڵایەتی، پیشە، ئینتیمای سیاسی).

4-1-2- **زانیارییە تایبەتییەکان:** پەیوەستن بەم بڕگانەی کە تایبەتن بە ئامانجەکانی توێژینەوەکە. کە هەر ئامانجەو لە تەوەرەیەکدا خراوەتە ڕوو.

**پرسیارنامەی ڕاپرسی، بەگرنگ دادەندرێت لە ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری، ئەمیش پێویستی بەئاستێکی باش لە ڕاستگۆیی (Validity) و جێگیری (Reliability) هەیە.**

4-1-3- **ڕاستگۆیی ڕووکەش:** (Face-Validity) بۆ دەرهێنانی ڕاستگۆیی ڕووکەش، زانیارییە گشتییەکان و زانیارییە تایبەتییەکانی نێو پرسیارنامەی ڕاپرسی کە لە (54) برگە پێکهاتبوو، خستوومانەتە بەر دیدی دەستەیەکی پسپۆڕ بەپلەی پرۆفیسۆر و پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە کۆلیژەکانی، یاسا و زانستە سیاسییەکان، کۆمەڵناسی، دەروونزانی، ئابووری. تاوەکو، بۆچوونی خۆیان لەم بارەوە بخەنەڕوو، لە ئەنجامدا دوای تێبینی و سەرنجی پسپۆڕان برگەکان لەئاستێکی بەرزی زانستییدا مانەوە و بەم شێوەیە ڕێژەی سەدیی ئەم برگانەی ڕەزامەندییان لەسەر درا (97.73%)ە. کە، لە پاشکۆی (2) دا خراوەتە ڕوو.

4-1-4- **جێگیری:** (Reliability) بەمەبەستی دەرهێنانی جێگیری، پرسیارنامەی ڕاپرسیمان دابەش کردووە، بەسەر (15) لە یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە، بەسەر هەردوو ڕەگەز نێر و مێ، دوای (15) ڕۆژ جارێکی تر، پرسیارنامەی ڕاپرسیمان دابەش کردووە بەسەر هەمان لە یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە، دەرکەوت، کە ڕێژەی جێگیری پرسیارنامەی ڕاپرسی بریتییە لە (80.54%) کە، لە پاشکۆی (3) خراوەتە ڕوو.

**پێنجەم/ ئامرازە ئامارییە بەکارهاتووەکان:**

لەم توێژینەوەیەدا پشت بە ئامرازە ئامارییەکانی "هەگبەی ئاماری زانستە کۆمەڵایەتییەکان" (Statistical Package for Social Science)، (SPSS) بەستراوە، لە لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکەشدا سوودی لێوەرگیراوە، بەمەبەستی شیکاری داتا و زانیارییەکان. ئەم ئامرازانەش بریتییە لەمانەی خوارەوە:

1- ناوەنــــدە ژمێریـــی (Mean)، ناوەنـــد (Median)، منـــوال (Mode) ((Agresti and Finlay, witout year, pp, 51-54)). بۆ دەرهێنـانی ناوەندی گۆڕاوەکان و سروشتی نموونە.

2- لادانـی پێـوەری (The Standard Deviation) چەمـاوە (Skewness) شێوازی چەماوەی پانی (Kurtosis) (بکر، 2013، ص: 174). بۆ دەرهێنـانی سروشتی دابەشبوونی نموونەکە.

3- هاوکێشـــەی پەیوەســتی ســپێرمان ( Spearman Correlation Coefficientr) (شـریف، 2016، ل:55). بـۆ دۆزینـەوەی جێگیـری نمـوونەی توێژینەوەکە.

4- هاوکێشەی (ت) بۆ دوو نموونە (Two-Sample T- test) (الحسـن و الزيدي، 1982، ص: 175). بۆ پێوانەکردنی جیاوازی نێوان دوو گۆڕاو.

5- تـاقیکردنەوەی ئەنۆڤا (One -way ANOVA) (ئەحـمەد، 2015، ل: 103). بـــۆ دەرخســـتنی جیـــاوازیی گۆڕاوەکـــان لەســـەر نمـــوونەی توێژینەوەکە.

## بەشی چوارەم:
## باسی یەکەم/ خستنەڕووی زانیارییە گشتییەکانی نموونەی توێژینەوەکە:

لەم توێژینەوەیەدا چەند گۆڕاوێکی، وەک: (ڕەگەز، تەمەن، شـوێنی نیشتەجێبوون، ئاستی خوێندەواری، ئاستی ئابووری، باری کەمەڵایەتـی، پیشـە، ئینتیمای سیاسی) پشتیان پێ بەستراوە، بۆ ئەوەی زانیارییەکانی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە ببەستینەوە بە بابەتی توێژینەوەکە ، بۆ ئەم مەبەستە پشتمان بەهەندێ ئامرازی ژمێریاری و وەسفی بەستووە لەگەڵ بەکارهێنانی خشتە، وەک ئامرازێکی ڕوونکردنەوە، بەم شێوانەی خوارەوە:

**یەکەم/ ڕەگەز:** خشتەی (2)

ڕەگەزەکانی نموونەی توێژینەوەکە

| ڕەگەز | ژمارە | % |
|---|---|---|
| نێر | 247 | %61.75 |
| مێ | 153 | %38.25 |
| کۆ | 400 | %100 |

**دووەم/ تەمەن:** خشتەی (3)

ئاستی تەمەنی نموونەی توێژینەوەکە

| تەمەن | ژمارە | % |
|---|---|---|
| 27 - 18 | 55 | %13.75 |
| 37 - 28 | 192 | %48.0 |
| 47 - 38 | 115 | %28.75 |
| 57 - 48 | 28 | %7.0 |
| 67 - 58 | 10 | %2.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

**سێیەم/ شوێنی نیشتەجێبوون:** خشتەی (4)

شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی توێژینەوەکە

| شوێنی نیشتەجێبوون | ژمارە | % |
|---|---|---|
| شار | 389 | %97.25 |
| لادێ | 11 | %2.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

**چوارەم/ ئاستی خوێندەواری:** خشتەی (5)

ئاستی خوێندەواری نموونەی توێژینەوەكە

| ئاستی خوێندەواری | ژمارە | % |
|---|---|---|
| سەرەتایی | 9 | %2.25 |
| ناوەندی | 17 | %4.25 |
| ئامادەیی | 49 | %12.25 |
| پەیمانگا | 61 | %15.25 |
| زانكۆ | 193 | %48.25 |
| خوێندنی باڵا | 71 | %17.75 |
| كۆی گشتی | 400 | %100 |

**پێنجەم/ ئاستی ئابووری:** خشتەی (6)

ئاستی ئابووری نموونەی توێژینەوەكە

| ئاستی ئابووری | ژمارە | % |
|---|---|---|
| باش | 87 | %21.75 |
| ناوەند | 289 | %72.25 |
| خراپ | 24 | %6 |
| كۆی گشتی | 400 | %100 |

**شەشەم/ باری كۆمەڵایەتی:** خشتەی (7)

باری كۆمەڵایەتی نموونەی توێژینەوەكە

| باری كۆمەڵایەتی | ژمارە | % |
|---|---|---|
| سەڵت | 81 | %20.25 |
| خێزاندار | 313 | %78.25 |
| جیابووەوە | 5 | %1.25 |
| تاك مردوو | 1 | %0.25 |
| كۆی گشتی | 400 | %100 |

**حەوتەم/ پیشە:** خشتەی (8)

پیشەی نموونەی توێژینەوەکە

| پیشە | ژمارە | % |
|---|---|---|
| مامۆستای زانکۆ | 52 | %13 |
| مامۆستای قوتابخانە | 32 | %8 |
| فەرمانبەران | 39 | %9.75 |
| یاریدەدەری توێژەر | 20 | %5 |
| ڕۆژنامەنووس | 24 | %6 |
| ڕاگەیاندنکار | 11 | %2.75 |
| پارێزەران | 23 | %5.75 |
| پزیشکان | 14 | %3.5 |
| قوتابیانی زانکۆ | 19 | %4.75 |
| کرێکاران | 26 | %6.5 |
| پیشەوەران | 35 | %8.75 |
| نووسەران | 26 | %6.5 |
| خانەنشینان | 10 | %2.5 |
| ئەندامانی پەیمانگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی | 20 | % 5 |
| ئەندامانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی | 49 | %12.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

**هەشتەم/ ئینتیمای سیاسی:** خشتەی (9)

ئینتیمای سیاسی نموونەی توێژینەوەکە

| ئینتیمای سیاسی | کۆی گشتی | % |
|---|---|---|
| هەیە | 138 | %34.5 |
| نییە | 262 | %65.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

**باسی دووەم/ خستنەڕووی زانیارییە تایبەتییەکانی نموونەی توێژینەوەکە:**

**یەکەم/ خستنەڕووی ئەنجامەکانی تایبەت بە ئامانجەکانی توێژینەوەکە:**

خشتەی (10)
دەرخستنی ململانێی سیاسی لەسەر لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان

| 1- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 181 | %45.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 160 | %40 |
| لەگەڵیدانیم | 59 | %14.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (11)
دەرهاویشتەی نەرێنی ململانێی سیاسی
لەسەر ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری

| 2- ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 154 | %38.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 182 | %45.5 |
| لەگەڵیدانیم | 64 | %16 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (12)

زانینی دەستوەردانی سیاسی لە قوتابخانەدا.

| % | ژمارە | 3- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی دەستوەردانی سیاسی لە قوتابخانەدا. |
|---|---|---|
| %54 | 216 | لەگەڵیدام |
| %33.25 | 133 | تارادەیەک لەگەڵیدام |
| %12.75 | 51 | لەگەڵیدانیم |
| %100 | 400 | کۆی گشتی |

خشتەی (13)

زانینی بایەخ نەدان بەرۆشنبیرکردنی سیاسی لە قوتابخانەدا

| % | ژمارە | 4- لە قوتابخانە بایەخ بەرۆشنبیرکردنی نیشتیمانی نادرێت. |
|---|---|---|
| %56.25 | 225 | لەگەڵیدام |
| %30.5 | 122 | تارادەیەک لەگەڵیدام |
| %13.25 | 53 | لەگەڵیدانیم |
| %100 | 400 | کۆی گشتی |

خشتەی (14)

زانینی لێکترازانی چەمکەکانی خوێندن وەک (قوتابی، خوێندکار)

| % | ژمارە | 5- لێکترازانی چەمکەکانی خوێندن وەک (قوتابی، خوێندکار) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە. |
|---|---|---|
| %64 | 256 | لەگەڵیدام |
| %27 | 108 | تارادەیەک لەگەڵیدام |
| %9 | 36 | لەگەڵیدانیم |
| %100 | 400 | کۆی گشتی |

خشتەی (15)

زانینی دەستێوەردانی سیاسی لە زانکۆدا

| 6- دەستێوەردانی سیاسی لە زانکۆدا بوونی هەیە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 285 | %71.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 93 | %23.25 |
| لەگەڵیدانیم | 22 | %5.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (16)

سوود وەرنەگرتن لە توانا زانستییەکانی مامۆستایانی زانکۆ بەهۆی پێشینەی سیاسی

| 7- سوود لە توانا زانستییەکانی مامۆستایانی زانکۆ وەرنەگیراوە بەهۆی هەڵوێستی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 242 | %60.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 136 | %34 |
| لەگەڵیدانیم | 22 | %5.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (17)

دەرخستنی ڕۆڵی دەزگا ئایینییەکان لە هێورکردنەوەی ململانێی سیاسی

| 8- دەزگا ئایینییەکان ڕۆڵیان لاوازبووە لە هێورکردنەوەی ململانێی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 213 | %53.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 133 | %33.25 |
| لەگەڵیدانیم | 54 | %13.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (18)

زانینی زۆریی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی حیزبی (بینراو، بیستراو، نووسراو)

| 9- زۆری هۆیەکانی راگەیاندنی حیزبی (بینراو، بیستراو، نووسراو) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 310 | %77.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 78 | %19.5 |
| لەگەڵیدانیم | 12 | %3 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (19)

زانینی کارکردنی هۆیەکانی ڕاگەیاندن بۆ بەرژەوەندیی حیزبە سیاسییەکان

| 10- لە بواری هۆیەکانی راگەیاندن کار بۆ بەرژەوەندیی حیزبە سیاسییەکان دەکرێت. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 318 | %79.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 72 | %18 |
| لەگەڵیدانیم | 10 | %2.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (20)

بێزاری یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لە زۆریی بەرنامە سیاسییەکان

| 11- زۆریی بەرنامە سیاسییەکان بێزاری کردووین. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 265 | %66.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 107 | %26.75 |
| لەگەڵیدانیم | 28 | %7 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (21)

زانینی ڕۆڵی ڕاگەیاندنەکان لە قووڵترکردنی ململانێی سیاسی

| 12- راگەیاندنەکان رۆڵیان هەیە لە قووڵترکردنی ململانێی سیاسی | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 264 | %66 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 116 | %29 |
| لەگەڵیدانیم | 20 | %5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (22)

زانینی لایەنگیری ڕاگەیاندنەکان لە گەیاندنی ڕاستیی زانیارییەکان بەپیشەیی

| 13- راگەیاندنەکان بەهۆی لایەنگیرییان لە گەیاندنی راستی زانیارییەکان بەپیشەیی کارناکەن. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 251 | %62.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 132 | %33 |
| لەگەڵیدانیم | 17 | %4.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (23)

بودجەیەکی زۆر تەرخاندەکرێت بۆ ڕاگەیاندنەکانی حیزبە دەسەلاتدارەکان

| 14- بەهۆی ململانێی سیاسی بودجەیەکی زۆر تەرخاندەکرێت بۆ راگەیاندنی حیزبە دەسەلاتدارەکان. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 303 | %75.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 80 | %20 |
| لەگەڵیدانیم | 17 | %4.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (24)

زانینی ڕۆڵی گرنگی ڕاگەیاندنەکان لە هوشیاریی سیاسی

| 15- راگەیاندنەکان رۆڵی گرنگیان نەبووە لە هوشیاریی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 109 | %27.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 164 | %41 |
| لەگەڵیدانیم | 127 | %31.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (25)

لاوازبوون لە پەیڕەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەهۆی ململانێی سیاسی

| 16- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازی لە پەیرەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 279 | %69.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 74 | %18.5 |
| لەگەڵیدانیم | 47 | %11.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (26)

جێبەجێ نەکردنی یاسا بەیەکسانی بەسەر هاوڵاتییان بەهۆی ململانێی سیاسی

| 17- بەهۆی ململانێی سیاسی یاسا بەسەر هاوڵاتییان بەیەکسانی جێبەجێ ناکرێت. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 317 | %79.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 61 | %15.25 |
| لەگەڵیدانیم | 22 | %5.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (27)
ڕەنگدانەوەی نەرێنی ململانێی سیاسی لەسەر کارکردنی دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی

| 18- ململانێی سیاسی ڕەنگدانەوەی نەرێنی هەبووە لەسەر سەربەخۆبوونی دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 264 | %66 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 100 | %25 |
| لەگەڵیدانیم | 36 | %9 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (28)
ململانێی سیاسی نێو پارتە سیاسییەکان پاڵنەرێکی گرنگی کۆچکردنە بۆ دەرەوەی وڵات

| 19- ململانێی سیاسی نێو پارتە سیاسییەکان پاڵنەرێکی گرنگی کۆچکردنە بۆ دەرەوەی وڵات. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 258 | %64.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 113 | %28.25 |
| لەگەڵیدانیم | 29 | %7.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (29)
کارکردنی حیزبە سیاسییەکان بۆ بەرژەوەندیی پارتەکانیان نەوەک بۆ بەرژەوەندیی گشتی

| 20- حیزبە سیاسییەکان کار بۆ بەرژەوەندیی پارتەکانیان دەکەن نەوەک بۆ بەرژەوەندیی گشتی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 316 | %79 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 68 | %17 |
| لەگەڵیدانیم | 16 | %4 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (30)

زانینی دەرهاویشتەی ململانێی سیاسی لەسەر باری دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگا

| 21- رۆژ بەرۆژ دەرهاویشتەکانی ململانێی سیاسی قووڵتر دەبێتەوە لەسەر باری دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگا. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 247 | %61.75 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 124 | %31 |
| لەگەڵێدانیم | 29 | %7.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (31)

لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خزمایەتی بەهۆی ململانێی سیاسی

| 22- بەهۆی ململانێی سیاسی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خزمایەتی لاواز بووە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 167 | %41.75 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 98 | %24.5 |
| لەگەڵێدانیم | 135 | %33.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (32)

زانینی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان هاوڕێیان بەهۆی ململانێی سیاسی

| 23- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان هاوڕێیان. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 149 | %37.25 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 145 | %36.25 |
| لەگەڵێدانیم | 106 | %26.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (33)

زانینی ڕەوشی کۆمەڵایەتیی هەرێمی کوردستان

بە هۆی ململانێی سیاسی

| 24- بەهۆی ململانێی سیاسی رەوشی کۆمەڵایەتی لە هەرێمی کوردستاندا ئاڵۆز بووە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 231 | %57.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 124 | %31 |
| لەگەڵیدانیم | 45 | %11.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (34)

دەرخستنی کێشە سیاسییەکانی پارتە دەسەڵاتدارەکان

لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا

| 25- تاکەکانی کۆمەڵگا باجی کێشە سیاسییەکانی پارتە دەسەڵاتدارەکان دەداتەوە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 302 | %75.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 76 | %19 |
| لەگەڵیدانیم | 22 | %5.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (35)

ئاشنابوون بە دروستبوونی قەیرانی سیاسی

لە لایەن حیزبە سیاسییەکان

| 26- حیزبە سیاسییەکان بوونەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 262 | %65.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 112 | %28 |
| لەگەڵیدانیم | 26 | %6.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (36)

حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕۆڵی گرنگیان نەبینیوە

لە دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی

| 27- حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕۆڵی گرنگیان نەبینیوە لە دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 233 | %58.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 148 | %37 |
| لەگەڵیدانیم | 19 | %4.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (37)

بوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئاستی هۆشیاریی سیاسی بەرز ناکات

| 28- بوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئاستی هۆشیاریی سیاسی بەرز ناکات. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 72 | %18 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 146 | %36.5 |
| لەگەڵیدانیم | 182 | %45.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (38)

بەرژەوەندیی سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان

وەک هۆکاری توندوتیژی سیاسی

| 29- بەرژەوەندیی سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان هۆکاری توندوتیژی سیاسییە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 289 | %72.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 86 | %21.5 |
| لەگەڵیدانیم | 25 | %6.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (39)
ئاشنابوون بە بایەخدانی تاکەکانی کۆمەڵگا بە پرسە سیاسییەکان

| 30- بەهۆی ململانێ سیاسی تاکەکانی کۆمەڵگا کەمتر بایەخ بە پرسە سیاسییەکان دەدەن. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 249 | %62.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 125 | %31.25 |
| لەگەڵیدانیم | 26 | %6.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (40)
ئاشنابوون بە دەرکەوتنی نامۆبوونی سیاسی بەهۆی ململانێی سیاسی

| 31- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی دەرکەوتنی نامۆبوونی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 308 | %77 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 80 | %20 |
| لەگەڵیدانیم | 12 | %3 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (41)
ڕێکنەکەوتن لەسەر پڕۆژە دەستووری هەرێمی کوردستان لەنێوان حیزبە سیاسییەکان

| 32- ڕێکنەکەوتن لەسەر پڕۆژە دەستوور لەنێوان حیزبە سیاسییەکان بەهۆی ململانێی سیاسییە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 244 | %61 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 124 | %31 |
| لەگەڵیدانیم | 32 | %8 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (42)

ئاشنابوون بە بەکارهێنانی ئایینەکان بۆ بەرژەوەندیی پارتە سیاسییەکان

| 33- بەهۆی ململانێی سیاسی ئایینەکان بەکاردەهێنرێن بۆ بەرژەوەندیی پارتە سیاسییەکان. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 315 | %78.75 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 74 | %18.5 |
| لەگەڵێدانیم | 11 | %2.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (43)

ئاشنابوون بە پەروەردەکردنی ئەندامەکانی
حیزبی سیاسی لەسەر بنەمای حیزبایەتی تەسک

| 34- حیزبە سیاسییەکان ئەندامەکانیان لەسەر بنەمای حیزبایەتی تەسک پەروەردە دەکەن. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 293 | %73.25 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 81 | %20.25 |
| لەگەڵێدانیم | 26 | %6.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (44)

ئاشنابوون بە پەککستنی دەسەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان)
بە هۆی ململانێی سیاسی

| 35- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی پەککستنی دەسەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان). | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵێدام | 322 | %80.5 |
| تارادەیەک لەگەڵێدام | 61 | %15.25 |
| لەگەڵێدانیم | 17 | %4.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (45)

ململانێی سیاسی نێو حیزبە سیاسییەکان بووەتە هۆی

ڕێکنەخستنی نێو ماڵی کوردی

| 36- ململانێی سیاسی نێو حیزبە سیاسییەکان بووەتە هۆی ڕێکنەخستنی نێو ماڵی کوردی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 322 | %80.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 58 | %14.5 |
| لەگەڵیدانیم | 20 | %5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (46)

ئاشنابوون بە دەستوەردانی دەرەکی لە هەرێمی کوردستاندا

| 37- دەستوەردانی دەرەکی لە هەرێمی کوردستاندا یەکێکە لە هۆکارەکانی دروستبوونی ململانێی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 275 | %68.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 93 | %23.25 |
| لەگەڵیدانیم | 32 | %8 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (47)

پەرەسەندنی ململانێی سیاسی بەهۆی شکست

لە دەستاو دەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات

| 38- شکست لە دەستاو دەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات هۆی پەرەسەندنی ململانێی سیاسی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 283 | %70.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 89 | %22.25 |
| لەگەڵیدانیم | 28 | %7 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (48)

دەرهاویشتەی نەرێنی ململانێی سیاسی لەسەر ئەنجامدانی ڕیفراندۆم

| 39- ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی ڕیفراندۆم بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 279 | %69.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 88 | %22 |
| لەگەڵیدانیم | 33 | %8.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (49)

قۆرخکردنی ئابووری وڵات لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە

| 40- حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئابووری وڵاتیان قۆرخکردووە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 332 | %83 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 56 | %14 |
| لەگەڵیدانیم | 12 | %3 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (50)

لاوازبوونی پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری بەهۆی ململانێی سیاسی

| 41- بەهۆی ململانێی سیاسی پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری لاواز بووە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 307 | %76.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 83 | %20.75 |
| لەگەڵیدانیم | 10 | %2.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (51)
شکست لە سیستەمی سیاسی بووەتە هۆی
شکستهێنان لە سیستەمی دارایی

| 42- شکست لە سیستەمی سیاسی بووەتە هۆی شکستهێنان لە سیستەمی دارایی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 309 | %77.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 78 | %19.5 |
| لەگەڵیدانیم | 13 | %3.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (52)
دروستبوونی قەیرانی دارایی بەهۆی ململانێی حیزبە دەسەڵاتدارەکان

| 43- دروستبوونی قەیرانی دارایی هۆکاری ململانێی حیزبە دەسەڵاتدارەکانە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 292 | %73 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 83 | %20.75 |
| لەگەڵیدانیم | 25 | %6.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (53)
دروستبوونی قەیرانی دارایی بەهۆی شکست
لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئابووریی ئازاد

| 44- شکست لەبەڕێوەبردنی سیاسەتی ئابووریی سەربەخۆ هۆکاری دروستبوونی قەیرانی داراییین. | ژمارە | ڕێژەی سەددی |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 283 | %70.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 93 | %23.25 |
| لەگەڵیدانیم | 24 | %6 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (54)

ناڕوونی سەرچاوەکانی داهات بەهۆی ململانێی سیاسی

| 45- ململانێی سیاسی بووەتە هۆی ناروونی سەرچاوەکانی داهات. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 307 | %76.75 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 71 | %17.75 |
| لەگەڵیدانیم | 22 | %5.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (55)

دروستبوونی قەیرانی دارایی

بەهۆی بڕینی بودجەی هەرێمی کوردستان

| 46- برینی بودجەی هەرێمی کوردستان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بووەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی دارایی. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 204 | %51 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 138 | %34.5 |
| لەگەڵیدانیم | 58 | %14.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (56)

ئاڵۆزبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان

بەهۆی قەیرانی دارایی

| 47- قەیرانی دارایی بووەتە هۆی ئاڵۆزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 281 | %70.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 101 | %25.25 |
| لەگەڵیدانیم | 18 | %4.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (57)
دواخستنی پرۆسەی هاوسەرگیری بەهۆی قەیرانی دارایی

| 48- قەیرانی دارایی بووەتە هۆی دواخستنی پرۆسەی هاوسەرگیری. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 286 | %71.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 95 | %23.75 |
| لەگەڵیدانیم | 19 | %4.75 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (58)
بەرزبوونەوەی ڕێژەی جیابوونەوە بەهۆی قەیرانی دارایی

| 49- قەیرانی دارایی بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی جیابوونەوە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 276 | %69 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 95 | %23.75 |
| لەگەڵیدانیم | 29 | %7.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (59)
بوونی گەندەڵی بەهۆی ململانێی حیزبە سیاسییەکانە

| 50- بوونی گەندەڵی بەهۆی ململانێی حیزبە سیاسییەکانە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 334 | %83.5 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 53 | %13.25 |
| لەگەڵیدانیم | 13 | %3.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (60)
ئەنجامدانی زۆرترین گەندەڵی لەلایەن بەرپرسە سیاسییەکانەوە

| 51- زۆرترین گەندەڵی کە ئەنجام دەدرێت لەلایەن بەرپرسە سیاسییەکانەوەیە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 333 | %83.25 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 53 | %13.25 |
| لەگەڵیدانیم | 14 | %3.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (61)
ئەنجامدانی دەرفەت بەگەندەڵکاران تا زیاتر گەندەڵی ئەنجام بدەن بەهۆی ململانێ ی سیاسی

| 52- ململانــێ سیاســییەکان دەرفەتیــان بەگەنــدەڵکاران داوە تــا زیــاتر گەنــدەڵی ئەنجام بدەن. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 328 | %82 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 60 | %15 |
| لەگەڵیدانیم | 12 | %3 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (62)
ئەنجام نەدانی دادپەروەری بەهۆی بڕینی مووچە بەناوی پاشەکەوت

| 53- بڕینــی مــووچە بەنــاوی پاشــەکەوت دادپەروەری تیایدا ئەنجام نەدراوە. | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 324 | %81 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 63 | %15.75 |
| لەگەڵیدانیم | 13 | %3.25 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

خشتەی (63)

بوونە قوربانی چینی ناوەند لە کۆمەڵگادا بەهۆی ململانێی سیاسی

| 54- چینی ناوەند لە کۆمەڵگادا بوونەتە قوربانی ململانێی سیاسی | ژمارە | % |
|---|---|---|
| لەگەڵیدام | 324 | %81 |
| تارادەیەک لەگەڵیدام | 66 | %16.5 |
| لەگەڵیدانیم | 10 | %2.5 |
| کۆی گشتی | 400 | %100 |

**دووەم/ پەیوەندی و ئاستی پەیوەستی تەوەرەکانی توێژینەوەکە بەیەکتری:**

خشتەی (64)

پەیوەندی و ئاستی پەیوەستی تەوەرەکانی توێژینەوەکە بەیەکتری

| تەوەرەکان | ناوەندی ژمێری | لادانی پێوەری | تەوەری یەکەم | تەوەری دووەم | تەوەری سێیەم | تەوەری چوارەم | تەوەری پێنجەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەکەم | 30.79 | 4.051 | 1 | .510** | .476** | .643** | .571** | .799** |
| دووەم | 20.09 | 3.184 | | 1 | .506** | .565** | .506** | .733** |
| سێیەم | 18.06 | 2.411 | | | 1 | .635** | .535** | .731** |
| چوارەم | 38.77 | 4.930 | | | | 1 | .722** | .901** |
| پێنجەم | 42.92 | 5.102 | | | | | 1 | .859** |
| کۆی گشتی | 150.62 | 16.155 | | | | | | 1 |

لە خشتەی (64) دا بەپشت بەستن بە بەهای خشتەیی ( Pearson correlation) کە بریتی بووە لە (0.082) بۆ (400) یەکە، بە ئاستی دەلالەتی (0.05)، دەرکەوتووە کە تەوەرەکانی پێوەری ڕاپرسی سەبارەت بە

بـابەتی تـوێژینەوەکە واتـادار و ڕاسـتەوانەیە، چـونکە بەهـای خشـتەی (Pearson correlation)، (0.082)، بچـووکترە لە بەهـای تەوەرەکـان. بەهـۆی ئەوەی سـەرجەمی هاوکێشـەی پەیوەسـتی نێـوان تەوەرەکـان دەکەوێـتە نێـوان (476. - 901.) کە هەڵگـری بەهـای بەرزن، ئەمەش گوزارشـت لە پەیوەندیی بەهێزی نێوان تەوەرەکان دەکات، بەهەمـان شـێوە پەیوەنـدی لە نێوان تەوەرەکان بە کۆی گشتی واتادار و ڕاستەوانەیە.

**سێیەم/ خەسڵەتە ئامارە وەسفییەکانی نموونەی توێژینەوەکە:**

دەرهێنانی ئەدگارە ئاماریيە وەسفییەکانی توێژینەوەکە، کە وەڵامی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکەن، لە خشتەی (65) دا خراوەتە ڕوو:

خشتەی (65)
خەسڵەتە ئاماریيە وەسفییەکانی نموونەی توێژینەوەکە

| خەسڵەتەکانی ئاماری وەسفی | تەمەن | تەوەری یەکەم | تەوەری دووەم | تەوەری سێیەم | تەوەری چوارەم | تەوەری پێنجەم | کۆی گشتی بڕگەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **ژمارە** (N) | 400 | 400 | 400 | 400 | 400 | 400 | 400 |
| **ناوەندی ژمێری** (Mean) | 36.00 | 30.79 | 20.09 | 18.06 | 38.77 | 42.92 | 150.62 |
| **ل.پ.لە ناوەندیی ژمێری** (Std. Error of Mean) | 0.418 | 0.203 | 0.159 | 0.121 | 0.247 | 0.255 | 0.808 |
| **ناوەند** (Median) | 35.00 | 32.00 | 21.00 | 19.00 | 40.00 | 44.00 | 154.00 |
| **منوال** (Mode) | 35 | 33 | 24 | 19 | 43 | 48 | 152 |
| **لادانی پێوەری** (Std. Deviation) | 8.368 | 4.051 | 3.184 | 2.411 | 4.930 | 5.102 | 16.155 |
| **لاری** (Skewness) | 0.864 | -1.057 | -0.925 | -0.992 | -1.149 | -1.412 | -1.218 |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **بڵاوبوونەوە** (Kurtosis) | 1.104 | 0.835 | 0.668 | 0.631 | 0.892 | 1.747 | 1.085 |
| **دووری** (Range) | 49 | 21 | 15 | 12 | 23 | 24 | 77 |
| **کەمترین** (Minimum) | 18 | 15 | 9 | 9 | 22 | 24 | 95 |
| **بەرزترین** (Maximum) | 67 | 36 | 24 | 21 | 45 | 48 | 172 |

لە خشـــتەی (65) دا، ئاشـــنا دەبـــین بە خەســـڵەتە ئامـــارییە وەسفییەکانی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە وەک: ناوەندیی ژمێری، لادانـی پێـوەر لە ناوەنـدەیی ژمێـری، ناوەنـد، لادانـی پێـوەری، لاری، بڵاوبوونـەوە، دووریـی، کەمتـرین و بەرزتـرین دەرهێنـراون، کە وەڵامـی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکەن بۆ تەوەرەکانی توێژینەوەکە و کۆی گشتی بڕگەکانی توێژینەوەکە.

**چوارەم/ هەڵسەنگاندنی تەوەرەکانی ڕاپرسی بەپێی گۆڕاوەکان:**

بۆ زانینی کاریگەری گۆڕاوی تەوەرەکانی ڕاپرسـی لەسـەر بابەتی توێژینەوەکە، توێژەر هەڵساوە بە بەکارهێنـانی هاوکێشـەی (ت) بـۆ دوو گۆڕاوی جیاواز، (Two-Sample T-test) وەک گۆڕاوەکانی (ڕەگەز، شـوێنی نیشـتەجێبوون، ئینتیمـای سیاسـی). ئەوانەشـی کە لە دوو گـۆڕاو زیـاتر بوون پشتمان بەستووە بە هاوکێشەی ئەنۆڤا (One- wey ANOVA)، وەک گۆڕاوەکـــانی (تەمەن، ئاســـتی خوێنـــدن، ئاســـتی ئـــابووری، بـــاری کـۆمەڵایەتی) بەئاسـتی دەلالەتـی (0.05) وەک لـەم خشـتانەی خـوارەوەدا هاتووە:

خشتەی (66)
ئەنجامی تاقیکردنەوەی (ت) بۆ دەرخستنی جیاوازی
لە نێوان ڕەگەز بەپێی تەوەرەکان

| تەوەرەکان | ڕەگەز | ژمارە (ن) | ناوەندە ژمێرەیی | لادانی پێوەری | بەهای (ت) ی دەرهێندراو | خشتەیی | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەکەم | نێر | 247 | 31.105 | 4.031 | 1.88 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 30.331 | 4.049 | | | |
| دووەم | نێر | 247 | 20.342 | 3.079 | 1.95 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 19.712 | 3.305 | | | |
| سێیەم | نێر | 247 | 18.232 | 2.385 | 1.70 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 17.816 | 2.435 | | | |
| چوارەم | نێر | 247 | 38.844 | 4.994 | 0.38 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 38.650 | 4.849 | | | |
| پێنجەم | نێر | 247 | 43.122 | 4.950 | 0.95 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 42.626 | 5.318 | | | |
| کۆی گشتی بڕگەکان | نێر | 247 | 151.646 | 15.845 | 1.53 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | مێ | 153 | 149.135 | 16.532 | | | |

لە خشتەی (66) دا دەردەکەوێت، کە گۆڕاوی ڕەگەز کاریگەری لەسەر تەواوی تەوەرەکانی بابەتی توێژینەوەکە نەبووە، چونکە بەهای (ت) ی دەرهێنراوی تەوەرەکان بچووکتر بوونە لە بەهایی (ت) ی خشتەیی (1.96) بەپلەی ئازادیی (398) و ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە ڕەگەز جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری نەبووە.

خشتەی (67)

جیاوازی لە نێوان ئاستی تەمەن بەپێی تەوەرەکان

بەڕێگای One-way ANOVA

| تەوەرەکان | بەهای (ف) ی | | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|
| | دەرهێندراو | خشتەیی | |
| یەکەم | 1.738 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| دووەم | 1.897 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| سێیەم | 2.271 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| چوارەم | 2.148 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| پێنجەم | 0.426 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| کۆی گشتی برگەکان | 1.927 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |

لە خشتەی (67) دا دەردەکەوێت، کە گۆڕاوی تەمەن کاریگەری لەسەر تەواوی تەوەرەکانی بابەتی توێژینەوەکە نەبووە، چونکە بەهای (ف) ی دەرهێنراوی تەوەرەکان بچووکترن لە بەهایی (ف) ی خشتەیی بەئاستی دەلالەتی (0.05).

خشتەی (68)

تاقیکردنەوەی (ت) بۆ دەرخستنی جیاوازیی نێوان لە شوێنی نیشتەجێبوون بەپێی تەوەرەکان

| تەوەرەکان | شوێنی نیشتەجێ | ژمارە (ن) | ناوەندە ژمێرەیی | لادانی پێوەری | بەهای (ت) ی | | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | دەرهێندراو | خشتەیی | |
| یەکەم | شار | 389 | 30.77 | 4.080 | 0.62 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 31.55 | 2.876 | | | |
| دووەم | شار | 389 | 20.14 | 3.170 | 1.92 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 18.27 | 3.319 | | | |
| سێیەم | شار | 389 | 18.06 | 2.428 | 0.29 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 18.27 | 1.794 | | | |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چوارەم | شار | 389 | 38.77 | 4.937 | 0.02 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 38.73 | 4.901 | | | |
| پێنجەم | شار | 389 | 42.89 | 5.137 | 0.65 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 43.91 | 3.700 | | | |
| ک/ گشتی بڕگەکان | شار | 389 | 150.62 | 16.245 | 0.02 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | گوند | 11 | 150.73 | 13.207 | | | |

لە خشتەی (68) دا دەردەکەوێت، کە گۆڕاوی شوێنی نیشتەجێبوون کاریگەری لەسەر تەواوی تەوەرەکانی بابەتی توێژینەوەکە نەبووە، چونکە بەهای (ت) ی دەرهێنراوی تەوەرەکان بچووکتر بوونە لە بەهایی (ت) ی خشتەیی (1.96) بەپلەی ئازادیی (398) و بە ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە شوێنی نیشتەجێبوون جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری نەبووە.

خشتەی (69)

جیاوازی لە نێوان ئاستی خوێندن بەپێی تەوەرەکان

بەرێگای One-way ANOVA

| تەوەرەکان | بەهای (ف) ی دەرهێندراو | بەهای (ف) ی خشتەیی | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|
| یەکەم | 1.606 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| دووەم | 0.353 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| سێیەم | 0.345 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| چوارەم | 2.561 | 2.394 | **ئاماژەدارە** |
| پێنجەم | 1.106 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |
| کۆی گشتی بڕگەکان | 1.188 | 2.394 | ئاماژەدار نییە |

لە خشتەی (69) دا دەردەکەوێت، کە گۆڕاوی ئاستی خوێندن کاریگەری لەسەر تەوەرەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم و پێنجەم

بابەتی توێژینەوەكە نەبووە، چونكە بەهای (ف) ی دەرهێنراوی تەوەرەكان بچووكتر بوونە لە بەهایی (ف) ی خشتەیی بە ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە جیاوازییەكی خاوەن گوزارشتی ئاماری نەبووە. بەڵام لە تەوەری چوارەم (دەرهاویشتە سیاسییەكانی ململانێی سیاسی) دەبینین بەهای (ف) دەرهێنراوی بریتییە لە (2.561)، بەمەش گەورەترە لە بەهای (ف) خشتەیی (2.394) بە ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە ئاماژەدار بووە، كەواتە ئاستی خوێندن لە تەوەری چوارەم جیاوازییەكی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری هەیە.

خشتەی (70)
جیاوازی لە نێوان ئاستی ئابووری بەپێی تەوەرەكان
بەڕێگای One-way ANOVA

| تەوەرەكان | بەهای (ف) ی | | ئاستی دەلالەت |
|---|---|---|---|
| | دەرهێندراو | خشتەیی | 0.05 |
| یەكەم | 1.696 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |
| دووەم | 0.962 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |
| سێیەم | 0.285 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |
| چوارەم | 0.955 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |
| پێنجەم | 0.024 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |
| كۆی گشتی برگەكان | 0.769 | 3.0185 | ئاماژەدار نییە |

لە خشتەی (70) دا دەردەكەوێت، كە گۆڕاوی ئاستی ئابووری كاریگەری لەسەر تەواوی تەوەرەكانی بابەتی توێژینەوەكە نەبووە، چونكە بەهای (ف) ی دەرهێنراوی تەوەرەكان بچووكترن لە بەهایی (ف) ی خشتەیی بە ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە تەمەن جیاوازییەكی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری نەبووە.

خشتەی (71)
جیاوازی لەنێوان باری کۆمەڵایەتی بەپێی تەوەرەکان
بەڕێگای One-way ANOVA

| تەوەرەکان | بەهای (ف) ی | | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|
| | دەرهێندراو | خشتەیی | |
| یەکەم | 1.848 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |
| دووەم | 0.553 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |
| سێیەم | 0.499 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |
| چوارەم | 0.416 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |
| پێنجەم | 0.974 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |
| کۆی گشتی بڕگەکان | 0.618 | 2.3945 | ئاماژەدار نییە |

لە خشتەی (71) دا دەردەکەوێت، کە گۆڕاوی ئاستی ئابووری کاریگەری لەسەر تەواوی تەوەرەکانی بابەتی توێژینەوەکە نەبووە، چونکە بەهای (ف) ی دەرهێنراوی تەوەرەکان بچووکترن لە بەهایی (ف) ی خشتەیی بە ئاستی دەلالەتی (0.05).

خشتەی (72)
تاقیکردنەوەی (ت) بۆ دەرخستنی جیاوازی
لە نێوان ئینتیمای سیاسی بەپێی تەوەرەکان

| تەوەرەکان | ئینتیمای سیاسی | ژمارە (ن) | ناوەندە ژمێرەیی | لادانی پێوەری | بەهای (ت) ی | | ئاستی دەلالەت 0.05 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | دەرهێندراو | خشتەیی | |
| یەکەم | هەیە | 138 | 30.05 | 4.409 | 2.66 | 1.96 | **ئاماژەدارە** |
| | نییە | 262 | 31.18 | 3.801 | | | |
| دووەم | هەیە | 138 | 19.86 | 3.112 | 1.04 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | نییە | 262 | 20.21 | 3.220 | | | |
| سێیەم | هەیە | 138 | 17.80 | 2.440 | 1.55 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | نییە | 262 | 18.20 | 2.389 | | | |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چوارەم | هەیە | 138 | 38.32 | 4.731 | 1.31 | 1.96 | ئاماژەدار نییە |
| | نییە | 262 | 39.00 | 5.025 | | | |
| پێنجەم | هەیە | 138 | 42.12 | 5.154 | 2.27 | 1.96 | **ئاماژەدارە** |
| | نییە | 262 | 43.34 | 5.034 | | | |
| ک/ گشتی برگەکان | هەیە | 138 | 148.15 | 16.688 | 2.23 | 1.96 | **ئاماژەدارە** |
| | نییە | 262 | 151.92 | 15.744 | | | |

لە خشتەی (72) دا دەردەکەوێت، کە ئینتیمای سیاسی کاریگەری لەسەر هەندێک لە تەوەرەکانی بابەتی توێژینەوەکە هەبووە، لە تەوەری یەکەمدا بەهای (ت) دەرهێنراو بریتییە لە (2.66)، کە گەورەترە لە بەهای (ت) ی خشتەیی (1.96)، بە پلەی ئازادیی (398) و ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری هەبووە.

لە تەوەری پێنجەمدا بەهای (ت) دەرهێنراو بریتییە لە (2.27)، گەورەترە لە بەهایی (ت) ی خشتەیی (1.96) بە پلەی ئازادیی (398) و ئاستی دەلالەتی (0.05)، بۆیە جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری هەبووە. هەریەک لە تەوەرەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم بەهای (ت) دەرهێنراو بچووکتر بووە لە بەهای (ت) خشتەیی، بۆیە جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماریان نەبووە، لە ئەنجامدا ئینتیمای سیاسی جیاوازییەکی ئاماژەداری خاوەن گوزارشتی ئاماری هەبووە بەکۆی گشتی بڕگەکانی بەهای (ت) ی دەرهێنراو، کە بریتیی بووە لە (2.23).

**بەشی پێنجەم**

**تاوتوێکردنی ئەنجام و پێشنیاز و ڕاسپاردەکانی توێژینەوەکە**

لەم بەشەدا توێژەر لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئامانجانەی کە بەدەستهاتوون لە خستنەڕووی خشتەکانی کاری مەیدانی توێژینەوەکە، تاوتوێی ئامانجەکانی توێژینەوەکە بە ئەنجامەکان دەکات لەپێناو گەیشتن بە خستنەڕووی ڕاسپاردە و پێشنیازەکان:

**باسی یەکەم/ یەکەم/ تاوتوێکردنی ئامانجەکانی توێژینەوەکە بەئەنجامەکان**

-1-1 **ئامانجی یەکەمی توێژینەوەکە، زانینی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە:**

لە پێوانەکردنی ئەم ئامانجە بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین، بە پشتبەستن بەم داتایانەی کە لە خشتەکانی (10- 24) دا هاتوون. لە خشتەی (10) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان، بەرێژەی (45.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (11) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری؛ ململانێی سیاسی تاڕادەیەک دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری، بە ڕێژەی (45.5%) یەکە کە تاڕادەیەک لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (12) ململانێی سیاسی بووەتە هۆی دەستوەردانی سیاسی لە قوتابخانەدا، بەرێژەی (54%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (13) دا لە قوتابخانە بایەخ بە ڕۆشنبیرکردنی نیشتمانی نادرێت، بەرێژەی (56.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (14) دا ئاماژە بەوەکراوە کە لێکترازانی چەمکەکانی خوێندن وەک: (قوتابی، خوێندکار) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە، بەرێژەی (64%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (15) دا دەستێوەردانی سیاسی لە زانکۆدا بوونی هەیە، بەرێژەی (71.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (16) دا سوود لە توانا زانستییەکانی مامۆستایانی زانکۆ وەرنەگیراوە بەهۆی هەڵوێستی سیاسی، بەرێژەی (60.5%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (17) دا دەزگا ئایینییەکان ڕۆڵیان لاوازبووە لە هێورکردنەوەی ململانێی سیاسی، بە ڕێژەی (53.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە.

لە خشـــتەی (18) دا ئامـــاژە بەوەکـــراوە کە زۆری هۆیەکـــانی ڕاگەیاندنی حیزبی (بینراو، بیستراو، نووسراو) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە، بەڕێژەی (77.5%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (19) دا لە بـــواری هۆیەکـــانی ڕاگەیانـــدن کـــار بـــۆ بەرژەوەنـــدیی حیـــزبە سیاســـییەکان دەکرێـــت، بەڕێـــژەی (79.5%) ی یەکە لەگەڵیـــدابوونە. لە خشتەی (20) دا زۆری بەرنامە سیاسییەکان بێزاری کردووین، بەڕێژەی (66.25%) ی یەکەکـان لەگەڵیـدابوونە. لە خشـتەی (21) دا ڕاگەیانـدنەکان ڕۆڵیان هەیە لە قووڵترکردنی ململانێی سیاسی، بەڕێژەی (66%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (22) دا ڕاگەیاندنەکان بەهـۆی لایەنگیرییـان لە گەیاندنی ڕاستیی زانیارییەکان بەپیشـەیی کارناکەن، بەڕێژەی (62.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (23) دا بەهـۆی ململانێی سیاسـی بودجەیەکی زۆر تەرخاندەکرێت بۆ ڕاگەیاندنی حیزبە دەسـەڵاتدارەکان، بەڕێـــــژەی (75.75%) ی یەکە لەگەڵیـــــدابوونە. لە خشـــــتەی (24) دا ڕاگەیانـدنەکان ڕۆڵـی گرنگیـان نەبـووە لە هوشـیاربوونەوەی سیاسـی، لێـرەدا دەگەیـنە ئەم ئەنجـامەی کە ڕاگەیانـدنەکان تـاڕادەیەک ڕۆڵـی گرنگیـان نەبـووە لە هوشـیاربوونەوەی سیاسـی، بەهـۆی ئەوەی ڕێژەی (41%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە تاڕادەیەک لەگەڵیدابوونە.

لەم داتایـانەی کە لە خشـتەکانی (25- 34) دا هـاتووە. لە خشـتەی (25) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ململانێی سیاسـی بووەتە هـۆی لاوازی لە پەیڕەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بەڕێژەی (69.75%) ی یەکەکانی نمـــوونەی تـــوێژینەوەکە لەگەڵیـــدابوونە،. لە خشـــتەی (26) دا بەهـــۆی ململانێی سیاسی یاسا بەسەر هاوڵاتییان بە یەکسانی جێبەجێ ناکرێت، بەڕێـــژەی (79.25%) ی یەکەکـــان لەگەڵیـــدابوونە. لە خشـــتەی (27) دا ململانێی سیاسی ڕەنگدانەوەی نەرێنی هەبووە لەسـەر سـەربەخۆبوونی ڕێکخراوەکـــانی کۆمەڵگـــای مەدەنـــی، بەڕێـــژەی (66%) ی یەکە لەگەڵیـدابوونە. لە خشـتەی (28) دا ئامـاژە بەوە کـراوە کە ململانێـی سیاسـی نێـو پـارتە سیاسـییەکان پـاڵنەرێکی گرنگـی کـۆچکردنە بـۆ

دەرەوەی وڵات، بەڕێــژەی (64.5%) ی یەکەکــان لەگەڵیــدابوونە. لە خشتەی (29) دا حیزبە سیاسییەکان کار بۆ بەرژەوەندیی پارتەکانیان دەکەن نەوەک بــۆ بەرژەوەنــدیی گشــتی، بەڕێــژەی (79%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (30) دا ڕۆژ بەڕۆژ دەرهاویشتەکانی ململانێی سیاسی قووڵتر دەبێتەوە لەسەر باری دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگا، بەڕێژەی (61.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (31) دا بەهۆی ململانێی سیاسی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خزمایەتی لاواز بووە، بەڕێژەی (41.75%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (32) دا ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان هاوڕێیان، بەڕێژەی (37.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (33) دا بەهۆی ململانێی سیاسی ڕەوشی کۆمەڵایەتیی هەرێمی کوردستان ئاڵۆز بووە، بەڕێژەی (57.75%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (34) دا تاکەکانی کۆمەڵگا باجی کێشە سیاسییەکانی پارتە دەسەڵاتدارەکان دەداتەوە، بەڕێــژەی (75.5%) ی یەکەکــانی نمــوونەی تــوێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە.

**1-2- ئامانجی دووەمی توێژینەوەکە، ئاشنابوون بە دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە:**

لە پێوانەکردنی ئەم ئامانجەش بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین، بە پشتبەستن بەم داتایانەی کە لە خشتەکانی (35- 48) دا هاتووە. لە خشتەی (35) دا ئاماژە بەوەکراوە کە حیزبە سیاسییەکان بوونەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی سیاسی، بەڕێژەی (65.5%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (36) دا حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕۆڵی گرنگیان نەبینیوە لە دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی، بەڕێژەی (58.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (37) دا ئاماژە بەوەکراوە کە بوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئاستی هۆشیاری سیاسی بەرز ناکات، لێرەدا دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵ ئەوەدا نەبوونە کە بوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی

ئاستی هۆشیاری سیاسی بەرز ناکات، چونکە بەزۆرترین ڕێژەی (45.5%) ی یەکەکان لەگەڵیدانەبوونە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بوونی ئۆپۆزسیۆن لە پرسە سیاسییەکانی سەردەم، ئاستی هۆشیاری سیاسیی تاکەکانی کۆمەڵگا بەرز دەکاتەوە. لە خشتەی (38) دا بەرژەوەندیی سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان هۆکاری توندوتیژیی سیاسین، بەڕێژەی (72.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (39) دا بەهۆی ململانێی سیاسی تاکەکانی کۆمەڵگا کەمتر بایەخ بە پرسە سیاسییەکان دەدەن، بەڕێژەی (62.25%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (40) ململانێی سیاسی بووەتە هۆی دەرکەوتنی نامۆبوونی سیاسی، بەڕێژەی (77%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (41) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ڕێکنەکەوتن لەسەر پڕۆژە دەستووری هەرێمی کوردستان لەنێوان حیزبە سیاسییەکان بەهۆی ململانێی سیاسییە، بەڕێژەی (61%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (42) دا بەهۆی ململانێی سیاسی ئایینەکان بەکاردەهێنرێن بۆ بەرژەوەندیی پارتە سیاسییەکان، بەڕێژەی (78.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (43) دا حیزبە سیاسییەکان ئەندامەکانیان لەسەر بنەمای حیزبایەتیی تەسک پەروەردە دەکەن، بەڕێژەی (73.25%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (44) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ململانێی سیاسی بووەتە هۆی پەکخستنی دەزگای یاسادانان (پەرلەمان). بە زۆرترین ڕێژەی (80.5%)ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (45) دا ئاماژە بەوەکراوە کە ململانێی سیاسی نێو حیزبە سیاسییەکان بووەتە هۆی ڕێکنەخستنی نێو ماڵی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا، بەزۆرترین ڕێژەی (80.5%)ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (46) دا دەستوەردانی دەرەکی لە هەرێمی کوردستان یەکێکە لە هۆکاری دروستبوونی ململانێی سیاسیی ناوخۆ، بەڕێژەی (68.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (47) شکست لە دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات بووەتە هۆی پەرەسەندنی ململانێی سیاسی، بەڕێژەی (70.75%) ی یەکەکان

لەگەڵیدابوونە، لە خشتەی (48) دا ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی ریفراندۆم بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، بەرێژەی (69.75%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە.

**1-3- ئامانجی سێیەمی توێژینەوەکە، گەیشتن بە دەرهاویشتە ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە:**

لە پێوانەکردنی ئەم ئامانجەش بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین، بە پشتبەستن بەم داتایانەی کە لە خشتەکانی (49- 63) دا هاتووە. لە خشتەی (49) دا ئاماژە بەوەکراوە کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئابووری وڵاتیان قۆرخ کردووە، بە رێژەی (83%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (50) دا بەهۆی ململانێی سیاسی پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری لاواز بووە، بەرێژەی (76.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (51) دا شکست لە سیستەمی سیاسی بووەتە هۆی شکستهێنان لە سیستەمی دارایی، بەرێژەی (77.25%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (52) دا ئاماژە بەوەکراوە کە دروستبوونی قەیرانی دارایی هۆکاری ململانێی حیزبە سیاسییەکانە، بەرێژەی (73%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (53) دا شکست لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئابووریی سەربەخۆ هۆکاری دروستبوونی قەیرانی داراییە، بەرێژەی (70.75%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (54) دا ململانێی سیاسی بووەتە هۆی ناڕوونی سەرچاوەکانی داهات، بەرێژەی (76.75%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (55) دا بڕینی بودجەی هەرێمی کوردستان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بووەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی دارایی، بەرێژەی (51%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (56) دا قەیرانی دارایی بووەتە هۆی ئاڵۆزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان، بەرێژەی (70.25%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (57) دا قەیرانی دارایی بووەتە هۆی دواخستنی پرۆسەی هاوسەرگیری، بەرێژەی (71.5%)

ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (58) دا قەیرانی دارایی بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی جیابوونەوە، بەڕێژەی (69%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (59) دا بوونی گەندەڵی بەهۆی ململانێی حیزبە سیاسییەکانە، بە زۆرترین ڕێژەی (83.5%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (60) دا زۆرترین گەندەڵی کە ئەنجام دەدرێت لەلایەن بەرپرسە سیاسییەکانەوەیە، بەڕێژەی (83.25%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (61) دا ململانێی سیاسی دەرفەتیان بە گەندەڵکاران داوە تا زیاتر گەندەڵی ئەنجام بدەن، بەڕێژەی (82%) ی یەکەکان لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (62) دا بڕینی مووچە بەناوی پاشەکەوت دادپەروەری تیایدا ئەنجام نەدراوە، بەڕێژەی (81%) ی یەکە لەگەڵیدابوونە. لە خشتەی (63) دا چینی ناوەند لە کۆمەڵگادا بوونەتە قوربانی ململانێی سیاسی. بەڕێژەی (81%) ی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەگەڵیدابوونە.

### باسی دووەم/ پێشنیاز و ڕاسپاردەکانی توێژینەوەکە

### یەکەم/ پێشنیازەکانی توێژینەوەکە:

لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامەکانی توێژینەوەکە دەردەکەوێت کە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا، بەشێوەیەکی فراوان ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە، بووەتە کێشە و گرفت لەبەردەم ژیانی کۆمەڵایەتییان. لەم ڕوانگەوە کۆمەڵێک پێشنیاز پێشکەش کراوە بە ئومێدی ئەوەی لایەنە پەیوەندیدارەکان سوودی لێ ببینن بە مەبەستی چارەسەری لەوانە:

1-1- گرنگی بدرێت بە بنەماکانی سەروەری یاسا و دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەک یاسا بەسەر تەواوی هاوڵاتیان بەیەکسانی جێبەجێ بکرێت، حیزبە سیاسییەکان، بەتایبەت حیزبە دەسەڵاتدارەکان و دەستەگەرییە خێزانییەکان و خێڵەکی، فشار لەسەر دەزگای

دەسەڵاتی دادوەری دروست نەکەن، بۆ ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگا هەست بەئاسوودەیی بکەن و متمانەیان هەبێت بە دەزگاکانی دەسەڵاتی دادوەری و سەروەربوونی یاسا.

1-2- بایەخ بدرێت بە سەربەخۆبوونی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بۆ ئەوەی بەئەرکی سەرەکی خۆیان هەڵبستن، دووربن لە هەر دەستوەردانێکی سیاسی، پێویستە لەم ڕێگایانەوە هەنگاو بەرەو کۆمەڵگایەکی مەدەنی بنرێت لە هەرێمی کوردستاندا.

1-3- پێویستە لەلایەن حکومەت و دامەزراوەکانی، فەزایەکی ئازاد بۆ تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان برەخسێندرێت، بۆ ئەوەی کۆچ نەکەن بۆ دەرەوەی وڵات، ئینتیمای نیشتیمانییان زیاد بێت. ئەم کولتوور و داب و نەریتانەی کە لە کۆمەڵگادا بوونی هەیە بەرەو پێش ببردرێت، بەشێوەیەک کە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی دنیای ئازاد خۆی بگونجێنێت.

1-4- پێویستە حیزبە سیاسییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبێت لە کۆتاییهێنان بە ململانێی سیاسی نارەوا و چەسپاندنی دیموکراسی و دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی، بایەخ بدرێت بە ململانێی سیاسی لە پێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندیی گشتی تاکەکانی کۆمەڵگا، لەگەڵ فراوانکردنی ڕێگاکانی بەردەم ئازادی ڕادەربڕین، بەمەبەستی نەهێشتنی توندوتیژی و نامۆبوونی سیاسی. پێویستە سەرکردایەتی حیزبە سیاسییەکان پۆستی حکومییان پێنەدرێت، بەڵکو زیاتر گرنگی بەکەسانی تەکنۆکراتی شارەزا بدرێت.

1-5- هەوڵبدرێت بۆ بەدیهێنانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بەتایبەت لە ڕووی ئابوورییەوە و دامەزراندنی بنەمایەکی پیشەسازی کە ببێتە هۆی بەرفراوانبوونی چینی ناوەڕاست و سەرهەڵدانی چینی کرێکار، لەگەڵ دانانی پلانێکی تۆکمە و خێرا بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی دارایی. پێویستە تەنیا پشت بەیەک سەرچاوەی داهاتی وەک: نەوت نەبەسترێت، بەڵکو پشت بەسەرچاوەکانی تری داهاتی، وەک: کشتوکاڵ و گەشتو گوزار دانانی باج لەسەر کۆمپانیاو کارگەکانی بەرهەمهێنان و بازرگانی

ببەسترێت بەیەکسانی، حکومەت چالاکییە سروشتییەکەی لەڕێگای سەپاندنی باجەکانەوە کارا بکات، لەگەڵ شەفافیەتی تەواو لە سەرچاوەکانی داهات. پێویستە سزای توندی گەندەڵکاران بدرێت لەهەر پلەو پۆستێکی سیاسی، یان حکومیدا بن لەلایەن دەسەڵاتی دادوەری و دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە.

1-6- بایەخ بدرێت بە بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتی تاک و نەهێشتنی بێکاری و ڕەخساندنی هەلی یەکسانی لە دەرفەتی کارکردندا لەلایەن حکومەتەوە، بەتایبەت بایەخدان بە ڕۆڵی گەورەی کاراکردنی کەرتی تایبەتی نیشتیمانی و دەستپێشخەری تاکی، کە ڕێگا بە تاکەکان بدات پێداویستییەکانیان تێر بکەن.

**دووەم/ ڕاسپاردەکانی توێژینەوەکە:**

2-1- بایەخدانی زیاتر بدرێت بە ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر دەرخستنی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی کوردستاندا.

2-2- ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیی زیاتر لە ڕوانگەی زانینی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستاندا.

2-3- گرنگی بدرێت بە ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستاندا.

2-4- ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر دەرهاویشتە ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستاندا.

2-5- بایەخ بدرێت بە ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر دەرهاویشتە دەروونییەکانی ململانێی سیاسی، لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستاندا.

2-6- ئەنجامدانی تویژینەوەی زانستی لەسەر سروشت و هۆکارەکانی دروستبوونی ململانێی سیاسی، پاڵنەرەکانی قووڵتر بوونەوەی ململانێکان لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەرێمی کوردستاندا.

2-7- گرنگی بدرێت بە بەستنی کۆنگرەی زانستی لەلایەن زانکۆکانەوە لەسەر دەرهاویشتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی، بە مەبەستی پێشنیازی زیاتر بۆ لایەنی پەیوەندیدار بە ئامانجی چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکان.

* لە نامەی ماستەر بەناونیشانی "دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا" توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری هەولێر.. وەرگیراوە.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**1- سەرچاوە کوردییەکان:**

**1-1- کتێبەکان:**


1. ابراهیم، عبدالمجید غفور. (2015) کۆمەڵناسی دانیشتوان، چ1، چاپخانەی هێڤی، هەولێر.
2. خەمەش، مەجدەدین عومەر خەیری. (2012) کۆمەڵناسی بابەت و میتۆد، وەرگێڕانی،
3. موحسینی، مەنوچێهر. (2007) دەروازەکانی کۆمەڵناسی، وەرگێڕانی، ڕێبوار سیوەیلی و


**2- سەرچاوە عەرەبییەکان:**

**2-1- کتێبەکان:**


1. ألاسود، صادق. (1986) علم الاجتماع السياسي، ط1، مكتبة جامعة الموصل، موصل، عراق.
2. إسماعيل، فضل الله محمد. (2001) أزمة القرار السياسي في دول العالم الثالث، ط2، مكتبة بستان المعرفة، الإسكندرية، مصر.
3. البكري، جواد كاظم. (2011) فتح الاقتصاد الامريكي الازمة المالية 2008، ط1، مركز حمورابي للبحوث والدراسات الستراتيجية، بيروت، لبنان.

4. البياتي، فراس عباس فاضل. (2012) علم الاجتماع، دراسة تحليلية للنشاة والتطور، ط1، دار غيداد للنشر والتوزيع، موصل، عراق.
5. الحسن، أحسان محمد و الزيني، عبدالمحسن (1982) الأحصاء الاجتماعي، دار الكتب للطباعة والنشر، موصل.
6. الحمداني، قحطان احمد. (2012) المدخل إلى علوم السياسة، ط1، دار الثقافة، عمان الاردن.
7. دحام، الهام وحيد. (2012) العوامل الاقتصادية والاجتماعية والمالية وأثرها على التنمية الأقتصادية، ط1، مطبعة الثقافة، أربيل، كردستان.
8. الدخيل، عبدالعزيز عبدالله. (2006) معجم مصطلحات الخدمة الاجتماعية والعلوم الاجتماعية، ط1، مكتبة دار المناهج، عمان، الاردن.
9. عبدالقادر، موفق عبدالله. (2011) منهج البحث العلمي وكتابة الرسائل العلمية، ط1، دار التوحيد، الرياض، سعودية.
10. الطيب، مولود زايد. (2007) علم الاجتماع السياسي، ط1، مكتبة دار الكتب الوطنية، بنغازي، ليبيا.
11. عبدالكافي، اسماعيل عبدالفتاح. (2012) اسس مجالات العلوم السياسية، ط1، الازاريطة، الاسكندرية، مصر.

**3- نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا کوردییەکان:**

1. احمد، نیاز علی (2015) پەیوەندی کەناڵە ئاسمانیەکان بە ئاسایشی کۆمەڵایەتی، نامەی ماستەر پێشکەشکراوە بە بەشی کۆمەڵناسی – کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر.
2. حسن، بارزان کمال. (2008) ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی توندوتیژی سیاسی، نامەی ماستەر، بڵاونەکراوەتەوە، پێشکەش کراوە بە کۆلیژی ئەدەبیات، بەشی کۆمەڵناسی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.
3. شەریف، ڕۆزە عبداللە. (2007) ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ناسەقامگیری سیاسی لە هەرێمی کوردستان، نامەی ماستەر بڵاونەکراوەتەوە، پێشکەش کراوە بە کۆلیژی ئەدەبیات، بەشی کۆمەڵناسی، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.

**4- نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا عەرەبییەکان:**

1. الحقون، نادية (2013) العولمة الاقتصادية والازمات المالية، الوقاية والعلاج، اطروحةدكتوراه مقدمة الى كلية العلوم الاقتصادية والتجارية، جامعة الحاج الخضر، باتنة- الجزائر.
2. بكر، جوان اسماعيل (2013) جودة الحياة وعلاقاتها بالانتماء والقبول الاجتماعيين، أطروحة دكتوراه، منشورة، مقدمة الى كلية الاداب، قسم علم الاجتماع، جامعة صلاح الدين، كردستان- العراق، أربيل.
3. قزرون، محند أعداب. (2011) المجتمع المدني عند هيجل، رسالة ماجستير، غير منشورة، مقدمة الى كلية العلوم الانسانية، قسم الفلسفة، جامعة الجزائر.

**5- سەرچاوە ئینگلیزییەکان:**

1. Agresti, A and Finlay, B. (without year) Statistical Methods for the social scientific, third edition, prentice Hall, United States of America.
2. Lauer, R. H and Jeanette, C. (2002) Social problems and the quality of life, eighth edition, New York , America.
3. Reid, J. (1972) Alienation, University of Glasgow Publication, Scotland.

## پاشکۆکان:

### پاشکۆی (1)

ڕاستی هەڵسەنگاندنی پسپۆڕان بۆ پرسیارنامەی ڕاپرسی

| ژ | ناوی پسپۆڕان | کۆی بڕگە دروستەکان | بڕگە نادروستەکان | نمرەی سەدی ڕاستییەکەی | ژمارەی بڕگە نادروستەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | پ.د. ڕەشاد صبری میران | 53 | 1 | %98.14 | 31 |
| 2 | پ.د. صباح أحمد نجار | 52 | 2 | %96.29 | 42، 46 |
| 3 | پ.د. عمر إبراهيم عزيز | 54 | 0 | %100 | / |
| 4 | پ.د. رزگار محمد قادر | 54 | 0 | %100 | / |
| 5 | پ.د.أمين محمد سعيد أدريس | 54 | 0 | %100 | / |
| 6 | پ.ی.د.عبدالله خورشيد عبدالله | 53 | 1 | %98.14 | 5 |
| 7 | پ.ی.د. عبدالحميد على سعيد | 53 | 1 | %98.14 | 20 |
| 8 | پ.ی.د. محمد حسين شوانی | 48 | 6 | %88.88 | 26، 27، 29، 42، 50، 52 |
| 9 | پ.ی.د. ئازاد عثمان صالح | 54 | 0 | %100 | / |
| کۆی گشتی | | 475 | 11 | %95.67 | 11 |

ژمارەی تەواوی بڕگەکانی پرسیارنامەی ڕاپرسی = (54) بڕگە.

ژمارەی پسپۆڕان = (9) پسپۆڕ.

کۆی گشتی بڕگەکان = (ژمارەی بڕگەکان × ژمارەی پسپۆڕان)، (54×9= 486).

ژمارەی بڕگە دروستەکان= 475، ژمارەی بڕگە نادروستەکان = 11.

ڕێژەی سەدی پلەی ڕاستی بڕگەکان= بە کۆی گشتی بڕگە دروستەکان ÷ کۆی گشتی بڕگەکان × 100.

475 ÷ 486 × 100= 97.73% ڕێژەی سەدی پلەی ڕاستی بڕگەکان.

**پاشکۆی (2)**

ناو و شوێنی کارکردنی پسپۆڕانی هەڵسەنگاندنی پرسیارنامەی ڕاپرسی

| ژ | ناوی پسپۆڕان | کۆلیژەکان | بەش | زانکۆ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | پ.د. ڕەشاد صبری میران | ئەدەبیات | کۆمەڵناسی | سەلاحەددین |
| 2 | پ.د. صباح أحمد نجار | ئەدەبیات | کۆمەڵناسی | سەلاحەددین |
| 3 | پ.د. عمر إبراهیم عزیز | ئەدەبیات | دەروونزانی | سەلاحەددین |
| 4 | پ.د. رزگار محمد قادر | یاسا و ز. سیاسییەکان | یاسا | سەلاحەددین |
| 5 | پ.د. أمین محمد سعید أدریس | بەڕێوەبردن و ئابووری | ئابووری | سەلاحەددین |
| 6 | پ.ی.د. عبدالحمید علی سعید | ئەدەبیات | کۆمەڵناسی | سەلاحەددین |
| 7 | پ.ی.د.عبدالله خورشید عبدالله | ئەدەبیات | کۆمەڵناسی | سەلاحەددین |
| 8 | پ.ی.د. محمد حسین شوانی | ئەدەبیات | کۆمەڵناسی | سەلاحەددین |
| 9 | پ.ی.د. ئازاد عثمان صالح | یاسا و زانستە سیاسییەکان | زانستە سیاسییەکان | سەلاحەددین |

**پاشکۆی (3)**

دەرهێنانی جێگیری پرسیارنامە

| ژمارە | س | ص | پێگەی س | پێگەی ص | پێگەی س- پێگەی ص | ف² |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 160 | 164 | 8 | 11 | 3- | 9 |
| 2 | 163 | 163 | 11.5 | 9 | 2.5 | 6.25 |
| 3 | 150 | 151 | 4 | 4 | 0 | 0 |
| 4 | 153 | 164 | 6 | 11 | 5- | 25 |
| 5 | 151 | 162 | 5 | 8 | 3- | 9 |
| 6 | 125 | 126 | 1 | 1 | 0 | 0 |
| 7 | 144 | 144 | 3 | 3 | 0 | 0 |
| 8 | 130 | 130 | 2 | 2 | 0 | 0 |
| 9 | 160 | 153 | 8 | 5 | 3 | 9 |
| 10 | 160 | 159 | 8 | 6 | 2 | 4 |
| 11 | 165 | 161 | 13.5 | 7 | 6.5 | 42.25 |
| 12 | 163 | 165 | 11.5 | 13 | 1.5 | 2.25 |
| 13 | 166 | 166 | 15 | 14.5 | 0.5 | 0.25 |
| 14 | 161 | 164 | 10 | 11 | 1- | 1 |
| 15 | 165 | 166 | 13.5 | 14.5 | 1- | 1 |
| کۆ | | | | | | 109 |

س: نرخەکانی تاقیکردنەوەی یەکەم

پێگەی س: ڕیزبەندی ژمارەیی بۆ تاقیکردنەوەی یەکەم

ص: نرخەکانی تاقیکردنەوەی دووەم

پێگەی ص: ڕیزبەندی ژمارەیی بۆ تاقیکردنەوەی دووەم

ف²: جیاوازی نێوان ڕیزبەندی ژمارەی یەکەم و دووەم

n : قەبارەی نموونە

(عباس، 2007، ص: 309)

$$r_{xy}=1-\frac{6\sum_{i=1}^{n} d_i^{\,2}}{n\left(n^2-1\right)}=1-\frac{6\times 109}{15\left(15^2-1\right)}=0.8054=80.54\%$$

**پاشکۆی (4)**

شێوەی کۆتایی پرسیارنامەی ڕاپرسی

وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانست

ژمارەی فۆڕم ( )

زانکۆی سەڵاحەددین/ هەولێر

ڕێکەوت / / 2016

کۆلیژی ئەدەبیات/ بەشی کۆمەڵناسی

**زانیارییەکانی پرسیارنامەی توێژینەوەکە:**

سڵاو و ڕێز.......

ئەم پرسیارنامەیە بەشێکە لە ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی بە ناونیشانی: **(دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراق)**، توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری هەولێر، داواکارین لە بەڕێزتان هاوکاریمان بکەن بەوەڵامدانەوەی بڕگەکان بە شێوەیەکی ورد.

هاوکاریتان مایەی ڕێزو سوپاسە..

تێبینی:

1- زانیاریەکانی ئەم پرسیارنامەیە تەنیا بۆ مەبەستی زانستی بەکاردێت، بۆیە پێویست بە ناونووسین ناکات.

2- تکایە هیچ بڕگەیەک بەجێ مەهێڵە بێ ئەوەی وەڵامی نەدەیتەوە.

3- سەرکەوتنی ئەم توێژینەوەیە پشت بە ڕاستگۆیی وەڵامەکان دەبەستێت.

4- هێمای ( √ ) بکێشە بەرامبەر بەم وەڵامەی کە بە گونجاوی دەزانیت.

**قوتابی ماستەر: ڕۆژگار سعدی صابر**

**سەرپەرشتیار: پ.ی.د. سليم بطرس الياس**

**یەکەم: زانیارییە گشتییەکان:**

- ڕەگەز: نێر (  )  مێ (  ).
- تەمەن: (   )ساڵ.
- شوێنی نیشتەجێبوون: شار (   )، گوند (   ).
- ئاستی خوێندن: سەرەتایی (  )، ناوەندی (  )، ئامادەیی (  )، پەیمانگا (  )، زانکۆ (  )، خوێندنی باڵا (  ).
- ئاستی ئابووری: باش (  )، ناوەند(  )، خراپ (  ).
- باری کۆمەڵایەتی: سەڵت (  )، خێزاندار (  )، جیابووەوە (  )، تاک مردوو(  ).
- پیشە: (                    ).
- ئینتمای سیاسی: هەیە (   )، نییە (   ).

**دووەم: زانیارییە تایبەتییەکان:**

بڕگەکـانی تـایبەت بە دەرهاویشـتەی ململانێـی سیاسـی لەسـەر دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان:

| ژ | بڕگەکان | لەگەڵیدام | تارادەیەک لەگەڵیدام | لەگەڵیدانیم |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان. | | | |
| 2 | ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی پڕۆسەی هاوسەرگیری. | | | |
| 3 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی دەستوەردانی سیاسی لە قوتابخانەدا | | | |
| 4 | لە قوتابخانە بایەخ بە ڕۆشنبیرکردنی نیشتیمانی نادرێت. | | | |
| 5 | لێکترازانی چەمکەکانی خوێندن وەک (قوتابی، خوێندکار) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە. | | | |
| 6 | دەستێوەردانی سیاسی لە زانکۆدا بوونی هەیە. | | | |
| 7 | سوود لە توانا زانستییەکانی مامۆستایانی زانکۆ وەرنەگیراوە بەهۆی پێشینەی سیاسی. | | | |
| 8 | دەزگا ئایینییەکان ڕۆڵیان لاوازبووە لە هێورکردنەوەی ململانێی سیاسی. | | | |

بڕگەکـــانی تـــایبەت بەدەرهاویشـــتە کۆمەڵایەتییەکـــانی ململانێـــی سیاسی لەسەر بواری ڕاگەیاندن:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 9 | زۆری هۆیەکانی ڕاگەیاندنی حیزبی (بینراو، بیستراو، نووسراو) دەرهاویشتەی ململانێی سیاسییە. | | | |
| 10 | لە بواری هۆیەکانی ڕاگەیاندن کار بۆ بەرژەوەندی حیزبە سیاسییەکان دەکرێت. | | | |
| 11 | زۆری بەرنامە سیاسییەکان بێزاری کردووین. | | | |
| 12 | ڕاگەیاندنەکان ڕۆڵیان هەیە لە قووڵترکردنی ململانێی سیاسی. | | | |
| 13 | ڕاگەیاندنەکان بەهۆی لایەنگیرییان لە گەیاندنی ڕاستیی زانیارییەکان بە پیشەیی کارناکەن. | | | |
| 14 | بەهۆی ململانێی سیاسی بودجەیەکی زۆر تەرخاندەکرێت بۆ ڕاگەیاندنی حیزبە دەسەڵاتدارەکان. | | | |
| 15 | ڕاگەیاندنەکان ڕۆڵی گرنگیان نەبووە لە هوشیاربوونەوەی سیاسی. | | | |

بڕگەکانی تایبەت بە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ململانێی سیاسی:

| ژ | بڕگەکان | هاوڕام | تارادەیەک هاوڕام | هاوڕانیم |
|---|---|---|---|---|
| 16 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازی لە پەیڕەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. | | | |
| 17 | بەهۆی ململانێی سیاسی یاسا بەسەر هاوڵاتییان بەیەکسانی جێبەجێ ناکرێت. | | | |
| 18 | ململانێی سیاسی ڕەنگدانەوەی نەرێنی هەبووە لەسەر سەربەخۆیی کارکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی. | | | |
| 19 | ململانێی سیاسی نێو پارتە سیاسییەکان پاڵنەرێکی گرنگی کۆچکردنە بۆ دەرەوەی وڵات. | | | |
| 20 | حیزبە سیاسییەکان کار بۆ بەرژەوەندی پارتەکانیان دەکەن نەوەک بۆ بەرژەوەندیی گشتی. | | | |
| 21 | ڕۆژ بەڕۆژ دەرهاویشتەکانی ململانێی سیاسی قووڵتر دەبێتەوە لەسەر باری دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگا. | | | |
| 22 | بەهۆی ململانێی سیاسی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خزمایەتی لاواز بووە. | | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان هاورێیان. | 23 |
| | | | بەهۆی ململانێی سیاسی ڕەوشی کۆمەڵایەتی لە هەرێمی کوردستاندا ئاڵۆز بووە. | 24 |
| | | | تاکەکانی کۆمەڵگا باجی گرفت و کێشە سیاسییەکانی پارتە دەسەڵاتدارەکان دەداتەوە. | 25 |

بڕگەکانی تایبەت بە دەرهاویشتە سیاسییەکانی ململانێی سیاسی:

| لەگەڵیدانیم | تارادەیەک لەگەڵیدام | لەگەڵیدام | بڕگەکان | ژ |
|---|---|---|---|---|
| | | | حیزبە سیاسییەکان بوونەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی سیاسی. | 26 |
| | | | حیزبە سیاسییەکان ڕۆڵی گرنگی نەبینیوە لە دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی. | 27 |
| | | | بوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئاستی هوشیاریی سیاسی بەرز ناکات. | 28 |
| | | | ململانێی سەرکردەی حیزبە سیاسییەکان هۆکاری توندوتیژی سیاسییە. | 29 |
| | | | بەهۆی ململانێی سیاسی تاکەکانی کۆمەڵگا کەمتر بایەخ بە پرسە سیاسییەکان دەدەن. | 30 |
| | | | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی | 31 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | دەرکەوتنی نامۆبوونی سیاسی. | | | |
| 32 | ڕێکنەکەوتن لە سەر پرۆژە دەستووری هەرێمی کوردستان بەهۆی ململانێی حیزبە سیاسییەکانە. | | | |
| 33 | بەهۆی ململانێی سیاسی ئایینەکان بەکاردەهێنرێن بۆ بەرژەوەندی پارتە سیاسییەکان. | | | |
| 34 | حیزبە سیاسییەکان ئەندامەکانیان لەسەر بنەمای حیزبایەتی تەسک پەروەردە دەکەن. | | | |
| 35 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی پەکخستنی دەزگای یاسادانان (پەرلەمان). | | | |
| 36 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی ڕێکنەخستنی نێوماڵی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا. | | | |
| 37 | دەستوەردانی دەرەکی لە هەرێمی کوردستاندا یەکێکە لەهۆکارەکانی دروستبوونی ململانێی سیاسی. | | | |
| 38 | شکست لە دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات بووەتە هۆی دروستبوونی ململانێی سیاسی. | | | |
| 39 | ململانێی سیاسی دەرهاویشتەی نەرێنی هەیە لەسەر ئەنجامدانی ڕیفراندۆم بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. | | | |

برگەکانی تایبەت بە دەرهاویشتە ئابوورییەکانی ململانێی سیاسی:

| ژ | برگەکان | لەگەڵیدام | تارادەیەک لەگەڵیدام | لەگەڵیدانیم |
|---|---|---|---|---|
| 40 | حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئابووری وڵاتیان قۆرخ کردووە. | | | |
| 41 | بەهۆی ململانێی سیاسی پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری لاواز بووە. | | | |
| 42 | شکست لە سیستەمی سیاسی دەبێتە هۆی شکستهێنان لە سیستەمی دارایی. | | | |
| 43 | دروستبوونی قەیرانی دارایی هۆکاری ململانێی حیزبە سیاسییەکانە. | | | |
| 44 | شکست لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئابووری سەربەخۆ هۆکاری دروستبوونی قەیرانی داراییە. | | | |
| 45 | ململانێی سیاسی بووەتە هۆی ناڕوونی سەرچاوەکانی داهات. | | | |
| 46 | بڕینی بودجەی هەرێمی کوردستان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بووەتە هۆی دروستبوونی قەیرانی دارایی. | | | |
| 47 | قەیرانی دارایی بووەتە هۆی ئاڵۆزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان. | | | |
| 48 | قەیرانی دارایی بووەتە هۆی دواخستنی پرۆسەی هاوسەرگیری. | | | |
| 49 | قەیرانی دارایی بۆتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی جیابوونەوە. | | | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 50 | بوونی گەندەڵی بەهۆی ململانێی حیزبە سیاسییەکانە. | | | | |
| 51 | زۆرترین گەندەڵی کە ئەنجام دەدرێت لەلایەن بەرپرسە سیاسییەکانەوەیە. | | | | |
| 52 | ململانێ سیاسییەکان دەرفەتیان بەگەندەڵکاران داوە تا زیاتر گەندەڵی ئەنجام بدەن. | | | | |
| 53 | بڕینی مووچە بەناوی پاشەکەوت دادپەروەری تیایدا ئەنجام نەدراوە. | | | | |
| 54 | چینی ناوەند لە کۆمەڵگادا بووەتە قوربانی ململانێی سیاسی | | | | |

## ملخص البحث

هـذا البحـث (الافـرازات الاجتماعيـة للصـراع السياسـي فـي أقلـيم كوردستان العراق) دراسة ميدانية في أقليم كوردستان العراق، يهدف الى التعرف على الافرازات الاجتماعية والسياسية والاقتصادية على أفراد المجتمع في أقليم كوردستان العراق.

يتكون البحث من مدخلين رئيسيين، الاول يختص بالجانب النظري للبحث، والذي يتضمن فصلين، الاول عبارة عن الاطار العام للبحث وتحديد مفاهيم البحث، أما الفصل الثاني فقد تضمن ثلاثة محاور، المحور الاول يتطرق الى الافرازات الاجتماعية للصراع السياسي، والمحور الثاني يتطرق الى الافرازات السياسية للصراع السياسي، فيما يتضمن المحور الثالث الافرازات الاقتصادية للصراع السياسي.

أما المدخل الثاني فأنه يختص بالجانب الميداني للبحث، والذي يتكون من ثلاثة فصول، الفصل الثالث يتضمن ألاطار العام للبحث، وهو عبارة عن تحديد منهج البحث، مجتمع البحث، عينة البحث وحجم العينة مع الاشارة الى وسائل جمع المعلومات، وكيفية تنظيم استمارة الاستبيان.

أما الفصل الرابع فأنه يتضمن المميزات الاساسية لوحدات العينة مع عرض المتغيرات، وكذلك عرض نتائج البحث ومناقشاتها في ضوء أهداف البحث.

أما الفصل الخامس، فأنه يتكون من مبحثين، المبحث الاول تطرق الى الاستنتاجات، فيما تطرق المبحث الثاني الى الاقتراحات والتوصيات.

# Abstract

(Social secretions of the political conflicts in the Kurdistan Region of Iraq) is a scientific research in the city of Hawler, in order to identify the social, political and economic secretion of the political conflicts in Kurdistan regnal government.

The research consists of two main sections; the first section is the social secretions on the social equality, civil society, immigration to outside. In the second part, the political effects of the political conflicts, such as, political crises, political violence and political uniqueness. In the third part, the economic effects of the political conflicts, the causes of the economic crises, the financial crises.

The second section, which is the domain side of the research, consists of three parts. In the third part, the first point is the method of the research that examines the analyzing methods. The second point is about the society, the examples, and the size of the research. The third point refers to the felids of the research and the fourth point is about the means used to collect the necessary data for the research. For this reason, we have benefited from the questionnaire. First, it is seen as the general information of the example units of the research such as, (gender, age, residency, level of education, economic levels, social circumstances, job and political affiliations.) Second, is the information that are necessary related to the main purpose of the research which consists of five main parts each part has several sections which totally became (54) sections. To figure out the reality of the survey, we depended on the virtual reality and (%97.73) of the sections have been accepted. Also by using Spearman Correlation, we figured out that (80.54%) is the ratio of stability of the questioner. In the fifth point for determining the nature of the sample and the alteration points, we used the Statistical Package for Social Science (SPSS).

In the fourth part, first section, the general information of the variables of the research's sample has been showed. In the second section, first point, the results related to each point of the research have been showed, and the causes of the field work has been mentioned by the researcher, According to the results shows that political conflict has had a lot of secretions on the economic, political, and social aspect of the units of the research samples as shown in (14-67) tables. In the second point, the relations between the different parts of the survey have been displayed by using Pearson Correlation. It appears that the basis under which the survey conducted for the topic of the research are in natural connection. In the third point, the survey's standard based on variables has been evaluated.

The fifth part consists of result, discussion, and suggestions of the research. In the first point, the results and consequences are mentioned. In the second part, the suggestions and the results of the research have been determined. At the end, the list of references, and the attachments with an English version of the research.

# کورد و سەرسامیی بە مۆدێرنیتە

## فەرمانڕەوایانی بابان بە نموونە

**پ. ی. ڕێبوار سیوەیلی**
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی

**پێشەکی**

ئەم توێژینەوەیە تەرخانکراوە بۆ پەیوەندیی کورد و مۆدێرنیتە و جەخت دەکاتەوە سەر ماوەی (١٨٢٠ بۆ ١٨٥١). من ناچمە ناو باسی مێژووی سەرهەڵدانی مۆدێرنیتەوە، هێندەی ئەوەی دەمەوێت لە دەرکەوتەکانی لە دنیای کوردیدا تێبگەم. مۆدێرنیتە هەر تەنیا کۆمەڵێک چەمک و زاراوەی هزری و فەلسەفی نییە، بەڵکو دیاردە و ڕەوەند (پرۆسە)یەکیشە، کە کۆمەڵگاکانی ناچارکردووە لە شێوەژیان و هزرینێکەوە بەرەو شێوەژیان و جۆری دیکەی بیرکردنەوە بگوێزنەوە. هەر بۆیەشە، مۆدێرنیتە، هەرچەندە لە خۆرئاوا دەردەکەوێت، بەڵام دەبێتە دیاردەیەکی فراوان و لە ڕێگەی دەرکەوتەکانییەوە، لەوانەش نوێبوونەوەی ماتەریاڵی (مۆدێرنیزاسیۆن)، دەبێتە دیاردەیەکی جیهانی، وەک ئەوەی ئالان تۆرین، باسیکردووە[1]. بەم جۆرەش، مۆدێرنیتە لەگەڵ سەرهەڵدانی خۆیدا، ئەو ئامانجەش باڵادەست دەکات، کە بۆی دروستبووە و لە پێناویدا بەدیارکەوتووە: گۆڕان و گواستنەوە لە مێژوو و سەردەمێکەوە بۆ یەکێکی تر و هەڵگێڕانەوەی کۆی بەهاکان و ڕوانگەکان و دانان و جێگیرکردنی بەهای نوێ لە جێگەکەیان. بەم جۆرەش، مۆدێرنیتە هەم مژدەیە و هەم سزا، هەم ئازادی بەرهەمدەهێنێت و هەم کۆیلایەتی. وەک (پۆڵ ڤالیری) لەبارەی (بۆدلێر)ەوە نووسیویەتی: ("**مرۆڤی مۆدێرن کۆیلە و بەندەی مۆدێرنیتەیە" ئەمەش بەمانای ئەوەیە مۆدێرنیتە وەک چارەنووسێکی *ناچارەکی* ئێمەی لێهاتووە. چارەنووسێ، وەک ڕووداوێکی بوونناسیانە**

**پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و جیهان و مرۆڤ و مرۆڤی گۆڕیوە. ئەم چارەنووسە هەمیشە وەک *شەڕێکی بەردەوام* و شەڕی مۆدێرنیتە و نەریت، وەک *بزاوتێکی بێبڕانەوە* و بەردەوام بەدیار کەوتووە)**[٢].

لەلایەکی ترەوە، مۆدێرنیتە وەک هابرماس ڕاڤەی دەکات، ***لە زەماندا***، شتێکە و **هوشیاری** بە مۆدێرنیتە و چوونە مێژووەکەیەوە، شتێکی ترە. بۆ هابرماس مۆدێرنیتە لە زەماندا، بەلایکەمەوە دووسەد ساڵ پێش مێژووی هوشیاری بە مۆدێرنیتە ڕوویداوە و دەستی پێکردووە[٣]. هەندێک ئەوە بە دۆزینەوەی ئەمەریکا لەلایەن (کریستۆفەر کۆڵۆمبس ١٤٩٢)، دەستنیشان دەکەن و هەندێکیش بە دۆزینەوەی هونەری چاپ و شۆڕشی کۆپەرنیکی[٤].

باشە کورد لە کەیەوە، ئەم زەمەنە و ئەم هوشیارییەی ئەزموون کردووە؟ زۆربەی ئەو توێژەرانەی من بە ڕێکەوت و پاش گەڕان، بەرهەمیانم بینیوە و باسیان لە پەیوەندیی کورد و مۆدێرنیتە، کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و بەرەودوا، بۆ وەها کاریگەریی و پەیوەندییەک، لە پێش چاو دەگرن[٥].

من لەم باسەدا ڕۆژگارێکی زۆر لە پێشتر بۆ ئاشنابوونی کوردەکان و دنیای مۆدێرن و دیاردەکانی لە پێش چاو دەگرم. ڕەنگە ئەمە ئەو سەرەتا زەمەنییە بێت، کە هابرماس مەبەستێتی و هێشتا بۆ ئەوانەی دواتر دەچنە ناو مێژووی مۆدێرنیتەوە، ڕوون و ئاشکرا نەبووبێت. لەبەر ئەوە، هوشیاریی کورد بە مۆدێرنیتە، دەکەوێتە دوای ئەو زەمەنەوە کە کورد وەک سەردەمی مۆدێرن، ئەزموونی کردووە.

بەڵام ئیتر ئەو بەڵگانەی لەبەر دەستدان ئەو شەرمەمان دەشکێنن کە نەتوانین باسی ئەم پەیوەندییە بکەین. هەڵبەتە کۆمەڵگای کوردی هەرگیز بە تێگەیشتنە خۆرئاواییەکەی **مۆدێرن** نەبووە، بۆیە ئەوە ئامانجی من نییە تا لەپێناوی وابەستەیی کوردبوونمدا، مامەڵەیەکی ئایدیۆلۆژییانە لەگەڵ ئەم چەمکەدا بکەم. بەڵام ئەوەش ڕاستییەکە، مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزاسیۆن[٦] کاریگەریی خۆیان لە زۆر ئاست لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگای ئێمە جێهێشتووە.

**وشە کلیلییەکان:**

لەم باسەدا، زاراوەی (مۆدێرن)، ئاماژەیە بە سەردەم و کات و چاخی مۆدێرن لەبەرامبەر کات و سەردەمی (پێش مۆدێرن)دا. لە نێوان ئەو دوو چاخەدا گەشەکردنێکی هێواش و هەمە لایەنەمان لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا هەیە، کە هەتا دێت لە دینییەوە دەبێتە دنیایی، لە دەستەجەمعییەوە دەبێتە کەسباوەڕی و تاکباوەڕی. لە سیستەمی مێراتییەوە دەبێتە یاسا و ماف. لە بڕوابوون بە چارەنووسەوە دەبێتە بڕوابوون بە ئەقڵ و ویستی مرۆڤ خۆی، لە دەسەڵاتی ئایینییەوە دەبێتە دەسەڵاتی دەوڵەت و لێک جیاکردنەوەیان. هزری ڕەخنەیی بەسەر هزری نەریتیدا باڵادەست دەبێت، هیوا بە داهاتوو بەرەو پێشکەوتن، پەرە دەستێنێت و هەموو ئەمەش لە زاراوەی (مۆدێرنیتە)دا ڕەنگدانەوەی هەیە[٧]، کە ئاماژەیە بە بیرکردنەوە و هزرینی مۆدێرن و ئەوەی کە سەردەمی مۆدێرن لە خۆی دەگرێت.

زاراوەی (***مۆدێرنیزاسیۆن***)یش بۆ ئاماژەدان بە نوێبوونەوەی ماتەریاڵی وەک بەرەنجامی هزری مۆدێرن و ڕەنگدانەوەی ئەو هزرە لە ژیانی کردەیی و ماتەریاڵی مرۆڤدا، بەکار هاتووە. هەر لەسەر ئەم پێودانگەش، زاراوەی (***مۆدێرنیزم***)، وەک ئەنجامی هزری مۆدێرن لە بواری هونەر و داهێنان و زەوقی جوانناسییدا، بەکار هاتووە[٨].

**شوێن و کات**

بەپێی ئەو بەڵگە پچڕپچڕانەی لەبەر دەستدان، (بەڵام دەکرێت پێکیانەوە ببەستینەوە و ڕایەڵێکی پەیوەندیی ئاسۆییان لە نێواندا بەرهەم بهێنینەوە)، سەرەتاکانی ئەم کاریگەری و بەرەوپیروەچوونە لە پێش بیستەکانی سەدەی نۆزدەوە لە قەڵەمڕەوی بابانییەکانەوە و بە تایبەتیش لە شاری سلێمانییەوە، دەستی پێکردووە، بەڵام ئێمە دەتوانین بەڵگە بۆ سەرەتاکەی لەو کاتەوە بهێنینەوە. ئەم دەستنیشانکردنە بۆ شوێن و کات، لە خۆوە نییە و گێلانەش نییە. پێش ئەو کاتە ئەوروپاییەکان هاتوون بۆ ئەو مەڵبەندە، بابانییەکان مێژوویەکی

دوورودرێـــژی حوکمـــدارییان ئـــەزموون کردبـــوو. ئـــەورووپایی و بەتایبـەتیش ئینگلیزەکـان دەستنیشـانی بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان لـە ناوچەکەدا کردبوو.. هەموو ئەمانـەش پەیوەندیی و یـەکتر خوێندنـەوە و دەستنیشـــانکردنی بەرژەوەنـــدی و لایـــەنگری و پـــەیمانکارییان لـــە پشـتەوەیە. ڕەوەندەکـە لـە شـەو و ڕۆژێکـدا دەسـتی پێنـەکردووە و پێشینەی خۆی هەیە، کە دەستنیشانکردنی ئاسان نییـە، بـەڵام دەبێت لـە شوێنێکەوە دەس پێبکرێت.

مەبەستی سەرەکیی من لە وشەی مۆدێرن و مۆدێرنیتـە، ئاسـتێکی ئاگـایی و هوشـیاریی مرۆڤـە بـە دنیـای نـوێ و ئـەو تازەکارییانـەی لـە جیهانێکی دیکە و لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازیی ئەورووپیدا هاتنە ئاراوە. ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە کۆمەڵگاکانی دیکەش، بکەونە هەوڵدان بۆ ئەوەی بەم دنیا نوێیە ئاشنا ببن و سوودمەند بن لـە بەرهەمـەکانی. ئەم ڕەوتە لە کوردستانی ئەوسادا هـەرگیز نـەبووە بـاو و بـەربڵاو، یـان شـــەپۆلێکی کاریگـــەر. نـــەبوونی پەیوەنـــدیی ڕاســـتەوخۆ بـــە وڵاتـــانی ئـەورووپاوە، گوشـاری زۆری هـەردوو دەوڵـەتی عوسـمانی و قاجـاری لەسـەر قەڵـەمڕەوە کوردییـەکان، دابەشـبوونی جەوهەرییانـەی خـاکی کوردسـتان بەسـەر پێکهاتـە خێڵییـەکان و ئامـادەیی هـەردوو تەریقـەتی قـادری و نەقشـبەندی و ململانێکانیـان، پابەنـدبوونی خێـڵ و عەشـیرەتە کوردییـەکان بـە سیسـتەمی تۆڵەکردنـەوە و پشتبەسـتنیان بـە پەیوەنـدیی خوێنی لە دەستنیشانکردنی (دۆست) و (دوژمن) و (خۆمانـە) و (بێگانـە) و زاڵبوونی ڕۆشنبیریی ئایینی و چەندین هۆکاری تر، وایانکردبوو هـەر هەنگاونانێک بۆ گۆڕین و دەستکاریکردنی پەیوەندییـەکانی دەسـەڵات و کۆمەڵگا، ڕووبەڕووی دەیان ڕێگر ببێتەوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەر لـەو ماوەیـەدا، لـە نێـوان ١٨٢٠ تـاکو کۆتـایی لـەناوچوونی ئـەمارەتی بابـان (١٨٥١)، چەنـدین دەنـگ هـەبوون کـە لـە تێگەیشتنێکی ڕێژەییانەوە، یان نزیکەوە لە بەها مۆدێرنەکان، ئاستێک لە هوشیاریی مۆدێرن ختووکەی داون. من ناڵێم ئەو دەنگانە تێگەیشتنێکی

تیۆرییان لە بابەتەکە هەبووە، ناشڵێم ئەوانە بە بەرنامە ئەو کارەیان کردووە، ناڵێم ئاوەدانییان خستۆتە شارەکەوە، ناڵێم پابەندی ئایین و مەزهەب نەبوون، لە پاڵ باسکردنی بیرۆکە شێوە مۆدێرنەکانیاندا، نامەوێت دژێوی و ڕق و دووبەرەکی و پابەندبوونیان بە ئایین و تەریقەتەوە، بشارمەوە. بەڵام ناشمەوێت چاو لەو هەوڵدانە سەرەتایی و بیرۆکانەیان بپۆشم، کە لە دەرەوەی نەریت و دواکەوتوویی و داخراویی باو، سیمایەکی دیکەیان پێدەبەخشێت و ڕۆحی دەربازبوونیان لەو واقیعە تێدا دەخەملاندن. ئەوان هەوڵیانداوە بەدگومانی لەسەر ئەو بەهایانە بڕەوێننەوە، کە دواجار بەهای مۆدێرنن. وێڕای ناکۆکیی سیاسی و لێژبوونەوەیان بەرەو دابەشبوونی عەقیدەیی و تەریقەتیانە، هێشتا نوێنەرایەتی ویژدانی مرۆڤێکی نوێ دەکەن، نەک نەریتی. لەگەڵ ئەوەشدا ئاستێک لە مۆدێرنیزاسیۆن و دروستکردنی ئەو دامەزراوانە، بە گوێرەی تاقەت و توانای خۆیان، کە گوزارش لە نوێبوونەوە بکەن، لە ئارادا بوون.

بابانییەکان نەیانتوانی چاپخانە بهێنن، بەڵام کتێبخانەی گەورە و دەوڵەمەندیان دروستکردن[٩]. دروستکردنی کتێبخانە بەشدارییەکی گرنگی کرد لە بەرهەمهێنانی بیرۆکەی نوێ و جێگیرکردنی بەهای زانست و خوێندەواریدا. ئەوان گرنگییەکی تەواویان بە ڕەوتی خوێندن و زانین دەدا و نەوە دوای نەوە لە هەوڵدابوون پشتیوانی لە بەردەوامییەکەی بکەن[١٠]. نەیانتوانی زانکۆ دروستبکەن، بەڵام مەدرەسە و مزگەوتیان دروستکردن کە هەمان ڕۆڵی زانکۆی بۆ ئەو سەردەمە دەبینی[١١]. نەیانتوانی وەرزشگای تایبەت دروستبکەن، بەڵام مەیدانی شاریان دروستکرد و تیایدا هەموو کەس دەیتوانی بەشداریی مەراسیمەکان و یارییەکان بێت. گەرماویان دروستکرد و تەندروستی و جەستە بوونە شوێنی گرنگیپێدان[١٢]. ئەمەش بڕوابوون بە دەرمانی پزیشکیی هێنایە ئاراوە[١٣] و چوونە زیارەتگای پیر و شێخ و مەرقەدی تا ڕاددەیەکی کەم، لەق کرد. بازاڕیان هەبوو[١٤]، بەرهەمیان هەبوو[١٥] و

دەیانزانی چۆن بەروبوومی وڵاتەکە کۆبکەنەوە و لە بواری بازرگانیدا سوودی لێوەربگرن و پارە و سامانی خۆیان بە هەوانتە نەخەنە بەردەستی داگیرکەرەکانیان[16]. شاریان دروستکرد، ئیدارەیان دروستکرد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دانیشتوان، تا ئەو ڕاددەیەی بەباشی ئاساییشیان خستەڕێ و چەتەگەری و ڕاووڕووتیان بنەبڕ کرد[17]. سەربازگەیان پێکهێنا و لە نەخشەکێشان و هێڵکاریدا کارامەییان هەبوو، بە وشەی زانست نامۆ نەبوون و جیاوازییان دەکرد لە نێوان خورافە و زانستدا و ئاگاداریی مێژووی زانست و بگرە ناودارانی زانستکاریی هاوچەرخی خۆشیان بوون. پرسیاریان لەبارەی سیستەمی سیاسیی وڵاتانەوە دەکرد، پەیوەندیی نێوان وڵاتانیان بۆ گرنگ بوو. پرسیاریان لەبارەی دۆزینەوەی ئەمەریکاوە دەکرد و دەیانویست بزانن لە ئەورووپا، چین و ڕووسیا چۆن حوکم دەکرێت و یەکەمین ڕەخنەکانیان لە سیاسەتی داگیرکاریی بەریتانیا لە هیندستان، گرت. لە بارەی ئەستێرەناسی و ئاسماناسییەوە شارەزاییان هەبوو. هونەری بەڕێوەبردن و دیپلۆماسییان دەزانی. ژن پێگەی تایبەتی خۆی هەبووە و وەک نوێنەری میرنیشینەکە نێردراوەتەوە دەرەوەی قەڵەمڕەوەکە، کە ئەمە بۆخۆی هەم دەرخەری متمانە بەخۆبوون و جۆرێکی کرانەوەی کۆمەڵایەتیشە. ئەڤینداری و ژیانی سێکسی ڕەوتی خۆیان وەرگرتووە و لە سەفەرنامەکاندا، باسێک لە دیاردەی کێشەی شەرەف و کوشتن و تۆڵەکردنەوە ناکرێت. وەک بە وەسفەکانی ڕیچدا دەردەکەوێت، عاممەی خەڵک لە بۆنە و شایی و مەراسیمەکاندا بەشداربوون و بە جلوبەرگی ڕەنگینەوە دەرکەوتوون و شارەزای بەکارهێنانی ئامێرە موزیکییە خۆرئاواییەکان بوون، وەک کەمانچە. ئەمە جگە لە بوونی موزیک وەک بەشێک لە سرووتی پاشاکانی بابان، کە ئاشکرای دەکات ئەوان وشکەمیزاج نەبوون[18]. بابانییەکان، بەشێوەیەکی باش سوودیان لە سەرچاوە سروشتییەکان و ئاو وەردەگرت و گرنگییان بە چاندنی باخ و نەمام و سەوزایی دەدا[19].

لــە مانـــای "ئـــازادی" و "دادوەری" تێدەگەیشـــتن، حـــەزکردنیان لـــە ڕێکخســتنەوەی ســوپا دەکـرد و ئەفســەرانی ئـەوروپاییيان هێنـان بـۆ مەشـقپێکردنی ســوپاکەیان. هەوڵیانـدا لـە دژی نەخۆشـییەکان، کوتـان بـەکار بهێـنن و ئەمـەش بڕواکـردن بـوو بـە چارەسـازیی زانسـتییانە و دوورکەوتنـەوە لـە (دوعـا) و (نوشـتەکردن). جیـاوازیی بیرکردنـەوەیان پەسەند دەکرد و کەسیان لەسەر جیاوازیی ئایینی سزا نـەدەدا. جوو و مەسـیحی و ئەرمـەنی و سـریانی و هیدیکـە لـە عەشـیرەتە کوردەکـانی دەوروبـــەر و دووری ناوچـــەی ســـلێمانی و شـــارەزوور[٢٠] لەگـــەڵ دروسـتکردنی شـارەکەدا هـەبوون و شـوێن و پێگـەی خۆیانیـان هـەبوو. بازرگانییان دەکرد و بەرهـەمی قەڵـەمڕەوی خۆیـان دەگەیاندە پایتەختـە گەورەکانی ئەوسا و گەلێک چالاکیی تریش..

هەموو ئەمانە دەبوونە هۆی دەستکاریکردنی هزر و گۆڕینی واقیع. لـە هـەموو ئـەو هەنگاوانـەدا جۆرێـک لـە عەقڵانییـەتی (ڕێکخسـتن) و (پلاندانان) و (پێشـبینیکردن) و (تـەگبیر)، هەیـە، کـە تایبەتمەندیی هـزری مۆدێرن و هەنگاون بەرەو دەرچوون لە نەریت، کە هەموو شتێک تیایدا لەسـەر (قـەزا) و (قـەدەر) وەسـتاوە و چـارەنووس شـتێکی پێشـینەییيە، نـەک تـەگبیر و پێشـبینیکردن و ئیرادەی هـەڵبژاردن. ئـەوان هەمیشـە لـە هـەوڵی دەستنیشـانکردنی بەرژەوەنـدیی خۆیانـدا بـوون و هـیچ شـەڕ و شـۆڕێکی نـاوخۆیی و هێرشـێکی دەرەکـی ئـەوەی بیـر نەدەبردنـەوە کـە ئەوان نیـازێکی تایبـەتی خۆیانیـان هەیـە. زۆر لـە بیرۆکـە مۆدێرنـەکانیان نەدەبوونـە مۆدێرنیزاسـیۆنی ماتـەریاڵی و نوێکردنـەوەی ژیـانی مـادی، زۆریـش لـەو نوێکردنەوانـە بـەهای مۆدێرنیـان دروسـت دەکـردن. بـەڵام بیرۆکەی چوونـە نـاو دنیـای نوێـوە، گەیشـتنەوە بـە گـەلان، هەوڵـدان بـۆ سەربەخۆیی و ئازادی، جۆرێ لـە سـێکۆلاریزەکردنی بـەرایی، دژایـەتی دەروێشـیزم و پشـکۆ خـواردن و زەرگ وەشـاندن و هتـد و ناوهێنانیـان بە چاوبەست و خورافە، تا ماوەیەکی زۆر بەردەوامی وەرگرت.

**بابانییەکان و مۆدێرنیتە:**

ئەو بابەتەی من بە ***مۆدێرنبوون*** ناوی دەبەم، بناخە و پێشینەیەکی کولتووری لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی باباندا هەیە و پاڵنەرەکان بۆ ڕەنگدانەوەی هەندێ بیروڕا و بۆچوونی مۆدێرنانە، لەو فەزایەوە هاتوون کە پاشتر دەبێتە بەردی بناخە بۆ بیرکردنەوەیەکی جیاواز. بۆیە لە ئێستادا، هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە بەشەرمەوە باسی هەبوونی سەرسامییەکی لە ڕاددەبەدەری دەستەی فەرمانڕەوا و خەڵکی قەڵەمڕەوی بابان بە دیاردە مۆدێرنەکان بکەین، بگرە بەڵگە و شایەتەکان زۆر لەوە زیاتر ڕێگەمان پێدەدەن لەم بارەیەوە بە ڕاشکاوی قسە بکەین. بابانییەکان، وێڕای هەر کێشە و ململانییەکی ناوخۆیی و سەرباری ئەو دوژمنایەتی و دەسیسانەی لەلایەن ئیمپراتۆریەتی ئێرانی و عوسمانییەکانەوە، بەمەبەستی لێکدابڕکردن و ئاژاوە دروستکردن لە نێوانیاندا، ڕووبەڕوویان دەبوونەوە و تیایدا ئەمان دەکرانە ئامراز بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی داگیرکەران، هێشتا لە هەناوی ئەم قەڵەمڕەوەدا هێڵێکی گشتی "هوشیاری" دەبینرێتەوە، کە کوردەکان دەیانەوێت لە ڕێگەیەوە خۆیان لە هەر گیرۆدەبوونێک ڕزگار بکەن و لەسەر ئەو بنەمایانەوە خۆیان ڕێکبخەنەوە و بەردەوامی وەربگرن، کە شێوازێکی مۆدێرنانەی حوکمداری و ژیانە. هەرچەندە لێرەدا وشەی (هوشیاری) بە شێوەیەکی ڕێژەیی و لە پەیوەندیی بەو سەردەمەوە بەکار دەهێنم، بەڵام بۆ ئەوەی لەم ڕاستییە زیاتر تێبگەین، لە ناو گەشتنامەکانی هاوسەردەمدا هەندێ زانیاری وەک نموونە، لە چەند گەشتنامەی بەنرخەوە دەگوێزمەوە، کە یارمەتیدەر و نزیکماندەخەنەوە لەو ڕاستییەی کە بە "پێشینە و زەمینەی کولتووریی مۆدێرن" لەو سەردەمەدا ناویان دەبەم. بەڵام ئەوەش بە سوود وەرگرتن لە مالینۆڤسکی بەیاد دەهێنمەوە[21]، کە ئەم "**دۆخە کولتووری**"یە، لەگەڵ "**دۆخی واقیعی**"دا، کە پڕ بووە لە ناکۆکی و مەترسی، جیاوازە. وەک بڵێی زەمینەی واقیعی، یارمەتیدەری وەها

بیرۆکەیەک، کە چوون بێت بەرەوپیری دنیای نوێ، نادات، بەڵام دۆخی کولتووری و زەینی کەسەکان و دەستەیەکی هەڵبژاردە، وێڕای ئەوەش کە لە واقیعدا چیی ڕوو دەدات، بەردەوامن لەسەر ئەو بەرەوپیرچوونە و دەربڕینی مەیل بۆ گەیشتنەوە بە جیهانی مۆدێرن وەک ڕێگایەک بۆ ڕزگاربوون لە دۆخی واقیعی سەپاو. گەشتنامەکان بریتین لە گەشتی ڕیچ، ١٨٢٠، گەشتی فرەیزەر ١٨٣٤، گەشتی ئۆژین فلاندن ١٨٤١ و توێژینەوەکەی خۆدزکۆ لەسەر زمانی کوردی.

**هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان:**

ئەوەی لەو گەشتنامانەوە، وەک بەڵگە ڕایدەگوێزمە ئەم باسەوە، بە زۆری ئەو گوتە و دەستەواژە و وەسفانەن، کە گەریدەکان ڕاستەوخۆ لە زاری ئەوانەوە دەیگوێزنەوە، کە ڕووبەڕوو و هاوکاتییانە لێیان بیستوون و بۆ شەوێ، یان ڕۆژانی دوایی، یاخود دوای گەڕانەوەیان بۆ شوێنی خۆیان، تۆماریان کردوون. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو گەشتنامانە پێویستییان بە خوێندنەوەیەکی کوردانە هەیە بۆ ئەوەی بەهای ڕاستەقینەیان بۆ ئێمەی کورد دەربکەوێت و گەلێک زانیاریی مرۆڤناسیانە، کۆمەڵایەتیانە، ئێستاتیکیانە، تەلارسازیانە و ئیداریانە و تەنانەت تێگەیشتنیشیان لەسەر مێنتاڵیتەی کورد لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، لێوە بەدەست بهێنین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە نابێت بەچاوی بێگانە و بەتایبەتیش بەچاوی بەدگومانیانەی عەرەبی/ئیسلامی تەماشای کۆی پڕۆژەی ڕۆژهەڵاتناسی و بەتایبەتیش گەشتنامەی گەڕیدە بیانییەکان بۆ ناوچەکانی کوردستان بکەین و لە پێشەوە و لە زمان ئەوانی ترەوە، حوکمیان بەسەردا بدەین[٢٢].

ئەوە ڕاستە، کە گەشتکەر و گەڕیدە بیانییەکان ئەرکێکی سیاسیی، ئیدارییان لە ناوچەکەدا لە ئاست دەوڵەتی خۆیان لە ئەستۆ بووە، ئەوەش ڕاستە ئەوانە لە ڕۆشنبیری و ڕوانگەی کولتووریی خۆیانەوە تەماشای ئەویتریان کردووە، کە کوردە، ئەوەش ڕاستە کە ئەم گەشتیارانە هەڵگری بڕیاری پێشینەیی خۆیان بوون لەسەر کورد.. بەڵام

ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە کۆی گەشتنامەکان بەو چاوە تەماشا بکەین، کە "جاسووسانە" نووسراین.

ئەم چەند گەشتنامەیەی من بۆ مەبەستی ئەم توێژینەوەیە پشتیان پێدەبەستم، گەوهەری پڕ بەهان لەسەر کورد و بابانییەکان کە نووسەرەکانیان لە نزیکەوە پاشاکانی بابانییان بینیون و ماوەیەکی باش لەلایان ماونەتەوە. بۆیە ئەو زانیارییانەی بۆیان پاراستووین، زانیاریی ورد و دەستی یەکەمن بۆ تێگەیشتن لە کەسایەتی مرۆڤی کورد و کەسایەتی حوکمدارانی بابان و تەنانەت کۆمەڵگای کوردستانی ئەو سەردەمەش. ئەمانە ئەوەندە لە نزیکەوە کوردەکانیان بینیون و لەگەڵیان دانیشتوون و دۆستایەتییان کردوون، کە وادەکات نووسراوەکانیان بایەخێکی یەکجار بەنرخیان هەبێت لە هەموو ڕوویێکەوە..

کەسانی تریش هەن کە بۆ ئەم باسەی من سوودی زۆریان هەیە، بەتایبەتی کتێبەکەی (سێر ڕۆبێرت ک. پۆرتەر: **سەفەرەکان بە جۆرجیا، پارسیا، ئەرمێنیا و بابلی کۆن لە ماوەی ساڵانی ١٨١٧، ١٨١٨، ١٨١٩ و ١٨٢٠دا)**[٢٣]. هەروەها کتێبەکەی مەیژەر فردریک میلینگن بەناوی (**ژیانی سەرەتایی کوردەکان**، لە ١٨٧٠)دا[٢٤]. ئەمە جگە لە کتێبەکەی ولیام هیوود، کە لە شوباتی ١٨١٧ دەچێتە سلێمانی و لەلایەن پاشای بابانییەوە "**بەشێوەیەکی شکۆمەندانە پێشوازی لێکردوون**"[٢٥]، هیوود هەرچەندە زۆر بەباشی باسی کوردەکان ناکات و ڕۆحییەتێکی گومانکارانە و لووتبەرزانەی بەرامبەر بەو خەڵکە دەست و دڵپاک و میواننەوازە هەیە، کە پێشوازیی لێدەکەن، بەڵام ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە، کە "**کوردەکان سەرسامن بە ئەورووپاییەکان**"[٢٦]. هەر ئەم سەرسامییەشیانە، کاتێک دەزانن ڕووسەکان دەیانەوێت هێرشیان بکەنە سەر، لە هیوود دەپرسن: "**ئاخۆ ئینگلیز و پۆناپارت چ هەڵوێستێک وەردەگرن**"[٢٧] هەرچەندە ئەم گەڕیدەیە وەلامێکی نائومێدکەری داونەتەوە، بەڵام کوردەکان نەیانویستووە بڕوای پێبکەن و "**حەزیانکردووە بە پێچەوانەوە بووایە**"! بەم جۆرەش هەر لەو

سەردەمەوە کوردەکان بەو چاوەڕوانییەوە ژیاون کە "**دۆستە فەرەنگییەکان**"یان لە "**هاوسێ دڕندەکان**"یان دەیانپارێزن و بەوەش دەچنە نێو دنیای نوێوە. تەنانەت هیوود کاتێک دەگاتە هەولێر، بۆی دەردەکەوێت "**کوردەکان لەو بڕوایەدان کە ئەورووپایی و بەتایبەتیش ئینگلیزەکان دەستی شفا و چاککردنەوەیان هەیە و پزیشکی گەلێ کارامە و زیرەکن**"[۲۸]. ئەم چاوەڕوانییە ***پێشینەیەی*** کوردەکان دروستکەری ئەو پێشزەمینە کولتووری و هزرییەیە کە ئەوانی هاندەدا بۆ خۆ نزیکخستنەوە و دۆزینەوەی دەستی هاوکاری بۆ ڕزگاربوونیان لە ستەمی چواردەوریان. هەر ئەمەشە کە سەرەتا سادەکانی وێناکردنێک لەسەر ئەورووپا و فەرەنگستان لە خەیاڵگەی ئەواندا چێدەکات، کە مەیلیان بۆ "دنیای نوێ" بەهێز بێت. ناکرێت لە پەیوەندیی بەم باسەوە، کاری گەڕیدەی فەرانسەییش، **ئۆژین فلاندن** لەبیر بکرێت کە **ئەحمەد پاشای** بابانی بینیوە، کە یەکێکە لە سیما هەرە بەرجەستەکانی مۆدێرنیتەی بابانی و لە شوێنی خۆیدا شیکاریی بۆ قسەکانی دەکەم[۲۹].

من لەناو ئەم گەڕیدانەدا، لەسەر چواریان دەوەستم: (***ڕیچ، فرەیزەر، فلاندن و خۆدزکۆ***)[۳۰]، تاکو بتوانم ئەو زەینییەتە ئومێدەوار و خەیاڵگەیەی کورد ڕوونبکەمەوە، کە لەو سەدەیەدا دەبێتە سەرەتاکانی هەوڵدان بۆ گەیشتنەوە بە پێشکەوتن و دانایی گەلانی ئەورووپا. ئەم گەڕیدانە هەریەکەیان لە نزیکەوە کوردیان بینیوە و زانیاریی زۆریان لەسەر بیرکردنەوە و چاوەڕوانی و خەون و ئاواتە شاراوەکانیان بۆ پاراستووین، کە لە شوێنی پێویستدا ئاماژەیان پێدەدەم. ئەوەی مەبەستی سەرەکیی من بووە، ئەوەیە کە ئەم سەفەرنامە و گەڕیدانە، وێڕای هەر ڕەخنەیەکی لەسەریان هەبێت، یان ئەو ڕوانگە و مەبەستەی هەیانبووە و بڕی ئەو زانیارییانەی لە سەریانەوە باسی کوردیان کردووە، هێشتا سەرچاوەی زۆر باشن بۆ سۆراخکردنی ئەو پەیوەندییەی کورد بە دنیای نوێوە دەبەستێتەوە.

**یەکەم: کلۆدیوس جەیمس ڕیچ:**

ئـەوەی پەیوەنـدیی بـە گەشـتنامەکەی (ڕیچ)ـەوە هـەبێت لـە سـاڵی ١٨٢٠، مـاوەی چـوار مانـگ لـە شـاری سـلێمانی سـەردەمی مـەحموود پاشـادا دەمێنێتـەوە، بـەدەر لـەوەی ئـەم مرۆڤـە خۆشەویسـتییەکی بـۆ پاشای بابانی لەلا دروستبووە و بە بێ خۆسانسۆری باسی کەسایەتی مرۆڤـی کـورد لـەو دەڤـەرەدا دەکـات، ئـاواش لـە پەیوەنـدیی بـە بـوونی بیرۆکە و تاسـەی مرۆڤـی کورد بۆ مۆدێرنیتـە لـەو سـەردەمەدا، گەلێک ئاماژە و ڕاگواستنی وتەی بابانییەکانی تێدایە، کـە ئـەم بیرۆکەیـەی ئێمـە دەسەلمێنن.

بابانییەکان، لەو سەردەمەدا بە تاسەوە چاوەڕێی خۆنزیکخسـتنەوە و فێربوونیـان لـە ئەورووپاییـەکان کردووە و تەنانـەت بـە ئومێدیشـەوە ویستوویانە "نەسەب"ی خۆیان ببنەوە سەر ئەورووپاییەکان. مەحموود پاشا، میری بابان، لە (٤ی تشرینی یەکەم، بۆخۆی بـە (ڕیـچ)ی گوتـووە، کە شانازیی دەکات "**وەچەی (کەیخان/**Keighan**)ی ئەورووپاییە و پێشی وتم ڕەنگە بە دووری نەزانێ، بە خزم بە من بگاتـەوە**"[٣١]. هـەروەها لـە ڕۆژی (٧ی تشرینی یەکـەم) لـەم بارەیـەوە لـە زمـان پیـاوێکی بەتەمـەنی بابانییەوە بـەناوی (ئەحمـەد بـەگ)، ئـەوە دەگێڕێتـەوە، کاتێـک ئـەو پیـاوە دەزانێـت ڕیـچ ئەورووپاییـە، پێیـدەڵێت: (**ئـای، خـۆ ئێمـە خـزمین و باپیرانیشمان هەر خزم بوون**)[٣٢]. لێرەدا وەک ڕیچ ئاماژەی پێکردووە، پیاوە بەتەمەنەکە مەبەستی داستانی (کەیغان فەرەنگی و فەقێ ئەحمەد) بـووە، کـە گوایـە پێکهێنـەری بنـەوانی بنەچـەی بابانییـەکان بـوون و ئـەم ڕووداوەیشـی لـە بەشـێکی دیکـەی کتێبەکەیـدا باسـکردووە. بـەڵام ڕیـچ بۆخۆی بڕوای بەو گێڕانەوەیە نەبووە.

**عوسمان بەگ:**

ڕۆژی ١٣ی ئایـار، پـاش نیـوەڕۆ، ڕیـچ سـەردانی عوسـمان بـەگی برای مەحموود پاشا دەکات، لەو کاتەدا عوسمان بـەگ (٣٣) سـاڵ بـووە و پاشـا (٣٥) سـاڵ بـووە و بـەم جـۆرە دەیگێڕێتـەوە: "**هـەروەک چـۆن**

**پرسیاری زۆر بەجێی لێدەکردم، هەر بەو شێوەیەش وەڵامی پرسیاری منی بە جۆرێک دەدایەوە، کە زیرەکیی تێدا بەدی دەکرا. پۆزشی بۆ ئەوەش دەهێنایەوە کە ئارەزووی زانینی هەیە و پرسیاری زۆر دەکات و وتی: (ڕەنگە بێزارت بکەم، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ کوردێک چەند بەلایەوە سەیرە کە لەگەڵ ئینگلیزێکدا دەدوێ و چەند ئارەزوو لە سنگیدا دەجۆشێ بۆ قۆستنەوەی ئەو قسە و زانینی ئەو شتانەی کەڵکیان لێ وەردەگرێ و ڕێگەی تریشی نییە بۆ فێربوونیان)"**[٣٣].

هەرچەندە ڕیچ، لە چەند شوێنێکدا سەرنجی ئاکاریی لەسەر عوسمان بەگ هەیە لە پەیوەندیی بە ژیانی غەریزەییەوە[٣٤]، بەڵام عوسمان بەگ لەو کەسانەیە کە لە کولتوورێکی تایبەتەوە قسان دەکات و عەودالّیی ئەو بە دوای زانین و فێربووندا، عەودالّیی مرۆڤی مۆدێرنە. جگە لەوەی ئەتەکێتی ئەو لە خوێندنەوەیدا بۆ سایکۆلۆژیای ڕیچ، کە پێیدەڵێت: "**ڕەنگە بێزارت بکەم، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ کوردێک چەند بەلایەوە سەیرە کە لەگەڵ ئینگلیزێکدا دەدوێ**"، ئەتەکێتێکی شارییانە و لە هەمان کاتیشدا هەڵگریی نرخاندنێکە بۆ ئینگلیز و ئاشکراکەری هوشیاریی کوردیشە لە ئاست ئینگلیزدا. بۆیە ڕیچ سەرسام دەبێت و وا هەست ناکات هیچ ئاڵۆزییەکی کولتووری و بنەماگەلێک بۆ بەهەڵە لێکحاڵیبوون لە نێوانیاندا دروست بووبێت و بە خۆشحاڵییەوە عوسمان بەگ هان دەدات تا بەردەوام بێت. پاشان ڕیچ دەنووسێت: "**پرسیاری زۆری لەبارەی ئینگلتەرە و فەرەنسا و ڕوسیا و ڕژێمەکەی ئێمە و شێوەی سەراپەردەی وڵاتەکەمان و چۆنێتی ڕێکخستنی سوپاکەمان کرد... لەبارەی شەڕەکەی (واتەرلو)ەوە، بە دوورودرێژی پرسیاری زۆری لێکردم.. سەبارەت بە (پۆناپارت)، یان وەک ئەو دەیوت: (ئیمبراتۆل)یش شتی بیستبوو. دوایی هاتە سەر باسی (چین)..**"[٣٥].

ڕەهەندی جوگرافیایی ئەم پرسیار و قسانەی عوسمان بەگ زۆر فراوان و بەرینن، ئاستی ئاگایی تیایاندا بەرزە و ئەو پۆلێنکردنەش کە لە ڕیزبەندیی پرسیارەکاندا هەیە، بیرخەرەوەی ئەقڵانییەتێکی سیاسیی

بەرزە. لە پرسیارکردنەوە لەسەر وڵاتەکان دەپەڕێتەوە بۆ پرسیار لەسەر سیستەمی سیاسی و ئیداریی وڵاتەکە و ڕێکخستنی سوپایی. وەک ئەوەی لە ناوەڕۆکی ئەم ڕیزبەندییەدا تێگەیشتنێکی زەینیی مۆدێرن ئامادەبێت کە ئەمانە پێکەوە دەبەستێتەوە. بەشێوەیەکی گشتیش جوگرافیای پرسیارەکان بەرین و نیشانەی گوێقوڵاخی و بەدواداچوونی زۆرە بۆ دەنگوباسی وڵاتان. هەر لەوێشدا پرسیارکردن لەبارەی (چین)ەوە باسەکە بەرەو ئەو شوێنە دەبات، کە لە بیرکردنەوەی عوسمان بەگدا، سۆسەی ئامادەیی قوتببەندیی نێوان خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی ئەوسای لێبکرێت. بەتایبەتیش کە ڕیچ دەنووسێت: **هەر هەمان ئەو پرسیارانەی دووبارە کردەوە، کە سەرلەبەیانی ئەمڕۆ عەبدوڵڵا پاشا، لێی کردبووم و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دڵنیا بم لەوەی هەبێ و نەبێ ئەم بابەتەیان لە ناو خۆیاندا باسکردووە**"[٣٦].

بەم جۆرەش، پرسیارەکان و تێگەیشتنی ڕیچ لێیان ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە لەناو دەستەی بەڕێوەبەرێتی باباندا، کولتوور و زەینییەتێکی هوشیار و مۆدێرن لەسەر سیاسەت ئامادەیی هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، عوسمان بەگ، باسەکە بەرەو ڕەخنەیەکی هێمن، بەڵام سەرقاڵکەر بۆ ڕیچ دەگوێزێتەوە، کە بریتییە لە ڕەخنە لە سیاسەتی ئینگلیز لە هیندستان: "**شتێکی سروشتییە، پاشایەک سوپایەکی بەهێزی وەک سوپای ئێوەی هەبێ و بەپێی ئارەزووی خۆی بەکاری بهێنێ و سەیریش نییە بەلامەوە، کە ئێوە هەمیشە هەوڵ بدەن دەرفەتی *دەست بەسەرا گرتنی وڵاتانی ترتان بۆ بڕەخسێت***"[٣٧]. لێرەدا دەستەواژەی "**دەست بەسەرا گرتنی وڵاتانی تر**" هەمان مانای ***داگیرکاری*** و "***ئیستیعمار***"ی هەیە کە ڕیچ ناچار دەکات بەرگریی لە خۆی و وڵاتەکەی بکات و ڕوونکردنەوە بدات و بیخاتە چوارچێوەی "***بەرگریکردن لە خۆمان***". بەڵام عوسمان بەگ بەردەوام دەبێت لە ڕەخنە بە ئەدەبەکەیی و بەشێوەیەکی هێمنانە، بەڵام بە تۆنێکی ڕەخنەگرانە، دەڵێت: "***ئەگەر***

*وابێ وەک تۆ دەڵێیت، ئەی چۆن ساڵ دوای ساڵ لە هێندستان دەست بەسەر شوێنی زیاتردا دەگرن و دەست بەسەراگیراوەکانتان فراوانتر دەکەن؟*" ئەمجا ڕیچ دەنووسێت: "*لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی: "تکا دەکەم پرسیارەکەم بە نابەجێ وەرنەگریت*" [٣٨].

عوسمان بەگ لەوپەڕی ڕەچاوکردنی ڕێوڕەسمی میوانداریی کوردییانەدا، کە پێشتریش مۆڵەتی لە ڕیچ خواستبوو، پرسیاری لێبکات، ڕەخنەیەکی توندی لە سیاسەتی بەریتانیا لە هیندستانی ئەوسا گرتووە. ناوەڕۆکی ڕەخنەکەی ئەوەیە، ئەگەر ئێوە سوپاتان بۆ داگیرکاری پێکنەهێناوە، بۆچی شوێنە داگیرکراوەکان ساڵ بەساڵ فراوانتر دەکەن؟. مانایەکی دیکەی ئەم قسەیە ئەوەیە کە بڵێت: **چییەتی و جەوهەری سیاسەتی بەریتانییەکان بریتییە لە داگیرکردن**، کە بێگومان ئەمەش ڕەخنەیەکی توندە. لەوە گەڕێ کە لە پرسیارەکان و ڕەخنەکەی عوسمان بەگدا، ئاگاییەکی مۆدێرن سەبارەت بە چەمکی داگیرکاریی هەیە، ئاواش ڕۆحێکی کۆسمۆپۆلیتیانە لە بیرکردنەوەیدا بەدی دەکرێت، کە ڕۆحی بەرگریکردنە لە مافی میللەتانی داگیرکراو (لێرەدا، هیندستان) و وەستانەوەیە لە دژی کردەی داگیرکردن.. ئەمە جگە لەوەی ترسێکی پێشبینیکەرانەیش پیشان دەدات لەوەی کوردستانی قەڵەمڕەوی بابانیش دووچاری هەمان داگیرکاری ببێتەوە، کە بێگومان مێژووی پاشتری ناوچەکە، قسە و ترسەکەی وەسمان بەگی هێنایە دی!

ڕیچ لە بەرگرییەکانیدا هەرچەندە ددان بەوەدا دەنێت، کە پێش بەریتانییەکانیش وڵاتانیتر هیندستانیان داگیر کردووە، بەڵام ئەمە دەبەستێت بە سیاسەتی بەرژەوەندی و ململانێی وڵاتانی دیکەی ئەورووپاییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەخنەگرە کوردەکە دەڵێت وایزانیوە: "**ئینگلیز هەروا لە ناکاوێکدا سوپایەکی گەورەیان بۆ داگیرکردنی هیند ناردبێ و هەرکاتێکیش ئارەزوویان کردبێ، بێ هۆ و بەبێ بیانوو، دەستیان بە داگیرکردنی وڵاتان کردووە**"، کە ئەم قسەیە تا ئەندازەیەک ڕیچ دڵخۆش دەکات، بەبێ ئەوەی لە تۆنە ڕەخنە ئامێزەکەی

بکۆڵێتەوە، کە لە ڕستەی "**هەرکاتێکیش ئارەزوویان کردبێ، *بێ هۆ و بەبێ بیانوو*، دەستیان بە داگیرکردنی وڵاتان کردووە**"، بەڵام بەرگرییەکانی ڕیچ لە سیاسەتی داگیرکاری، ناتوانێت ڕەوایەتی بداتە کارەکە لە بەرچاوی عوسمان بەگدا. بۆیە عوسمان بەگی ڕەخنەگر، باسەکە بەرەو شوێنێکی دیکە دەبات، کە دیسانەوە ڕەنگدانەوەی خولیا مۆدێرنەکانێتی: پرسیارکردن لەسەر (**باڵۆنی هەوایی**) وەک ئامرازێکی فڕین و گواستنەوە.. باڵۆن وەک تەکنەلۆژیای گواستنەوەی ئاسمانی: "**پاشان لەبارەی (باڵۆن)ـەوە پرسیاری کرد و وتی: پێی وایە** (یان: پێیانگوتووە)**، ئەوە ئامێرێک بێت و بۆ هەر جێگایەک بتەوێ سەربازی پێ بگوێزرێتەوە**"[٣٩].

باڵۆن وەک ئامێرێکی گواستنەوەی پێش دروستبوونی فڕۆکە، مژدەیەکی مۆدێرنیتەیە بۆ دەستکاریکردنی خێرایی لە زەوییەوە بۆ ئاسمان و پێشدەستییەکە بۆ دروستبوونی تەکنەلۆژیایەکی مۆدێرن[٤٠]. مرۆڤ لە مێژە خەونی فڕینی هەبووە، بەڵام بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٨٣دا بەو ئاواتەی گەیشت، کاتێک دوو پیاوی فەرەنسی توانییان لە باڵۆنێکدا بفڕن و لە ساڵی ١٨٠٠یشدا توانرا ماتۆڕی بۆ زیاد بکرێت[٤١]. بە لەبەرچاوگرتنی ماوەی ئەو (٢٢) ساڵەی لە نێوان داهێنان و گەشەکردنی ئەم ئامێرە و کاتی پرسیارەکەی عوسمان بەگ، هەیە، کە زۆر کەمە بۆ ئەوەی لە ئەورووپای ئەوساوە، کاریگەرییەکانی بگەنە دنیای لە کێشە نغرۆبووی بابانیدا، کەچی هێشتا لە پرسیارەکەی عوسمان بەگدا هوشیارییەکی مێژوویی بەرامبەر تەکنەلۆژیای مۆدێرن و پەیوەندیی بە سوپاوە هەیە[٤٢]. جگە لەوەش ئەو ڕاستییە ئاشکرا دەکات، کە ئەم پیاوە بەدواداچوونی تایبەتی هەبووە بۆ دنیای مۆدێرن و دەستکەوتەکانی، کە ئەوەش ئاشکرای دەکات، بابانییەکان لە هەمان کاتدا، کە لە دنیای لۆکاڵیدا قووڵ دەبوونەوە و کۆمەڵگای خۆیان باش دەناسی، وەک ئەوەی پاشان لە لای جەیمس فریزەر دەبینرێتەوە، کە هەژدە ساڵ پاشترە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە زۆر جار هوشیاری پێش ئەزموون و بیرکردنەوە پێش واقیع دەکەوێت.

عوسمان بەگ وەک گەنجێکی کورد، لە ڕوانگەی لۆکاڵیانەی خۆیەوە زۆر سەرسام دەبێت کاتێ دەبیستێ لە لەلای بەریتانییەکانیش هەندێک خێڵ (Tribe) هەن، بۆیە تکا لە ڕیچ دەکات ناوی هەندێکیان پێ بلێت و زانیاریی لەسەر شێوە و زمان و ڕەوشتیان بزانێت و بزانێت چۆن خۆیان لە ڕووی سەربازییەوە تەییار کردووە و چۆنە ئەوانە جلوبەرگی میللیی خۆیان لەبەردایە و ئەفسەرەکانیشیان هەر لە خۆیانن.

وشەی (خێڵ/Tribe)، هەمان مانای خراپ، یان بەکەمگرتنی ئەمڕۆکەیی، لە زەینی عوسمان بەگدا نییە. لە ئێستادا بۆ ئێمە، وشەی خێڵ بەیادخەرەوەی قۆناغی پێش و بگرە ڕێگرە لەبەردەم نەتەوە/دەوڵەتدا. بۆ ئەو، خێڵ یەکەیەکی کۆمەڵایەتی یەکگرتوو بووە، کە کۆمەڵێک بەهای نەگۆڕ پێکیانەوە دەبەستێتەوە و پابەند بوون بە خاک و شێوەژیانەوە، لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە و پەیوەندییە (نەسەبی)ی و خوێنییەکان لە پێش پەیوەندییە هۆکارمەند (سەبەبی)یەکانەوەن. خێڵ لە بنەڕەتدا، سیستەمێکی خزمایەتییە کە ئەندامەکانی یەکتریی دەخوازن و یەکترییان دەوێت[٤٣]. بۆیە خێڵ هێشتا هەڵگری خەونی نەتەوەیی نییە و تیایدا وەک هاووڵاتی بیر لە ئەندامانی کۆمەڵگا ناکرێتەوە. ڕەنگە لە ڕووی بەهاوە، خێڵ بۆ وەسمان بەگ هەمان بەها بێت کە لە دنیای ئێمەدا دەدرێت بە دەوڵەت، یان بە نەتەوە. هەر بۆیەشە، ئەمە نابێتە ناکۆکی و بە پێوەرە لۆکاڵییەکان پرسیاری لەبارەی وڵاتانی دیکەوە لێدەکات و بە هەمان شەوقەوە باسی (جیهانی تازە)ی لێدەپرسێت کە (ئەمەریکا)یە و پرسیاری چۆنێتی دۆزینەوەی ئەو کیشوەرە تازەیە دەکات:

**("بۆیە دەمودەست پرسیاری چۆنێتی دۆزینەوەی ئەو کیشوەرە تازەیەی کرد، (کە برنجی لێوە دەهێنرێت). منیش پێم وت "کە زاناکانی ئەستێرەناسی و ئەندازیاری، سەلماندبوویان، زەوی وەک پرتەقاڵ خڕە. ئەم بەشەم لە ڕوونکردنەوەکانم بەهۆی نووقاندنی مشتمەوە نیشاندا. لێرەدا فەرەنگستانە و ئەویشیان هیندستانە، ئەوەش ئەو ڕێگایەیە کە لە**

**فەرەنگستانەوە بۆ هێند دەچێ، بەڵام هەندێ کەس دەیانپرسی: ئەی بۆ ناتوانن بە دیوی ئەودیوی ئەو ڕێگەیەدا بڕۆن، کە بۆ هیند دەچێ؟! لێرەدا هەندێ ئەمەیان سەلماند و هەندێکی تریشیان ئەمەیان نەسەلماند، تا یەکێکی لە هەموویان ئازاتر بڕیاری دا ئەو ڕێگایەش تاقی بکاتەوە. بۆیە شازادەیەکی دۆزییەوە کە پاپۆڕ و کەلوپەلی ڕێگای بۆ ساز بکات، تا بتوانێ کارەکەی ئەنجام بدات. ئەویش ئەو ڕێگا تازەیەی بەرەو هیند لەبەر گرت، کیشوەرە تازەکەی دۆزییەوە. ئیتر زۆر بەباشی لەمە گەیشت. کاتێکیش کە جۆری ئەو کۆمارە تازەیەم بۆ ڕوون دەکردنەوە، وتی: "ئەمەیان لە خێڵەکانی خۆشناوەتی دەچێ، کە هەر گوندێکیان سەرۆکی خۆی هەیە و هەمووشیان بۆ بەرژەوەندیی تێکڕای خێڵەکە کۆدەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن")[٤٤].**

پەرەگرافەکە کەمێک درێژە، بەڵام گرنگییەکی بێهاوتای هەیە. باسێکی سەرەکیی لە زانستی مۆدێرن، کە پێچەوانەیە لەگەڵ جیهانناسی خۆرهەڵاتی و ئیسلامییانە، هاتۆتە پێش. زەوی خڕە و بە یاریدەی ئەم دوو زانستەش، ئەمەریکا دۆزراوەتەوە[٤٥]. عوسمان بەگ نەک هەر ڕێگە بە وەها باسێک دەدات، بەڵکو وەک ڕیچ دەنووسێت: زۆر بە باشیش لێی تێدەگات. ئەو لە ڕوانگەی خۆیەوە بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵیی پێناسەی ئەمەریکا دەکات و دەڵێت: ***"ئەمەیان لە خێڵەکانی خۆشناوەتی دەچێ، کە هەر گوندێکیان سەرۆکی خۆی هەیە و هەمووشیان بۆ بەرژەوەندی تێکڕای خێڵەکە کۆ دەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن"***. زەینییەتی بەراوردکاری لەم دەقەدا بەڕوونی دیارە. ئەو زەینییەتەش کە بەراورد لەنێوان خۆی و ئەوانیتردا دەکات، لە خۆیدا جێهێشتنی زەینییەتی خێڵەکیانەیە کە هەمیشە خۆی دەکاتە سەنتەر و ئەوانیتر بە پەراوێز. لەم وێکچوواندنەی عوسمان بەگدا، ئەوەی گرنگە جیاوازییە لە پێکهاتەدا و یەکگرتووییە لە ئامانجدا.

ناوەڕۆکی ئەم وێکچوواندنە و ڕووە نادیارەکەی ئەوەیە، کە کوردەکانی قەڵەمڕەوی بابان ناکۆکن و یەک ئامانجیش نین، لە کاتێکدا

خۆزگەی عوسمان بەگ ڕێزگرتنە لە جیاوازی و یەکبوونە لە ئامانجدا. بەم جۆرەش لە بیرکردنەوەی عوسمان بەگدا ئامانج هەر ئەوە نییە کوردەکان بۆ ئامانجەکەیان یەکبگرن، بەڵکو وەک جیهانە نوێیەکەشیان لێبێت. ئەمە بیرۆکەیەکی مۆدێرن و هەڵگری بەهایەکە لە سەرووی بەهای خێڵەوە، کە تەنیا بیر لە خۆی دەکاتەوە و ئەوانیتر وەک دوژمن دەبینێت. ئەوەشمان بیر نەچێت، وێڕای دڵسۆزییەکانی عوسمان بەگ بۆ مەحموود پاشای برای، کەچی هێشتا لەگەڵیدا ناکۆکە لەسەر ئەو پابەندبوونەی میر هەیەتی بە تورکەکانەوە. هەر لەو دانیشتنەدا، ڕیچ بە عوسمان بەگ دەڵێت: " ***لای ئێمە کەس پرکێشی ئەوە ناکات لەبەرامبەر شا دا دابنیشێ، وتی: (چی؟ تەنانەت پیاوی ئایینیش؟). پێم وتەوە: (بەڵێ ئەوانیش)***. لێرەدا ڕووی لە هەندێ لە دانیشتوان کرد و بە زمانێکی پڕ لە ڕەزامەندییەوە پێی وتن: (***چاوتان لێیە لە وڵاتی ئەمان، مەلاکان دەستیان ناڕوات!)***[٤٦]

ئەم ئاماژەیە زۆر شتمان لەسەر بیرۆکە و هزرە شاراوەکانی عوسمان بەگ پێدەڵێت، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی سیاسییەوە هەبێت. ئەو، دوو زاراوەی جیاوازیش بەکار دەهێنێت: (عولەما Ulema) بۆ پیاوانی ئایینی ئەورووپی و (مەلا Mulla)ش بۆ پیاوانی ئایینی خۆمان. عوسمان بەگ چ لە پرسیارە سەرسووڕهێنەرەکەیدا: (**چی؟**) و چ لە دەستنیشانکردنیدا بۆ **پیاوانی ئایینی** و چ لە ڕوونکردنەوە ڕەزامەندانەکەیدا، کە باس لە **دەست نەڕۆیشتوویی مەلاکان** دەکات، جەخت لەو شتە دەکاتەوە، کە خۆی لە ناخدا بڕوای پێیەتی و ئێستا پێیدەگوترێت: دوورخستنەوەی ئایین لە سیاسەت و حوکم و وەرسبوونی ئەو لە تێکەڵبوونی ئەم دووانە لە وڵاتەکەی خۆیدا..

کۆتایی دانیشتنەکەی ڕیچ و عوسمان بەگ، بە تێبینییەکی زۆر گرنگ لەسەر شوناس کۆتایی پێدێت: عوسمان بەگ دەڵێت: (***وڵاتەکەمان لەبارێکی زۆر ناهەمواردایە، چونکە ئەگەر خزمەتی تورک دەکەیت، بە***

***سووک سەیرت دەکەن و هەر کاتێ ئارەزوویان کرد لەسەر کارت لا دەبەن. ئەگەریش خزمەتی ئێرانی دەکەیت، هەمیشە بەداواکردنی پارە، بێزارت دەکەن***(٤٧).

دیققەت بدە، لێرەدا وشەی (وڵاتەکەمان) وەک پێناسەیەک بۆ خۆجیاکردنەوەی (ئێمەی کورد) لە ئەوانیتری (فارس) و (تورک) بەهای خۆی هەیە. ئەمە ئاستێکی ئاگایی و جۆرێکی تایبەتی دەستنیشانکردنی (شوناسی من) لە بەرامبەر (شوناسی ئەوانیتر)دا، دەردەخات. بەم جۆرەش، عوسمان بەگ وەک گەنجێکی فەرماندار لە چینی باڵای کۆمەڵگای بابانی، نوێنەرایەتی هزریی گۆڕان و گەڕان بەدوای شوناسێکی تایبەت دەکات، کە لە سەرێکەوە ئەم شوناسە عەودالی مۆدێرنیتە و بەهاکانێتی و لە سەرێکیشەوە، خوازیاری ئازادبوونە لە ئەرکی "***خزمەتکردن***" بە تورک و فارس. هەر ئەوەی کە دژی بەسووک سەیرکردنی خۆت و دژی ڕازییکردنی ئەوانیتر بیت، ئەمە بیرۆکەیەکی ناخێڵەکیانە و دژە خێڵەکیانەشە.

سەردەمەکە پڕە لە ئاماژەی ورد و گرنگ بۆ خۆڕزگارکردن لەم قەیرانە. وەک لە یاداشتەکانی پاشتری ڕیچ دا دەردەکەوێت، بۆ نموونە لە (١٩/ی تشرینی یەکەم): عوسمان بەگ کێشەیەکی دیکەیشی هەبووە، چونکە میری برا گەورەی، (مەحموود پاشا) گوشاری زۆری لێدەکات کە ببێتە حاکمی کۆیە. بەڵام لەبەر ئەو تێگەیشتنە لە خۆی وەک کوردێک و ئەو بۆچوونەی لەسەر شوناس، هەروەها لەبەر هەڵوێستی خۆی لە ئاست تورکەکاندا هەیەتی، نایەوێت مل بۆ ئەم داوا و فەرمانە بدات.

میر (مەحموود پاشا)، بۆ خۆی هەرچەندە لە ناخدا جۆرێکی دیکەیە، بەڵام لە فەرمانڕەواییدا، مەیلێکی عوسمانلیانەی هەیە، کە هۆکارێکی ئایینیشی لە پشتەوەیە. بەڵام عوسمان بەگ، وەک ڕیچ دەنووسێت: (**لە هەموو ڕووداوەکانی ئەم دواییەدا، هەڵوێستی پیاوێکی جوامێر بوو، کە لە چاکە و پاراستنی بەرژەوەندیی نیشتیمانەکەی زیاتر،**

**هیچ شتێکی تری لە دڵدا نەبوو. هەڵەی گەورەی میریش ئەو هەموو ڕێزە زۆرە بوو، کە بەرامبەر تورکەکان هەیبوو. ئەم ڕێزەش هەر بەڕاستی لە هەستێکی ئایینییەوە هەڵقوڵا بوو..)**[٤٨]. ئەم هەستە ئایینییە لە سەردەمی ئەحمەد پاشادا، کە دوا پاشای ڕۆشنگەری بابانی بووە، وەک پاشتر دەبینین، کاڵتر دەبێتەوە و کوردانی موسوڵمانی بابانی، بە بەرگریکردنیان لە دژی سوپای عوسمانی، هەستدەکەن کارەکەیان غەزایە و مافی خۆیانە، چونکە هێرشیان دەکرێتە سەر و مافی بەرگریکردنیان لە خۆیان، هەیە.

بەم جۆرەش، کێشەی شوناس لە هەمان کاتدا کە کێشەی شوناسێکی سەپێنراوە لەلایەن (ئەوانیتر)ەوە، ئاواش کێشەیەکی ناوخۆیی و قەیرانێکە لە تێگەیشتنی ئەندامانی بنەماڵەی بابان بۆ شوناسی کوردبوون، کە بە شێوەیەکی گشتی عوسمان بەگ نوێنەرایەتی ڕەهەندە مۆدێرنەکەی دەکات و میر (مەحموود پاشا)ش نوێنەرایەتی ڕەهەندە نەریتییەکەی دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم نوێنەرایەتیکردنانە جێگیر نین و یەکتربڕن، چونکە: لە کەسایەتی عوسمان بەگدا، ڕەهەندی نەریتی و لە کەسایەتی مەحموود پاشادا ڕەهەندی مۆدێرن دەبینرێتەوە. ئەمەش خاڵی هاوبەشی هەردوو براکەیە، کە تێگەیشتنێکی هاوبەش لە بەرامبەر ئەوانیتردا، پێکیانەوە دەبەستێتەوە: کوردبوون..

**مەحموود پاشا:**

ڕۆژی (١٤ی ئایاری ١٨٢٠)، مەحموود پاشای میری بابان، سەردانی ڕیچ دەکات. ڕیچ بە وردیی وەسفی کەسایەتی مەحموود پاشا دەکات و بە پیاوێکی سنگفراوان و لێزان و کراوەی ناوزەد دەکات و دەنووسێت: "**پیاوێکە هەتا لە نزیکەوە بیناسیت، هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە دەبنە مایەی دڵخۆشی، هەر لە هەڵسوکەوتییەوە، تا نەرمی و بنەوەشی و ڕووخۆشی**"، یان: میر کەسێکی کراوە بووە و "**ئەندامانی ئەنجومەن دیار بوو بەو پەڕی سەربەستیی خۆیانەوە، سەبیل و**

**قەننەیان دەکێشا و هەرچۆنیان حەز بکردایە بە ئارەزووی خۆیان قسەیان دەکرد**"[٤٩]. یاخود: "**هەر بەڕاستی میر مەحموود، پیاوێکی خۆشەویست بوو.. بڕوام نەدەکرد لە خۆرهەڵاتدا پیاوێکی وا ببینم. دەترسم مرۆ لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانیشدا زۆر نموونەی ئەم پیاوە نەبینێ**"[٥٠]. نموونەی ئەو پیاوانە بووە کە ژن و منداڵی خۆی زۆر خۆشویستووە. بڕوادارێکی زۆر بەهێز بووە، بەڵام دەمارگیریی ئایینی نەبووە. خۆشباوەڕ و ناسک بووە و لە جەنگدا ئازا بووە، فڕوفێڵی نەزانیوە و[٥١]..

مەحموود پاشا وەک عوسمان بەگی برای، پرسیاری زۆر لەبارەی وڵاتانی ئەورووپا و (چین)، لە ڕیچ دەکات.. پاشتریش چەند جارێک ئەمە دووبارە دەبێتەوە، بۆ نموونە لە (١٨ی ئایار، ل: ١٢٥). بەپێچەوانەی ئەوەی کە مەحموود پاشا زۆر پابەند بووە بە ئایینەوە، کاتێک ڕیچ باسەکەی نێوانیان دەگۆڕێت بۆ (کوتاندن) دژی (ئاوڵە): "**کە زۆر مەبەستم بوو لە کوردستاندا بڵاوی بکەمەوە.. زۆری پێخۆش بوو لەناو هاونیشتیمانییەکانیدا بڵاوی بکەمەوە**"[٥٢]. لەگەڵ ئەوەشدا میر و خێزانەکەی پابەندی چارەسازیی نەریتی دەبن، وەک پاشتریش دەردەکەوێت، کاتێک لە (١٢ی تشرینی یەکەم، ١٨٢٠)، (ئەحمەد بەگی کوڕی دووەمی میر)، بە نەخۆشیی ئاوڵە دەمرێت[٥٣]، ئەوان پشتیان بە مەولانا خالید بەستووە تا کوڕەکەیان چاک بکاتەوە. کاتێکیش مەولانا خالید لە (٢٠ی تشرینی یەکەم) هەڵدێت، ئەوە دەرکەوتووە کە وتبووی: "**چاکی دەکاتەوە و سەیری کتێبی بۆ دەکات، بزانێ خوا چی لە چارە نووسیوە..**"[٥٤]. ڕیچ لەم بارەیەوە، نووسیویەتی: "**ئەمرۆ کە بیستم (ئەحمەد بەگ – کوڕی دووەمی میر) بە ئاوڵە مردووە، زۆرم پێ ناخۆش بوو، ... (مستەر بەل)یش تەقەللای زۆر لەگەڵ دا و دوو جاریش سەردانی کرد، بەڵام نەیتوانیبوو دایک و باوکی ڕازی بکات تا دەرمانی بدەنێ، یان لە جێگایەکی فێنکدا دایبنێن، هەرچەندە لە دواییدا کەمێک ئامۆژگارییەکانی میستەر (بەل)یان بەجێ گەیاندبوو،**

**سەلماندبووشیان کە هەموو ئامۆژگارییەکانی بەکەڵک بوون و کارێکی باشیان کردبۆوە سەر تەندروستی منداڵەکە)**[٥٥].

بەم جۆرەش، بڕواداریی ئایینیی میر، ڕێگەی ئەوەی لێناگرێت کە بڕوای بە چارەسەریی پزیشکی و دەرمانی زانستیی نەبێت. ئەم ڕاڕایی و مانەوەیە لە نێوان دوو جیهاندا، ڕێگە لەوە ناگرێت، هەرکات میر هەلێکی لەگەڵ ڕیچ بۆ دەڕەخسێت، لەبارەی دنیای مۆدێرنەوە پرسیاری لێنەکات. پرسیارەکان بۆخۆیان ئاشکراکەری ئاستێکی ئاگایین لە جیهانی مۆدرێن و داناییناسی ئەو قۆناغەی کورد لەو دەڤەرەدا دەخەنە ڕوو. بۆ نموونە لە (١٨ی ئایار)، ڕیچ نووسیویەتی: "**میر پرسیارێکی زۆری لەبارەی سوپاگەلی ئەورووپاوە کرد و تێبینیی زۆر ژیرانە و هوشیارانەیشی لە قسەکانیدا نیشان دەدا**"[٥٦]. ئەم خەم و خولیایە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی گۆڕانکارییەکانی ئەورووپاوە، بەردەوامی وەردەگرێت و هەر دەسەڵاتدارێکی بابانی بە ئەرکی سیاسیی خۆی دەزانێت بەدواداچوونی بۆ بکات.

بۆ نموونە، عوسمان بەگ لە (٢٠ی ئایاردا)، "**زۆر بە تاسەوە گوێی بۆ ئەو چیرۆکانە گرتبوو، کە سەبارەت بە لەشکرەکانی ئەورووپا و شەڕەکانیان بۆم گێڕایەوە**"[٥٧]، هەمان ڕۆژ دوای نیوەڕۆ، ڕیچ کەیخوسرەو بەگی جاف دەبینێت، کە چۆن بە خۆی و کیتەڵەیەک باڕووتەوە خۆی دەکات بەو چادرەی، کە لەبەردەم ماڵی مەحموود مەسرەفی سەرەک وەزیرانی باباندا، هەڵدراوە، بەڵام نازانێت بەکاری بهێنێ و داوا لە ڕیچ دەکات چۆنێتی بەکارهێنانی فێر بکات[٥٨].

ڕیچ لە (١٠ی حوزەیران) دەنووسێت: "**میر چووە سەر باسی (ئاسمانناسی) ئەورووپایی، کە پێشتریش گەلێ جار ئەم باسەی دووبارە کردبووەوە و بە تایبەتی پرسیاری لەمەڕ شاخەکانی ناو مانگ کرد و وتی لە ڕێگای ئایینەوە بۆی دەرکەوتووە**[٥٩]**، کە مانگ پارچەیەک ئاسنە و خوای گەورە بۆ ئەوەی بەرز کردۆتەوە تا تیشکی هەتاو لە زەوی بداتەوە. فەرمانی بە ئەستێرەناس (منجم باشی)، یان سەرۆکی**

**ئەستێرەناس کرد تا لەسەر شێوەی خۆرهەڵاتیانە نەخشەیەکی جیهانم بۆ بکێشێ، ئەویش کردی و دایمێ و لە ڕاستیشدا نەخشەیەک بوو، باش دروستکرابوو**"[٦٠].

میر، بەپێی شایەتیی ڕیچ بێت، مەسەلەیەکی زانستیی مۆدێرن خولیایەتی و پێشتریش شتی لەبارەوە زانیوە. بۆ پڕکردنەوە و تۆکمەکردنی زانینەکانیشی بیروڕای خۆی دەکاتە پاڵپشت و باسی ئاسماناسیی خۆی دەکات و داواش لە هاوکارە زانستکارەکانی خۆی دەکات، تا نەخشەیەک بۆ ڕیچ لەسەر شێوازی خۆرهەڵاتیانە بکێشن، کە بەرهەمی ئەم کارەش، بە تەواویی ڕیچ ڕازی دەکات. شتێکی سەرسووڕهێنەرتر لە قسەکانی ڕیچدا سەبارەت ئاگایی کوردەکان لە زانست و دەستکەوت و ناودارانی هەیە، کە ئاشکرای دەکات ئەو بابانییانە زانیاریی ***هاوکاتیانەیان*** لەسەر ڕەوتی زانست لە ئەورووپا، هەبووە. ئەوەتا لە (١١ی حوزەیران)دا، ڕیچ دەنووسێت: "**جارێکی تریش لەگەڵ میردا دەربارەی ئاسماناسین دواینەوە. ئەستێرەناسەکەی میریش دەمگۆیەکی سەبارەت بە من بڵاوکردبۆوە، کە گوایە ناگەم بە (مەسکەلاین)، یان (هەرشەل) لە زیرەکییاندا**"[٦١].

ئەو ئەستێرەناسە بابانییە چۆن مەسکەلاین و هەرشەلی ناسیوە؟! نیڤیل مەسکەلاین (١٧٣٢-١٨١١) و ولیەم هەرشەل (١٧٣٨-١٨٢٢)، دوو ئەستێرەناسی پاشایەتی بەریتانیای ئەو سەردەمە بوون و هەردووکیان لە بواری خۆیاندا ناوبانگ و پێگەی خۆیان هەبووە. مەسکەلاین، بە دۆزینەوەی ئەستێرەی ڤینۆس[٦٢] و ولیەم هەرشەل لە سەردەمی خۆیدا گەورەترین تەلەسکۆپی دروستکرد و توانیبووی لەگەڵ خوشکەکەیدا، کارۆلین هەرشەل، گەلێک دۆزینەوەی ئاسماناسی ئەنجام بدات[٦٣].

ئەوەی جێی سەرنجە و پێگەی زانستیی ئەستێرەناسەکەی بابان بەرز دەکاتەوە، ئەوەیە، کاتێک دەڕوانینە ساڵی مردنیان و ناوبانگی ئەم دوو ئەستێرەناسە، دەبینین هەردووکیان لەو سەردەمەوە نزیکن کە ئەستێرەناسە کوردەکە، ناویان دەهێنێت و دیارە شارەزاییشی

لەبارەیانەوە هەبووە. مەسکەلاین بە ماوەی دوازدە ساڵ پێش ئەو سەردەمە، کۆچی دوایی کردووە و هەرشەل دوو ساڵ لەوە دوا. بە هێنانە پێشچاوی ئەوەش کە لە ئەوسای کوردستاندا پۆستەچی و ڕۆژنامە و هۆکارەکانی پەیوەندییکردن و هاتوچۆی نێوان خۆرئاوا و خۆرهەڵات زۆر کەم بووە، دەردەکەوێت، کە ئەستێرەناسە بابانییەکە ئاگاداریی بەناوبانگترین زانایانی ئەو سەردەمەی بوارەکەی خۆی بووە.

دەکرێ سەرچاوەی ئەم زانینە کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی بابان و بوونی سەدان مزگەوت و مەدرەسەی فێربوون بێت[٦٤]، دەشکرێ ئەو دەنگوباسانەیان لەو گەڕیدە و بیانیانەوە بیستبێت کە پێشتر سەردانی وڵاتەکەیان کردووە، بە گریمانەیەکی لاوازیش، دەکرێت خۆیان لەگەڵ هەندێ لە پاشاکانی بابان سەفەری ئەستەمبووڵ و شوێنەکانی تریان کردبێت و لەوێوە زانیارییان بەدەست هێنابێت. بۆی هەیە لە قاجارییەکانەوە بیستبێتیان و هتد.. لەگەڵ هەموو ئەم گریمانانە و هی تریشدا، هێشتا ئەم زانیارییانە، ئاستی ئەو ئاگاییە بەرزەی دەستەبژێری بابانییەکان بە دنیای نوێ و هوشیارییان بە داردە و دۆزینەوە نوێیەکان و تامەزرۆییان بۆ زانین لەسەر سیستەمی وڵاتان، کەم ناکاتەوە. بە جۆرێک کە ڕیچ لە ڕۆژی (٢٠ی ئایاری ١٨٢٠)دا نووسیویەتی: "**ئەگەر ئاسایش و ئاشتی لەم وڵاتەدا هەبێ و میراتگریش دۆخی سروشتیی خۆی وەربگرێ، ئەم وڵاتە زۆر گەشەی دەکرد**"[٦٥].

هەروەها ڕیچ لە چەندین شوێنی تردا ستایشی کوردەکان بەشێوەیەکی گشتی دەکات و لەبارەی ویست و خولیای ئەوانەوە بۆ زانست، شتی جۆر بەجۆر دەنووسێت. بۆ نموونە: لە (١٨ی تشرینی یەکەم) نووسیویەتی: "**بەشێوەیەکی گشتی منیش وای دەبینم کە کورد زۆر تینووی زانیاری کۆکردنەوەن، بەڵام خۆیانی بۆ ئامادە ناکەن**" ل:٢٩٠)، یان: لە (١٩ی تشرینی یەکەم): "**کورد لە گردکردنەوەی زانیاریشدا لەسەر هۆردووی دوژمن زۆر چوست و زرنگ و بە توانان** ل: ٢٩٨). هەروەها لە هەمان ڕۆژ نووسیویەتی: "**تا ئێستا لەش ساغی**

**وەکو خەڵکی کوردستانم، لە ژن و لە پیاو لە هیچ جێیەک نەدیوە.** ل: ٢٩٨).

هەریەکە لەم وەسفانە هەڵگری دەلالەتی مانایی جیاوازن بۆ پەیوەندیی کوردەکان و شێوەژیانێکی زانستی و ڕەنگدانەوەی ئاستێکی ئاگایین بەرامبەر بە کایەی زانست لە بۆتەی ئەو سەردەمەدا. ئەمە جگە لەوەی لە کتێبەکەی ڕیچدا بە زۆر شێوازی دیکە، پەیوەندیی کورد بە دنیای مۆدێرن و بە دیاردە جۆربەجۆرەکانی مۆدێرنیتەوە باسکراون، کە گەلێک لایەنی وەک ڕووەکناسی و ناوی زانستیی ڕووەکەکان، میعماری و پێکهاتەکانی: (پەنجەرەی ئینگلیزی)، باسی سوپایی و تەکنیکەکانی: (مەشقی سەربازی لەسەر شێوەی ئینگلیزی و گرنگیدان بە بارووت..)! سیستەمی ئاودێری و ئاوەڕۆ و کانیاوەکان، ناوی کەسایەتی سیاسی ئەورووپی وەک (ماڵکۆڵم، پۆناپارت) و زانستەکان و زانیاران: (ماتماتیک، پزیشکی و مەسکەلاین و هەرشەل)، تەنانەت ئادابی نانخواردنی کوردەکانیش لەسەر شێوەی ئەورووپیایی، دەگرێتەوە.

ئەم هوشیاری و خولیا مۆدێرنە، وێنەیەکی ڕوونترمان لەسەر پێکهاتەی سیستەمی حکومڕانیی بابانییەکانیش پێدەڵێت، کە نایەوێت تەنیا کۆپی و پێڕەوکار و لاساییکەرەوەی شێوە حکومڕانییەکانی ناوچەکە بێت. بابانییەکان وەک کورد، یان خێڵ بیر لە خۆیان بکەنەوە، هێشتا ئەوە دەزانن کە نابێت بۆ هەمیشە گوێڕایەڵ و ملکەچ و دەستتندەخۆری ئەوانیتر بن لە فارس، تورک و عەرەب. ئەم هزرە داپۆشراوە، نادیارە، وێڕای هەر ناکۆکییەکی ناوخۆییان، یان لەگەڵ ئەردەڵانییەکان، ئەوەیان بیر دێنێتەوە کە دەبێت هاوکار و تەبا بن. چونکە لە کاتی لێقەوماندا هیچ چارەیەکیان نییە لەوەزیاتر پەنا بۆ یەکتر ببەن، چونکە دوژمنانیان کۆکن لەسەر یەکدەنگی بۆ لاوازکردنیان[٦٦]. توێژەرانێکیش هەن ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن و پێگەی ئەم میرنیشینە بە پێگەیەکی "**زەبر کەمکەرەوە**" ناو دەبەن کە ئەمەش وایکردووە "**ئەم میرنیشینە لە زۆر شتدا سەربەخۆ بێت**"[٦٧].

هەموو ئەم زانیارییە وردانە، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکەن، کە ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتناسی و گەڕیدەیی، هەر تەنیا "جاسووسیکردن" نییە و هەڵگری زۆر زانیاریی وردە لەبارەی مرۆڤ و کۆمەڵگای ئێمەوە. ئەم ڕاستییانە ئەوەشمان بۆ دەسەلمێنن، کە ئێمە هەر تەنیا لە بەردەم دەستەیەکی هەڵبژاردەی چینی باڵادا نین، بەڵکو لەبەردەم هوشیاری و داناییناسییەکی مۆدێرنیشداین کە ڕۆحی پێشکەوتن و گەیشتنەوە بە گەلان و ئازادیی سیاسی، لەلای بابانییەکان، هاندەر و وەگەڕخەریەتی.

ڕیچ لە (١٢ی ئایار)، لە وەسفی حەمامەکانی سلێمانیدا دەنووسێت:

**"ئەم بەیانییە چووم بۆ حەمام و سەیرم کرد زۆر جوان و پاک و خاوێن بوو، زۆر باشیش ڕووناک کرابووەوە، کارگوزارەکانیشی باش بوون و لە هەموو حەمامەکانی وڵاتی عوسمانی چاکتر بوو، کە هەتا ئێستا دیومن، جگە لە حەمامەکانی شام و ئەستەموول و قاهیرە، کە ئەم، لە هەندێ ڕووەوە لەوانیش باشتر بوو"**(٦٨).

کاتێک ئەم وەسفە و باسەکانی ڕیچ لەبارەی ئادابی نانخواردن، وەرزشکاری، خۆگۆڕین و وتووێژی کوردەکان و زمانپاکییان لە کاتی دەمەقاڵەدا، لەبەرچاو دەگرین، دەتوانین ئاگامەندییەکی مۆدێرن لەبارەی شێوەژیان و ئەتەکێتی نوێ هەست پێبکەین، کە گرنگیدان بە خود، بە جەستە و بە کات، بەشێکی هەرە سەرەکییەتی(٦٩). هەرچەندە چەند ساڵێک پاشتر (١٨٣٨)، گەڕیدەیەکی دیکە دەیەوێت "هەرچی زووتر **شاری سلێمانی لەبەر پیس و پۆخڵییەکەی، جێبهێڵێت**"، بەڵام ئەم شارە هێشتا ئەو دەنگە ئازا و بوێرانەی تێدا ماون کە دەتوانن ڕووبەڕووی تەماعکارانی فارس و تورک ببنەوە(٧٠). ئەمەش ئەو خاڵەیە کە نەک هەر میرنیشینە جیرانەکانی وەک بابان و ئەردەڵان دەیزانن، بگرە وێڕای شەڕوشۆڕی نێوانیشیان، ئەم تێگەیشتنە هاوبەشە وایان لێدەکات ببنە پشتیوانیی یەکتر. خانمە توێژەری ڕووس، ڤاسیلیەڤا، هەوڵێکی زۆر شایانی داوە، بۆ ئەوەی لەو دیو تەمی دوژمنایەتی و خێڵەکییەوە، کە ئەم دوو میرنیشینەی ناچار دەکرد، دژایەتی یەکتر بکەن و ناوبەناو لە

دژی یەکتر خۆیان پەنای ئێران و عوسمانی بدەن، هێشتا ئەوە دەسەلمێنێت کە: ئەوانە دواجار پێویستییان بەیەکتر هەبوو و لە ڕۆژانی تەنگانەدا یەکتریان دەپاراست[٧١]. هەر ئەم خانمە لە جێیەکی دیکەدا زۆر بە وردیی لەم بارەیەوە نووسیویەتی: "**ڕاست نییە بڵێین کە هەر خێڵ و هەر ئیمارەتێک بە تەنیا و دوورەپەرێزی لە ئەوانیدی دەژیا، ئەمان لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کولتوورییەوە توند بەیەکەوە بەسترابوون، ئەو پەیوەندییانەی کە یەکیانیان دەخستن گەلێ بەهێزتر بوون لەوانەی لێکیان دادەبڕاندن. سنوورەکانی موڵک و ماڵی میرانی ئەردەڵان و بابان و میرنشینانی تر ڕێگەیان نەگرتبوو لە ئاپۆرای پەنابەران لە کاتی قڕوقاتی و بوومەلەرزە سیاسییەکاندا. چارەنووسی بنەماڵە فەرمانڕەواکان بەیەکەوە گرێدرابوو. تەنانەت خێڵە کۆچەرەکان بە کۆچکردنەکانیان لە ماوەی سەدەکاندا ئەرکی یەکخستنی ناوچەکانی کوردستانیان، لە چوارچێوەی میکانیزمێکی ئابووریی یەکگرتوودا، جێبەجێکردووە.**"[٧٢]. هیچ گومان لەوەش ناکرێت، هەروەک (لازاریف) نووسیویەتی، کە بەدرێژایی مانەوەی میرنشینەکان بە تایبەتی بابان، ببووە "**بنکەیەک بۆ دژایەتیکردنی تورکیا لەپێش هەموو کەسدا.. بۆیە بەردەوام جێگای ئامانجی دەستدرێژیی هەردوو دەوڵەتە گەورەکە بوون**[٧٣]". مەستوورەی کوردستانییش لە مێژووەکەی خۆیدا، گەلێک نموونەی ئەم قسەیە باس دەکات[٧٤]. هەر هاتنی مەستوورە بۆ سلێمانی لە کۆتایی میرنیشینی باباندا بەڵگەی ئەو ڕاستییەیە[٧٥].

لە درێژەی ئەو پۆرترێتەدا کە ڕیچ لە مەحموود پاشای بابانی دەکێشێت، چەند جارێک باس لە سادەیی و دینداریییەکەی دەکات. دینداریییەکەی وای لێکردووە بە ڕیچ بڵێت: "**جگە لە مێژووی پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئەوەندەی بتوانم لە ڕۆژگار و گوزەرانیان بزانم، ئیتر زۆر تامەزرۆی مێژوو نیم و لە "شانامە" زیاتر، شتێکی لێ ناخوێنمەوە**"[٧٦]، ڕیچ دەیەوێت لەمەوە ئەو ئەنجامە بەدەست بهێنێت، کە مەحموود پاشا، هوشیاریی مێژوویی بە بنەماڵە و میللەتەکەی نییە،

بۆیشی گرنگ نییە، بەڵام هەر خۆی دەڵێت: قسەکانی کاری تێکردووە و ڕۆحی بنەماڵەیی و خێڵچێتی گەشیی کردەوە و بەشێوەیەکی نائاسایی بووژاوەتەوە[٧٧].

ئەم لێکدانەوەیە لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە مەحموود پاشا خوێندەوار بووە و خوێندووشییەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە ژیانی تایبەت و کارەساتی جەرگبڕی و لەدەستدانی کوڕە بچکۆڵەکەی بەرەو دین و گۆشەنیشینی بردووە تا **سنووری دەستهەڵگرتن لە دەسەڵات و میرایەتی**، وەک ئەوەی عوسمان بەگی برای، لە (١٦ی تشرینی یەکەم)، ئەو نهێنییەی بۆ ڕیچ باسکردووە[٧٨]، ئەمەش کاریگەریی سۆفیزم و ڕۆحییگەریی لەسەر ئەم پاشا کوردە دەردەخات. کەچی ڕیچ، ڕەهەندە واقیعبینی و بوێرییەکەشی لە بیر ناکات. ڕەنگە چیرۆکی سەربازە ڕووسەکە ئەو ڕاستییە پتر ئاشکرا بکات..

ئەم چیرۆکە مەحموود پاشا بۆ (ڕیچ)ی دەگێڕێتەوە، جێی سەرنجە و شتێکی سەیرمان لەسەر دینداریی میری بابان بۆ ئاشکرا دەکات. ئەو کاتەی محەمەد عەلی میرزای ئێران، وڵاتی گورجستان داگیر دەکات، مەحموود پاشای بابانی لەگەڵدا دەبێت. لەو شەڕەدا ئێرانییەکان سەربازێکی ڕووس کە هەندێ نامەی بە ڕووسی، پێدەبێت، بە دیل دەگرن و دەیهێنن بۆ لای شازادەی ئێرانی. شازادە هیچ دەنگوباسێک و زانیارییەکی لە سەربازەکە دەست ناکەوێت. داوای لێدەکات ببێتە موسوڵمان و سەربازەکە نابێت. هەڕەشەی لێدەکات ئەگەر نەبێتە موسوڵمان، گەورەترین ئازاری دەدات. سەرباز ورە بەرنادات، بۆیە: "**شازادە فەرمانی کرد گۆڕێک هەڵکەنن.**" لەو ماوەیەدا کە گۆڕەکە هەڵدەکەنرێت سەربازەکە هیچ خۆی تێک نادات و پێدەکەنێ و لەگەڵ دەوروپشتیدا قسان دەکات. پاش تەواوبوونی گۆڕەکە، دیسانەوە شازادەی ئێرانی داوای لێدەکاتەوە ببێتە موسوڵمان و سەرباز هەر مل نادات. بۆیە شازادە فەرمان دەدا هەر بە زیندوویی بینێژن. پاشان مەحموود پاشا گێڕانەوەکەی بۆ ڕیچ تەواو دەکات و دەڵێت: "**منیش**

**هەرچەندم کرد ئەوکارە دڕندانەیە (barbarous) (بەربەری)، نەکات، کەڵکی نەبوو... بەڕاستی شتێکی ناخۆشە یەکێکی چاک و ئازا لەبەر چاوت ببێتە قوربانیی ئایینەکەی.. باشە شازادە حەقی چی بوو بەسەر ئایینی ئەو کابرایەوە؟**"(٧٩).

چ شتێکی ئەم بەسەرهاتە شتێکمان لەسەر مەحموود پاشا خۆی پێدەڵێت؟ ئێمە دەزانین کە خودی مەحموود پاشا، کەسێکی دوور نەبووە لە کاری نەنگ و سزادانی کەسوکار و نەیارەکانی خۆی و هتد. لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا ویژدان دەکاتە پێوەر و کاری شازادە ئێرانییەکە بە "**دڕندانە**" وەسف دەکات. بەڵام خاڵی جەوهەریی، وێڕای ئیمانداریێتی خۆی، ئەوەیە کە دەڵێت: "**بەڕاستی شتێکی ناخۆشە یەکێکی چاک و ئازا لەبەرچاوت ببێتە قوربانیی ئایینەکەی.. باشە شازادە حەقی چی بوو بەسەر ئایینی ئەو کابرایەوە؟**".

کەواتە نابێت تاکەکەس لەسەر ئایینەکەی، یان بڕوادارییەکەی سزا بدرێت. دیوێکی دیکەی ئەم قسەیە ئەوەیە، کە ئەگەر کەسێک لەسەر ئایینی ئێمە نەبوو، یان هەر ئاییندار نەبوو، نابێت لەسەر ئەوە سزا بیگرێتەوە و ئەوە کارێکی دڕندانەیە. ئەم بۆچوونە پتر لەوەی بۆچوونێکی دۆگمایی بێت، بیرکردنەوەیەکی کراوەیە و مەحموود پاشا دوور دەخاتەوە لە هەر جۆرە توندڕەوییەکی ئایینی. ڕەنگە، هەر ئەمەش هۆکار بووبێت، کە پاشا بابانییەکان توانیبێتیان تا ماوەیەکی باش، هاوسەنگی لە نێوان ململانێ ئایینییەکانی نێوان هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی ڕابگرن(٨٠). کاتێکیش دەبینین ئەم پاشا کوردە، چۆن سزا بۆ ئەوانە دەبڕێتەوە کە کابرایەکی عەرەبی داربڕیان ڕووتکردۆتەوە و دارەکانیان لێ زەوت کردوون و ناچاریان دەکات بایی ئەوەندە داری بۆ ببڕنەوە، یان کاتێک دەبینین کە سیستەمەکەی وەک کۆنفیدراڵییەکی عەشیرەتی بووە و هەموو کەس بۆی هەبووە لە حزووری ئەودا بیروڕای خۆی بڵێت، بۆمان دەردەکەوێت، کە هیچ کات بیروڕای تایبەتی خۆی بەسەر ئەوانی تردا باڵادەست نەکردووە. هیچ

کامێکیش لە ڕیچ و فرەیزەر لەماوەی مانەوەیاندا لە سلێمانی، شتێکی ئەوتۆیان لەسەر سزادانی ئایینی، یان سزادان لەسەر بیروڕای دینی، بۆ تۆمار نەکردووین. هەموو ئەمانە، زەینییەتێکی کراوە، یان "جیاوازی قەبووڵکەرمان" پێدەناسێنن، کە ڕێز لە فرەیی دەگرێت و زۆرەکیانە بیر لە ئەوانی تر ناکاتەوە. هەر ئەمەشە وا لە ڕیچ دەکات، کاتێک بۆ دواجار ماڵئاوایی لەم میرەی کورد دەکات، بەو پەڕی حەسرەت و دڵپڕییەوە جێیدەهێڵێت[٨١].

ئەم کرانەوە ئایینییە و ئەم دوورییە لە فۆڕمێکی "فەندەمانتاڵیزمی سەرەتایی"، لە ڕوانگەی ئاپۆرا و خەڵکی ڕەشۆکی بابانییشەوە، شتێکی زۆر ئاسایی بووە. ئەمەش لە هەڵسەنگاندنی بابانییەکانی ئەوسای شاری سلێمانیدا بۆ کەسایەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی دەردەکەوێت، ڕیچ دەنووسێت: "**سلێمانی سۆفییەکی گەورەی لێیە، ناوی (شێخ خالید)ـە. کوردەکان پێیانوایە ئەگەر لە (حەزرەتی مەولانا)، کەمتری پێ بوترێ، نەنگییە و وتەکانیشی بە (فەرمووده) دادەنێن.. کوردەکان هەموویان بە (وەلی) دەزانن، زۆری تریشیان لە ڕیزی (پێغەمبەرەکەیاندا دایدەنێن**")[٨٢].

ئەم قەدەخەشکێنیە و دۆزینەوەی کەسێک لە "خۆمان" و خستنیە ڕیزی "پێغەمبەر"ـەوە، کە لە "ئەوانی ترە"، بۆخۆی کرانەوەیەکی ئایینی و دوورکەوتنەوە لە دۆگمای باوەڕداریی ئیسلامییانەی عەرەبی، پیشان دەدات. بەپێی ئەم بەراوردکارییەی بۆ مەولانا خالید بە پێغەمبەری موسوڵمانان، کراوە، دەردەکەوێت لەو سەردەمەدا بیروڕایەک هەبووە بەوەی دەکرێت، کوردێکی شارەزووریش بچێتە پێگەی پێغەمبەرایەتییەوە و وتەکانیشی بە فەرموودە ناوبەرن و ئەمەش کوفر و حەرام نەبێت. خاتوو ڤاسیلیەڤا لەم بارەیەوە نووسیویەتی: "**ڕێزگرتنی لەمە زێتر ڕێی تێ ناچێ، ئەوەش لە ڕوانگەی ئیسلامی ئۆرتۆدۆکساڵەوە ڕێگە نەدەدرا. محەمەد بە دوا پێغەمبەر و (خاتم الانبیاء) دادەنرا و کاتێکیش شێخ لە (ڕیزی پێغەمبەر)دا بێ و قسەکانی بکرێن بە حەدیس، لادانێک بووە لە شەرعی ئیسلامی**"[٨٣].

پێشینەی ئەم ڕێزگرتنە لە جیاوازە بیرانی سەر بە ئایینەکانی تر، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی شاری سلێمانی. "**بەپێی بیر و بۆچوونی جووەکان، سلێمان پاشا کە لە ساڵی ١٧٨٤**[٨٤] **شاری سلێمانی دامەزراند، وتی: شارێک بەبێ بوونی جوو تیایدا، بە شار دانانرێت. ئەو بیروباوەڕە لە باپیرانەوە ماوەتەوە کە دەبێ باوەڕت بەوە هەبێت کە جوو لە هەر کوێی دنیا هەبن، خودا ڕەحمەتی خۆی بەسەر ئەم شوێنەدا دەبارێنێت**"[٨٥].

هەرچەندە بۆی هەیە ئەم گێڕانەوەیە، بنەمایەکی مێژوویی نەبێت و هەرچەندەش بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی جووەکان بە دەستی خەڵکە موسوڵمانە سادەکەی چەوساونەتەوە، بەڵام ئەوەی لەگەڵ دامەزراندنی شارەکەدا، جووەکان ***یەکێک بوون لە پێکهاتەکانی دانیشتوانی بنەڕەتیی،*** نکوڵی لێناکرێت. جگە لەوەی یەکێک لە گەڕەکە کۆنەکانی سلێمانی بەناوی (جوولەکان)ە[٨٦]، ئەوە "**جووەکان کاتی خۆی لە قەڵاچوالانەوە هاتوون**" و لەو گەڕەکەدا نیشتەجێ بوون[٨٧]. بۆیە سلێمان پاشای بابان بۆخۆی لیژنەیەک لە کاربەدەستانی میری پێکدەهێنێت و بە مەبەستی بانگهێشتکردنی جووەکان بۆ ناوشار، لیژنەکە دەنێرێت بۆ دەرەوەی شار (بۆ نموونە بۆ: قەرەداخ)، تاکو بتوانن جووەکان بهێننە ناو شارەکەوە.

هەمان سەرچاوەی پێشووتر، دەنووسێت: شانزە ساڵ دوای بنیاتنانی شارەکە، واتە لە ساڵی ١٨٠٠، گەشتیارێکی جوو بەناوی (ئێدمان) وتی: ***جووەکانی سلێمانی مافی یەکسانیان هەیە و بە خۆشگوزەرانی و برایەتی لەگەڵ برا کوردە موسوڵمانەکانیان، ژیاون***[٨٨]. کاتێکیش لە ساڵی ١٨٩٥دا و بە کاریگەریی لە دەرەوەی سیاسەتی قەڵەمڕەوەکە، شەپۆلێکی دژە جوویی، دەستپێدەکات، دەستەیەک لە کوردە موسوڵمانەکانی سلێمانی بە فیتی شێخێک، پەلاماری کۆمەڵێک جوو دەدەن. دەسەڵاتی فەرمی سەرەتا هەوڵ دەدات دۆخەکە کۆنترۆڵ بکات و جووەکان بپارێزێت، پاشانیش هێرشبەرەکان دەستگیر دەکات و

سزای پانزە بۆ بیست ساڵ زیندانییان بۆ دەبڕێتەوە. پاشانیش خەڵکی شارەکە ئاگادار دەکرێنەوە کە نابێت جارێکی دیکە لە دژی جووەکان ئەو کارە دووبارە بکەنەوە(٨٩).

هەموو ئەم زانیارییانە ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە، کە فەرمانڕەوایانی بابان و پاشتریش، (دیسانەوە، وێڕای هەر ئاژاوە و نەگونجانێکی لێرە و لەویَ لە ناو میرنشینەکەدا)، کەشێکی هەمەڕەنگیی کولتووریی ئەوتۆیان دابینکردبوو، کە هەموو کەس و بەهەر بیروڕایەکی ئایینییەوە، دەیتوانی لەو شارەدا بحەوێتەوە. ئەم کەشە کولتوورییە بە درێژایی ساڵان، وێڕای هەر هەوڵدانێکی حکومەتەکانی عێراق بۆ دابڕکردنی کورد و جوو و چەوساندنەوەی کوردە جووەکان، وەک بەشێک لە مێنتاڵیتە و کولتووری شارەکە مایەوە.

**عومەر ئاغا:**

کەسایەتییەکی دیکەی ناو پۆرترێتەکانی ڕیچ، کە لەو ماوەیەدا دەچێتە ڕیزی "مننەووەران"ی بابانییەوە، ***عومەر ئاغایە***. عومەر ئاغا هاوڕێیەکی کۆنی ڕیچ بووە و لە گەلێک شوێنی گەشتەکەیدا باسیکردووە، بەڵام لە (١٨ی تشرینی یەکەم)، سیمایەکی نوێی ئەو کەسایەتییەمان پێدەناسێنێت، کە تەواوکەری ئەو کەشە کولتووری و هوشیارییەیە بە دنیای نویَ و زانست، کە ئێمە عەودالێن لەو ماوەیەدا بەرهەمی بهێنینەوە.

ڕیچ، ئەو ئێوارەیە هەندێک لەو سکێچانەی لە گەشتەکەیدا بۆ سنە و بانە، کردویێتی، پیشانی عومەر ئاغا دەدات. سەرەتا زۆری پیَ سەیرە کە دەبینێت عومەر ئاغا لێیدەزانێت و هەندیَ ناوی شوێن و گردیشی بیر دەخاتەوە پێیان زیاد دەکات و بۆی ڕاستدەکاتەوە. ڕیچ دەنووسێت: **"ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر زرنگیی ئەو و دروستیی سکێچەکانم، لە کاتێکدا لە بەغدا خەڵکێکی زۆرم دیبوو لەوانەی وەک دەڵێن (ماتماتیک- ڕیاضیات)یان خوێندبوو، بەڵام کەسیان ئەوەندەی تۆزقاڵێک ئاگاداری نەخشە، یان سکێچکاریی نەبوون.. کەچی عومەر ئاغا**

**هەرئەوەندەی دەستی بە دەفتەری سکێچەکان گەیشت، یەکسەر هەر بە دەست، یەک لە دوای یەک ڕووی سکێچەکانی کردە ڕێکی ڕێگاکانمان و بەبێ سێ و دوو، بە پەنجە هەموویانی دیاری کرد**"[٩٠].

ڕیچ، لەمەوە ئەو ئەنجامە وەردەگرێت، تاکو شتێک لەسەر عومەر ئاغا بڵێت، ئێستاش بۆ ئێمە، کە هیچ متمانەمان بە خۆمان نەماوە، جێی بڕوا نییە: "**ئەو کەڵکانەی کە زانست لە پیاوێکی سەرنج تیژی ئاوای وەردەگرێ، کە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم نیشتیمانەی دیبێ، بێگومان زۆر زۆرە و جێی بایەخ پێدانە، چونکە ئەویش لای خۆیەوە دەتوانێ خەڵکی تر فێر بکات. بەمەش زانست و زانین تەشەنە دەکات**"[٩١].

ڕیچ، لەم پەرەگرافانەدا بە ویژدانەوە، هەر مەبەستێکیشی لە وشەی (زانست) هەبووبێت، پایەی زانستی و زیرەکیی ئەم بابانییە شەیدایەی بۆ زانست و دنیای نوێ، کە بۆ کوردەکانی ئەوسا ڕێگایەک بوو بۆ دەربازبوون لە زۆر شت، هەڵسەنگاندووە. بێجگە لەوەی ڕاستی و دروستیی سکێچەکانی خۆی پشتڕاست دەکاتەوە، بەراوردی عومەرئاغا بەوانە دەکات کە لە بەغدا بینیونی و گوایە ماتماتیکیان خوێندووە و هیچ لە سکێچکاری و نەخشە نازانن. بێجگە لەوەش، ڕیچ پێیوایە زانست دەتوانێت کەڵکێکی زۆر لە شارەزایی و زیرەکی ئەم پیاوە وەربگرێت و ئەویش بۆخۆی ببێتە مامۆستایەک بۆ فێرکردنی ئەوانی تر و بەمەش زانست (science) و زانین (knowledge) پێش بکەوێت. دیققەت بدەن ڕیچ هەردوو وشەکەی بە مانای ئەمڕۆیی بەکار بردووە، کە جێی گومان ناهێڵێتەوە مەبەستی لە **دانایی** و **زانستی** عومەر ئاغا، شتێکی تر بێت لە دەرەوەی (science) و (knowledge)!.

لەمەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە، کە ڕیچ لەبارەی دیدی ئایدیۆلۆژی و ناخەکی و شاراوەی عومەر ئاغاوە زانیارییەکی گرنگمان دەداتێ: "**جارێکیان باسی مێژووی ئەسکەندەرم کرد، کە (ئاریەن) نووسیویێتی**[٩٢]**، عومەر ئاغا زۆر بە پەرۆشەوە حەزی کرد لەو**

**ڕووداوانە بگات، کە لەو سەرچاوە کۆن و باوەڕپێکراوانەدا هەن. منیش کە بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وا پێدەچوو باسی شتێکم کردبێ پێچەوانەی بیروباوەڕی محەمەدی[٩٣] (ئیسلامی) بێت، بۆیە کوردێکی (شینکی) لە ناو دانیشتواندا هەڵیدایە و وتی ئەو مێژووەی وەک ئەسکەندەر خۆی کۆنە. لەبەر ئەوە پشتی پێ نابەسترێ، چونکە پێغەمبەری ئێمە دەربارەی ئەمەی وتووە و ئەوەی وتووە**". هەرچەندە کابرای شینکی لەسەر قسەکانی دەڕوات بەڵام ڕیچ دەڵێت: "**عومەر ئاغا بەمە کۆمەڵێ ئارەزووی تێگەیشتنی لەو کتێبە دامردەوە**"[٩٤].

ئێمە نازانین، ئاخۆ عومەر ئاغا زانیویەتی کە کتێبەکەی (ئاریەن) بە زمانی گریکی نووسراوە، یان نا و چۆن بەرگری لە ئەسکەندەر کردووە، بەڵام ئەو، بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکان، بە سەرچاوەیەکی "**کۆن و باوەڕپێکراو**"ی دەزانێت. هەرچەندە لە ڕوانگەی ئۆرتۆدۆکسی ئیسلامییەوە، هیچ سەرچاوەیەک لە دوای قورئان، جێی باوەڕکردن نییە، بەڵام هێشتا ئەوەی عومەر ئاغا لەو سەرچاوەیەوە دەیبیستێت، کۆمەڵێک ئارەزووی تێگەیشتنی دادەمرکێنێتەوە. بەم جۆرەش **نەگوتراوێک** لە پەرۆشیی عومەر ئاغادا هەیە بۆ گوێگرتن لە ڕاستییەک، کە لە کتێبە "***کۆن و باوەڕپێکراوەکان***"دا هەیە، با موسوڵمانانیش نەیاننووسیبن. ئەو ئەم نەگوتراوە نادرکێنێت، بەڵام بەوەی کە گوێی لەو ڕاستییانە دەبێت، کە لەو کتێبەوە دەیبیستێت، ئارەزووی تێگەیشتنی دادەمرکێتەوە. هەموو ئەمەش دەمانباتەوە سەر ئەو بیچمە کولتوورییەی کە خەریک بوو دەخەملا و کرانەوە و تێگەیشتن لە ئەوانی تر و گۆڕینەوەی ئەزموون و زانیاری یەکێک بوو لە ئامانجەکانی. ئەمە هەمان زەینییەت و بیچمی کولتووریشە کە زمانێکی کراوەی شیعری و هزرین لەلای شاعیرانی ئەوسا دروستدەکات و دەبێتە ڕەنگدانەوەیەکی داهێنەرانەی سەردەمەکەی. بەڵام پێش ئەوەی بچمە سەر ئەو مەبەستە، گەشتەکەم بەناو کتێبەکەی جەیمس فرەیزەردا تەواو دەکەم.

**دووەم: جەیمس فرەیزەر:**

پاش نزیکەی چواردە ساڵ لە گەشتەکەی ڕیچ بۆ سلێمانی و بینین و هەڵسوکەوتی لەگەڵ میرەکانی بابان، جەیمس بیلی فرەیزەر، گەڕیدە و دیپلۆماتی سکۆتلەندی، دەگاتە هەمان شار و ماوەیەکی کورت لەوێ دەمێنێتەوە (١٨٣٤). دۆخی ئابووری و سەربازیی شارەکە و باری گوزەرانی خەڵکەکەی تەواو تێکچووە و ئەندامانی بنەماڵەی بابانیش هێشتا لەناوخۆیاندا ناکۆک و دژن[٩٥]. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ مەبەستەکەی ئێمە و ڕۆحی مۆدێرنخوازی لەو دەڤەرەدا هەندێ یاداشتی گرنگی بۆ تۆمار کردووین. هەرچەندە ئیتر، هەمان ئەو مەیل و خولیا مۆدێرنەی سەردەمی ڕیچ، کە لەسەر زاری عوسمان بەگەوە دەمانبیست، هەمان خرۆشی جارانی نەماوە، بەڵام هێشتا لەسەر زاریی میرەوە، کە سلێمان پاشایە، کۆمەڵێک زانیاری و بیروڕا دەبیستین، کە ڕەنگدانەوە و پاشماوەی ئەو کوانووەیە کە پێشتر لەو دەڤەرەدا هەبووە.

فرەیزەر لە (١٠/١ی) ساڵی ١٨٣٤، لە سلێمانییەوە نامەیەک بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت و تیایدا بە گشتی وەسفی دۆخی سلێمانی و بنەماڵە و کەسایەتی سلێمان پاشا دەکات:

**(ڕوانیم پاشا کەسێکی خۆش مەشرەبە، شارەزاییەکی زۆر باشی لەبارەی کوردەوە هەیە و لە ڕاستیدا بە شێوە و ڕواڵەت لە عوسمانی دەچوو تا کورد. دنیایەک پرسیاری لێ کردم، سەبارەت بە دۆخی ئەورووپا، پێوەندیی نێوان هەر دەوڵەتێک و ئەوانی دیکە، بەتایبەتی لەبارەی پەیوەندیی نێوان بابی عالی و ڕووسیا و محەمەد عەلی پاشا. وێدەچوو ئاگادارییەکی باشی لە کاروباری ئەمەریکا هەبێ. بۆچوونی- بەلای ئەوەوە- کۆنی هەندێ فارسی دانیشتووی مەجلیسەکە و چەند پیاوێکی خۆیشی ڕاست دەکردەوە. گفتوگۆ لەسەر هەل و مەرجی هیندستان کرا، یەکجار بە بایەخەوە ناوی چەندین داهێنانی نوێی برد، بەتایبەتی ئەوانەیان کە مۆرکێکی جەنگییان هەیە. مەسەلەی چاککردنەوەی پارچەکانی تفەنگ، ڕایکێشاینە ناو باس و خواسی**

**جۆرەها بەرهەمهێنانی فیشەک و بەرامبەر بەوەیش، باشترین ڕێگەی بەسەردا زاڵ بوون و بەرەنگاری. ئەم مەسەلانە کێشایانەوە بۆ باسکردنی بابەتێک، کە پێشتر پتر لە جارێک ئاماژەیان پێدابوو و بەر گوێم کەوتبوو و نموونەیەکی سەیری بەندوباوی (خورافات) و شێوەی بڵاوبوونەوەی لەناو خەڵکدا دەخاتە بەر چاو، یانی نموونەی لەلایەکەوە- خێرا باوەڕ پێهێنان و لەلایەکی دیکەوە، جادووگەریی بێ شەرمانە)**[٩٦].

پەرۆشیی سلێمان پاشا بۆ وەرگرتنی زانیاری لە فرەیزەر لەبارەی ئەورووپاوە، دەمانباتەوە سەر هەمان نەریتی بابانییەکان لە خولیایاندا بۆ ئەو بابەتە. پێشتریش ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە چۆن مەحموود پاشا و عوسمان بەگ بە بەردەوامی ئەم خرۆش و تامەزرۆییەیان لە بارەی سروشت و پێکهاتە و پەیوەندیی دەوڵەتانی ئەورووپی بە یەکترەوە و ململانێی نێوانیان هەبوو. ئەوەی لێرەدا بۆ من گرنگە ئەوەیە کە لە سلێمانییەکی دوورە دەست و لاتەریوی ئەوسای کوردستان و جیهاندا، جگە لەو پەیوەندیی و سەفەرانەی هەندێک لە پاشاکانی بابان بە دەوڵەت و پایتەختەکانی ئەوسای ئێران و عوسمانی دەیبەستنەوە و ئەمەش سەرچاوەی زانیاریی سیاسییان بوو، چۆن توانیویانە ئەو هەموو زانیارییانە بەدەست بهێنن ئەگەر بۆخۆیان هاندەرێکی ناخەکییان بۆ ئەم بابەتە نەبووبێت و لە پەرۆشییان بۆ مەسەلەیەک نەبووبێت، کە لە ناخدا بڕوایان پێی هەبووە، بەڵام هەمیشە دەریاننەبڕیوە و نەگەیشتۆتە ئەوەی لە ئاستی فیکریدا ببێتە گوتارێک و ڕەنگدانەوەی لەسەر بەڕێوەبردنی سیاسییان هەبێت. هەر ئەمەشە، وێڕای ناکۆکی و دژایەتی ناوخۆییان، وێڕای گیرۆدەبوونی ئابووری و ئیدارییان بە دەوڵەتی ئێرانی قاجاری و عوسمانییەوە، وێڕای ئەوەی هەمیشە دەبوو نەوەکانیان بکەنە "بارمتە"، هێشتا لە ئاستی ئاگاییدا، نموونەی "کەسایەتی لۆکاڵی بەڵام بە ئاگایی جیهانییەوە"، بەرجەستە دەکەن و ئەمەش بۆ من ئاستێکی ڕۆشنگەرانە و مننەوەرانە، دەداتە کەسایەتییان.

ئەوەتا ئەوەی جێی سەرنجە ئاگایی سلێمان پاشایە وەک پاشایەکی لۆکاڵی، لە ململانێ نێودەوڵەتیەکانی ئەوسا، بۆیە بەتایبەتی پرسیاری لەسەر پەیوەندیی ڕووسیا بە بابی عالی و محەمەد عەلی پاشای میسرەوە لێدەکات! ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سلێمان پاشا بە باشی زانیویەتی کە چۆن هەردەم ڕووسیا، "محەمەد عەلی پاشا"ی میسری هانداوە بۆ هەڵگەڕانەوە و کۆتاییهێنان بە دەوڵەتی عوسمانی[٩٧]. هەرچەندە فرەیزەر ئەو زانیارییانەی پاشای لەبارەی ئەمەریکاوە بۆ تۆمار نەکردووین، کە لە زاری خۆی بیستوونی، بەلام لە هەڵسەنگاندنەکەی فرەیزەردا لەم بارەیەوە کە دەڵێت: "**وێدەچوو ئاگادارییەکی باشی لە کاروباری ئەمەریکا هەبێ**"، دوو شتمان بۆ دەردەکەوێت، یەکەم ئەوەی کە سلێمان پاشا زانیاریی باشی لەسەر ئەمەریکای ئەوسا هەبووە و دووەمیش ئەوەی کە ئەو زانیارییانە هەڵەیان تێدا نەبووە، کە شیاوی ڕاستکردنەوە بن لەلایەن فرەیزەرەوە. جگە لەوەش، پرسیار لە بارەی (ئەمەریکا، چین و هیندستان) و (ئامێر و دەستکەوتە تەکنەلۆژییەکان)، ئەو چوارگۆشەی پرسیارەن، کە لە ڕۆشنبیریی سیاسیی بابانییەکاندا جێگەیەکی تایبەتی هەیە زۆر دووبارەیان دەکەنەوە.

خاڵی جەوهەریی لە کەسایەتی و هزری سلێمان پاشادا، وێڕای ئەوەی لەم کاتەدا (مانگی ١٠ی ١٨٣٤)، کە فرەیزەر دەیبینێت لەو پەڕی لاوازیی ئیداری و ئابووریی خۆیدایە. وەک ئەوەی لەم پەرەگرافەدا هاتووە، دەستنیشانکردنێتی بۆ دیاردەیەک، کە جێی پەسەندی ئەو نەبووە و وەک هەندێ "**بڕوا و بیرۆکەی کۆن**"، ناویان دەبات، کە زانیویەتی هەندێ لە فارسەکانی میوانی و پیاوانی خۆیشی بڕوایان پێیەتی و لەو بیروڕا خورافیانەوە گلاون. پاشان هەوڵدانێتی بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بیروڕایانە بە بەدەستهێنانی پشتیوانی فرەیزەر بۆ قسەکانی.

ئەو بیرۆکانە وەک فرەیزەر دەستنیشانی کردووە، لەلای سلێمان پاشا، پەیوەندییان بە دوو هۆکارەوە هەیە، یەکەم: بڵاوبوونەوەیان لەناو بازنەی پیاوەکانی خۆی، کە ڕەنگە ئەمە ئاماژەیەک بێت بۆ بڵاوبوونەوەی بیروڕای دەروێشی و تەشەنەسەندنی، نەک هەر لە کۆمەڵگادا، بەڵکو لەناو سیستەمی حوکمڕانیشدا، بەهۆی ئەو کاریگەرییە زۆرەی تەریقەتی قادری لە قەڵەمڕەوی ئەوسای باباندا کردبووی، کە ئەوەش لە ڕوانگەی پاشاوە، جۆرێک لە ساویلکەیی و نییەتپاکی ئەوان دەردەخات، دووەمیش: خودی ئەم جۆرە بیروڕایانە بەخێرایی بڕوایان پێدەکرێت.

کەواتە ئێمە لەبەردەم چەند شتێکی گرنگداین کە دەتوانین لە ڕێگەی ئاماژەپێدانیانەوە، لەو خەم و هوشیارییە تێبگەین کە ئەم پاشا کوردە هەڵگریان بووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە سلێمان پاشا لە دژی خورافەیە و لە دژی بڵاوبوونەوەیەتی لە نێوان پیاوانی خۆیدا و دەیەوێت بەرپەرچی میرزایەکی فارسیش بدرێتەوە کە لە مەجلیسەکەیدا بووە، بۆ ئەمەش دەیەوێت سوود لە ئامادەیی فرەیزەر وەربگرێت، کە ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو تێگەیشتنەی پاشای ناوبراوە لە فرەیزەر، وەک کەسایەتییەک، کە جیاواز بۆ ئەو بابەتانە دەچێت و دەکرێت پشتی پێببەسترێت. هەر بۆیەشە لە درێژەی گفتوگۆکەدا، پاشا لایەنگریی خۆی بۆ فرەیزەر دووپات دەکاتەوە و بەمەش هەم بەرپەرچی میرزای فارس، دەدرێتەوە و هەم پاشایش ***پەیامێک*** ئاراستەی پیاوەکانی خۆی دەکات. بەڵام لەلابەلای دیمەنەکەوە شتی دیکەش بە شاراوەیی خۆیان مات داوە: ململانێی نێوان کورد و فارس، نێوان شیعە و سوننە و نێوان نەقشبەندی و شیعە و نێوان داگیرکەر و داگیر کراو.. کۆی ئەم دیمەنە پەیوەندییەکانی دەسەڵات ئاشکرا دەکات.

باسکردن و بەرپەرچدانەوەی ئەوەی "عاممە" بڕوای پێیەتی و بە پیرۆزی دەزانێت، کارێکی ئاسان نییە، بەتایبەتی بۆ دەسەڵاتدارێکی وەک سلێمان پاشای بابان، کە لەو کاتەدا بە نەگبەتییەکی

هەمەلایەنەشــدا (کــە ئاماژەیــە بــەگرانیی یەکــەم)، تێپــەڕیوە و لــە بەرژەوەندییدا نەبووە عاممە لە خۆی بورووژێنێ. فرەیزەر لە بەشێکی دیکەی گێڕانەوەکەیدا، ئەوە باس دەکات، لە درێژەی مەجلیسەکەدا کە دانیشتوانەکەی بڕوایان بەوە بوو کەسانێکی بەهرەمەند هەن، ئاسنی سوورەوەکراو بە دەستی ڕووت لە تەندوور دەردەهێنن. بۆیە فرەیزەر گوتوویەتی هەرکات بە چاوی خۆم وەها دیمەنێکم بینی، "ئەو دەمە دڵنیا دەبم کە هەندێ هێزی لە عەقڵ بەدەر هەیە. کەچی هەموو دانیشتوانی مەجلیسەکە بە یەک دەنگ گوتیان: "**ئەم ڕاستییە هیچ گومانێکی تێدا نییە، چونکە هەمووومان دەزانین ڕاستە**". فرەیزەر دەنووسێت: منیش بە پێداگرتنەوە گوتم: ("**باشە، ئەگەر پارچە ئاسنی سوورەوەکراو بە دەستی سەییدەوە ببینم، ئەوسا منیش باوەڕی پێدەهێنم و ددانی پێدا دەنێم کە ئەم چەشنە هێزە، مەبەست لێی هەرچی بێت، لە خوداوەیە". میرزای فارس کە بەپەرۆشییەوە دەیویست بەکێشم بکاتە ناو گفتوگۆی ئایینی، بە تەوسەوە پێی گوتم: "وا دەکەی؟ پاش ئەوە، هەرچی ئەوە بیڵێ، پێی قاییل دەبی؟" گوتم: "گریمان، توانی ڕوونی بکاتەوە خودا نییە. ئاخۆ دەتەوێ پشتگیریی ئەم باوەڕەی بکەم؟ وەڵامی دایەوە: "نەخێر، ئەوە شتێکی مەحاڵە." وەڵامم دایەوە: "وایە. ئێوە کاتی خۆی پیاوی واتان تێدا هەڵکەوتووە، خۆیان بە خودا زانیوە و لافی ئەوەیان لێداوە کە هێزێکی لە عەقڵ بەدەریان هەیە، لە کاتێکدا کەسانێکی دیکە بەتەواوی نکووڵییان لەم شتە کردووە. لەبەر ئەوە دەبێ سەرنج بدەن، یەکێک نییە بە متمانەوە بەڵێن بدا باوەڕ بە هەموو قسەیەکی کەسێکی دیکە بکا، ئەگەر خۆی پێشتر گوێی لێ نەبێ و نەزانێ گونجاوە قبووڵی بکا، یان نا." پاشا هاتە قسە و گوتی: "ڕاستە، بەجێ نییە ئەوە بکا." میرزاش قڕوقەپی لێ کرد و هیچی تری نەگوت.)**[٩٨].

لە ڕوانگەی داناییناسیی سەردەمەکەوە، گفتگۆیەکە مەجلیسەکەی کردووە بە دوو بەشی سەرەکییەوە: (عاممەباوەڕان) و (مننەوەران)، کە فرەیزەر و سلێمان پاشا بۆ ئەم مەسەلەیە لە بەرەی دووەمدان. ئەم

دوو کەسایەتییە نوێنەرایەتی بیروباوەڕێک دەکەن، کە سەردەمەکە بەتەواوی ڕەتیدەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا مکووڕن لەسەر بەرگریکردن لێی. کێشەکە لەسەر حەقیقەتە. بەلای عاممەی خەڵکەکەوە، **ڕاستەقینەی بیروڕایەکە، ڕاستە**، تەنیا لەبەر ئەوەی: ***ئەوان* باوەڕیان** پێیەتی و بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەوانەی ئاگر و پشکۆ دەخەنە سەر سەریان و ئاسنی سووورەوەکراو لە تەندوور بە دەستی ڕووت، دەردەهێنن، خاوەنی هێزێکی لە عەقڵ بەدەرن کە لە خواوەیە. بەرەی دووەم، ئەم بڕواهێنانە ڕەتدەکەنەوە، بە دوو بەڵگە، یەکەم ئەوەی کە دەبێت لەو کەسانە بێن و لەبەرچاوی خۆیان ئەو کارە بکەن، کە دەیسەلمێنێت ئەوان خاوەنی هێزێکی لە عەقڵ بەدەرن. دووەمیش: **یەکێک نییە بە متمانەوە بەڵێن بدا باوەڕ بە هەموو قسەیەکی کەسێکی دیکە بکا، ئەگەر خۆی پێشتر گوێی لێ نەبێ و نەزانێ گونجاوە قبووڵی بکا، یان نا".**

لێرەدایە کە بڕوای تاکەکەسی و ئەزموونی تایبەت بۆ وەها بڕواهێنانێک، گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە. ئەمە جگە لەوەی لە مەسەلەی بڕواهێنان بە ڕاستەقینە، ناکرێت قسەی کەس بکەینە پێوەر، ئەمەش ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردنە: لە دنیای مۆدێرندا هەرکەس گوزارش لە خۆی دەکات و کەس ناتوانێت بەناوی ئەوانی ترەوە شتێک بڵێت، کە نەیانگوتووە.. بەم پێیەش، پرانسیپەکانی مۆدێرنیتە و تێگەیشتن لە ڕاستەقینە، لە گفتوگۆکەی فرەیزەر و پشتگیرییەکەی سلێمان پاشادا ئامادەییان هەیە.

**لەجیاتی ئەنجام:**

بە ئاسانی ئەنجامگیری لە مەسەلەی پەیوەندیی کورد بە مۆدێرنیتەوە، ناکرێت. بابەتەکە پێویستی بە شەنوکەوکردنی زیاتر و سەرچاوە و بەڵگەی زیاتریش هەیە. لەو ماوەیەدا کە من لەم بەشەی توێژینەوەکەدا، لە پێش چاوم گرتووە، گوێمان لە چەند دەنگێک دەبێت، کە ئاشکراکەر زەینییەتێکی تایبەتن. ئەم زەینییەتەی لە پشت ئەم ڕستانەوە ئامادەیە و ئەو شێوازی بەڵگەکارییەی فرەیزەر داوای دەکات و سلێمان پاشا پشتگیریی ڕاشکاوی لێدەکات، جگە لەوەی بوێرییەکی تایبەتی ئەم دوو کەسە ئاشکرا دەکات، ئاواش نوێنەرایەتی کولتوور و ڕۆشنبیری و ئاگاییەکی تایبەت دەکات، کە دەچێتە بازنەی مۆدێرنیتەوە. پاشان فرەیزەر ڕاستەوخۆ ڕووی دەمی لە پاشا دەکات و پرسیارەکەی دەستنیشانتر و کۆنکرێتتر دەکاتەوە، لێی دەپرسێت: ("**ئێستا تکام وایە پاشا ڕێم بدا لێی پرسم: ئایا پایە بەرزتان ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک لەم سەییدانەتان دیوە، کاری وا لە عەقڵ بەدەری لێ بوەشێتەوە؟" وەڵامەکەی "نەخێر" بوو.**"). ئیتر فرەیزەر هەمان پرسیار لە پیرەمێردێکی گوێ قوڵاخ و تامەزرۆی ناو مەجلیسەکە دەکات و ئەویش وەڵامی "**نەخێر**"ـە، هێندە نەبێت دەڵێت: "**یەکێکم دیوە ئاگری خستۆتە ناو دەمی**". گوتم: "**ئەمە هەر جادووگەر (حوققەباز)ێکی نێوانمان دەیکا و هیچ ناسەلمێنێ، بەڵکو بەڵگەیە کە بەزۆری فڕوفێڵە.**" لێرەدا پاشا دیسانەوە دێتەوە قسە و لە پشتگیریی فرەیزەردا، دەڵێت: "**ڕاست دەڵێ، من خۆم ئەم جۆرە فڕوفێڵەم دیوە، ئەو برادەرانە کردوویانە**")[99]. بەم جۆرەش، لە میانەی مشتومڕەکەدا، پاشا ئەو شتەی لەلای عاممە بە "**هێزێکی لە عەقڵ بەدەر**"ی سەییدەکان، بۆتە بناغەی بڕواهێنان، بە "**فڕوفێڵ**"، ناو دەبات کە ***"ئەو برادەرانە کردوویانە"***. گوزارەی "**ئەو برادەرانە**"، هەڵگری ئاماژەیەکی ڕاشکاو و ڕاستەوخۆیە بۆ کەسانێک لە نزیکی پاشاوە، یان هەر هیچ نەبێت لە کۆمەڵگا و قەڵەمڕەوەکەی خۆیدا. بۆ پاشا مەسەلەکە ئەوەیە کە بڕوایەک لەسەر بنەمای فڕوفێڵ بێت بۆ

ئەو جێی پەسەند نییە. ئەمەش نامەیەکی گرنگە لەو کاتەدا کە کۆمەڵگای بابانی بەتەواوی دابەش ببوو بەسەر دوو ڕەوتی باوەڕداریدا: قادری و نەقشبەندی.

بـەم جـۆرەش، ئێمـە لـەم گفتوگـۆ بوێرانەیـەوە، جـۆرێ لـە "پیرۆزییخسـتنی خورافـە" و "باوەڕ"ێـک دەبینینـەوە، کـە لـە دەڤەرەکـەدا بەناوی ئایینەوە تەشەنەی سەندووە. لێدان و کەمکردنەوە لەم بیروڕایە کـە بۆتـە هـۆی تـەبیارکردنی ئـاپۆرا و عـەوام، لێدانێکی ڕۆشـنگەرانە و زادەی ئاسـتێکی هوشـیاری و باوەڕبوونـە بـە عـەقڵ، کـە بەرهـەمی مۆدێرنیتەیـە. ئەمـە سـەرەتای گەمەیەکـە، کـە سـلێمان پاشـا لەگـەڵ عەوامباوەڕیدا کردوویەتی. هیچ نەبێت ئەم جۆرە گفتوگۆیانە دەرفەتیان بە پاشای بابان داوە، جاروبار دڵی خۆی بکاتەوە و ئەوە بڵێت کە جیای دەکاتەوە لە عەوام.

لەلایـەکی تریشـەوە، نموونـەی ئـەم دانیشـتنانە، وەک ئـەوەی لە سەردەمی مەحموود پاشا و عوسمان بەگی برایشیدا بینیمان و ڕێچ شـایەتییان بـووە، ئـەوە پیشـان دەدەن کـە جـۆرێ لـە کرانـەوە، قەبووڵکردنی ڕای جیاواز و ڕێزگرتن لە فرەیی، لە کولتووری سیاسیی بابانییەکانـدا هـەبووە. هـەموو ئەمـەش وەک بناخەیـەکی کولتـووری و بنـەمایـەکی فیکـری، دەبێتـە هۆکـاری دروسـتکردنی ئـەو زەمینـە ڕۆشنبیرییەی کە پاشتر بووە دەلاقەیەک بۆ ئەوەی چەندین منەوەری کورد قسەی خۆیانی لێوە بکەن.

بۆ درێژەی ئـەم باسـە، دەتوانیت بگەڕێیتـەوە بـۆ کتێبـی: نـالی لـە "بەلاغە"وە بۆ "مۆدێرنێتە". بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ٢٠١٨.

## پەراوێزەکان:

(١) الان تـورين: **نقـد الحداثـة**. ترجمـة: أنـور مغيـث. مصـر: المجلـس الاعلـى للثقافـة، المشروع القومى للترجمة. ١٩٩٨، فصل: الثانى. ص: ١٢٩-١٨٣.

(٢) رامين جهانبگلو: **مـوج چهـارم**. ترجمـه: منصـور گودرزى. تهـران: نشـر نـى، چ: ٢، ١٣٨٢ (٢٠٠٣)، ص: ١٧.

(٣) يورگن هابرماس: **گوتاری فەلسەفیی مۆدێرنە**. وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: هاوژین مەلائـەمین. سـلێمانی: نێوەنـدی ڕۆشـنگەری بـۆ لێکۆڵینـەوەی فکـری و سیاسـی، ٢٠١٠، ل: ١٧ و ٢٥.

(٤) **محسن محمدي:** الجذور الفلكية للحداثة: انبثاق الذات وانهيار البـاراديغم الأرسـطي التراتبي. **لە:** https://www.youtube.com.

(٥) توكلى: ٢٠٠٩، أحمدپور: ١٣٨٨، ١٣٩١، عباس تبار، رحمت؛ و محمـد حسـينى پـور، خسرو 1395 **خوانشـی ژانوسـی از مدرنيتـه** :مـورد مطالعـه انفـال قـومى در عـراق . فصلنامه مطالعات ميان رشته اى در علوم انسانى،)3 (8 ،. 89 - 111 . ڕەحیم: ٢٠١٧، لە: http://penus.krd/news307-10.htm.

(٦) بڕوانە: حسينعلى نوذرى: **صـورتبندى مدرنيته و پست مدرنيته**. ١٣٨٥، ل: ١٠٣ و بەرەودوا.

(٧) سـون اريـک ليـدمن (سـڤين ئيريـک ليـدمان): **در سـايەى اينـده**. تـاريخ انديشـەى مدرنيته. ت: سعيد مقدم، تهران: نشر اختران، ١٣٨٧ (٢٠٠٨).

(٨) ڕێبوار سیوەیلی: **نووسین و بەرپرسیارێتی**. سلێمانی: ڕەنج، ٢٠٠٦، ل: ٥٩-٦١

(٩) جەمال بابان، ٢٠١٢، ب: ٣، ل: ١٦٢-١٦٤، چ. بابان: ٢٠١٢، ب: ٤، ل: ١٨٥-١٨٩

(١٠) مـەحموود ڕەزا: "**لـە لاپـەڕە گەشـەکانی مێـژووی میرانـی بابـان**". گۆڤـاری ژیـن. ژمارە: (٥) دێسەمبەری ٢٠١٣، ل: ١٦٥-١٨٤

(١١) مەحمود ئەحمەد، ١٩٨٤، بابان: ٢٠١٢، ب: ١ و ٢، ل: ٣٣٩-٣٥٠

(١٢) جەمال بابان. ب: ١و ٢، ل: ٣٨٧-٣٩٠.، سیوەیلی: ٢٠١٥، چ: ٢، ل: ١٩٩-٢١٠

(١٣) جەمال بابان: ٢٠١٢، ب: ١و ٢، ل: ٤١٨-٤٢٠

(١٤) جەمال بابان. ب: ١و ٢، ل: ٣٨٥-٣٨٦.

(15) J. Shiel Notes on a Journey from Tabríz, Through Kurdistán, via Vân, Bitlis, Se'ert and Erbíl, to Suleïmániyeh, in July and August, 1836 .The Journal of the Royal Geographical Society of London ,Vol. 8

(١٦) مامۆسـتا جەعفـەر (فازيـل کـەريم ئەحمـەد): **شـاری سـلێمانی**: ململانێـی نێـوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، ١٨٢٠-١٩٢٠. ٢١٠٤، ل: ٥٢

(١٧) مارتین ڤان برونەسن: **ئاغا و شێخ و دەوڵەت**. و. د. کوردۆ عەلی، ب: ٢، سلێمانی: ئەکادیمیای هوشیاری و پێگەیاندنی کادیران، ٢٠١١، ل: ١٦٣

(١٨) لەم بارەیەوە بڕوانە: محەمەد حەمە باقی: **مێژووی موزیکی کوردی**. ژ: ٣، ل: ٢٣٤-٢٣٨.

(١٩) بابان: ب:١و ٢، ل: ٣٧٨-٣٨٢، ل: ٣٨٣-٣٨٤.

(٢٠) محەمەد حەمە باقی: **موزیک و گۆرانیی کوردی** (لێکۆڵینەوە، مێژوو، بەسەرکردنەوە). ٢٠١١، ل: ١٥٦ و بەرەودوا.

(21) Bronislaw Malinowski (1923): Supplement 1. The problem of meaning in primitive languages, p: 297- 298.

(٢٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین: **بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین**. بەشی یەکەم: **میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا**. بیروت: دار العربیە للعلوم، ٢٠١٤، ل: ١٣٥.

(23) Sir Robert ker Porter: Travels in Georgia, Persia, Armenia, Ancient Babylonia, during the years 1817, 1818, 1819 and 1820. Vol II. London 1822.

(24) Major Frederick Millingen: Wild life among the Koords. London, Hurst and Blackett, Publishers, 1870.

(٢٥) ولیەم هیوود: **سەفەرنامەی ولیەم هیوود بۆ کوردستان ساڵی ١٨١٧**. وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە، پێشەکی و پەراوێزنووسینی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا. هەولێر: لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، ٢٠١٢، ل: ٥٠. هەروەها بڕوانە:

-William Heude: A Voyage Up the Persian Gulf: And a Journey Overland from India to England ... by. Publication date 1819.

(٢٦) ولیەم هیوود: **١٨١٧**. ل: ٥٠ (Heude:٢٠٢-٢٠٣).

(٢٧) ولیەم هیوود: **١٨١٧**. ل: ٥١ (Heude:٢٠٣).

(٢٨) هـ س.: **١٨١٧**. ل: ٦٢

(29) Eugene Flandin: Voyage en Perse 1840-1841. Paris 1851

وەرگێڕانی ئەو بەشەی سەردانەکەی فلاندین بۆ سلێمانی، لەلایەن مامۆستا محەمەدی حەمەباقییەوە کراوەتە کوردی: "**کورد لە سەفەرنامەی بیانیدا**". گۆڤاری ڕامان، ژمارە: (٥٩)، ساڵی ٢٠٠١، ل: ٢١٠-٢١٤

(٣٠) ئەڵبەتە لەبەر درێژیی باسەکە، تەنیا ڕیچ و فرەیزەر لێرەدا بڵاو دەکرێنەوە..

(٣١) کلودیوس جێمس ڕیچ: **گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠**. و. محەمەد حەمە باقی، چ: ٤، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠١٢، ل: ٢٨٣. پێشتریش: دەزگای ئاراس ٢٠٠٢. ل: ٢٧٣. لەمەودوا بۆ دەقە ئینگلیزییەکەی،

سـوود لـەم سـەرچاوەیە و لـەم دوو چاپـەی وەردەگـرم وەرگێڕانەکـەی م. حەمەباقی تەواو شایان و وردە و بە دیققەتەوە زەحمەتی تێدا کێشاوە. هـەروەها هەڵـەکانی ڕێنووسیشـم لـە دەقـە ئینگلیزییەکـەدا، ڕاسـت نەکردوونەتـەوە. ئەمـە ناونیشـانی دەقـە ئینگلیزییەکەیـەتی و مـن سـوودم لـە نوسـخە ئەلیکترۆنییەکـەی وەرگرتووە:

Rich: Narrative of A Residens in Koordistan, London, J. Ducan P. Row. MDCCXXXVI, 2008) (Rich: 296)ڕیچ: **گەشتنامە**، ١٨٢٠، ل: ٢٧٩ .

[٣٢] کلودیـوس جـێمس ڕیـچ: **گەشـتنامە ١٨٢٠**. ٢٠١٢.، ل: ٢٨٣. پێشـتریش: دەزگـای ئاراس ٢٠٠٢. ل: ٢٧٣.

[٣٣] ڕیچ: **گەشتنامە**، ١٨٢٠، ل: ١١١. (Rich: 97).

[٣٤] ڕیچ: **گەشتنامە**، ١٨٢٠، ل: ٢٧٢.

[٣٥] ڕیچ: **هەر ئەوێ**، ١٨٢٠، ل: ١١١-١١٢.(Rich: 97-98) .

[٣٦] ه. س. پ.، ١٨٢٠، ل: ١١٢( Rich: 98) .

[٣٧] ڕیچ، هەمان لاپەڕە. ٩٩، (Rich:98).

[٣٨] ڕیچ: هەرئەوێ،. ل: ١١٢،(Rich: 99).

[٣٩] ڕیچ: **گەشتنامە**، ١٨٢٠، ل: ١١٣، 100 ، (Rich: 100).

[40] ttp://en.wikipedia.org/wiki/Balloon_(aeronautics).

[41] K. O. B. Jørgensen: Teknik og Samfund. København, Munksgaard, 1, oplag, 1976, s:54.

[42] ttp://www.newworldencyclopedia.org/entry/Balloons in the military.

[٤٣] بڕوانە ئەو مانایەی د. جەمال نەبەز بۆ وشەی (خزم) لێکیدەداتەوە:

- جەمال نەبـەز: **وشـەنامەکی ئیتیمۆلۆژیـای زمـانی کوردی**. کۆبەرهـەم ژمـارە (٨)، بابـەتی زمـان و زمانـەوانی (١). چـاپی یەکـەکی ئـەلیکترۆنی، ٢٠٠٨، وشـەی: (Xizim) ل: ٣٥٨.

[٤٤] ڕیچ: **گەشتنامە، ١٨٢٠**، ل: ١١٣-١١٤، (Rich: 100-101).

[٤٥] بۆ ئاگاداریی زیاتر، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتـەوە بۆ ئـەم سـەرچاوە بـە سـوودە لەبارەی ئەمەریکاوە:

- پ. د. سەعدی عوسمان هەروتی: **مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا** (لە دەسـپێکەوە تـا کۆتـایی جـەنگی دووەمـی جیهـانی). چ: ١، هـەولێر: چ. زانکـۆی سەلاحەدین، ٢٠١٦، ل: ٧-١٥.

[٤٦] ڕیچ: هەمان شوێن و لاپەڕە (Rich:102 ).

[٤٧] ڕیچ: هەمان سەرچاوە، ل: ١١٤، (Rich: 102).

(٤٨) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، ل: ٢٩٤.

Rich: 314 ("Osman Bey's conduct, throughout the whole of the late transactions, has been that of an honourable man, and one who has the interests of his country at heart. The Pasha's great fault is his weakness and unaccountable reverence for the Turks ; which proceeds, however, from a religious feeling").

(٤٩) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، ل: ١٣٠.

(٥٠) ڕیچ: هەر ئەویێ، ١٨٢٠، ل: ٣٠٢.

(٥١) ڕیچ: هـ س. ١٨٢٠، ل: ٣٠٢-٣٠٣.

(٥٢) ڕیچ: هـ س. ١٨٢٠، ل: ١١٥.(Rich: 103).

(٥٣) ڕیچ: هـ س ١٨٢٠، ل: ٢٨٦(Rich: p: 312) .

(٥٤) ڕیـچ: گەشـتنامە ١٨٢٠، ل: ٢٩٩. بـەڵام بـۆ تێگەیشـتن لـە هۆکارەکـانی کـۆچی مەولانا خالید، ئەم گوزارشەی ڕیچ هەموو شتێکمان بۆ باس ناکات. لەوبارەیەوە بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

**برونەسن**: (٢٠١١) ٢، ل: ١٥٢-١٥٥، بابی لالۆ (**کەمال ڕەووف محەمـەد**) (٢٠٠٤، ل: ٧٥-٧٨، **ڤاسیلەڤیا** (٢٠٠٩) ل: ٢٣٦-٢٣٩. **حەمـەی حەمـە بـاقی** (٢٠١٣) ل: ٢٥٧-٢٧٤، **تەوەککولی** (٢٠١٥)، ل: ٢٥١-٢٥٣. **تۆفیق** (٢٠١٤)، **فەتاح**، (٢٠٠٩).

Rich: 321 ("He lost his consideration on tile death of the Pasha's son. He said he would save his life and that he had inspected God's registers concerning him").

(55) Rich: p: 313.

(٥٦) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، ل: ١٢٥.

Rich: 111; ("Pasha making many inquiries about European armies, with very judicious remarks.").

(٥٧) ڕیچ: ه. س. ١٨٢٠، چاپی ٢٠٠٢، دەزگای ئاراس، ل: ١٢١.

(٥٨) ڕیچ: ه. س. ١٨٢٠، پێشوو، ل: ١٢٢.

(٥٩) پێدەچێت میری بابان مەبەستی لەم سورەتانەی قورئان بێت کە تیایاندا باسـی تـەختایی و زەویـی و بـە گشـتیی گەردوونناسـی، کـراوە: (النازعـات: ٢٧-٣٢، الغاشیة: ١٧-٢١، لقمان: ١٠، النحل: ١٤-١٥، الرعد: ٣، التکویر: ١ و ٢، الصافات: ٥، المعـارج: ٤٠-٤١، النحـل: ٨٧-٨٩) و چەنـد شـوێنێکیتریش.. بـۆ تێگەیشـتنێکی باشتر و ڕوونتر سەرنجی خوێنەر بۆ ئەم باسەی (هیوا محەمەد) ڕادەکێشم کە بەشێوەیەکی ورد باسی لەم بابەتە لە تێکستەکانی ئیسلامدا کردووە. بەداخەوە مـن سـەرچاوەی باسـەکەم لا نییـە و لـە فەیسـبووکەوە کـۆپیم کـردووە و

ڕایەڵەکــەیم بیــر چــووە، بــەڵام بابەتەکــە زۆر شــتمان لەســەر تێگەیشــتنی مەحموودپاشا لە ئاسماناسی ئیسلامی بۆ ڕووندەکاتەوە:

- هیوامحەمەد: "*ئاسمان لە نێوان ئایین و زانستدا*" بەشی:(٣).

(٦٠) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، ل: ١٤١-١٤٢، (Rich: 136).

(٦١) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، چاپی ٢٠٠٢، چاپی دەزگای ئاراس، ل: ١٣٧.

(62) J. J O'Connor and E F Robertson :Nevil Maskelyne لە :http://www-groups.dcs.st-and.ac.uk.

(63) The Editors of Encyclopædia Britannica: Sir William Herschel. In: https://www.britannica.com.

(٦٤) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ڕەوشی زانستی و فێربوون لە قەڵەمڕەوی ئەوسای بابان و ڕەوتی گەشەکردنی مەدرەسە و مزگەوت و کتێبخانەکانی، بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

- جەمال **بابان** (٢٠١٢) بەرگی ١ و ٢، ل: ١٣٤-١٤٩ کە سوودی لەم توێژینەوەیە وەرگرتووە:
- مەحموود ئەحمەد محەمەد (١٩٨٤)، ڕۆشنبیری نوێ ژ: ١٠٢، ل:١٠١-١١٢.
- بابی لالۆ (٢٠٠٤)، ل: ٤٥و بەرەودوا، و بابی لالۆ: (٢٠١٢)ل: ٢٦ و بەرەو دوا.
- عباس عزاوی: **شهرزور – السليمانية (اللواء و المدينة)**. مراجعة، تقديم وتعليقات: محمد علي القرەداغی. ط: ١، بغداد: السالمي، ٢٠٠٠. ص ص: ٢١٣-٢٦٦.

٦٥ ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، چاپی ئاراس، ل: ١٢١.

(٦٦) عومەر خدر خدر: **میرنشینی ئەردەڵان**. توێژینەوەیەک لە بارودۆخی سیاسی پوختەیەکی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری. هەولێر: ئەکادیمیای کوردی، ژ: ٢٦٥، ٢٠١٦، ل: ٢٨٧-٣١١. توێژەر لەم کتێبەدا زۆر بە ڕوونی ئەو دژایەتی و پێویستییەی ئەمارەتی ئەردەڵان و بابان لێکدی دەکا و پێکەوە دەبەستێتەوە، شرۆڤە دەکات.

(٦٧) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا: **کوردوستانی خواروی ڕۆژهەلات**. (لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە، کورتەیەکی مێژووی میرنیشینانی ئەردەڵان و بابان). و. لە ڕووسییەوە: د. ڕەشاد میران. هەولێر: ئاراس، ل: ١٥٤، چاپی دووەم، ٢٠٠٩.

(٦٨) ڕیچ: **گەشتنامە** ١٨٢٠، چ: ئاراس، ل: ١٠٣.

(٦٩) ڕێبوار سیوەیلی: **کتێبی نالی**. ماڵی وەفایی و ڕێکخراوی زەریاب بۆ خزمەتگوزاریی گشتی، ٢٠١٥، ل: ١٩٩-٢١٠. هەرچەندە لەو کتێبەدا من بوێریی ئەوەم نەبوو، هەموو ئەم بیرۆکە و ئاستە هوشیارییە لەبەر ڕۆشنایی

مۆدێرنیتەدا، ناوزەد بکەم، بەڵام ئەوەی لەو بەشەی کتێبەکەدا نووسیومە، ئەو ئامانجەی هەیە.

(70) William Francis Ainsworth: A Personal Narrative of the Euphrates Expedition. London, 1888, Vol: II, P: 296-297.

لەم کتێبەدا کە نووسەر ڕۆژێک پاش گەیشتنی بۆ سلێمانی، لە بەیانیدا پاشای بابان دەبینێت، وەسفی دانیشتێک دەکات کە ئەو نامەی سوڵتانی بەغدا پێشکەش بە میری بابان دەکات کە مۆڵەتی بداتێ بچێت بەدوای شوێنەوارەکاندا بگەڕێت. پاشای بابان لێی دەپرسێت ئەگەر شتێکی دۆزییەوە، "**چۆن دەیپارێزێت و لە هەمان کاتیشدا دەستی بۆ فارسەکان ڕادەکێشێت وبە پێکەنینەوە دەڵێت: ئەمانە بۆت دەپارێزن**". ئەم ڕستەیە و ئەو پێکەنینە هەڵگریی گەلێک ئادرێس و نیشانەی تایبەتە کە دەریدەخات کوردەکان چۆن بیر لە ئەوانیتری داگیرکەریان دەکەنەوە.

(٧١) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا: **کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات**، پێشوو. بڕوانە کۆتایی بەشی ٥، ل: ٢٥٧ و بەرەو دوا.

(٧٢) یڤگینیا ئی. ڤاسیلیەڤا: **دابەشبوونی سیاسیی کوردستان** ١٥١٤-١٩١٤ (تراجیدیای کورد). وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: د. ڕەشاد میران، هێشتا چاپ نەبووە. ل: ٣٢-٣٣. زۆر سوپاسی پرۆفیسۆر میران دەکەم، کە دەستنووسی ئەم کتێبەی پێش چاپبوون خستە بەردەستم.

(٧٣) م. س. لازاریف و (ئەوانیتر): **مێژووی کوردستان**. و. وشیار ع. سەنگاوی. چ: ٥، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٢، ل: ١٧٥-١٧٦.

(٧٤) تاریخ اردلان، ل: ٢٠٩ و بەرەو دوا.. لە سەرچاوەی پێشوو، وەرگیراوە.

(٧٥) یڤگینی ئیلینچنا ڤاسیلیڤیا: "***دەربارەی ژیان و بەرهەمی شاعیر و مێژوونووسی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم- ماهـ شەرەفخانمی کوردستانی***". لە: ئەنوەر قادر محەمەد: **چەند وتارێکی کوردناسی**، سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨، ل: ٥٢-٥٣.

(٧٦) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، چاپی ئاراس، ل: ٢٧٥ .

(٧٧) ڕیچ: ە. س. ١٨٢٠، چاپی ئاراس، ل: ٢٧٤-٢٧٥.

(٧٨) ڕیچ: ە. س. ١٨٢٠، چ. ئاراس، ل: ٢٧٨-٢٧٩. Rich: (306).

(٧٩) ڕیچ: گەشتنامە ١٨٢٠، ل: ١٤٧، (Rich: p: 140).

(٨٠) ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە مامۆستا جەعفەر لە لێکۆڵینەوە نایابەکەیدا پێی گەیشتووە، بڕوانە:

- مامۆستا جەعفەر: **شاری سلێمانی (ململانێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠-١٩٢٠)**: هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٤.

[٨١] ریچ: **گەشتنامە ١٨٢٠**، چاپی ئاراس، ل: ٢٧٧.

[٨٢] ریچ: **گەشتنامە** ١٨٢٠، ل: ١٤٨.

[٨٣] ی. ئی. ڤاسیلیەڤا: **کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات**. ٢٠٠٩، ل: ٢٣٦.

[٨٤] هەرچەندە ئەم ڕێکەوتە بۆ دروستبوونی شاری سلێمانی ڕۆیشتووە و تا ڕاددەیەکی زۆریش چەسپاوە، بەڵام توێژینەوەی نوێ دەریانخستووە ئەو مێژووە دووساڵ پاشترە. لەم بارەیەوە بڕوانە: د. زرار صدیق توفیق: "**شاری سلێمانی، خوێندنەوەیەکی دی بۆ مێژووی بنیادنانی**". لە : گۆڤاری ژین، ژمارە (٦)، ٢٠١٤، ل: ١٢٧-١٣٣.

[٨٥] دکتۆر مۆردیخای زاکین: **جووەکانی کوردستان**: مێژووی ژیان و پەیوەندییان لەگەڵ ئاغا کوردەکاندا. و. لە ئینگلیزییەوە: سیروان حسێن بیەیی، هەولێر: ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ژ: ٢٣٦، ٢٠١٥، ل: ١٣٧.

هەروەها بڕوانە: اریک براور: **یهود کردستان**. أکملە و أصدرە: رافائیل پاتای. ت: شاخوان کرکوکی و عبدالرزاق بوتانی. اربیل: منشورات اراس (٩٢٣)، ط: ٢، ٢٠٠٩.

[٨٦] وا دەردەکەوێت لێرەدا وشەی (**جولەکان**) کەمێک خۆی لە وشەی (**جوو**) جوداکردبێتەوە و لە پشت ئەم گۆڕینەی (جوو) بە (جولەکە) تێڕوانینێکی بچووککراوەی مێژوویی خۆی شاردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وشەی (جولەکان) یان (جو/لە/کە/کان)، کورتکرابێتەوە بۆ ئاماژەدان بە هەمان ناوی بنەڕەتی: (جووەکان)، بۆ خۆڕزگارکردن لەو ناوە چەندبڕگەییە، بەبێ ئەوەی ماناکە باری دەروونی و میزاجیانەی بەخۆیەوە گرتبێت و ئامانجی بچووککردنەوەی جووەکان بووبێت.

[٨٧] جەمال بابان: سلێمانی: **شارە گەشاوەکەم**، ب: ١و ٢، هەولێر، ئاراس. چ: دووەم، ٢٠١٢، ل: ٣٥٩.

[٨٨] هەمان شوێن و هەمان لاپەڕە.

[٨٩] زاکین، پێشوو: **جووەکانی کوردستان**: ٢٠١٥، ل: ١٣٨-١٣٩.

[٩٠] ریچ: **گەشتنامە ١٨٢٠**. ل: ٢٧٩ – ٢٨٠.

[٩١] ریچ: **گەشتنامە ١٨٢٠**. ل: ٢٨٠.

Rich: (308 “The advantages to science, from having so intelligent an observer, who is constantly going over such unknown and interesting countries, would be prodigious, and he might in his turn have instructed others, and propagated science and knowledge”).

[٩٢] دوای بەدواداچوونم بۆم دەرکەوت، مەبەستی ریچ لەم شاکارە مێژووییەی (ئاریەن)"ـە، لە بارەی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە:

- Arrians History of Alexander's expedition. Trans &notes historical, Geographical and Critical by Mr. Rooke. A new edition in two Vol. London, 1814.

(٩٣) بۆ ئاگاداریی خوێنەر، ڕیچ بە دەگمەن وشەی "ئیسلام" بەکار دەهێنێت، ئەو لەسەر نەریتی ئەورووپی دەنووسێت: (محەمەدی) و بە موسوڵمانانیش دەڵێت: (موحەمەدییەکان).

(٩٤) ڕیچ: **گەشتنامە ١٨٢٠**. ل: ٢٨٠، (Rich: 310).

(٩٥) نەوشیروان مستەفا ئەمین: **بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین**، ١، ل: ١٦٥ و چەند شوێنێکی تر.

(٩٦) سەرەتا گەشتەکەی فرەیزەرم لە زمانی ئینگلیزی دەستنەکەوت، وەرگێڕانە عەرەبییەکەی لەسەردەمی پاشایەتیدا کراوە و گومانم هەبوو کە لەبەر چەند هۆکارێک سانسۆر کرابێت، یان لەبەر نەشارەزایی وەرگێڕەکەی لە ناو و شوێنەکانی کوردستان، هەڵەی تێکەوتبێت، یاخود لەبەر سانسۆری ئایدیۆلۆژی ئەو بەشەی پەیوەندیی بە کوردستانەوە هەیە، دەستکاریی کرابێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەوەرگێڕانێکی سەرکەوتووی دەزانم و چەند وەرگێڕانێکی دیکەی ئەو بەشەم بە کوردیی لەبەردەستدا بوون، مەسەلەکەم لەگەڵ مامۆستای بەڕێزم شارەزا لەو بوارە مێژووییە، (مامۆستا ***سدیق ساڵح***)، لە بنکەی ژین لە سلێمانیی، باسکرد، جەنابی دوای ئەوەی کێشە و گومانەکانی منی بە هەند وەرگرتن، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا وەرگێڕانێکی نوێی بۆ ئەنجام دام و بە دەستنووس و بە خەتێکی خۆش و جوان، بۆی ناردم. هەموو ڕاگواستنەکان لە کتێبەکەی فرەیزەرەوە لەم وەرگێڕانەوە دەکرێن لەگەڵ ئاماژەدان بە لاپەڕەی نوسخە عەرەبییەکەی. بڕوانە:

- **گەشتنامەی جەیمس بێلی فرەیزەر بۆ کوردستان و مێزۆپۆتامیا**. (١/١٠/ ١٨٣٤)، و. سدیق ساڵح، دەستنووس، ٢٠١٧.
- **جیمس بلی فریزر**: رحلة فریزر الی بغداد فی ١٨٣٤. ت: جعفر الخیاط، بغداد: دار الکتب العلمیة، ط: الثانیة، ٢٠١٣، ص: ٣١.
- J. Baillie Fraser Travels in Koordistan, Mesopotamia, &c. Two Volumes, London, Richard Bentley, New Burlington Street, Publisher in Ordinary to her Majesty, 1840.

(٩٧) ئەم زانیارییانەم بە شێوەیەکی زارەکی لە (**پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**)، وەرگرتووە. پێش نیوەڕۆی ١٢/١٢ی ٢٠١٧ لە ئەکادیمیای کوردی. هەولێر.

(٩٨) فرەیزەر(دەستنووس)، ل: ٣، فریزر: ص: ٣٣.

(٩٩) فرەیزەر (دەستنووس): ل: ٤، فریزر: ص: ٣٣.

## سەرچاوەکان:

### بە زمانی کوردی:


١. یورگن هابرماس: **گوتاری فەلسەفیی مۆدێرنە**. وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: هاوژین مەلائەمین. سلێمانی: نێوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فکری و سیاسی، ٢٠١٠.

٢. ڕێبوار سیوەیلی: **نووسین و بەرپرسیارێتی**. سلێمانی: ڕەنج، ٢٠٠٦.

٣. مەحموود ڕەزا: "**لە لاپەڕە گەشەکانی مێژووی میرانی بابان**". گۆڤاری ژین. ژمارە: (٥) دیسەمبەری ٢٠١٣.

٤. مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد): **شاری سلێمانی**: ململانێی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، ١٨٢٠-١٩٢٠. ٢١٠٤.

٥. مارتین ڤان برونەسن: **ئاغا و شێخ و دەوڵەت**. و. د. کوردۆ عەلی، ب: ٢، سلێمانی: ئەکادیمیای هوشیاری و پێگەیاندنی کادیران، ٢٠١١.

٦. محەمەد حەمە باقی: **موزیک و گۆرانیی کوردی** (لێکۆڵینەوە، مێژوو، بەسەرکردنەوە). ٢٠١١.

٧. نەوشیروان مستەفا ئەمین: **بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین**. بەشی یەکەم: **میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا**. بیروت: دار العربیه للعلوم، ٢٠١٤.

٨. ولیەم هیود: **سەفەرنامەی ولیەم هیود بۆ کوردستان ساڵی ١٨١٧**. وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە، پێشەکی و پەراوێزنووسینی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا. هەولێر: لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، ٢٠١٢.

٩. محەمەدی حەمەباقی: "**کورد لە سەفەرنامەی بیانیدا**". گۆڤاری ڕامان، ژمارە: (٥٩)، ساڵی ٢٠٠١.

١٠. کلودیوس جێمس ڕیچ: **گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠**. و. محەمەد حەمە باقی، چ: ٤، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠١٢

١١. جەمال نەبەز: **وشەنامەکی ئیتیمۆلۆژیای زمانی کوردی**. کۆبەرهەم ژمارە (٨)، بابەتی زمان و زمانەوانی (١). چاپی یەکەکی ئەلیکترۆنی، ٢٠٠٨.

١٣. د. سەعدی عوسمان هەروتی: **مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا** (لە دەسپێکەوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی). چ: ١، هەولێر: چ. زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠١٦.

١٤. ڕێبوار سیوەیلی: **فەلسەفەی پێش سوکرات**. دەزگای زەریاب، هەولێر، ٢٠١٦ .

١٥. (بابی لالۆ) **کەمال ڕەووف محەمەد (ئاشناکردن و لێکۆڵینەوە)**: عەقیدەی ئیمان – عەقیدەی کوردی "لوببەلعەقاییـد". کـۆنترین دەسـتنوس ١٨١٨/٥/١٦. کـۆ و کورتکردنەوەی: خالید شارەزووریی نەقشبەندی. (٢٠٠٤).
١٦. **محەمەد حەمە باقی: ئەدەب و مێژوو. چ: یەکەم، هەولێر: دەزگای موکریانی** (٢٠١٣)
١٧. محەمەد ڕەئووف تەوەکولی: **مێژووی تەسەوف لە کوردستان**. و. یوسف زاهیر هەورامی. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات. چ: یەکەم، هەولێر: ٢٠١٥.
١٨. کۆمەڵێک توێژەر: **ڕێبازی سۆفیگەریی نەقشبەندی – خالیدی**. مەولانا خالید و تەریقـەتی خالیدی. و. لـە ئینگلیزییـەوە: محەمـەد حەمەسـاڵح تۆفیـق. چ: دووەم. سلێمانی: چاپخانەی کارۆ. (٢٠١٤)
١٩. عەلی عەبدوڵڵا، حەبیب محەمەد دەروێش (ئامادەکار): **مەولانا خالید** (موسافیرە بێ نیشتیمانەکە). زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ (٢)، شوێنی چاپ: ؟، ٢٠١٢.
٢٠. زرێبـار (گۆڤـار): **نـالی**. فصـلنامە فرهنگی/ادبی/اجتمـاعی (بـا روش تحلیلـی-پژوهشی. ش: ٧٩-٨٠، پایز و زمستان ١٣٩١.
٢١. ئیبـراهیم فـەتاح (وەرگێـڕ و لێکدانـەوە): **نامـە عەرەبییـەکانی مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی**. لـە بڵاوکراوەکـانی دیـداری جیهـانیی مـەولانا خالیـد ٤. هـەولێر: دەزگای ئاراس، (٢٠٠٩).
٢٢. عومەر خدر خدر: **میرنشینی ئەردەڵان**. توێژینەوەیەک لە بارودۆخی سیاسی پوختەیەکی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری. هەولێر: ئەکادیمیای کوردی، ژ: ٢٦٥، ٢٠١٦.
٢٣. ی. ئی. ڤاسیلیەڤا: **کوردوستانی خوارووی ڕۆژهەڵات**. (لە سـەدەی حەڤدەوە تـا سەرەتای سەدەی نۆزدە، کورتەیەکی مێژووی میرنشینانی ئەردەڵان و بابان). و. لـە ڕووسـییەوە: د. ڕەشـاد میـران. هـەولێر: ئـاراس، ل: ١٥٤، چـاپی دووەم، ٢٠٠٩.
٢٤. ڕێبـوار سـیوەیلی: **کتێبـی نـالی**. مـاڵی وەفـایی و ڕێکخـراوی زەریـاب بـۆ خزمەتگوزاریی گشتی، ٢٠١٥
٢٥. یڤگێنیـا ئـی. ڤاسـیلیەڤا: **دابەشـبوونی سیاسـیی کوردسـتان** ١٥١٤-١٩١٤ (تراجیدیای کورد). وەرگێڕانی لـە ڕووسـییەوە: د. ڕەشاد میران، هێشتا چاپ نەبووە.

٢٦. م. س. لازاریف و (ئەوانی تر): **مێژووی کوردستان**. و. وشیار ع. سەنگاوی. چ: ٥، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٢.
٢٧. یڤگینی ئیلینچنا ڤاسیلیڤیا: "***دەربارەی ژیان و بەرهەمی شاعیر و مێژوونووسی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم- ماهـ شەرەفخانمی کوردستانی***". لە: ئەنوەر قادر محەمەد: **چەند وتارێکی کوردناسی**، سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨.
٢٨. مامۆستا جەعفەر: **شاری سلێمانی (ململانێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠-١٩٢٠)**: هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٤.
٢٩. د. زرار صدیق توفیق: "**شاری سلێمانی، خوێندنەوەیەکی دی بۆ مێژووی بنیادنانی**". لە : گۆڤاری ژین، ژمارە (٦)، ٢٠١٤.
٣٠. دکتۆر مۆردیخای زاکین: **جووەکانی کوردستان**: مێژووی ژیان و پەیوەندییان لەگەڵ ئاغا کوردەکاندا. و. لە ئینگلیزییەوە: سیروان حسێن بیەیی، هەولێر: ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ژ: ٢٣٦، ٢٠١٥.
٣١. جەمال بابان: سلێمانی: **شارە گەشاوەکەم**، ب: ١و ٢، هەولێر، ئاراس. چ: دووەم، ٢٠١٢.
٣٢. **گەشتنامەی جەیمس بێلی فرەیزەر بۆ کوردستان و مێزۆپۆتامیا**. (١/١٠/ ١٨٣٤)، و. سدیق ساڵح، دەستنووس، ٢٠١٧.

**بە زمانی عەرەبی:**
٣٣. الان تورين: **نقد الحداثة**. ترجمة: أنور مغيث. مصر: المجلس الاعلى للثقافة، المشروع القومي للترجمة. ١٩٩٨.
٣٤. عباس عزاوي: **شهرزور – السليمانية (اللواء و المدينة)**. مراجعة، تقديم وتعليقات: محمد علي القرەداغي. ط: ١، بغداد: السالمي، ٢٠٠٠.
٣٥. **جيمس بلى فريزر**: رحلة فريزر الى بغداد في ١٨٣٤. ت: جعفر الخياط، بغداد: دار الكتب العلمية، ط: الثانية،
٣٦. محسن محمدي: **الجذور الفلكية للحداثة: انبثاق الذات وانهيار البارادیغم الأرسطي التراتبي**. لە: https://www.youtube.com.
٣٧. اريک براور: **يهود كردستان**. أكمله وأصدره: رافائيل پاتای. ت: شاخوان كركوكي و عبدالرزاق بوتاني. اربيل: منشورات اراس (٩٢٣)، ط: ٢، ٢٠٠٩.

**بە زمانی فارسی:**

٣٨. رامین جهانبگلو: **موج چهارم**. ترجمه: منصور گودرزی. تهران: نشر نی، چ: ٢، ١٣٨٢ (٢٠٠٣).

٣٩. أحمد محمدپور: از سنت بە نوسازی. مطالعەی تغییرات اجتماعی بە روش اثنوگرافی ، تهران: جامعەشناسان، ١٣٨٨.

٤٠. أحمد محمدپور: تجربەی نوسازی. مطالعه تغییر و توسعه در هورامان با روش نظرةی زمینەای. تهران: جامعەشناسان، ١٣٩١.

٤١. عباس تبار، رحمت؛ و محمد حسینی پور، خسرو ١٣٩٥ " **خوانشی ژانوسی از مدرنیته**:" مورد مطالعه انفال قومی در عراق . فصلنامه مطالعات میان رشته ای در علوم انسانی، ٨ (٣)، ١١١ - ٨٩. . ڕەحیم: ٢٠١٧، لە: .http://penus.krd/news307-10.htm

٤٢. حسینعلی نوذری: **صورتبندی مدرنیته و پست مدرنیته**. ١٣٨٥.

٤٣. سون اریک لیدمن (سڤین ئیریک لیدمان): **در سایەی اینده**. تاریخ اندیشەی مدرنیته. ت: سعید مقدم، تهران: نشر اختران، ١٣٨٧ (٢٠٠٨).

**بە زمانی ئینگلیزی و سکەندناڤی:**

44.J. Shiel Notes on a Journey from Tabriz, Through Kurdistán, via Vân, Bitlis, Se'ert and Erbil, to Suleïmániyeh, in July and August, 1836 .The Journal of the Royal Geographical Society of London ,Vol. 8

45.Bronislaw Malinowski (1923): Supplement 1. The problem of meaning in primitive languages.

46.Sir Robert Ker Porter: Travels in Georgia, Persia, Armenia, Ancient Babylonia, during the years 1817, 1818, 1819 and 1820. Vol II. London 1822.

47.Major Frederick Millingen: Wild life among the Koords. London, Hurst and Blackett, Publishers, 1870.

48.William Heude: A Voyage Up the Persian Gulf: And a Journey Overland from India to England ... by. Publication date 1819.

49.Eugene Flandin: Voyage en Perse 1840-1841. Paris 1851

50.Rich: Narrative of a Resident in Koordistan, London, J. Ducan P. Row. MDCCXXXVI, 2008).

51.ttp://en.wikipedia.org/wiki/Balloon_ (aeronautics).

52.K. O. B. Jørgensen: Teknik og Samfund. København, Munksgaard, 1, oplag, 1976.

53.ttp://www.newworldencyclopedia.org/entry/Balloons in the military.

54.J.J O'Connor and E F Robertson :Nevil Maskelyne. لە: http://www-groups.dcs.st-and.ac.uk.37.

55.The Editorsof Encyclopædia Britannica: Sir William Herschel. In: https://www.britannica.com.

56.William Francis Ainsworth: A Personal Narrative of the Euphrates Expedition. London, 1888, Vol: II.

57.Arrians History of Alexander's expedition. Trans notes historical, Geographical and Critical by Mr. Rooke. A new edition in two Vol. London, 1814.

58.J. Baillie Fraser Travels in Koordistan, Mesopotamia, &c. Two Volumes, London, Richard Bentley, New Burlington Street, Publisher in Ordinary to her Majesty, 1840.

## الملخص

## الكورد وانبهارهم بالحداثة (١٨٢٠–١٨٥١)

### (حكام بابان انموذجا)

من اين بدأ الكورد بالحداثة؟ هل كان سبق وعي الكورد بالحداثة ام وقع التحديث؟ هكذا اسئلة دفعتني الى التفكير بالموضوع ورجعت الى المصادر التاريخية وخاصة الى كتابات الرحالة الاوروبيين. و وقع اختياري على اثنين منهم وهما: كلوديوس ج. ريج (١٨٢٠) و جيمز فريزر (١٨٣٤).

ان هؤلاء الرحالة والباحثين، قاموا ضمن عملهم السياسي والحكومي آنذاک، بضبط وتدوين المعلومات المهمة عن الكورد وطرز تفكيرهم وحياتهم السياسية والاقتصادية والاجتماعية. ونقلوا اقوال الشخصيات البارزة من الذين كان لهم دور في القرار السياسي ضمن ادارة حكومة امارة بابان الكوردية.

بعد قيامي بقراءة مضمون ما كتبه هؤلاء الرحالة توضح لي بأن هناک بدايات الوعي الكوردي بما كان يجري في البلدان الاوروبية خاصة التي بدأت في العقد الثاني من القرن التاسع عشر، حيث هناک لقاءات ما بين الكورد والاجانب من البريطانيين والفرنسيين والايطاليين وغيرهم .

طبيعة التفكير الكوردي في الحداثة يبرز من خلال الاسئلة. فالكوردي يسأل عن كل شيئ ويعبر عن افكاره من خلال الاسئلة والمناقشة. وهذا البحث يدور حول (انبهار الكوردي) حول الحداثة، وآماله بأن تصبح حياته السياسية والعسكرية والاجتماعية وحتى الصحية، كالأوروبيين.

# Abstract:

## Kurds and modernity (1820-1851)

Where did the Kurds begin with modernity? Was the Kurds aware of modernity or modernization? Therefore, questions led me to think about the subject and returned to the historical sources, especially the writings of European travelers. Two of them signed my choice: Claudius J. Rich and James Fraser.

Each of these travelers and researchers, within their diplomatic, political and governmental work at the time, to write and record important information about the Kurds and models of their thinking and their political, economic and social life. They quoted statements by prominent figures who had a role in the political decision within the administration of Baban, the Kurdish state.

After reading the content of the speech and the content of the words to these people, explain, that the beginnings of Kurdish awareness of what happened in the European countries have already begun in the second decade of the nineteenth century, where there are links between the Kurds and foreigners of the British, French, Italians and others.

The nature of Kurdish thinking about modernity emerges through questions. The Kurds ask about everything and express their ideas during the questions and discussion. So this research is about (Kurdish whispers) about modernity and his hope that his life becomes a military, social and even health, as Europeans.

Therefore, we can say that the long story between the Kurds and the New World has started.

# کاریگەرییە نەرێنییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەسەر ئافرەتانی کوردستان

هاوکار یاسین شەریف                    لوقمان قادر ڕەواندزی
پەیمانگای تەکنیکی کارگێڕی هەولێر/ زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر

**پێشەکی :**

تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە سەرانسەری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بڵاوبوونەتەوە، هەرچی بەکارهێنانیشیانە لە کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە، دەرهاویشتەکانی جیاوازن، بێسنووری ئەو تۆڕانە و پێویستبوون یان (ئاڵودەبوونیش لە بەکارهێنانیاندا) هۆکاری سەرەکییە بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر بەکارهێنەران، ئەو کاریگەرییانەش بێگومان ئەرێنی و نەرێنین و لەسەر هەردوو ڕەگەز چەسپاون، بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت بە ڕێبازێکی زانستییانە ئاماژەی بۆ بکەین کاریگەرییە نەرێنییەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە لەسەر بەکارهێنەرانی لە کوردستانا بەتایبەتیش ئافرەتان، ئەوەش دوای ئەوەی کە ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە بوونە هۆکارێک بۆ سەرهەڵدانی چەندان کێشەی کۆمەڵایەتیی نێوان هاوسەران و ئەندامانی یەک خێزان تا کێشەی کۆمەڵایەتیی نێوان دوو خێزان و زیاتر یان دوو عەشیرەتیش سەری کێشاوە. ئەوەش هەروەک لە ناوەڕۆکی ئەم تۆژینەوەیەدا ئاماژەمان بۆی کردووە چەندان هۆکاری سەرەکیی هەن گرنگترینیشیان نەبوونی هۆشیارییە بەرامبەر ئەو تەکنەلۆژیایەی ڕۆژانە تازە دەبێتەوە و ئێمەش تا ڕادەیەک لێی بێ ئاگاین. ئەم تۆژینەوەیە ئەنجامدراوە بە پشتبەستن بە: سەرچاوە زانستی و باوەڕپێکراوەکان و ئامارە فەرمییەکان کە لە دام و دەزگا فەرمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دەستکەوتوون.

هەروەها پشتمان بە چەند کتێب و ماڵپەڕێکی ئەنتەرنێت بەستووە بۆ بەکارهێنانیان وەک سەرچاوەی باوەڕپێکراو بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوون و دیدە جیاوازانەی لەم توێژینەوەیە خراونەتەڕوو.

ئەم تۆژینەوەیە بریتییە لە سێ تەوەر و هەر تەوەرێک لە چەند بەشێک پێکهاتووە: تەوەری یەکەم لە بەشی یەکەمدا پێناسەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و کورتەیەک لە چۆنییەتی بڵاوبوونەوەیان باس کراوە، بەشی دووەم واقیعی هەرێمی کوردستان لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ تا ٢٠١٥ خراوەتە ڕوو، لە بەشی سێیەمیشدا ئاماژە بە چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە لە کوردستاندا کراوە.

لە تەوەری دووەمدا بەشی یەکەم تایبەتە بە خستنەڕووی ژمارەی بەکارهێنەرانی ئافرەت لە کوردستاندا، بەشی دووەمیش باسکردنی دەرکەوتنی کاریگەرییەکانە لەسەر ئافرەتانی کوردستان و لە بەشی سێیەمدا پوختەی لێکەوتەی کاریگەرییەکان خراوەتە ڕوو، لە بەشی چوارەمدا ئامارەکانی توندوتیژی دژ بە ئافرەتانی کوردستان بەپێی ساڵەکان و جۆری توند و تیژییەکان خراونەتە ڕوو .

لە تەوەری سێیەم لە بەشی یەکەمدا ئاماژە بۆ لایەنە یاساییەکانی بەکارهێنانی ئامرازەکانی گەیاندن کراوە و بەراوردی ئەو پێشێلکارییانە کراوە کە دوای دەرچوونی یاساکەش هێشتا بەردەوامن، بەشی دووەمیش تایبەتە بە ڕاسپاردە و پێشنیازەکان بۆ چۆنییەتی خۆپاراستنی ئافرەتان لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان .

**تەوەری یەکەم:**

**بەشی یەکەم: پێناسەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و چۆنییەتی بڵاوبوونەوەیان**

سەرەتای دروستبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٥ کە زانای ئەمریکایی (پۆل باران) لە زانکۆی پەنسلڤانیا بیرۆکەی بەیەکەوە بەستنەوەی دوو کۆمپیوتەر و زیاتری خستە ڕوو[١]، دوای چەندان جار هەوڵدان سەرکەوتن و شکست، گەیشتنە بۆشایی ئاسمان و بوونی مانگە دەستکردەکان و داهێنانی هێڵی ئەنتەرنێت، زۆربەی دەزگا و کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژیا و ناوەندەکانی زانستی کەوتنە تەقەلای ئەوەی سوود لەو داهێنانە وەربگرن و هەمووانیش کێبڕکێیان لەسەر (یەکەم) دەکرد، سەرەتای ئەو کێبڕکێیەش بە دروستکردنی ماڵپەڕی ئەلیکترۆنی دەستی پێکرد کە پەیڕەو و پرۆگرامەکانی خۆیانیان تێدا دەخستنە ڕوو[٢]. لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان مێژوویەکی دوور و درێژیان نییە، بەڵکو یەکەمین تۆڕی کۆمەڵایەتی لە ساڵی ١٩٩٧ لەلایەن قوتابییەکی زانکۆی واشنتۆن دروستکرا و ناوی لێنرا (Classmates.com) کە ڕاستەوخۆ قوتابیانی زانکۆی واشنتۆنیان بەیەکەوە دەبەستەوە و ئەو کارەش تەنها بۆ ئاڵوگۆڕی زانیاری بوو دەربارەی وانەکانی زانکۆ و کاتی تاقیکردنەوە و خشتەی وانەکان و ئەرک و فەرمانەکانی زانکۆ[٣].

ساڵی ٢٠٠٥ کۆمپانیای گوگڵ بەهۆی ئەو خزمەتگوزارییانەی لە بواری گەیاندن پێشکەشی کرد بووە گەورەترین ماڵپەڕی ئەلیکترۆنی لە ڕووی بەکارهێنانەوە کە زیاتر لە ٨٠٠ ملیۆن بەکارهێنەری هەبوو[٤].

تایبەتمەندییە جیاوازەکانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانەی کە هەیانە و ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی دەکەن هۆکاری سەرەکین بۆ بڵاوبوونەوەیان لە کۆمەڵگە مرۆییەکاندا، بەردەوامیش ئەو تۆڕانە فراوانتر دەبن چونکە چەندەها شێوازیان هەیە، کە بەپێی شێوازی خزمەتگوزارییەکانیانەوە دابەشی سەر پێنج چین بوونە:

**یەکەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی گەیاندن و ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان[٥]:**

ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە کاریان تەنها بەیەکەوە بەستنەوەی نێوان کۆمەڵێک کەسە کە مەبەستێک یان پەیامێک کۆیان دەکاتەوە و ئەو تۆڕانەش نموونەکانیان ئەمانەن:

**1ـ بلۆگ**[6] (Blog): ئەم ماڵپەڕانە زیاتر کەسین، واتە هەموو مرۆڤێک دەتوانێ بلۆگێک بکاتەوە و هەواڵی تازە بڵاوبکاتەوە یان ئەو بیروڕایانەی کە خۆی باوەڕی پێیەتی و بۆی تێدەکۆشێ، ئەم جۆرە زیاتر بەوە ناسراوە کە زۆر خێرایە بۆ گەیاندنی (تێکست، وێنە، دەنگ، گرتەی ڤیدیۆ) بەڵام تەنها دەبێ قەبارەیان بچووک بێ، خەڵکی زیاتر بۆ ناساندنی شار و دەزگا خزمەتگوزارییەکانی وڵات بەکاریان دەهێنن، باشترین نموونەش لەو جۆرە تۆڕانە (Facebook– فەیسبووک)ە. ئەم جۆرە گرنگیان زۆرە لەوانەش:

١ـ بەشداریکردن لە چالاکی هاوڕێیان ٢ـ گەڕان بە دوای هاوڕێی کۆن کە لێک دابڕاون ٣ـ گەڕان بەدوای کار. ٤ـ بانگەشە و ڕیکلامی بازرگانی. ٥ـ گەڕان بە دوای زانست و زانیاری. ٦ـ دۆزینەوەی هەلی کار و سەرچاوە بۆ پڕۆژە ئابوورییەکان ٧ـ دروستکردنی گرووپ بۆ کارکردنی بە کۆمەڵ. ٨ـ بەستنی کۆنگرەی زانستی. ٩ـ شیکارکردنی بابەتێک و چارەسەری گرفتێک کە تووشی تاک دەبێت، بەتایبەت ئافرەتان.

**٢ـ ڕووداو** :[7](Event) ئەم جۆرە تۆڕانە زیاتر بۆ بۆنە تایبەتییەکان دەکرێنەوە و ژمارەیەکی کەمی خەڵک پێدەزانێت دەتوانن سەردانی بکەن، دامەزرێنەرانی ئەم تۆڕانە زۆرترین بەربەست لەبەردەم خەڵکی ئاسایی دادەنێن تا نەتوانن بە ئاسانی بگەنە ئەو تۆڕانە. نموونەی ئەو تۆڕانەش : (Tweetvite – Enventful – meeptup)

**دووەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی هاوکاری و بەیەکەوە کارکردن:**

ئەم جۆرە تۆڕانە زیاتر لە زانکۆ و ناوەندە زانستییەکان بەکاردێت بەناوبانگترینیشیان (Wiki) کە مامۆستایەک بۆ قوتابییەکانی بابەتەکانی لەسەر نمایش دەکات و بەمەبەستی وەرگرتنی زانیارییەکانیش تەنها قوتابییەکانی ئەو مامۆستایە سەردانی دەکەن. ماڵپەڕی (ویکی پیدیا – Wikipedia) کە بە ناوەندێکی زانستی ناسراوە هەموو تاکێکی سەروو

هەژدە ساڵان ئەتوانێت ئەکاونتی تایبەتی خۆی تێدا دروست بکات و زانیاری و داتای تایبەتی بخاتە شوێنی مەبەست[٨].

هەندێک ماڵپەڕی تریش وەک (social news) کە زیاتر لە بواری هەواڵ و گەیاندنی دەنگوباس کارایە، بەکارهێنەری ئەو تۆڕە خۆی جۆری ئەو هەواڵە دەستنیشان دەکات تا پێی بگات، لە بەرامبەردا تۆڕەکە بە کەمترین نرخ جۆری ئەو هەواڵە بۆ ئەندامەکانی دەنێرێت کە دەستنیشانیان کردووە[٩].

**سێیەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییە پسپۆڕییەکان:**

ئەم جۆرە تۆڕە کۆمەڵایەتییانە زیاتر لایەنی پسپۆڕێتییان وەرگرتووە. بۆنموونە(photo sharing) : ماڵپەڕێکە تایبەت بە هونەری شێوەکاری و لەو ماڵپەڕەدا هەموو کارە هونەرییەکانی هونەرمەندان هەڵگیراوە و بۆ بینەرانیش بە شێوازێکی زۆر هونەری نمایشیان دەکات. هونەرمەندانیش لەگەڵ بینەران لە ڕێگەی ئەو ماڵپەڕەوە بەیەک دەگەن و بەرهەمەکانیان دەفرۆشن. لەو شێوازەشدا بەناوبانگترین تۆڕەکان بریتین لە :(Devint art – Flickar – phptppucket – picasa)[10].

بەشێکی دیکەی ئەو ماڵپەڕانە تایبەتن بە گواستنەوەی ڕاستەوخۆی ڤیدیۆکان و بە (Streaming – Vidio sharing) ناسراون. ئەمەش نەک بەو مانایەی کە جێگرەوەی کەناڵە ئاسمانییەکان بن کە ئەو کەناڵانە بەردەوام وێنەی کارەسات و ڕووداوەکان دەگوازنەوە، بەڵکو مەبەست لێی دروستکردنی گفتوگۆیە لە نێوان هاوڕێیاندا، ئەم جۆرە ماڵپەڕانەش لە وڵاتانی دیکتاتۆریدا قەدەغەیە[١١].

دیارە شیکردنەوە و گفتوگۆکردن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو و نووسینی زۆرترین کۆمێنت لەبارەی ئەو ڕووداوەوە کاردەکاتە سەر دەستنیشانکردنی چارەسەریش بۆ گرفتەکان و بەرفراوانی هەڵمەتێکی کۆکردنەوەی کۆمەک، ئەم حاڵەتانەش زۆرجار بوونەتە مایەی سەرسوڕمان[١٢].

**چوارەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تێڕوانین و پێداچوونەوە:**

ئەم جۆرە تۆڕە کۆمەڵایەتییانە زیاتر کەسانی پسپۆڕی بوارە دیاریکراوەکان بەکاری دەهێنن، بۆنموونە کەسێک گرفتێکی هەبێت لە تۆڕەکەدا باسی دەکات و لەوێوە داوای هاوکاری دەکات، ئەو پرسە بە زۆرترین ئەندامانی نێو ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە دەگات و لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵاتەوە دەیان پێشنیازی پێدەگات و خاوەن کێشەکە خۆی سەرپشکە لە دەستنیشانکردنی باشترین جۆری چارەسەری. هەرچی لایەنی بازرگانیشە لەم ماڵپەڕانەدا فەرامۆش نەکراوە، بۆنموونە کەسێک ئامێرێک دەکڕێت دەیەوێت بزانێت چۆنە و چۆن کاردەکات، ئەوا دەپرسێ کێ پێشتر کڕیویەتی یان لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی کامانەن. بەو هۆیەشەوە دەتوانێت بڕیاری تەواو بۆ کڕین یان نەکڕینی ئەو ئامێرە بدات[١٣].

**پێنجەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بە یاریکردن و کات بەسەربردن[١٤]:**

ئەم تۆڕانە کاریان تەنها هێنانە ئارای ئامراز و پرۆگرامەکانی کات بەسەربردنە، بیرۆکەی پشت ئەم پرۆژانە سوودی داراییە، چونکە ئەو یاری و پرۆگرامانەی کات بەسەربردن وێڕای ئەندامبوون تێیدا، بەڵام یاریکردن و بەشداریکردن لە پرۆگرامەکان بە خۆڕایی نییە.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەوانەی بەشداری لەو یارییانەدا دەکەن ئەوانیش قازانجی ماددی دەکەن، چونکە ئەو یارییانەی کە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێت زیاتر بە گرووپ دەکرێت و یاریکەر بە کۆکردنەوەی زۆرترین خاڵەکانی یارییەکە زۆرترین قازانج کۆدەکاتەوە[١٥].

لەم ماڵپەڕانەدا زیاتر جیهانی خەیاڵی (Virtual worlds) بۆ بەکارهێنەران دەهێننە کایەوە، بۆیە ئەوانەی کە مامەڵە لەگەڵ ئەم ماڵپەڕانە دەکەن لە جیهانی راستی بینین دەردەچن و دەچنە خەیاڵبینیی کەسێتی خۆیانەوە و کەمترین ئاگایان لە دەوروبەریانە[١٦].

**ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانەی لە کوردستان زۆرترین بەکارهێنەریان هەیە :**

**یەکەم: فەیسبووک** Face book [17]: فراوانترین تۆڕی کۆمەڵایەتییە لە سەرانسەری جیهاندا، بەشداربووانی ئەم تۆڕە هەموو جۆرە کەسێک و لە هەموو شوێنێکن، لە ڕێگەی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییەوە وێنە و نووسین و ڤیدیۆ و گفتوگۆی نێوان هاوڕێیان و ڕادەربڕین و دەستخۆشیکردن ئەنجام دەدرێت[18].

ئەم ماڵپەڕە لە ساڵی ٢٠٠٤ لەلایەن مارک زوگربێرگ و دوو قوتابیی هاوڕێیەوە بەناوەکانی (داستین مۆسکۆفیتز و کریس هیوز) دامەزراوە. لە سەرەتادا ئەم تۆڕە بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی قوتابیان و ئاڵوگۆڕی پرسیارەکانی یەکتری و ئاگاداربوون لە وانەکان دامەزرا، بەڵام لەماوەیەکی زۆر کەمتر لە ١٠٠ ڕۆژ سەرجەم زانکۆکانی ئەمریکای گرتەوە و لەماوەی کەمتر لە ٢ ساڵیشدا سەرانسەری جیهانی گرتەوە. لە هەرێمی کوردستانیش زۆرترین خەڵک بە هەموو چین و توێژەکانییەوە تێیدا ئەندامن[19].

ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە زۆرترین کاریگەرییەکانی خۆی دەرخست کاتێک شۆڕشەکانی وڵاتانی عەرەبی ناسراو بە (بەهاری عەرەبی) و دەتوانرا زۆر بە ئاسانی کار لەسەر تاکی عەرەبی بکرێت، بۆیە دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەو وڵاتانە زوو پەنایان دەبرد بۆ قەدەغەکردنی فەیسبووک[20].

سەرباری باشییەکانی، فەیسبووک کێشەی گەورەی بریتییە لە ئاسانی هاککردنی بەشداربووان، چونکە ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە گرەنتی پاراستنی نییە و دەتوانرێت بە ئاسانی هاک بکرێت.

**دووەم: ڤایبەر**Viber: پرۆگرامێکی پەیوەندیی دەنگ و ڕەنگییە، تەنها لەبەر موبایلە زیرەکەکان و ئێستاش لەسەر کۆمپیوتەرە خاوەن تایبەتمەندییە بەرزەکان کاری پێدەکرێت و هەر کەسێک دەتوانێت بە خۆڕایی تەنها بە بوونی هێڵی ئەنتەرنێت ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە بەکاربهێنێت[21]. مێژووی سەرهەڵدانی ڤایبەر دەگەڕێتەوە بۆ دیسەمبەری ساڵی ٢٠١٠ کە لە هەزار بەشداربووەوە دەستی پێکردووە و ئێستا لە

هەرێمی کوردستان ٪٩٥ی هەموو هەڵگرانی موبایلە زیرەکەکان بەشداری ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییەن[٢٢] تۆڕی کۆمەڵایەتی ڤایبەر لەلایەن کەسێکەوە بەناوی (تالمۆ مارکۆ)ی ئەمریکی بە رەگەز ئیسرائیلی دروستکراوە و ناوەندەکەی لە قوبرسی یۆنانییە و لە ساڵی ٢٠١٤وە کۆمپانیای راکۆتنی ژاپۆنی بە ٩٠٠ ملیۆن دۆلار بە کۆمپانیایەکی ئەمریکی فرۆشتوویەتی[٢٣].

**سێیەم: وەتسئاپ** WhatsApp تۆڕێکی پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە کە هەریەک لە جان کرۆم و بریان ئۆکتۆن لە ساڵی ٢٠٠٩وە دایانمەزراندووە و ڕۆژانە ملیۆنەها نامەی تێدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت لە ١٣ی ١١ی ٢٠١٣ دا راگەیەنرا کە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە ٢٧ ملیار نامەی تێدا ئاڵوگۆڕکراوە[٢٤] ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا بەشی زۆری بەکارهێنەرانی ئەو تۆڕە تەمەنیان لەنێوان ١٧ بۆ ٤٥ ساڵیدایە[٢٥].

**چوارەم: ئینستیگرام**Instagram : تۆڕێکی کۆمەڵایەتی گشتییە کە بەکارهێنەران دەتوانن تەنها یەک وێنە و نووسینێکی کەم یان ڤیدیۆیەک و نووسینێکی کەم بۆهەر جارێک بڵاوبکەنەوە، ئەو تۆڕە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠١٠ دامەزراوە و مانگانە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن وێنە و ٣٠ ملیۆن پارچە ڤیدیۆیی تێدا بڵاودەکرێتەوە. لە هەرێمی کوردستانیشدا بەشداربووانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە وێڕای ئەوەی بەشێکی زۆریان بەناوی خۆیان نییە، زۆرێکیش لە بەشداربووان تەمەنیان لە نێوان ١٥ بۆ ٣٥ ساڵیدایە[٢٦].

**پێنجەم: تویتە** Twitter[٢٧] تۆڕێکی کۆمەڵایەتییە بەمانای جریواندن دێت و بەشداربووانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە تەنها پەیامەکانیان پەخش دەکەن بەپێی ڕێژەی دیاریکراویش نابێت ئەو پەیامە لە (١٥٠) وشە زیاتربێت. ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە لە ساڵی ٢٠٠٧وە دامەزراوە و کۆمپانیای Odeoی ئەمریکی لە شاری هاوناوی خۆی سەرپەرشتی دەکات .

لە هەرێمی کوردستاندا بەکارهێنەرانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە ژمارەیان زۆر نییە و ئەوانەیشی تێیدا بەشدارن زۆرینەیان تەمەنیان لە نێوان ٢٥ بۆ ٦٠ ساڵیدایە و زۆربەی کەسایەتییە بەناوبانگەکانی کوردستانیش لاپەڕەیان لەو تۆڕەدا هەیە[٢٨]. دەتوانێت بۆ ئاگاداربوون لە

شـوێنی هاوڕێکانـت و پرسـیارکردن و ئاگـاداربوون لە ڕووداوەکـان و دەربڕینـی ڕای خـۆت لەبارەیـانەوە، هەروەهـا بـوونە هـاوڕێ لەگەڵ کەسایەتی و ڕێکخراوە جیهانییەکان سوودی لێوەربگریت.

لە دوای ئەوانیشـەوە بە شـێوەیەکی ڕاگـوزەر تـۆڕی کـۆمەڵایەتی یوتـوب لە پـلەی شەشـەمدایە لە کوردسـتان کە زۆرتـرین بەکـارهێنەری هەیە[٢٩].

**بەشی دووەم: هەرێمی کوردستان لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ تا ٢٠١٥:**

هەرێمی کوردستان تا ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ کۆمەڵگەیەکی نیمچە داخراوی ژێر گوشار بوو، لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە ناڕەوایەی بەرامبەر خەڵکی کوردستان پەیڕەو دەکرا کەمترین هۆکارەکانی پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکـان دەگەیشـتنە کوردسـتان[٣٠] ڕووخـانی ڕژێمـی بەعسـی بەیەکجاری لە عیراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، بووە هۆکارێک بۆ هاتنی دەیان کۆمپانیـای بیـانی لە سەرانسـەری جیهـانەوە بـۆ عیـراق بە گشـتی و کوردسـتان بە تـایبەتی، کۆمپانیـا زەبەلاحەکـانی تەکنۆلۆژیـاش هاوکـات لەگەڵ ئەم شـەپۆلی هـاتنی کۆمپانیایـانەدا گەیشـتن، ئەوەش بـووە هـۆی بەرزبوونەوەی ئاسـتی بەکارهێنـانی تەکنەلۆژیـا بە شـێوەیەکی فـراوان[٣١] هەروەک ئاماژەشـمان بـۆکرد بەهـۆی ئەو پەسـتانە (قەدەغەکـردن)ەی لە پێشـتردا هەبـوو خێرایـی بەکارهێنـانی تەکنەلۆژیاکـانی بـواری گەیانـدن لە ئەندازەی چاوەڕوانی تێپەڕین. بەشێوەیەک بەرهەمـی تـازەی کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژیا هەر دوای چەند ڕۆژێک دەگەیشتە کوردستان، ئەویش بە چەند هۆکارێکی کە:

١- کوردستان دەرگای بازرگانی عیراقی تازە بوو .

٢- پەیڕەوکردنی سیستمی بازاڕی ئازاد

٣ـ نەبـوونی سانسـۆری بازرگـانی (کـۆنترۆڵی جـۆری) و چـاودێری کۆمەڵایەتی[٣٢].

ئەم هۆکارانـە بـوونە هـۆی ئەوەی کە لە مـاوەیەکی زۆر کەمـدا خێزانەکـانی کوردسـتان لە هەمـان پـێگە جوگرافییەکـانی پێشـتردا بـۆ یەک بێنەوە و لە ناو یەک خێزاندا (تاک) لە یەک کاتدا خـاوەنی چەنـدان تەوەری

تەکنەلۆژیـــایی بێــت وەک (ســـەتەلایت، کۆمپیــوتەری لاپتــۆپ، موبایــل، ئامێرەکـانی یـاریکردن و .....هتـد) کە هەر ئەوەش وایکـرد دروشـمی (ئێمە جیهان بچووک دەکەینەوە)[*]ی کۆمپانیاکان بە تەواوی بچەسپێت هەر ئەو ئـامێرانە ئەوەنـدە داواکارییـان لەسـەر زۆر بـوو لە مـاوەی هەفتەیەکـدا هەزاران تۆنیان دەگەیشتنە کوردستان[٣٣].

**بەشی سێیەم: بڵاوبوونەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە کوردستان :**

ساڵی ٢٠٠٥ ساڵی وەرچەرخـانێکی خێرای کـۆمەڵگەی کوردسـتانی بوو لە هەرێمی کوردستاندا لە قۆناغی چەقبەستووەوە بۆ قۆناغی کرانەوە بە ڕووی بـازاڕی جیهانیـدا، هـاتنە سـەرپێی کۆمپانیاکـانی ئەنتەرنێت لەو ســاڵەدا و ســـەرەتای بڵاوبــوونەوەی ئەنتەرنێــت لە شـــار و گەڕەک و کۆڵانەکانــدا بەتــایبەتیش لە ڕێـــگەی ســـەنتەرەکانەوە، دەســـتپێکی ئەو گۆڕانکارییـانە بـوون کە دواتـر خـۆی لە ئەنتەرنێتـی بـێ تەل بینیـیەوە و پاشـــانیش لەگەڵ هـــاتنی موبـــایلە زیرەکەکـــان چـــووە نـــاو گیرفـــانی تاکەکانەوە[٣٤].

دامەزرانـــدنی کۆمپانیاکـــانی تەلەفـــۆنی گەڕۆک[٣٥] و کۆمپانیاکـــانی ئەنتەرنێت[٣٦] لەناو عیراق بە گشتی و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی زیاتر گــوڕ و تینــی بەخشـییە ئەو شـەپۆلانەی تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکـان بـڵاو دەکـاتەوە. لەلایەکـی دیکەشـــەوە کەناڵەکـانی تەلەفزیــۆنی نـاوخۆیی کە بەردەوام لە بەرنامەکانیانـدا باسـی پێشـکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیایـان دەکـرد بوونە هۆکارێکی بەهێز بۆ هەمان مەبەست[٣٧].

**تەوەری دووەم:**

**بەشی یەکەم: بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە کوردستان:**

تاوەکو ئێستا ئاماریکی وردی بەکـارهێنەرانی تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکـان لە کوردســــتاندا لەبەردەســــتدا نیــــیە، بەڵام ئەوەی کە لە ناوەنــــدە فەرمییەکانەوە ئاماژەی بۆ کراوە و کاری لەسەر کراوە بریتییە لە بوونی ڕێژەی بەرچـاوی ئافرەتـانی کوردسـتان لە نێو تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا[٣٨] بەپێی ئەو ئامـارانە بێت کە ڕێکخـراوە جیاوازەکـانی کوردسـتان دەیخەنە ڕوو ڕێژەی بەکارهێنەران لە کوردستاندا بەم شێوەیەیە:

١. پیاوان ڕێژەی ٤٢٪

٢. ئافرەتان ڕێژەی ٤٠٪

٣. منداڵان بە هەردوو ڕەگەزیانەوە ١٨٪ی بەکارهێنەران پێکدەهێنن. ئەم چینە زۆرتر جۆری پێنجەمی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تایبەت بە یاریکردن و کات بەسەربردن بەکاردەهێنن[٣٩].

٤ـ ٩٤٪ هەموو ئەوانەی ئافرەتن بەپێی پرۆفایلەکانیان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیان، بەناوێکی دیکە و بە وێنەی جیاواز لاپەڕەکانیان کردۆتەوە.

٥ـ ٨٤٪ هەموو ئەو ئافرەتانەی کە لاپەڕەیان هەیە وێنەکانی لاپەڕەکانیان وێنەی خەیاڵین.

٦ـ ٦٨٪ هەموو ئەو ئافرەتانەی ئەندامن لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەوانەن کە نەچوونەتە نێو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە.

٧ـ ٩٠٪ هەموو ئافرەتان کە ئەندامن لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، نووسینی (هونەری، ئامۆژگاری ئایینی، بابەتی ئەدەبی، وێنەی خەیاڵی، ...هتد) بڵاودەکەنەوە. تەنها ١٠٪یان نەبێت ئەو بابەتانە بڵاودەکەنەوە کە پەیوەستن بە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان وەک کاروچالاکی و بیروبۆچوونی خۆیان[٤٠].

**بەشی دووەم: دەرکەوتنی کاریگەرییە نەرێنییەکان لەسەر ئافرەتانی کوردستان.**

بڵاو بوونەوەی هێڵەکانی ئەنتەرنێت و پاشانیش هاتنیان بۆ نێو گیرفان و جانتاکانی هاوڵاتیان لە ڕێگەی موبایلە زیرەکەکانەوە، سەرەتا وەک مۆدێلێک دەرکەوتن[٤١] دانانی لاپەڕ (ئەکاونت)ەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرەتادا وەک مۆدێلێک سەریان هەڵدا و بووە باو، دوای ئەو بڵاوبوونەوە بێسنوور و دوور لە هۆشیاریی تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردستانی[٤٢] ئینجا پەیتا پەیتا کاریگەرییە نەرێنییەکانی لەسەر تاکەکان دەرکەوتن بەتایبەتیش لەسەر ئافرەتانی کوردستان، ئەو ئافرەتانە بەهۆی دەستخۆشی (Like) کردن یان نووسینی بۆچوون(Comment) ێک لە پۆست و بڵاوکراوەی کەسێکی نەناسیاو یاوەخود بردنی وێنەکانیان لەلایەن کەسانی بێگانەوە، تووشی چەندان گرفت هاتن ئامارەکانی ساڵی

٢٠١٠ ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن بەراورد لەگەڵ ساڵی ٢٠٠٩ چۆن ڕووداوەکان ڕوویان لە زیادبوون کردووە هەروەک لە تەوەری چوارەمی هەمان ئەم بەشەدا ئاماژەمان بۆ کردووە.

**بەشی سێیەم: لێکەوتەی کاریگەرییەکان و شێوازەکانی زیان گەیاندن بە بەکارهێنەران:**

بەپێی ئەو ئامارانەی کە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان ئاماژەی بۆ کردووە یەکەم لێکەوتەی نەرێنی کاریگەرییەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق و تۆمارکردنی سکاڵا لە لایەن ئافرەتانەوە لە سەر پیاوان ئەویش بەهۆی تەشەنەکردنی لێدان بە پلەی یەکەم دێ [٤٣] دوای ئەوە تەشەنەکردنی دیاردە نەشیاوەکانی زوو بە شوودانی کچان و بڵاوبوونەوەی ناپاساییانەی گفتوگۆی نێوان دوو هاوڕێ لە ڕەگەزی جیاواز و نووسینی کۆمێنتی نەشیاو بۆ لاپەڕەی ئافرەتان وەک شێوازێک لە مۆدێلی تازە سەرهەڵداوی ناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا ڕەنگی دایەوە[٤٤].

**بەهۆی ئەو فراوانییەش لە بەکارهێنانەدا شێوازەکانی زیان گەیاندن جیاوازتر دەرکەوتن وەک:**

**یەکەم: هەڵخەڵەتاندن:** لە زووەوە وا باوە کەسانی سادە زوو هەڵدەخەڵەتێن، ئەمەش بەهۆی مامەڵەکردنیان لەگەڵ پێداویستییەکانی ژیان و ڕوانینیان بۆ پێداویستییەکان و چۆنییەتی دابینکردنیان هەروەک دیارە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا پروپاگەندەکان بە شێوەیەک نەخشێنراون کەسانی سادە بە کەمترین کات هەڵدەخەڵەتێنێت، دەیانکات بە قوربانی مەرامە داڕێژراوە ئامانجدارەکانی خۆیان، بۆنموونە بانگهێشتکردن بۆ کردنەوەی ئەکاونت (لاپەڕە)ی بانکی و بەشداریکردن لە گەشتێکی کەم نرخ وادەکات کەسانێک کە خەون بەو جۆرە پێشهاتانەوە دەبینن زوو بەرەو پێشوازییانەوە دەچن و پاشانیش لێی ڕزگار نابن[٤٥].

لە هەرێمـی کوردسـتاندا ئەوەی زۆر بـاوە ئەوەیە دەیـان لاپەڕەی فەیسبووک هەیە بەناوی کچانەوە و وێنەی کچان بڵاودەکەنەوە بەڵام ئەو لاپەڕانە کۆمەڵێـک کـوڕن و ئەو کـارە دەکەن و زۆربەی ئافرەتـانیش بـۆ وەرگـرتن و ئـاڵوگۆڕی بۆچـوونی جیـاواز، تێیـدا دەبـنە هـاوڕێ و بەو هۆیەشەوە وێنە و نووسین ئاڵوگۆڕ دەکەن و سەرەنجام کێشە دروست دەبێـت چـونکە بەشـێک لەو وێنـانە بڵاودەبـنەوە، ئەوەش دەبێـتە هـۆی دروستبوونی چەندان کێشەی دیکە.

**دووەم: زۆرداری:** ئەو جۆرە کارانە زیاتر لەنێو چینی هەرزەکاراندا بـوونی هەیە، کاتێـک کۆمەڵێـک هەسـت بە هەڵەی یەکێـک دەکەن، ئەوا بەسەریەوە دەکەن بە هەڵا و دواتریش ڕێنمایی دەکەن بۆ ئەوەی کارێک بکات لە بری بێدەنگکردنیان، بۆیە هەموو ڕێکارێک ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە بڵاونەبێتەوە، زۆرجاریش ئەوانەی دەکەونە ئەو داوەوە بڕیـاری خۆکوشـتن دەدەن و بەوهۆیەشـەوە بەشـی تـایبەت لە هۆبەکـانی پۆلیسـدا بـۆ ئەو کێشـانە کـراوەتەوە. لە هەرێمـی کوردسـتاندا زۆرجـاران ئافرەتان بە پەیوەندییەکی سادە تێدەپەڕێت بۆ پەیوەندییەکی پتەو وێنە و زانیـاریی تـایبەتی و نـاوخۆیی خێـزانەکەی بـۆ بەرامـبەر ئاشـکرا دەکـات، دواتریش ئەوکەسەی زانیارییەکانی لایە داوای پارە دەکات یان هەڕەشـەی خۆتەسلیمکردنی لێدەکات[٤٦].

**سێیەم: ڕاونـان:** ئەوەش جۆرێکی دیکەیە کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە هۆکارێک بۆ بەرفراوانبوونی تاوانەکان، هەندێک باندی دزیکردن لە ڕێگەی ئەو تۆڕانەوە دەتوانن زۆر بە ئاسانی شوێنپێی ئەو کەسانە دیاری بکەن کە دەیانەوێت دزییان لێ بکەن یان تاوانێکیان بەرامبەر بکەن[٤٧].

**چـوارەم: دزینـی بەرهەمـی ئەدەبی:** بەهـۆی هـاککردنی ئیمێل یـان لاپەڕەی تــایبەتی فەیســبووکەوە زۆرجــاران کەســایەتییە ئەدەبــی و ڕۆشـنبیری و سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکـان، تووشـی گرفتـی گەورە دەبـن، چـونکە لە ڕێگەی ئەو ئیمێڵ و لاپەڕە تایبەتییـانەوە کە هـاک کـراوە، زۆر بـابەتی جیـاواز بڵاودەبنەوە کە ئەوان ئاگـادارنین، لە هەرێمـی کوردسـتاندا وێـڕای ئەوەی کە پۆسـت و لاپەڕە و ئیمێـڵ بەنـاوی زۆر کەسـایەتییەوە

دانراوە، هەندێکجاریش دیاردەی هاککردنی فەیسبووکەکان کێشەی خێزانی زۆری ناوەتەوە و بەدەیان پۆست و وێنەی تێدا بڵاوکراوەتەوە کە کەسی خاوەنی ڕاستەقینەی لاپەڕەکە ئاگاداری نییە[٤٨].

**پێنجەم ناوزڕاندن:** باوترین ئەو شێوازانەی کە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەنجام دەدرێت ناوزڕاندنە بەتایبەتی لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چونکە نە هیچ یاسایەک ڕێیان لێدەگرێت نە هیچ هۆکارێک هەیە بۆ ڕۆشنکردنەوەی بیری ئەوانەی ئەو کارە دەکەن، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە لەوانەش: (چاو پێهەڵنەهاتن و کێبڕکێیە) ئەو جۆرانەش چەندان شێوازی دیکەیان هەیە کە هەریەک بنەما و مەبەستی تایبەتی خۆی لە دواوەیە. بۆنموونە ئەو چاو پێهەڵنەهاتنە دەکرێت جۆرێک لە جەنگی دەروونی بێت، یان شکاندنی کەسایەتییەکی تایبەتی دیاریکراو بێت، یان کەسێکی کۆمەڵایەتی بێت کە تا ئەو کاتە هیچ هەوڵێکیان سەرکەوتوو نەبووە بۆ شکاندنی. هەرچی کێبڕکێیە ئەوەش لە نێوان کەس و کۆمپانیا و وڵاتانیشدا دەکرێت و ئەمانجی جۆراوجۆر لە خۆی دەگرێت، ئەوەی مایەی تێڕامانە لەو ململانێیە ئەوەی زۆرترین قازانجی دەست دەکەوێت هاککەرەکانن، و لە یارییەکەدا تا دەرکەوتنی دەرەنجامەکان بە هیچ جۆرێک براوەکان دیارنابن[٤٩].

**شەشەم: بێزارکردن و وروژاندن:** ئەم جۆرە بێزارکردنە زۆر ترسناکترە لە بێزارکردنی ئاسایی و ڕاستەوخۆ، ئەو کردارەش بە زۆری لەلایەن کەسانی کەم ئەزموونەوە ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەش وا باشە هەرزوو لایەنی پەیوەندیدار ئاگادار بکرێتەوە تاوەکو ڕێکاری یاسایی لە دژیان بگیرێتە بەر[٥٠].

دیارە ئەوانەی خەڵکی بێزاردەکەن لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە بە دوو شێواز ئەنجامی دەدەن یان ناردنی بەردەوامی نامەی داواکارییە بۆ هاوڕێیەتی یان ناردنی زانیاریی تایبەتی کەسێکە بۆ هەموو ئەو هاوڕێیانەی هەیەتی لەو نامانەدا کە زانیارییەکان دەنێرێت خاڵە لاوازەکانی کەسەکە بەزەقی باس دەکات و چەندان قسەی هەڵبەستراوی دەخاتە پشت، هەروەها خاڵە بەهێزەکانی دەشارێتەوە هەوڵی وێناکردنی وێنەیەکی ناشایستەی ئەو کەسە دەدات لەنێو دەوروبەرەکەیدا.

**بەشی چوارەم: ئامارە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان**

ئەو ئامارانەی لەبەردەستدان دوو شێوازی جیاوازیان هەیە یەکێکیان ناوخۆیی و ئەویتریان جیهانین، کە هیچکامێکیان مایەی دڵخۆشی نین و لێرەدا بەپێی سەرچاوەکان ژمارەکانیان دەخەینە ڕوو:

**یەکەم: ئامارە نێودەوڵەتییەکان**(٥١): بەپێی دوایین ڕاپۆرتی ڕێکخراوی Global digital statistitcs کە ساڵانە ئامارەکانی بڵاودەکاتەوە ٣٥٪ی دانیشتوانی گۆی زەوی کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن کە دەکاتە ٢ ملیار و نیو مرۆڤ لەو ڕێژەیەش ٢٥٪یان بۆ بەشداریکردنە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ٤٣٪ی بەکارهێنەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان مێینە و٤٧٪یان نێرینەن، بەپێی هەڵسەنگاندنی یەکێتی نێودەوڵەتی گەیاندن (ICU)(٥٢) ساڵانە ١٥٠ ملیۆن بەکارهێنەری کارا (ئەکتیڤ) خۆیان تۆمار دەکەن. هاوڵاتییە ئەمریکاییەکان٨١٪ و هاوڵاتیانی خۆرئاوای ئەوروپا ٧٨٪ و هاوڵاتیانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ٤٨٪ و هاوڵاتیانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ٣٧٪ و هاوڵاتیانی وڵاتانی ئەفریقا ١٨٪ کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن. نزیکەی ملیارێک و ٨٠٠ ملیۆن هاوڵاتی لەسەرانسەری جیهان بەشدارن لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک، هەروەها تۆڕی کۆمەڵایەتی (QQ) ٨١٦ ملیۆن بەکارهێنەر و (واتسئاپ)یش ٤٠٠ ملیۆن بەکارهێنەری هەیە. بە گشتی تەمەنی ٨٦٪ بەشداربووان لە نێوان ١٧ بۆ ٢٥ ساڵاندایە ئەم توێژەش زیاتر بۆ کات بەسەربردن و هاوڕێ گرتن تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن، ٨٨٪ی هەموو بەکارهێنەرانی تۆڕی گوگڵ تەمەنیان لە نێوان ٥٥ بۆ ٦٥ ساڵیدایە(٥٣). کە لە ڕێگەی ئەو تۆڕەوە بەدوای کاردا دەگەڕێن و پێداویستی ڕۆژانەیان پڕدەکەنەوە و زانیاری لەو بوارە کۆدەکەنەوە کە مەبەستیانە، هەر ئەم ئامارە دەریخستووە کە هەر چرکەیەک دوو بەکارهێنەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان زیاد دەکات، بۆیە ٥٤٪ی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی جیهان لەکاتی دەوامی فەرمیدا بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیان قەدەغەکردووە، چونکە بۆیان دەرکەوتووە کە هۆکاری کەمبوونەوەی بەرهەم بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە لەکاتی دەوامی فەرمیدا، ڕۆژانە هەر بەکارهێنەرێک ٢٠ خولەک بەدیار کۆمپیوتەر و

مۆبایلە زیرەكەكانەوە كات بەسەر دەبات[٥٤]، هەر چركەیەک ٢٩٣ هەزار كۆمێنت لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكاندا دەنووسرێت، ئامارەكە ئەوەیشی خستۆتە ڕوو كە لە هەر ٤٠ خولەكێک تاوانێک لە فەیسبووكدا ئەنجام دەدرێت[٥٥]، هەروەها ئەو شوێنەی كە زۆرترین بەكارهێنەر تێیدا ئەكتیڤن ٦٦٪یان بەرامبەر تەلەفزیۆن دانیشتوون و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان بەكاردەهێنن و ٣٦٪ی بەكارهێنەران لە توالێتەكانیش سەیری تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان دەكەن[٥٦].

**دووەم ئامارە ناوخۆییەكان[٥٧]:**

ئاماری توندوتیژیەكانی دژی ئافرەتان لە هەرێمی كوردستان ساڵی ٢٠٠٩ ئاماژە بە چەند ژمارەیەک دەكەن كە لە خشتەی ژمارە (١)دا دیارە:

| شوێن | ساڵ | ئەشكەنجە | سكاڵا | سووتان | كوشتن | سێكسی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | 2009 | 249 | 1108 | 151 | 37 | 46 |
| دهۆک | 2009 | -- | 486 | 75 | 19 | 13 |
| سلێمانی و گەرمیان | 2009 | -- | 1158 | 188 | 29 | 69 |

**خشتەی ژمارە (١)**

دوای ئەوەی كە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان تەشەنەی زیاتر دەكەن و بەكارهێنەریان لە كوردستان زیاتر دەبێت ئامارەكانی ساڵی ٢٠١٢ بەرەو سەر هەڵدەكشێن هەروەک لە خشتەی ژمارە (٢)دا هاتووە:

| شوێن | سێكسی | سكاڵا | ئەشكەنجە | خۆسووتاندن | سووتان | خۆكوشتن | كوشتن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | 22 | 1213 | 112 | 45 | 114 | 9 | 22 |
| دهۆک | 31 | 701 | -- | 25 | 35 | 10 | 9 |
| سلێمانی | 108 | 1241 | 444 | 30 | 76 | 15 | 10 |
| گەرمیان | 9 | 234 | 135 | 5 | 28 | 5 | 5 |
| كۆی گشتی | 170 | 3389 | 691 | 105 | 253 | 39 | 46 |

**خشتەی ژمارە (٢)**

لە ساڵی ٢٠١٣دا بەهۆی بەرزبوونەوەی داهاتی تاک لە هەرێمی کوردستان و بوونی زۆرترین ڕێژەی کارکردن جارێکی دیکە ئامارەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت چونکە هاووڵاتییانی کوردستان بەشێکی دیاری داهاتەکانیان بۆ کات بەسەربردن بەکار دەهێنا(٥٨). ئەوەش زیاتر لە خشتەی ژمارە (٣)دا دیارە کە تایبەتە بە ئامارەکانی ساڵی ٢٠١٣:

| شوێن | کوشتن | خۆکوشتن | سووتان | خۆسووتاندن | سکاڵا | سێکسی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | ٢٨ | ١٥ | ١٠٠ | ٤٦ | ١٥٤٨ | ٨ |
| دهۆک | ١١ | ٧ | ٢٥ | ٣٣ | ١٢٢٥ | ٢٨ |
| سلێمانی | ٤ | ٨ | ٥٧ | ٢١ | ١١٠٧ | ٧٣ |
| گەرمیان | ٦ | ٥ | ٢٥ | ٧ | ٥٠٦ | ٧ |
| ڕاپەڕین | ١ | ١ | ٢٩ | ٦ | ٣٤٩ | ٢٢ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٣٦ | ٢٣٦ | ١١٣ | ٤٧٣٥ | ١٣٨ |

**خشتەی ژمارە (٣)**

ئەگەر بەراوردی مانگەکان بکەین سەیر دەکەین لەوێشدا گۆڕانکارییەکان هەست پێکراون هەروەک لە خشتەی ژمارە (٤)دا کە بەراوردی مانگی (٦) ساڵی ٢٠١٤ و هەمان مانگی ساڵی ٢٠١٥ و ساڵی ٢٠١٦ کراوە:

| | هەولێر | | | دهۆک | | | سلێمانی | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٦ ٢٠١٤ | ٦ ٢٠١٥ | ٦ ٢٠١٦ | ٦ ٢٠١٤ | ٦ ٢٠١٥ | ٦ ٢٠١٦ | ٦ ٢٠١٤ | ٦ ٢٠١٥ | ٦ ٢٠١٦ |
| کوشتن | ١ | ٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢ | ٠ | ١ | ٠ |
| خۆکوشتن | ٢ | ١ | ٣ | ٠ | ١ | ٢ | ١ | ٠ | ٢ |
| سووتان | ٦ | ٨ | ٥ | ٠ | ٣ | ٠ | ٢ | ٤ | ١ |
| خۆسووتاندن | ١ | ٣ | ١ | ١ | ١ | ٢ | ٢ | ١ | ٠ |
| سێکس | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣ | ٦ | ٨ | ٢ | ٠ |
| سکاڵا | ٢٤٩ | ٢٤٩ | ٢٢١ | ١٣٤ | ٢٠٤ | ١٧٣ | ١٠٧ | ١٠٠ | ٥٤ |

**خشتەی ژمارە (٤)**

**تەوەری سێیەم:**

**بەشی یەکەم: بەریەککەوتنی حەزی بەکارهێنان و یاسا:**

ئەوە تەنها تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان نین کە کێشەیان بۆ بنکەکانی پۆلیس و دام و دەزگاکانی حکومەت زیاد کردووە، بەڵکو ئەوە سەرتاپای تەکنەلۆژیای ئەنتەرنێتە کە بۆتە هۆکارێکی سەرەکی لە تاواندا[٥٩]، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و پاشانیش بانکی ئەلیکترۆنی و مامەڵەی ئەلیکترۆنی و ئیمزای ئەلیکترۆنی و حکومەتی ئەلیکترۆنی بەشێکی دیکەن لەو کێشانەی کە تاوەکو ئێستا بەهۆی کەم تەمەنییانەوە یاسایەکی تۆکمە لە دژی تاوانبارانیان بوونی نییە. بۆیەش کاتێک کێشەیەک لەو بارەیەوە ڕوو دەدات بەدوو یاسای جیاواز بەرەنگاری دەبنەوە:

١- **یاسا کۆنەکان:** ئەو وڵاتانەی کە سیستمیان دکتاتۆرییە، کاتێک هەست دەکەن تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەوان بەکاردێت، بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان قەدەغە دەکەن یان چاودێریی چڕی دەخەنەسەر[٦٠].

٢- وڵاتانێکی وەک ئەمریکا و ئەوروپا و کۆریای باشوور و سەنگافورە و مالیزیا و ژاپۆن، بۆ ڕێگری لە تاوانی ئەلیکترۆنی یاسای تایبەتییان بۆ دەرکردووە و لە یەکەکانی پۆلیسیشدا هۆبەی چارەسەری ئەلیکترۆنی دروستکراوە و ئەو ئەفسەرانەی لەوێدا کاردەکەن دەرچووی بەشی تەکنەلۆژیای زانیارییەکانن و چەندان خولی ڕاهێنانیان لە بوارە جیاوازەکاندا بینیوە و ئاسانکاریی تەواویش خراوەتە بەردەست بۆ دۆزینەوەی تاوانباران لە هەر شوێنێک بن[٦١].

لە هەرێمی کوردستاندا لە ساڵی ٢٠٠٨دا پەرلەمانی کوردستان یاسای ژمارە ٦ی تایبەت بە (قەدەغەکردنی خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن)[٦٢] ی پەسەندکرد کە چەند ڕێکارێکی تێدا دەستنیشانکراوە بۆ ئەوەی هەر بەکارهێنەرێکی ئەو ئامێرانە بۆ دەربازبوون لەو کێشانەی تێی دەکەون، لە ڕێگەی یاساییەوە بتوانن خۆیان رزگاربکەن[٦٣] لەگەڵ ئەوەی لە یاساکەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە نابێ شکۆی تایبەتمەندییەکانی تەلەفۆنی و پەیوەندییە پۆستەیی و ئەلیکترۆنییەکان بشکێنرێت[٦٤].

**بەشی دووەم: پێشنیاز و ڕاسپاردەکان:**

١- بە وردی بڕوانــرێتە ئەو پەیــج و ئەکاونــت و لاپەڕانەی تــۆڕە کۆمەڵایەتییەکــان کە داوای هاوکــاری دەکەن پێویســتە بەکــارهێنەر دوای ئەوەی لێیان دڵنیا دەبێت ئینجا لایک و کۆمێنتیان بکات.

٢- هەر نووسینێک گرنگ بوو دوو جار بخوێنرێتەوە ئینجا لایک و کۆمێنت بکرێت وا باشترە لە ڕێگەی ماڵپەڕە جیهانییەکانی وەک (گوگڵ – یاهو – مای وای)یەوە بۆی بگەڕێین دوای دڵنیابوون لە ڕاستییەکەی ئینجا لایک و کۆمێنت بکرێن.

٣- ئاگاداربوون لە جۆریەتی و هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە نامە و پەیامە ڤیدیۆیی و دەنگییە سەرنج ڕاکێشەکان دەنێرن، چونکە ئەوان لە دوای هەڵەیەک دەگەڕێــن و دەیانەوێــت وەرگــر بکەوێــتە ئەو داوەوە کە ناویانەتەوە.

٤- پێنەدانــی ژمــارەی ئەکاونــت و ناوونیشــانی تــایبەتی کەســێتی لە نامەی ئەو لاپەڕانەی کە پڕوپاگەندەی بازرگانی و قازانجکردن دەکەن، بەو هـۆیەوە تـاوەکو ئێسـتا چەنـدین کەس لە جیهانـدا تووشـی مـایەپووچبوون هاتوون[٦٥].

٥- خۆ دوور گرتن لە بەرنامەکانی کێبڕکێ و بەربەرەکانێ.

٦- وەرنەگرتنــی هــیچ دیــارییەک لە بەرامــبەر هەر زانیــارییەکی بچــووکیش بێــت، چــونکە ئەمەش زۆر گرفتــی دیــکەی بــۆ بەشــداربووان دروست کردووە.

٧- گرتنە بەری هەموو ڕێگاکانی خۆ پاراستن و نەهێشتنەوەی هیچ گریمانەیەک.

٨- هاککەرەکان لە دوای بچووکترین هەڵە دەگەڕێن کە بەشداربووان دەیکەن، بۆیە ئاگاداری ئەوەبە و بە وشیارانە مامەڵە بکە و ئامێرەکان بە هەستیارییەوە بەکار بهێنە و لە هیچ شوێنێک فەرامۆشیان مەکە.

٩- کــردنەوەی ئەکاونــت و ئیمێــل و پەیــج و لاپەڕەکــان لە تــۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تەنها لەسەر ئەو کۆمپیوتەر و موبایلانە بێت کە بەردەوام تەنهــا خــۆت بەکــاری دەهێنیــت. هەوڵــیش بــدە ئەو کۆمپیــوتەر و موبــایلە

زیرەکەی بەکاری دەهێنیت ژمارەیەکی نهێنیی تۆکمەی لەسەر هەبێت، هیچ کەسێک نەتوانێت بیکاتەوە.

١٠- هەر پرۆگرامێک کە زۆر گرنگ و پێویست نەبێت وا باشە نەخرێتە ناو کۆمپیوتەر و موبایلەکەتەوە و هەرگیز شتێک وەرنەگیرێت کە پێویست نەبێت، بەرنامەکانی (بلوتوز – شێر- پۆپیل) یان نەکرێتەوە ئەگەر کرانەوە، دواتر دڵنیابین لە داخرانیان.

**ئەنجام**

لە ئەنجامی ئەم تۆژینەوەیە و بەراوردی ئەو ئامار و بۆچوونە جیاوازانەی خراونەتە ڕوو بۆمان دەردەکەوێت کە :

١- کەمی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و یاسایی و زانستی بۆ بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هۆکاری سەرەکیی زۆرینەی توندوتیژییەکانی ئەم دواییانەی کۆمەڵگەی هەرێمی کوردستانن .

٢- هێشتا زۆرینەی تاکی کوردستانی بەکارهێنەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە گرنگیی پەیامەکان نەگەیشتوون.

٣- زۆرینەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ڕێوشوێنی توند و تۆڵیان نییە بۆ ڕێگریکردن لە هاککردن و ڕێگریکردن لە دزەکردنی زانیارییە کەسییەکان.

٤- لە کوردستاندا دەزگا دادوەرییەکان لاوازن بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی یاسای خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی گواستنەوە بۆ سزادانی تاوانباران.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

(١) بەیاد حسێن: مێژووی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، سلێمانی، خانەی چاپ، ٢٠١٤، ل٨٦.

(٢) کاروان ئەحمەد: سوودی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بۆ سیستمی پەروەردە، لێکۆڵینەوەی تیۆری ل٨.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١.

(٤) https://ar.wikipedia.org-12/3/2016

(٥) فهد محمد بندر: توضيح عن الشبكات الاجتماعية، عمان، مطبعة ابولؤ، سنة ٢٠٠٦، ص١١٢.

(٦) قانون الحاسوب والأمن تقرير المجلد (٢) العدد (٢)، ٢٠٠٦، ص١٢٧-١٣٦.

(٧) ڕێبوار عەزیز ڕەمەزان، تایبەتمەندی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان: خەبات، (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٤٨٧٩)، ٢٠١٥/٩/١٠، ل٨.

(٨) **شبكة التعاون والأنشطة الثقافية: وزارة الشؤون الخارجية – ٢٠١٧ .**

(٩) زهرة الخليج، مجلة، ١٩/أب/٢٠٠٦، العدد ١٤٣٠، ص١٢٢.

(١٠) Networkset: مجلة العربية التخصصية، العدد ٤ – تموز ٢٠١٠، ص١٥

(١١) بەیاد حسێن: مێژووی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، سلێمانی، خانەی چاپ، ٢٠١٤، ل٤٦.

(١٢) نورا باسم جزيري، مقارنة صيغ الكتب الإلكترونية، مصر، اسكندرية، ٢٠١٢، ص١٩٥.

(١٣) کاروان ئەحمەد بایز، ئامرازەکانی بازاڕکاری، بازرگانی سەردەم، (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٩٤)، ٢٠١٦، لاپەڕە ٦.

(١٤) سەعید کامەلا: Sportmagazin.net، ماڵپەڕ، بیروڕا، ٢٠٠٩/٢/١٨.

(١٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە لاپەڕەی (لێرە یاری بکە) لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک، ئەم لاپەڕەیە تایبەتە بە یاری پۆکەر کە بەشێوەی ئەلیکترۆنی ئەنجام دەدرێت.

(١٦) شنۆ محەمەد: وێنەگەری و ئاڵۆزانی خەیاڵ، وتار، مەخموور، ڕۆژنامە، ژمارە (٥٨) لە٢٠١٣/٩/١، لاپەڕە ٦.

(١٧) www.Face book.com تۆڕێکی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی فراوانە، کە بە چوارەم دەوڵەتی جیهان دادەنرێت لە ڕووی ژمارەی ئەندامانییەوە.

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٩) ڕێکخراوی کۆمەڵ بۆ پرسە کۆمەڵایەتییەکان: ڕاپۆرتی ساڵی ٢٠١٥، ل١٧.

(٢٠) سمکۆ محەمەد: پۆلیس لە دژی تەکنەلۆژیا، وتار، (ئاڵای ئازادی)، ژمارە (٨٣٧) لە ٢٠١٢/٢/٨ ل٤.

(21) Viber - Free calls, text and picture sharing with anyone, anywhere ! (www.Viber.com)

(٢٢) دەستەی پەیوەندییەکانی کوردستان/ ڕێکخراو، ڕاپرسییەک لەبارەی پەیوەندییە گشتییەکان و تۆڕەکانی کۆمەڵایەتی، ساڵی ٢٠١٣، ل٢.
(٢٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ماڵپەڕی ویکیپیدیا www.wikipedia.org، بە زمانی عەرەبی (فایبر).
(٢٤) www.googl.com WhatsApp.
(٢٥) دەستەی پەیوەندییەکانی کوردستان/ ڕێکخراو، ڕاپرسییەک لەبارەی پەیوەندییە گشتییەکان و تۆڕەکانی کۆمەڵایەتی، ساڵی ٢٠١٣، ل٥.
(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥.
(٢٧) www.googl.com Twitter.
(٢٨) دەستەی پەیوەندییەکانی کوردستان/ ڕێکخراو، ڕاپرسیەک لەبارەی پەیوەندییە گشتییەکان و تۆڕەکانی کۆمەڵایەتی، ساڵی ٢٠١٣، ل٦
(٢٩) یوتیوب YouTube تۆڕێکی کۆمەڵایەتی تایبەتە بە بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆ و دەنگ، کە هەموو بەکارهێنەرێکی ئەنتەرنێت لە سەرانسەری جیهان دەتوانن سەردانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە بکەن و بە کەمترین ماوە و بە خێراترین شێواز پرۆسەی خۆتۆمارکردن ئەنجام دەدرێت و دواتر بەکارهێنەر دەتوانێت سەیری هەر ڤیدیۆیەک بکات کە مەبەستییەتی. ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە لە لایەن سێ کەسەوە بەناوەکانی چارد هێرلی و ستیڤن چین و جاود کەریم لە شاری سان پۆرنۆی کالیفۆرنیا لە ساڵی ٢٠٠٦ەوە دامەزراوە و بەپێی ئەو ئامارانەی بەردەوام ئەو تۆڕە بڵاوی دەکاتەوە تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٦ زیاتر لە ١٠٠ ملیار گرتە ڤیدیۆیی و دەنگی تێدا بڵاوکراوەتەوە کە ماوەکانیان لە نێوان یەک چرکە تا ١٠ سەعاتدایە.
(٣٠) سیروان محێدین بابان: کوردستان لەنێوان بەرداشی دوو قەیراندا، چاپی یەکەم، سلێمانی چاپخانەی حەمدی، ساڵی ٢٠٠٦، ل١٨٨-١٩٤.
(٣١) ڕاگەیاندن: گۆڤار، ژمارە (١٤)ی ساڵی چوارەم، ٢٠٠٧، هەولێر، ل٣٢، بەشێکی کورت لە ڕاگەیەنراوی کۆمپانیای (سورەیا- تۆڕی پەیوەندییە بێ سنوورەکانی جیهان) تایبەت بە پەرەسەندنی ئاستی تەکنەلۆژیا لە کوردستان.
(٣٢) سامان، گۆڤارێکی ئابووری وەرزییە، یەکێتی ژوورە بازرگانی و پیشەسازییەکانی هەرێمی کوردستان دەریدەکات، ژمارە(١١)، ساڵی٢٠١٤، ڕاپۆرتێک لەبارەی کرانەوەی پێشانگای نێودەوڵەتی سلێمانی، ل٧٠.
*/ ئەو دروشمە بوو کە کۆمپانیای کۆرەک تیلیکۆم تایبەت بە هێڵەکانی تەلەفۆنی گوازراوە بەرزی کردبۆوە.
(٣٣) بازرگانی لە سەردەمی بێ ئاگاییدا، سەروەر کاکەیی، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، سلێمانی، ژ (٥٩٩٤)،ل١٣.

